# ڕۆشنبیری نوێ

## لەم ژمارەیەدا


**ڕاپۆرتی جەنگ و ڕامیاری**

بناخەی کێشەکانی نێوان عیراق و ئێران ـ مولود سورچی ٣
چەند بەرپەرەك ژ قادسیا صدامی ـ جمال بەرواری ١٦
روناهی‌یەك ل سەر شەڕی عیراقێ ـ ئیران ـ حمید علی ٢٦

**لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی**

جاوان جمیل ڕۆژبەیانی ٣٥
مرۆڤی چاخی بەستەڵەك د. جمال رشید أحمد ٤٣
ئینولستەوفی د. محسن محمد حسین ٦٦
چەند بیرەوەریکی مێژوویی احمد خواجە ٨١
ڕاپەڕینی کوردەکان لە ئێران و. د. کاوس قەفتان ٨٧
ئەتنۆگرافیاو لێکۆڵینەوەی
هونەری میللی د. مجید حمید علی عارف ١٠٢
مێژووی هۆزی‌گل لطیف گلی ١١٦

**لێکۆڵینەوەی زمانەوانی**

زانیاری زمان و زمانی کوردی د. پاکیزە رفیق حلمی ١٣٠
لیکسیکۆلوگیا د. نەسرین فەخری ١٤٠
ڕستەی شوێن کەوتووی کات د. کوردستان موکریانی ١٤٨
جێناوی خۆیی لە زمان کوردی‌دا د. عبدالرحمن حاجی معروف ١٦١
دەوری پیتە بزوێنی (ە) لە... نوری علی امین ١٦٩
بیناغەی سادەترین ڕستەی کوردی د. وریا عمر أمین ١٨٣
فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ محمد ئەمین هەورامانی ١٩١
روناکیری لە (زمانی نەتەوایەتی) غازی فاتح وەیس ٢٠٥

**ڕاپۆرتی ژمارە**

**لێکۆڵینەوەی زاراوەی کوردی**

پێناسی زاراوە د. کامل بەسیر ٢١٣
زاراوە سازی پێوانە مسعود محمد ٢٠٥
زاراڤێد فولکلوری عبدالکریم دوسکی ٢٧٤
زاراوەکانی ناو کتێبی قوتابخانە عبدالرزاق بیمار ٢٨٦
زاراڤێت ئەدەبی دمەم وزینا رشید فندی ٣٠٣

**لێکۆڵینەوەی کشت وکاڵی**

ژیانی هەوجاری لابڕ د. جهاد کیانی ٣١٨
جۆرەکانی گوڵەباخ صلاح الدین صالح ٣٢٥

**لێکۆڵینەوەی زانستی**

ڤیتامینەکان د. ذنون پیریادی ٣٣٢
ئاڵ و گۆڕی تەکنولۆژی انور قەرەداغی ٣٤٨
فیساگۆریزم و بیرکاری نافع کاکە ٣٥٥

**کتێبی ژمارە**

هێرشی دەهەزار جەنگاوەرەکە کمال غەمبار ٣٦٢




وێنەی مرۆڤێکی چەرخی بەردین بڕوانە ل ٤٣ ـ ٦٥



وێنەیەك لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵێك لە مرۆڤی نیاندرتاڵ

وێنەکان لە ئەرشیفی دکتۆر جمال رشید احمد وەرگیراوە.

ئەیلولی ساڵی ١٩٨٦

# ڕۆشنبیری نوێ

ژمارە - ١١١ -

سەرەکی ئەنجومەنی
کارگێڕو سەرنوسەر
مصلح جەلالی

گۆڤاریکی وەرزیە بۆ لێکوڵینەوە
دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
دەری دەکات



ناونیشان

ڕۆشنبیری نوێ

دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی

وزیریە تەنیشت المعهد القضائی/ ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە

# بناخەی کێشەکانی نێوان عیراق و ئێران و قادسیەی صدام

- مولود سورچي -

**سەرەتا:**

ئەگەر ئاورێك لەرابردوو بدەینەوەو لاپەرەکانی مێژوو هەڵ دەینەوە، بۆمان روون دەبێتەوە، کە تەنگ و چەڵەمەی نێوان عیراق و ئێران بۆ پتر لە (٤٥٠) چوار سەدو پەنجا ساڵ دەگەرێتەوە.

ئەمە تەنیا تەنگ و چەڵەمەیێکی سنووری، یان ناکۆکی یێکی لاییدە نی‌یە دەربارەی مافەکانی کەشتی رانی، بەڵکو لەوە زۆر فراوانترە: چونکە تەنگ و چەڵەمەکە لە چاوچنۆکی‌یە فراوان خوازی‌یەکانی ئێران دا خۆی نیشان دەدات لە ناوچە عەرەبی‌یەکانی دراوسێ و ئەوانەی بەپاڵ سنوریەوەن.

پێش ئەوەی مەودای ئەم ناکۆکی‌یە بەسەربکەینەوە، دەبێ کەمێك قووڵتر بینەوەو ئاورێکیش لە مەودای ناکۆکی عەرەب و رەگەزپەرستیەتی فارسی بدەینەوە.

ناکۆکی عەرەب دژ ی رەگەزپەرستیەتی فارسی دیاردەیێکی کاتی نی‌یە لە ئەنجامی بارودۆخی شۆرشگێرانەی عیراقی نوێ هاتبێتەکایەوە... لە راستی‌دا ئەمە بەشە رواڵەتەکەیەتی. خۆ ئەگەرهاتوو لەم دژکاری‌یەدا پرسیارکردن رەوا بێ، ئەوە بەهەڵەدا دەچین ئەگەر عاستی ناکۆکی عیراق و ئێران لەسنووری گۆشەی یاسای وڵاتان دا راوەستین. ئەگەر ئەو مەسەلە ماف کارییانە هۆی راستەوخۆی بەیەکداچوونەکە بێ، ئەوە راست و بەجێ نی‌یە هەرگیز دڵمان بەوەندە ئاو بخواتەوە، بەڵکو دەبێ بە قووڵایی ئەو مەسەلانەدا بچینە خوارەوە، بۆ ئەوەی بگەینە بنج و بناوانی کێشەکە لە قووڵایی مێژووی ناوچەی عەرەبی‌دا...

هیچ گومانیشی تێدا نی‌یە کە ئەم مل ملانێ‌یە لەپێش پەیدابوونی ئایینی ئیسلامەوە بەرپابووەو، میللەتی عیراقیش بەر لە پەیدابوونی ئیسلام، بۆ بەرگری‌کردن لە ئادگارو تایبەتیەتی‌و خودی شارستانیەتی عەرەبی‌و کەسایەتی نەتەوەیی، خۆیان لەدژ ی هێرش و شاڵاوەکانی فارسەکان راگرتووەو بەرپەچیان داونەتەوە.



**شارستانیەتی فارسی!!:-**

کاتی خۆی «ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی» بوونێکی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی دژوار بوو، یەکیەتی و گونجانی تێدانەبوو. ئەم دوودیاردەیە مەرجی سەرەکین بۆ هەڵ گرتن و پەیامی مێژوویی. دەوڵەتی فارسی لەوەختی دورست بوونیەوە، ئیمپراتۆریەتیکی لەلای رۆژهەلاتی شارستانیەتی عەرەبی دامەزراندبوو، ئیمپراتۆریەتیکی سوپایی فارسی بوو، کۆمەڵێ لەو وەچەو بنەچانە فەرمان رەواییان کردووەو، توانیویانە بە پێی تاقی کردنەوەکەیان دەزگا رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان بخەنە ژێر رکێفی دەزگا سوپاییەکانەوە (رۆشنبیری: ل١٦).

دیاردەی هەرەسەیری ئیمپراتۆریەتی فارسی لەهەموو مێژوودا ئەوەبووە هەمیشە پشتی بەکۆمەڵێ چەکداری نۆکەرو بەکرێگیراوەوە بەستووە کە بەرەگەز فارسی نەبوون. ئەمەش وای لەسوپاکەی کردبوو ببێتە دژوارترین نموونەی درندەترین سوپایی وێران کاری و دوژمنی شارستانیەت. نموونەی ئەم درندەییەش ئەو هێرش و شالاوە نالەبارانە بوو کە رەگەزپەرستیەتی فارسی کردبوویانە سەر شارستانیەتی بابل، هەتا توانیان کاول و ویرانی بکەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا کە مۆرکی رەگەزپەرستیەتی فارسی مۆرکێکی سوپایی بوو، لاوازو بێ هێز بوو، شەرەکانیان لەگەڵ عەرەب و نەتەوەکانی تردا، شلۆقی لایەنی سوپایی و باری کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و شل وشاوی بوون و، خوونەریتی فارسەکانی ئاشکرا کردو سەلماندی کە بێ هێزو لاوازن، ئەوەبوو لەشەری - ذی‌قار - دا کە لەگەڵ عەرەب دا کردیان و، لەشەرەکانی رۆمەکانیش دا، تێك شکان و دەزگاسوپاییەکەیان پرش بووەوەو ترس دای‌گرتن. هەرچەند ئەم ئیمپراتۆریەتە بەگەرمی یەوە هەولی ئەوەی‌دا جۆرە ئایدیۆلۆجیەت و باوەرێکی وا بێنێتە کایەوە لەگەڵ لووت بەرزی و رەگەزپەرستیەتی خۆیان دا بی گونجێنن بۆ ئەوەی بتوانن باری نائاسوودەیی و پاشاگەردانی کۆمەلی هەرەس هێناوی پێ بپارێزن و بیکەنە کوتەکێك،

خزمەتی بەرژەوەندی دوژمنکاری و بەربڵاوی خۆیان بکات دژی نەتەوەکانی تر، بەڵام کار لە کار ترازابوو.

مەجووسیەت ئەگەرچی لە بیروباوەردا فەلسەفەکاری دەکا و وا دەگەیەنێ کە ڕووناکی و تاریکی جمك و دووانەن و... هتد، بناخەی ئاژاوەییکی ڕەوشتیاری و کۆمەڵایەتی دامەزراندووە. ئەو ئاژاوەیەش لە بیرو باوەڕی جووڵانەوە تازەکانی فارسەکان دا، وەکو (قرمطي) و (بهائی) و (بابی) و (حشاشی)یەکان دا سەری هەڵ داوە و دەرکەوتووە. ڕاستی‌یەکەشی ئەوەیە ئەو بزووتنەوە گیانیانەی کە لە ناوەرۆك دا دوژمنی ئیسلامن، لە بناخەدا لەسەر بەرەڵایی ئارەزووی دەروونی مرۆڤ دامەزرابوون و ببوونەچەرخی لەدایك بوونی جۆرە بەرەڵڵاییکی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

بیر و باوەڕەکانی (مانی)ـ ش لە زەردەشتی‌یەوە پەرەی پێداوە و (مانی) دامەزراوەو بیروباوەڕەکانی خستۆتە بۆتەی بیری ڕامیاری‌یەوە، ئەویش بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ ڕەگەزپەرستیەتی فارسی خۆش بکات.

(مانی) دەستی کرد بە ئاوێتەکردنی ئایینە کۆنەکان و مەسەلەی (دووانەیی گەردوون) - ڕووناکی و تاریکی - لە مەجووسیەت و (پەی پێ نەبردن)ی لە بووزییەت و (سیانەی‌پیرۆز)ی لە عیسایی‌یەوە وەرگرتووە. بۆ ئەوەی کە لە نرخ و بەها پیرۆزی پەیامی پێغەمبەران و ئایینە ئاسمانی‌یەکان بشکێنێ و کەم بکاتەوە، گەلێ درۆو دەلەسەی بۆ هەڵ بەستن. «بەرادەییك - شاپوورشا - کە پشتی دەگرت، وتبووی «حەزرەتی عیسا شەیتان بووە» (الجامعة: ل١٢).

لەگەڵ پەیدابوونی - مزدەك - دا، ئایدیۆلۆجیەتی ڕەگەزپەرستیەتی فارسی گەیشتە ترۆپك و، بەمەیش لە ڕووخان و هەرەس هێنان نزیك بوونەوە. ئەوەش بوو کە لە سەردەمی - قباذ - شادا، مەزدەك بوو بە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت و خەڵکی بەرەوپیری چوون و، سەرەنجام، باری کۆمەڵایەتی کەوتە مەترسی‌یەوە.

ابن الندیم - ی مێژوونووس دەڵێ: «مزدەك فەرمانی پێ‌دان کە بە ئارەزووی دەروونی خۆیانەوە ڕابوێرن و بخۆن و بخۆنەوەو هاوبەشی ژن و خێزانی یەکتری بکەن لە ڕابواردن دا...» (الجامعة: ل١٣) ئەوەش خوونەریتیکی کرچ وکاڵی مرۆڤەو، مرۆڤایەتی لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی‌دا پیایا تێ‌دەپەڕێ. ئەمەیە کۆڵەکەی سەرەکی شارستانیەتی فارس. ئەو شارستانیەتە پووچەڵەی. لەگەڵ سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزەدا هەرەسی هێنا.

دەوڵەتی ئێرانی نوێ، لە ئەنجامی ئینقیلابێك دا دروست بوو. کە پەهلەوی گەورە لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا بەسەر قاجارەکان دا کردی. وە ئەگەر یارمەتی دەوڵەتە ئەوروپایی‌یە داگیرکەرەکان نەبووایە، ئەو (ئەفسەرە لاوە!) نەی‌دەتوانی لەم ئینقیلابەدا سەرکەوێ. بەکورتی، ئەوەبوو بەیارمەتی بەریتانیا توانی بەسەر قاجارەکان دا سەرکەوێ، چونکە ئەوان بوونێکی وا ڕێك وپێکیان نەبوو بتوانن خواستەکانی بەریتانیا ئەنجام بدەن و بەرژەوەندی‌یەکانی بپارێزن. ئەو قۆناغەش - واتا قۆناغی سەردەمی قاجارەکان و سەدەی نۆزدەم -، دەوڵەت و کۆمەڵگای فارسی ڕوویان لە گزی و ئاژاوەیێکی سەیرکردبوو، ئەمەیش بوو بە بوارێك، بزووتنەوەی - بابی - و - بهائی - سەرهەڵ بدەن وەك دوو ڕێك خراوی نهێنی. بنەڕەتی ئەو دوو بزووتنەوانەش لەسەر بیروباوەڕی ئایینەکۆنەکانی فارسی دامەزرا بوو، بەڵام لەژێر پەردەی ئیسلام دا کاریان پێ‌دەکرد. ئاشکرایە ئەم دوو بزووتنەوانە بەزۆری زۆردارەکی نەبێ نەیان توانیوە هەموو فارسەکان بخەنە ژێردەسەڵاتی خۆیانەوە. ئەو بزووتنەوانەش پەیوەندی زۆریان لەگەڵ ماسۆنی و زایۆنی‌دا هەبووە. لەنێوان ئەم دوو بزووتنەوەیەدا کۆڵەکە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگای فارسی دەرکەوتن و گری‌کوێرەی ڕق و کینەیان دژ بە نەتەوەی عەرەب و ناوچەکە ئاشکرا بوو.

**مێژووی ناکۆکی نێوان عیراق و ئێران:**

لە بواری مێژووەوە... هەر لەساڵی (١٥٢٠)ەوە هەژدە پەیمان لەنێوان دەوڵەتی فارسی و دراوسێکانی‌دا لە ڕۆژئاواوە مۆرکراون.. هەموویان دەربارەی پەیوەندی لەگەڵیان دا... لەناو ئەوانەیش دا مەسەلەی سنوور. دەوڵەتی فارسیش لەهەموو بۆنەیەك دا چاوەڕێی هەڵی ئەکرد بۆ ئەوەی لەو پەیمانانە لابدات چ بەگفتوگۆ، چ بەکردەوە.

دەوڵەتی فارسی و دەوڵەتی عوسمانی، یەکەمین پەیمانی

نێوانیان له ساڵی (١٥٢٠)دا مۆرکرد، ئەویش لەئەنجامی داگیرکردنی چەند ناوچەکی عیراق ـ کە ئەوسا سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوو ـ لەلایەن ئێرانەوە. کە خستیە سەرخاکی خۆی، ئەوە بوو دەوڵەتی فارسی بەگوێرەی ئەو پەیمانانە ناچارکرا لەو زەویوزارانە بکشێتەوە کە داگیری کردبوون. چەند پەیمانێکیتریش بەدوایان دا هات، گرنگترینیان پەیمانی ساڵی (١٦٣٩)یە کە لەزەهاو مۆرکراو، بۆ یەکەمین جار بنەمای دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی تێدابوو. پەیمانی ناوبراو بەو پەیمانە دووپات کرایەوە کە لە ساڵی (١٧٤٦)دا لە (کردن) مۆرکراو هەمان سنوور کە لە پەیمانی ساڵی (١٦٣٩)دا دیارکرابوو، مایەوە.

«شایانی باسیشە لەهەردوو پەیمانەکەدا دەوڵەتی فارسی ناچارکراوە لەزەو یوزاری عەرەب لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بکشێتەوە، کە دەوڵەتی فارسی بەگوێرەی جوگرافی خۆی لەسەر حسابی ئەو فراوان دەکرد» (صدام حسین: ل٩).

هەر بەشوێن هەڵ گیرسانی جەنگ، لەنێوان دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی فارس دا) لەساڵی (١٨٣٣)دا پەیمانی (ارضروم)ی یەکەم مۆرکرا کە پەیمانە مۆرکراوەکانی پێشووی دووپات کردەوە سەبارەت بەسنوور. . . بەتایبەتی پەیمانی (١٧٤٦) کە بەکارپێ‌کراوی داناو دەبێت هەردوولا پەیرەوی بکەن.

هەردوولا لەم پەیمانە نوێیەدا بە شێوەیێکی تایبەتی دووپاتی قەدەغەکردنی دەست تێوەردانی دەوڵەتی فارسیان کردەوە لەکاروباری ناوخۆی عیراق، کە ئەوسا سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو. بەڵام کێشەی سنووری نێوان هەردوولا لەئەنجامی بەردەوام تێپەڕاندنی ناوچەگەرییانەی فارسی، هەر درێژەی کێشا. . . سەرەڕای ئەو پەیمانانەی پەنجەمان بۆ ڕاکێشان و، بەهۆی سەرهەڵ دانی پێش برکێی نێوان ڕوسیای قەیسەریو بەریتانیا بۆ دەست بەسەرا ـ گرتنی ناوچەکە، ئەوە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو فارسی وایان بەباش زانی کە سنوورێکی تەواو چەسپاو بۆخۆیان دابنێن. لەم بوارەشەوە، ڕوسیای قەیسەریو بەریتانیا دەوری ناوبژیکەریان بینی. . .

ئەوە بوو پەیمانی (ارضروم)ی دووەم لەساڵی (١٨٤٧)دا مۆرکرا، بەگوێرەی ئەم پەیمانەش، دەوڵەتی فارسی یەکەمین فراوان بوونەوەی ناوچەیی لەسەر حیسابی مافەکانی عەرەب دەست گیر بوو. . . پاش ئەوەی سنوور پێش ساڵی ١٨٤٧ لە ناوچەی (شط العرب)دا لە ڕۆژهەڵاتی دووڕگەی عەبادانەوە بوو وای لێهات لەگەڵ کەناری ڕۆژهەڵاتی )شط العرب)دا بڕوات. .

ئەگەرچی (شط العرب) بەتەواوی ئاوەکەیەوە لەژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانیدا مایەوە، بەڵام دەوڵەتی فارس دەسکەوتێکی ناوچەیی بەسەر خاکی کەناری ڕۆژهەڵات دا دەستگیربوو، ئەویش دان نان بوو بەدەسەڵاتی فارسی بەسەر بەندەرو کەشتیڕانی (محمرە)دا کە کەوتۆتە بەرامبەر نۆکەندی (الحفار) لە ڕووباری کارۆن و دووڕگەی (خضر) کە ئێستا بە (عبادان) ناودەبرێت، ئەو خاك و شارەو بەندەرەکانی لێدەرچێت کە لەو کەنارەدان و لەژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانیدا مانەوە.

شایانی باسیشە کە پەیمانی (١٨٤٧) بەڕاشکاوی تێدا هاتوە، هەر لایەکیان دەبێ واز لە داواکاری ناوچەگەری لەخاکی لاکەیتر بهێنن و دەست لە کاروباری ناوخۆی یەکتر وەرنەدەن.

بەگوێرەی ئەمەش، لیژنەیێکی هاوبەش پێك هێنرا بۆ دیاریکردنی هێڵی سنوور لەسەر نەخشە، بەگوێرەی وەسفەکانی دیاریکردنی سنوور کە لە پەیمانەکەدا هاتووەو، نەش دەتوانرا ئەو ئەرکە بەجێ بهێنرێت بەهۆی ئەو جەنگانەی لەناوچەکەدا هەڵ گیرسان، کە جەنگی (قرم)ی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ڕوسیا (١٨٥٤ ـ ١٨٥٦)و جەنگی بەریتانیاو فارسی (١٨٥٦ ـ ١٨٥٧) بوو، جەنگی (بلقان) بوون.

ئیتر بارودۆخ تاکو ساڵی (١٩١١) بە مەنگی مایەوە، ئەوسا کە دەربارەی بەجێهێنانی پەیمانی (ارضروم)ی دووەم ناکۆکی سەری هەڵ دایەوە لە ئەنجامی قایل نەبوونی دەوڵەتی فارسی بە بەجێهێنانی پەیمانەکە.

ئەنجام بەوە دوایی هات کە پرۆتۆکۆڵی (تاران)ی ساڵی (١٩١١) مۆربکرێت، کە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو فارسی بۆ

ریز ئەسەردان و چەسپاندنی هێڵی سنوور لەنێوان هەردوو لادا بەگیانیکی بێ لایەن لەسەر پێکەوەنانی لیژنەیەکی هاوبەش ریک کەوتن کە لە (استنبول) کۆببێتەوە، پاشان لیژنەیەکی هونەریی کەوەسفی هێڵی سنوور لەسەر سروشت جێبەجێ بکات، بەگوێرەی ئەوەی کە لە دەقەکانی پەیمانی ئەرزرۆم دا هاتووە کە ساڵی (١٨٤٧) مۆرکراوە.

«پاش ئەوەی هەردوولا ساڵی (١٩١٢) لە (استنبول) کۆبوونە، نەیان توانی لەسەر پیلانی کارکردن رێك بکەون بەهۆی ناوبژی کردنی روسیاو بەریتانیاوە دیسان پرۆتۆکۆلی ئەستانەی ١٩١٣ مۆرکرا کە نوێنەری هەردوولاو هەردوو دەوڵەتی ناوبژیکەر مۆریان کرد». (حسین: ل١٢).

پرۆتۆکۆلی ناوبراو وەسفێکی ئاشکرای هێڵی سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەردوو وڵاتی تێداهاتووە، ئەو وەسفەش جیاواز نی‌یە لەوەی کە لەپەیمانی (ارضروم)ی ساڵی (١٨٤٧)دا هاتووە

لەم پرۆتۆکۆلەدا جارێکی تر دەوڵەتی فارسی دەسکەوتێکی ناوچەگەری لەسەر حسابی مافەکانی عەرەب چنگ کەوت. ئەوەبوو دەوڵەتی عوسمانی جارێکی تر دەستی لە بەشێکی ناوچەی عەرەبی لە (شط العرب)دا هەڵ گرت بەرامبەر بە بەندەری (محمرة)و بەدرێژایی چوارمیل.

ئەوەبوو هێڵی سنوور لەم ناوچەیەدا وای لێ هات بە ناوەراستی (شط العرب)دا بروات و، ئەوجا شان بەشانی کەناری رۆژهەڵاتی رووبارەکە تا دەگاتە زەریا، بەم جۆرەیش کۆمەڵێ دوورگەی لەژێر چنگی دەوڵەتی فارسی‌دا هێشتەوە.

لە ئەنجامی ئەوەوە، لیژنەیەکی چوارقۆلی هاوبەش بەگوێرەی پرۆتۆکۆلەکە لە نوێنەری روسیاو بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانی ئێران پێك هێنرا، سنووری لەسەر سروشت چەسپاند بەگوێرەی ئەو وەسفەی لە پرۆتۆکۆلەکەدا هاتووە. ئەویش هەر لە گەیشتنی شط العرب ـ ەوەیە بە ئاوی کەنداوی عەرەب لە باشورەوە تا دەگاتە ئارارات لە باکوور.

لیژنەکە کاروباری خۆی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤دا کۆتایی پێهێنا، بەم جۆرە دەبوو سنوور چەسپاوبێت بە تەواوەتی و هەردوولا لەو مێژووەوە دانیان پێدا نابێت.

پاش ئەوەی عیراق سەربەخۆیی وەرگرت و لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیابووەوە، دوای جەنگی یەکەمی جیهان بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بەگوێرەی یاسای نێو دەوڵەتان لەو ئیمپراتۆریەتەوە ـ پەیمانە تورکی‌یەکانی تایبەتی بە ناوچەی عێراق بۆ بەجێ‌ما، وە بە پێی پرتۆکۆلی ساڵی (١٩١٣)و مەحزەرەکانی لیژنەی دیارکردنی سنووردا، دەبووایە ئێران هیچ کێشەیێك بۆ عیراق لەم ناوچەیەدا نەنێتەوە.

لەو سەردەمەی عیراق تازە سەربەخۆیی وەرگرتبوو، ئێران زنجیرەیێك کاری سنوور بەزاندنی ئەنجام داو رای‌گەیاند خۆی بە پەیمانی (ارضروم) و پرۆتۆکۆلەکانی ١٩١٣و مەحزەری دانیشتنەکانی ساڵی ١٩١٤ نابەستێتەوەو، دەستی کرد بە زنجیرەیەك کاری دەست تێوەردانی چەکدارانە لە (شط العرب)و پێی خستە ناو ناوچەی عیراقەوە ئەویش بە دروست کردنی مەخفەری سنوور لە ناو خاکی عیراق و پاسەوانی کردنی بەهێزی چەکدارانە.

«ئەم سنوور بەزاندنەش، سەرباسی ئەو سکاڵایە بوو کە عیراق ساڵی ١٩٣٤ پێشکەشی دەستەی نەتەوەکانی کرد ئەوەبوو دەستەکەیش ئامۆژگاری ئەوەی کرد ناکۆکی‌یەکە لە رێگەی گفتوگۆی راستەوخۆوە چارەسەر بکرێت» (صدام حسین: ل١٤)

ئەم ناکۆکی‌یە بە مۆرکردنی پەیمانی سنوور لە نێوان عیراق و ئێران دا لە چواردەی تەمووزی ١٩٣٧دا کۆتایی پێ‌هات کە لە یەکەمین بەندی ئەم پەیمانەدا هاتووە، پرۆتۆکۆلی ساڵی ١٩١٣ و مەحزەرەکانی دانیشتنەکانی لیژنەی دیارکردنی سنووری ساڵی ١٩١٤ بە بەڵگەنامەی رەوا دەژمێررێن و دەبێت هەردوولا چاودێرییان بکەن و لە نێوان هەردوو دەوڵەت دا هەمان ئەو هێڵە هەبێت کە لەلایەن لیژنەکەی (١٩١٤)وە دیاری‌کراوەو دارێژراوە.

ئەوەی پەیوەندی بە شط العرب ـ ەوە هەیە ئێران سەرلەنوێ بەگوێرەی ئەو پەیمانە لەسەر حسابی عیراق کەوتە پەل هاویشتن و دەسکەوتێکی ناوچەیی نوێی چنگ کەوت، سەرەرای ئەوانەی کە لە پێشوودا لە ساڵی ١٩١٣ دەستی

كەوتبـوو، ئەمەیش بریتی‌یە لەوەی عیـراق دەست لە بەشێكی بچووكی شط العرب ـ بەرامبەر بە عبادان هەڵ بگرێت بۆ ئەوەی هێڵی سنـوور بە ئاوەڕۆی قووڵی ئاوەكـەدا بە درێـژایی نزیكـەی چوار میل تێ‌پەڕێت. ئەمەی لێ دەرچێت، هێڵی سنوور لەنێوان عیـراق و ئێـران لە پلەی ئاوی تەنكی كەنـاری ڕۆژهـەڵاتی شط العرب ـ دا بەگوێرەی دیاركردنی سنوور كە لە مەحزەری ساڵی (١٩١٤)دا باس كراوە، مایەوە.

بەنـدی سێـیـەمی پەیمـانی ١٩٣٧ دەڵێ «لیـژنـەیێـك بۆ داكـوتـانی ئەو ستـوونـانـە پێـك بهێنـرێ كەوا شوێنـەكـانیـان و دامەزراندنیان لەلایەن لێژنەی ساڵی (١٩١٤)ەوە دەست نیشان كراوەو، دانانی ستوونی نوێی‌تریش ئەگەر سوود لە داكوتانیان بینرا».

لێژنەكە ساڵی ١٩٣٨ پێك هێنرا دەستی‌كرد بەكار، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٠دا ڕاوەستا بەهۆی ئەوەوە كە ئێران خۆی لێ‌كێشایەوە.

دوای ئەوەی كە بۆی ڕوون بووەوە كە زۆر سنووری گەورەی ناوچەیی پچڕاندووە لە خاكی عیراق دا لە ناوچەی (ام شیر) لە پارێـزگـەی میسـان لە خوارووی ڕۆژهـەڵاتی عیـراق، ئێـران سەرلـەنـوێ دەستی بە كێشـە و ئاژاوەی سەرسنـوور كردەوەو، سنووری عیراقی لە چەند ناوچەیێك دا بەزاند.

ئێران بەردەوام لە هەردوو سەردەمی پاشایی‌و كۆماری‌دا ئەم گیروگرفتانەی بۆ عیراق پەرەی پێ‌دەدا و گێژاوەی بۆ دەخوڵقاند. بارودۆخ بەم جۆرەمایەوە تا ئێران لە ساڵی ١٩٦٨دا ڕای‌گەیاند كە ئیتـر ئیلتـزام بە بەنـدەكـانی‌تـری پەیمـانی ساڵی ١٩٣٧ ناكـات و، پەیمـانەكەی تەواو هەڵ وەشاندەوەو، بەردەوام دەستی لە كاروباری ناوخۆی عیراق وەردەدا. عیراق هەردەم، وە بەپێی ئەحكامی یاساكانی نێو دەوڵەتان، بۆ نەهێشتنی ناكۆكی لەگەڵ ئێـرانی شادا، هەمـەجـۆر ڕێگـەی گرتە بەر. بەڵام تەقەڵلاكانی عیراق جاری پەسەند نەدەكراو جاری دەخرایە پاش گوێ.

ئێران هەموو وەخت لە هەل دەگەڕا بۆ داواكردنی سەرلەنوێ دیاركردنەوەی سنوور لە (شط العرب) لەسەر بنچینەی هێڵی تالوك.

بەم جۆرە، بارودۆخ هەر لە ساڵی (١٩٦٩)وە ـ پاش شۆڕش ـ تا ساڵی ١٩٧٥ كە ڕێكەوتنامەی جەزایر مۆركرا، هەروامایەوە.

× ×

**بارودۆخی پاش ١٩٦٨:**

هەر لە شۆڕشـی ١٧ی تەمـوزی ساڵی ـ ١٩٦٨ ـ وە تا مۆركردنی ڕێكەوتنامەی جەزایر، ئێران بەردەوام شەڕی بە عیـراق دەفرۆشت و دەستی لە سیاسـەت و كاروباری ناوخۆی عیراق وەردەدا.

لە سەردەمـی شادا، لووت بەرزی‌و دەست درێـژی كردن و فراوان و بوونـەوەی ناوچـەیـی لەسـەر حسـابـی عەرەب و، هەوڵ دانی ژیـان گەیـانـدن بە عیـراق و، بە مافـەكانی نەتەوەی عەرەب، ڕێرەوێكی چەسپاوی پێك دەهێنا، ئەویش ئەوەبوو، كە دەی‌ویست بەردەوام سیاسەتی ناوچەیی بەكاربێنێت و لە هەموو هەل و بوارێك دا نیەتی گلاوی خۆی ڕابپەڕێنێ‌و، هەر جارێك ویستێكی بەجێ‌بهێنێ.

پاش بەرپـابـوونـی شۆڕشـی ١٧ی تەمـووزی ١٩٦٨ لە عیـراق دا، كە خەریكی گەشـەپێ‌دان و بنـاغـەدانانی كۆمەڵێكی نوێ بوو و تەقەڵلاكانی خۆی لە خەباتی دژی دەست درێژی زایۆنی خستە پاڵ وڵاتانی عەرەبی، بەتایبەتی لەو كاتەدا پێڕۆی (ڕژێمی)شـا بەشێـوەییێكی لە ڕادەبـەدەر خۆی چەك ڕێـژ دەكردو خۆی ئامـادە دەكـرد كە دەوری باڵـباز (پـۆلیس) لە ناوچـەكـەدا ببینێ.. ئەم سیاسەتە گومڕایەش پاڵی پێوەنا كە شەڕ بە عیراقی سەربـەخـۆ بفـرۆشێ‌و هەوڵ بدا ڕژێمە نیشتمانی‌یەكەی عیراقی نوێ لاواز بكات.

ئەوەبـوو شای ئێـران سنـووری بەزانـدو ئێشكگـەی لە سەر سنوور لەناو خاكی عیراق دا دامەزراندن و ڕێگای قیرتاوی بۆیان كردەوە.

وە بۆ ئەوەی ئەم سنـوور بەزێنـە، بەهێـز فەرزبكـات، هێزی چەكـدارو جۆرەهـا چەكی تیـادانـا.. لەپـاشـان ـ بەپێچەوانەی ڕێكـەوتنـامـەكـان ـ داوای ـ ڕاست كردنەوەی ـ سنووری كرد لە كەنـداوی عەرەبی.. «كـە عیـراقیش ئەمـەی ڕەفز كرد، ڕژێمی



ئێران لە ١٩ی نیسانی ١٩٦٩دا پەیمانی ١٩٣٧ی هەڵوەشاندەوە بەبیانووی بیردۆزەی (تیووری) «گۆڕینی بارودۆخ»

بەوەی ئێران کە ئەم پەیمانەی مۆرکردووە، دەوڵەتێکی بێهێزو لاواز بووەو، بەکارتێکردنی بەریتانیا ـ گوایە لای عراقی گرتووە ـ ، بە (دیاری)ی داوەتە عیراق» (الجامعة: ل١٧). ئیتر وازی لە عیراق نەهێناو گەف و هەڕەشەی نەبڕایەوە.. دەستی لە دوژمنایەتی کردنی عیراق و کاروباری ناوخۆی عیراقەوە هەڵ نەگرت. هەردەم هەوڵی ئەوەی دەدا بزووتنەوەی عیراق، بخاتە سنوورێکی تەسکەوەو تەنگی پێ هەڵ چنێو نەتوانێ ڕوو لە گۆڕەپانی نەتەوایەتیو بەجێگەیاندنی ئامانجە مەرکەزییەکەی ـ ڕزگارکردنی فەلەستین ـ بکا.

شای دڵ پڕ لە ڕق وکینە، بە هاوکاری دایەرەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنی، لە پیلان گێران دژ بە عیراق نەوەستا... هەڵویست و خواستی ناپاکانەی ئەوتۆی بەکار دەهێنا بە پێی پێکران و زەفەربردن و دەرفەت، لە شۆڕشی میللەتی عیراق بدات و زیان بە سەربەخۆیی نیشتمانیو مافەرەواکانی نیشتمانیو نەتەوەیی بگەیەنێ.

بارو دۆخ بەم جۆرە مایەوە تا ڕێکەوتنامەی شەشی ئازاری ١٩٧٥.

ئەم ڕێکەوتنامەیە کە لەژێر بارودۆخێکی سیاسیو عەسکەریو نەتەوەیی تایبەت دا مۆرکرا، پێویست بە مۆرکردنی هەبوو.

سەرۆکی بەرێز صدام حسین، دەربارەی ئەم ڕێکەوتنامەیە دەفەرموێ: «ڕێکەوتنامەی ئازار کچی بارودۆخەکەی بوو.. گەلەکەمان باش تێی گەیشت.. لە چوارچێوەی بارودۆخەکەدا ـ بەسەرکەوتنێکی مەزنی داناو بەگەرمییەوە پێشوازی لێ کرد، ..نکە هەستی بە مەبەستەکەی کرد سەبارەت بە یەکیەتی .شتمان و پاشە ڕۆژی وڵات..» (الجامعة: ل١٤).

پاش ڕێکەوتنامەکە وتووێژی زۆر کرا بۆ ڕاپەڕاندنی بەندەکانی ،بەتایبەتی دەربارەی سنوورو دینگەدانان. ئەوە بوو هەرسێ پرۆتۆکۆلەکانی: دیارکردنی سنووری ئاوی، نەخشەکێشانەوەی سنووری وشکاییو، ئاسایشی سەرسنوور

مۆرکران.

بەنسبەت راپەراندنی ناوەرۆکی پرۆتۆکۆلی سنووری وشکایی، پێویستی بەوەخت دەکرد. . ئەمەش کارێکی ئاسایی یە. . پاشان، وە لەبەر رووداوەکانی ناوخۆی ئێران لە سالانی ١٩٧٨و ١٩٧٩، کارەکانی رەسمی گەراندنەوەی خاك دواکەوت.

لە ١١ی شوباتی ١٩٧٩دا شا گۆر بەگۆر چوو، رژێمی نوێ - رژێمی خومەینی - جلەوی دەسەلاتی ئێرانی گرتە دەست.

× ×

**خومەینیو. . خۆش کردنی کێشەکە:**

کە رژێمی شا رووخاو رژێمی نوێ - رژێمی خومەینی - هاتە سەرحوکم، سەرۆك کۆماری عیراق لە ١٥ی نیسانی ١٩٧٩دا بروسکەیەکی ئاراستەی خومەینی کرد بەبۆنەی دامەزراندنی «کۆماری ئیسلامی یەوە»!، تیایدا پیرۆزبایی لێ کردو، ئارەزووی عیراقی دەربری سەبارەت بە «شۆرش»و، بەو هیوایەوە پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوان عیراق و ئێران دا پتەو بێ.

«بەلام خومەینی وەلامی ئەم بروسکەیەی بەشێوەیێك دایەوە کە لەگەل شێوازی دواندن دا - کەپێویستە لەگەل سەرکردەی دەولەتان دا بکرێ - بە تایبەتی لەگەل سەرکردەکانی موسلمانان دا -، ناگونجێ» (صدام حسین: ل٢٧).

بۆ بەرژەوەندی ئێران وابوو، رژێم بەرگی رق و کینەی رەگەزپەرستی فرێ بدات و بۆ بنیاتنانی پەیوەندی دۆستانە، بە تایبەتی لەگەل ولاتانی دراوسێ دا، کۆشش بکا. بەلام خومەینی لەجیاتی ئەوە، بە پێداچوونەوەی زنجیرەی رق و کینەی تەماعکارانە دژی نەتەوەی عەرەب و عیراق بە تایبەتی، هەلسا. . . بەردەوام بوو لە داگیرکردنی خاکی عیراق کە ئێران - بەپێچەوانەی رێکەوتنامەکانی سنوور - دەستی بەسەرداگرتبوو بەتایبەتی لە (زین القوس)و (سیف سعد)دا، هەرئاواش بەرامبەر هەر سێ دوورگەی (طنب الکبرێ والطنب الصغرێ و ابو موسێ). . . سەرەرای دەست دانەسیاسەتی رەگەز پەرستیو شۆڤینی دژ بە برا عەرەبەکانی ئەهواز. سەرۆکی بەرێز صدام حسین، لە بیرەوەری دوازدەمینی بەرپابوونی شۆرشی ١٧ - ٣٠ی تەمووز، دەربارەی پەیوەندییەکانی نێوان عیراق و ئێران - پاش گۆرانکاری یە نوێکانی ناوەوەی ئێران، فەرمووی: «هەر لەسەرەتادا هەلوێستێکی ئیجابیو هاوسەنگمان بەرانبەر بە رووداوەکانی ئێران گرتە بەر. . . پیرۆز باییمان لەگەلانی ئێران و خواستەکانیان کرد. . بە هەلوێستی ئاشکراو راگەیاندراوەوە لەئاکامی وتووێژی راستەوخۆ لەگەل لێپرسراوانی رژێم و، لەژێر رۆشنایو تێروانینی پەیوەندی مێژوویی هاوبەش لەنێوان گەلانی موسلمان و لەسەر بنچینەی رێزلێنان گرتن و دەست نەخستنە کاروباری ناوخۆوە، دووپاتمان کردەوە کە عیراق بەتەنگ پەیوەندی باش و دۆستانەو دراوسێیەتیە لەگەل ئێران دا. . بەلام لێپرسراوانی رژێم رووبان لەم هەلوێستە دلسۆزو راستگۆیە نەکردو بەشێوازی رەگەز پەرستیو هەلوێستی دوژمنانە وەلامیان دایەوە. . . نیەتی دوژمنایەتی کردنی نەتەوەی عەرەب و بزووتنە شۆرشگێری یە خەباتگێرەکەی، راگەیاند. دووپاتی کردەوە کە چاوی لە خاکی عەرەب و سیاسەتی فراوان بوون لەسەر حسابی ناوچەی کەنداوی عەرەبی دایە. . ئەم هەلوێستانە کە سەرچاوەی رەگەزپەرستیو رك وکینەو دواکەوتوویەتی، کارەساتی بۆ ئێران هێنا».

× ×

**هەلسوکەوت و. . پیلانی گەورە:**

باسمان کرد کەوا لە سالانی سەردەمی داریۆشەوە تا دەگاتە چاخی شا عەباس و قاجارەکان و نادر شاو حەمەرەزاو، پاشان خومەینی، عەجەمە رەگەز پەرستەکان ویستوویانەو دەیانەوێ گەلانی دراوسێیان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. . بۆ ئەم مەبەستەش هەزاران ئاژاوەو پیلان و ئاشوب و شەرو هەرەشەو. . . هتد، بوون بە شملی شەری میللەتان و پاشە رۆژی ئەو میللەتانەیان گرتووە.

بەلام ئەوەی دەبێ زیاتر پەنجەی بۆ درێژ بکرێ رژێمە نوێیەکەی ئێران و فەرمانرەواکانیەتی، سەبارەت بە «ناردنە دەرەوەی شۆرشی ئیسلامی!!» بۆ ولاتانی دراوسێ، بە تایبەتی عیراق.

ئەوەبوو، رێبەری رژێمی ئێران و نیازی ناردنە دەرەوەی شۆڕشەکەی تەنیا لە سنووری قسە نەوەستا، بەڵکو تەقەلای بێ ئەندازەی داوە بێ گەیەنە رادەی کار لەدژی عیراق و دژی وڵاتانی تری موسڵمان و، ئەمانەش لەژێر چاودێری راستەوخۆی سەرکردەکانی ئەو رژێمەدا کراوە. لەقوم و تاران، دام ودەزگا دامەزراون کە تایبەتن بە پیلان گێران دژی عیراق و وڵاتانی دەوروبەرو، پیلان دژی عیراق فراوانتر بوو لە رێی کردەوەی تێکدەرو ئاژاوەوە بەهۆی چەند کەسانێکی ئێرانی‌یەوە.... سەرەڕای هان دانی کاربەدەستانی رەسمیی، ئێران بۆ کوشتن و تێکدەر کاری، گرنگترین کاری نارەوایان بۆمبا تەقاندنەوە بوو بە سەر کۆبونەوەیێکی فراوانی قوتابیان لەزانکۆی مستنصریە لە بەغدا لە یەکی نیسانی ١٩٨٠ ...پاشان لە ٥ی نیسانی هەمان ساڵدا... (صدام حسین: ل٣٠).

کۆماری عیراق، بەرێگای وەزارەتی دەرەوە، هەنگاو بە هەنگاو، ئەم کارە نارەوایانەی بە شێوەی یادداشتی (مەزەکەراتی) رەسمی بۆ رژێم دەنارد. بەڵام ئەمانە هەموویان بێ سوود بوون و کاریان گەیشتە رادەیێکی ئەوتۆ خۆیان بکوتنە بالوێزخانەی عیراق لەتاران و، پەلاماری (قنصلیە)ی کۆماری عیراق لە (محمرة) بدەن.

ئەمانە هەموویان لادانە لە پەیوەندی‌یەکانی هاوسێ‌یەتی‌و، نیەتی بۆگەنی رژێم روون دەکەنەوە بە سەپاندنی باری وەسیەت کردن. بەسەر گەل و خاکی عیراق دا.

عیراق زۆر بەئارامەوە هەوڵی بێ‌پایانی دا تا ئەو حوکم گێڕە سەیرانە بخاتە سەر راستە شەقامی مێژووی مرۆڤایەتی، کەچی هەموو هەوڵە پاکەکانی بێ‌هودەو بێ ئەنجام بوو.

«لە جیاتی ئەوەی بێن و چارەسەری زانستانەو پلانی ووردکارانە بۆ ئەو گیروگرفتە ئاڵۆزانە بدۆزنەوە، لە جیاتی ئەوە، ئەو رژێمە تازە بابەتە رۆژ لە دوای رۆژ مل هورترو بەدکارتر دەبوون و روویان لە ئازاردانی گەلی عیراق و شۆڕشی عیراق کرد..». (الثورة: ٩٧٩). دەستیان بۆ سەر خاکی پیرۆزی عیراق درێژکردو لە چواری ئەیلولی ١٩٨٠دا، شارو دێهات و ئێشکگەکانی عیراقیان دایە بەر ئاگری تۆپ و. رژێمی نوێ جەنگی بەزۆر بەسەر میللەتی عیراق دا سەپاند.

عیراق هەر بەرگەی گرت و، رێگەی پشوو ـ درێژی گرتە بەرو گەلێ یادداشتنامەی نارەزایی بۆ تاران نارد، بەڵام چش.... کاری دوژمنایەتی‌و دەست درێژی چەپەڵی تاران تا دەهات فراوانتر دەبوو، تا بەجارێ کاسەی عیراق پڕبوو. .کار لەکار ترازاو بەچاری ناچاری‌یەوە، عیراقی شۆڕش لە ٢٢ی ئەیلولی ١٩٨٠، بە بروایەکی پۆڵایین و بە مەچەکێکی ئاسنینەوە بەرپەچی ئەو دەست درێژیەی مێژەر بەسەرانی قوم و تارانی دایەوەو بەرەنگاری چەتەکانی رژێم هات و، هەندێ لەو خاکەی کە بەناهەق داگیری کردبوو رزگارکردوو گەلێ شوێنی تریشی لەناو قووڵایی خاکی ئێران دا داگیرکرد.

چونکە عیراق چاوی لە بستێك خاکی ئێران نەبووەو نابێ، وە بۆ ئەوەی رژێمی خومەینی هەست بکاو بۆ عەقڵ و هۆشی خۆی بگەڕێتەوە، عیراق بڕیاریدا لەشکرەکەی یەکسەر بۆ سەر سنووری دەوڵەتی بکشێنێتەوە. بەڵام دیسانەوە هەر بێ سوود بوو، بەمەیش عیراق داستانی قادسیەی دووەمی بەرپاکردو، لە قادسیەی صدام گەورەترین دەسکەوتی مێژوویی وەدەست هێنا.

× ×

## داستانی قادسیەی دووەم:

مێژووی کۆن و نوێی عیراق، باشترین بەڵگەی تێکۆشان و قوربانی‌دان و ئازایەتی عیراقی‌یەکان، لە پێناوی سەربەرزی رۆڵەکانی‌و پاراستنی خاکی پیرۆزی نیشتمان، لە توێی لاپەڕە نەمرەکانی‌دا پێش چاو دەخات.

ئەوەش پیشان دەدات کە تێکۆشەرانی ئەم خاکە بەهەر بارو دۆخێکی ناڵەبارو ناسك دا تێ پەڕبوون، بەپێی بۆلوان و پێکران و توانای لە رادەبەدەر، سەر شۆڕی‌و مل کەچیان قبوڵ نەکردووەو، درێغی بە خوێنی گەشی پاکی خۆیان. لە کاروانی درێژ خایەنی خەبات و تێکۆشان دا، نەداوەو رۆژ دوای رۆژ ئیرادەی رۆڵەکانی بەهێزتر دەبێ‌و، هێزو توانایان نوێ دەبێتەوە.

ئەگەر لاپەڕەکانی ئێستای داستانی قادسیە هەڵ دەینەوە، لە ئەنجامی بەرپەچ دانەوەی ڕژێمی گومڕای ئێران بەدرێژایی زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر ـ لە بەرەی جەنگ دا، بەڵگەی ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە هێزی عیراقی نوێ، خاوەن توانایێکی بێ بن و یەك جار بەرزەو لەجەنگیش دا، لەپێشی پێشەوەی سوپاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ـ بەڵکو لە زۆربەی زۆری سوپاکانی جیهان ـ دەوەستێت. هەر ئەو داستان و ڕووبە ڕووبوونەش بووەو دەبێتە مایەی یەکالاکردنی هێزو توانای جەنگاوەرانی ئازاو بەجەرگمان، کە دووپاتیان کردەوە، بەهیچ کلۆجێ ئۆردوی عەجەم ناتوانێ جێ بە سوپاو ڕۆلەکانی تێکۆشەرانی عیراق لێژ بکات. . . چونکە سەرەرای ئەوەی ئەم جەنگە، جەنگێکی خاوەن مەشەلەیە، لەهەمان کاتیش دا گەلێ هۆی سیاسیو مێژوویی بۆتە سەرچاوەی سەرکەوتنە پەیدەرپەیەکانی سوپاکەمان لەگشت کەرت و بەرەکانی جەنگ دا. لەوانەیش:ـ

ڕاستە ڕێگەی تایبەتی عیراق و سوپاکەی کە بەندە بە بیری پارتەوە، بە بەرنامە مەزنەکانی ئەو پارتەوە، لەپێناو گۆڕانکارییێکی شۆڕشگێرانەی بنەڕەتانەی شارستانێتی لە عیراق دا، سەرەرای ئەو دەورە دیارو سەرەکییەی سەرکردەی لێهاتوو سەرەك صدام حسین دەیگێرێت و بەزیرەکیو بەلێهاتوویی و بێ کۆڵ نەدان، هەوڵی بنیاتنانی ژیانێکی نوێی نێو عیراقێکی نوێو لە هەموو بوارێکی سیاسی و عەسکەری و ئابووری. . . هتد دەدات.

لە پاڵ ئەوەش دا، لەلایەکەوە وا شەش ساڵی جەنگ بەسەر دەچێ، جەنگاوەرە ئازاکانی عیراق، جلەوی دەست پێشکەری لە بەرەکانی جەنگ دا گرتوتە دەست و، شۆڕشیش لە بزووتنەوەی سیاسییانەو دیبلۆماسیانەی خۆیدا، ڕۆژ دوای ڕۆژ پێش دەکەوێت و، تەواوی گەلەکەمان فێری مەشقیکردن و هەڵ گرتنی باری سەرشان و بەرگەکردنی درتر دەبێ و، تا دێ ورەی بەرزتر دەبێتەوە، . . . لە لایەکی ترەوە، گەلانی جگەرسوتاوی کوردوستان و عەرەبستان و ئازربێجانی ئێران تاو بەخەباتی خۆیانەوە دەدەن و ڕووبەڕووی بەیت و باڵۆرەی کۆنەبازی «کۆماری نەمری ئیسلامی!!»ی خومەینی و تاقمەکەیەوە دەبنەوە لەپێناوی سەندنەوەی مافە خوراوەکانیان، خوێنی خۆیان دەبەخشن و ڕۆژ دوای ڕۆژ کێشە و ئەگەرەکانی ناوەوەی ڕژێم تیژتر دەبێ و، ئابوورییەکەی خەریکە لەبن دێ و، لە دەوڵەتانی جیهان دا جیادەکرێتەوە.

چاکیش دەزانن کە کۆتاییان لەسەر دەستی ئازاز دلێرانی عیراق زۆر نزیك بووەتەوەو هەڵوێستی ناوەوەو دەرەوەیان لاسەنگ بووە، لەگەڵ ئەمانە هەموویان و، ئەم تێك شکانە بەردەوامەی سوپا شڕەکەی، هێشتا عیراقی سەربەرزو سەرفراز، بەزمانی سەرکردە دلێرەکەیەوە داوای وەستانی شەڕ دەکاو جاری چارەسەری ئاشتیخوازانە دەدات و بە مەبەستێکی پاك و بەدڵێکی سافەوە پێشوازی لە هەموو «مەبەستە پاکەکان»ی نێو دەوڵەتانی کردووەو دەکا، بەڕەنگێك ئەو چارەسەریە زیان بە بەرژەوەندی و مافە ڕەواکانی عیراق لە خاك و ئاودا نەگەیەنێ. . . چارەسەرێکی بنەڕەتانەی وابێت بەند بێ بەگیانی عەدالەت و مافە مێژوویی و سیاسییەکانی عیراقەوە. . . بەڵام ئەم حیسابە لە ڕادەی سنووری تێگەیشتنی دەستوپێوەندی ڕژێم دا نییەو بە چاوێکی ترەوە سەیری دەکەن. ئەم تێڕوانینە شیان لەوەوە هاتووە گەر دەستیان لە سەپاندنی ئەم شەڕە هێنا، ڕەوڕەوی ڕژێم بەردەوام نابێو کێشەکانی ناوخۆ تەختی ڕژێم سەرەولێژ دەکات. . وە بۆ ئەوەی تەنیا حوکمی ڕژێم تۆزێکیتر درێژە پێبدا، نابێ دەست لە شەڕ بکێشنەوەو بێ فەرمانی گەورەکانیان بکەن لە زایۆنیەت و بزووتنەوەی ئیمپریالیزمی جیهانیدا.

× × ×

**هەوکاری چوارقوڵی و مەبەست و نیاز:**

حوستە بوگەنەکانی یەك گرتنەوەی هەر چوار رژێمی ئێران و ئەسەدو قەزافی و قەوارەی زایۆنی دوژمن، لای جیهان و ری گشتی و گشت هاولاتێکی عەرەب و غەیری عەرەب ئاشکراو بووە.

رژێمی حافظ أسد ـ ی تاوانبارو دەستە خوێن مژەکەی، دۆزو بەرەو نەمان دەڕۆن... مانەوەی رژێم بە ڕێنوێنی کردنی ئیمپریالیزم و زایۆنیەت و ڕاپەڕاندنی پیلانەکانیان بەستراوەتەوە. هەمیشە بەرژەوەندی زایۆنی و ئیمپریالیزم و دوژمنانی نەتەوەی عەرەبیش لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەب، ئەرادەیێك، بەهۆی رژێمی تاران مسوگەر دەکرێ و دەپارێزرێ.. چونکە ڕاپەڕێنەری سەرەکی پیلانەکانە.

دەستەی رژێمی دیمەشقیش، کارکەری دڵسۆزی ڕاپەڕاندنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمە لە ناوچەکەدا.. بەم جۆرە پەیوەندییێکی پتەو لە نێوانیان دا پەیدا دەبێ و... سەرۆکی رژێمی تاوانباری دیمەشقیش، بۆ بەرژەوەندی خۆی و، تەنیا مانەوەی لەسەر کورسی یە کارتۆنیەکەی حوکم دا، ئەوەی لایەتی سەبارەت بە یارمەت دانی رژێمی تاران، دەبێ چۆن بۆی دانراوە، دڵسۆزانە بێ دەنگ ڕای پەڕێنێت.

دۆستایەتی و هاوکاری نێوان زایۆنی دوژمن و رژێمی خومەینی، ئاشکرا و بەهێزە... لە لێدانی دەزگای ئەتۆمی عیراق بگرە تا دەگاتە کردنەوەی پردێکی ئاسمانی لە نێوان تل أبیب و تاران، بۆ ناردنی چەشنەها چەك و چەکەمەنی (جوبەخانە). بەڵام سەیر لەوەدایە کە ـ خومەینی دەیەوێ ـ بەرێگای رژێمی «حافظ اسد»ەوە، خاکی داگیرکراوی فەلەستین لە ژێرچنگی ـ جولەکەکان ـ رزگار بکات و سەربەخۆیی لوبنان بپارێزێ!!

بێ گومان بەگوێرەی ئەم تیوورەی خومەینی ـ ڕزگارکردنی خاکی فەڵەستین، بەهۆی یەك گرتنەوەی هەر چوار رژێمی نەفام و گێل، پێویست بە «بێ هێزبوونی» عیراقی شۆڕش دەکات!!... وە بە پێی رێکەوتنامەی خەیاڵ پلاوی خۆیانەوە، ـ بۆ ئەوەی فەلەستین رزگاربێ ـ ، دەبێ خومەینی عیراق داگیر بکاو، زایۆنیش نیوەی خاکی سوریا بخاتە ژێر دەستیەوە، بۆ ئەوەی تەنیا ـ حافظ أسد ـ لە پایەی ـ سەرۆکایەتی ـ رژێمە خوێناوی‌یەکەیەوە بمێنێتەوە!!!

خومەینی و قەزافیش، لە هەمان نیەت و ڕاپەڕاندنی پیلانەکانی گەورەکانیان بەیەك دەگەنەوە. دەیانەوێ ـ خومەینی ـ شۆڕشی ئیسلامی یە ـ تازە بابەتەکەی بۆ وڵاتانی دراوسێ بنێرێ و، قەزافیش لە گۆشەی بچووکی کۆشکەکەی دا خەریکی ـ دارشتنەوەی ـ حەدیسەکانی پێغەمبەر (د.خ) بێت.. چونکە هەروەك بێ شەرم و ڕووڕەشانە دەڵێ:

حەدیسەکانی پێغەمبەر (د.خ) درۆن و بناغەی راستیان نی یە!! یان هەروەك ووتی ـ سووننەی نەبەوی بوونی نی یەو، دەبێ مێژووی کۆچی لابچێت ـ !!!.

وە بە پێی رێکەوتنی هەردووکیان، پاش چەند مانگێك لەم زۆڕاندنەی قەزافی، خومەینیش وەڵامی دایەوەو وتی:
«پەیامی پێغەمبەر تەواو نی یەو.. یەکێك پەیدا دەبێ ئەو پەیامە تەواو دەکا»!!.

بەڵام یەك گرتنەوەی ئەم چوار رژێم و قەوارەیە، هیواو ئاواتی گەورەکانیان بەدی نەهێنا... وە لە ئەنجامی زەفەر ـ نەبردنی پیلانەکانیان بە عیراقی صدام حسین، ریسیان لێ بووە خوری!. چییان پێ نەما، هەردوو رژێمی قەزافی و ـ أسد ـ

ئاشكرا و ڕووڕەشانە، وەك زایۆنی دوژمن، دەستیان بە ناردنی چەشنەها چەك و جۆرەها (چەكەمەنی) جەبەخانە و پێداویستی یەكانی بەردەوام كردنی شەڕیان بۆ خومەینی بەڕێكرد... بەمەش نەوەستان، ڕاستەوخۆ دەستیان بەنەخشەدانانی هەر هێرشێكی ڕژێمی ئێرانی بۆ سەر خاكی عیراق ـ كرد بەو نیازەی تۆزێك تینوێتیان بشكێ، بەتایبەتی چونكە عیراق ماوەیێك بوو سیاسەتی بەرگریكردنی وەستاو «الدفاع الساكن»ی گرتبووە بەر، وە بەوەی گوایە ئیتر عیراق ناتوانێ هێرش بەرێ و ستراتیجیەتی بەكار بگرێتە بەر. ئەوەبوو پیلان بۆ داگیركردنی فاو دانراو، ڕژێمی تاران ناوچەیێكی تەسكەبەری (بەرتەسك) ناوچەی فاوی داگیركرد.

ئەم سیاسەتە لای سەركردایەتی عیراق ڕوون و ئاشكرا بوو.. بەڵام چونكە ڕژێمی ئێران چەند جار ڕووی لە ڕایگشتی دەكردوو ئەی وت: گوایە ئێران چاوی لە خاكی عیراق نییەو ڕۆژێك نایەت بستێكی خاكی عیراق داگیربكات!!، «مەبەستی زەویوزاری نوێبوو»، عیراق چاوەڕوانی (رد فعل)ی جیهانی بوو، ئەمەشی بە ڕاپۆرتی ڕەسمی یەوە بۆ ڕێك خراو و دەستەكانی جیهانی ناردو، نیەتی بۆگەنی ڕژێمی ئێرانی بۆ سەرانسەری جیهان دووپات كردەوە كە چاوی لە خاكی عیراقە و ڕژێمێكی تەماعكارو شەڕخوازەو چاوی لە فراوان بوون دایە.. ئەم هۆیە و چەند هۆیێكی تری نەتەوەیی وای لە عیراق كرد كەمێك ئارام بگرێ و ئیتر واز لە سیاسەتی «الدفاع المستكن» بێنێ و ستراتیجیەتی نوێی بەرگری بەكار «ستراتيجية الدفاع المتحرك» بگرێتە بەر.

ئەم ستراتیجیەتەش، ئەوەی دووپات كردەوە كە عیراق توانای لەبن نایەو لە شكری عیراق خاوەنی توانایێكی پۆڵایینی ئەوتۆیە هیچ حسابێكی دوژمنان و تەگەرە بەرگەی ناگرێت و، بەم ستراتیجیەتەش، هەڵمەتی لەناوبردنی و تێك شكاندنی هێزی دوژمن و ئاڵەت و ئامێری جەنگی دوژمن و گەمارۆدانی پتەوتری ئابووری دوژمن و لێدانی ئامانجە زیندووەكانی ئابووریو عەسكەریی دوژمن دەستی پێكرا. ئەنجامەكانیشی ئاشكراو دیارن، پێویست بە دووپات كردنەوە ناكەن.

× ×

## سەرچاوەكان:


١ ـ صدام حسين، ئارەزوومان بۆ ئاشتی لە شوێنی توانای بیروباوەڕی داد پەروەرانەوەیە، بەغدا، ١٩٨١.

٢ ـ مجلة «الجامعة»، مجلة شهرية تصدرها جامعة الموصل «عدد خاص»، تشرين الثاني، العدد الثاني، السنة الحادية عشرة، ١٩٨٠.

٣ ـ «القذافي والأسد»، من هما؟ وماذا يريدان؟، اصدارات وزارة الثقافة والاعلام، دار الرشيد للنشر، ١٩٨١.

٤ ـ معادات العراق.. لمصلحة من؟ سەروتارەكانی ڕۆژنامەی «الثورة» لە ڕۆژانی (١٢ ـ ١٤)ی حوزەیرانی ١٩٧٩.

٥ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارەكانی (٨٨)و (١٠٧).

ملخص البحث

# الصراع العربي ـ الفارسي والعلاقات العراقية الايرانية جذور تضرب في أعماق التاريخ

## مولود سورجي

لقد كان للصراع العربي ـ الفارسي أبعاداً مختلفة شملت جوانب سياسية واجتماعية وفكرية وثقافية، تمثلت باثارة صراع ومؤازرة كل حركة من شأنها اضعاف العرب والمسلمين.

واذا عدنا قليلاً الى الوراء، وتصفحنا صفحات التاريخ، نرى ان المشاكل بين العراق وايران تعود الى اكثر من (٤٥٠) سنة، وان كل هذه المشاكل لم تكن تتعلق بالحدود بينهما أو مشاكل جانبية فحسب، بل اوسع من ذلك، وتعود اساساً الى الاطماع التوسعية الفارسية لاخضاع العراق ونهب ثرواته والتحكم في مقدراته وموقعه الستراتيجي.

ان قضية تحديد الحدود بين العراق وايران كان من اهم المشاكل المزمنة في تأريخ الشرق الادنى، وقد تمخضت تلك القضية عن العديد من الاتفاقيات غير النهائية تمثلت في كل من معاهدات زهاو (١٦٣٩) وامير شرف (١٧٣٧) و نادر شاه (١٧٤٦) و ارضروم الاولى (١٨٣٢) وارضروم الثانية (١٨٤٧) وطهران (١٩١١) والاستانة (١٩١٣) ولجنة تحديد الحدود (١٩١٤) وغير ذلك،

وبالرغم من ان ايران كانت في كل معاهدة ـ ونتيجة لظروف خاصة ـ تحصل على (مكاسب) جديدة، الا انها ظلت تناصب العداء ارضاء لاطماعها التوسعية متذرعة بحجج واهية لاسند لها من القانون، وتغفل الاحداث لعرقلة الامور وترفض الالتزام بنصوص المعاهدات والانسحاب من الاراضي العراقية المغتصبة.

ثم جاءت السلطة الايرانية الجديدة متمثلة بنظام خميني الخرف بعد سقوط الشاه عام ١٩٧٩، وكان من مصلحة ايران قبل غيرها ان تعمل على التخلي عن الحقد العنصري الدفين وبناء علاقة قائمة على روابط حسن الجوار، لكن العنصرية الفارسية بنظامها المتخلف وملاليها الجهلة، تابعت مسلسل الحقد وبأنماط جديدة بهدف الوصول الى أحلام خميني الدجال تجاه العراق الصامد، وفرضت الحرب على العراق.

لقد اثبتت سنوات الحرب، قوة واقتدار فعل المقاتل العراقي في تلقين الزمرة الطاغية دروساً لن ينسوها أبداً.

ثم يتطرق البحث الى التحالف المشبوه بين النظام الايراني والعدو الصهيوني ونظامي أسد والقذافي، في تهيئة كل الامكانيات لاطالة امد الحرب،

وفي ختام البحث، ثمة تحليل للاستراتيجية الجديدة والدفاع المتحرك بغية فرض السلام بالقوة، وتكبيد قوات العنصريين الجهلة افدح الخسائر، وملاحقتهم وتحطيم آلتهم العسكرية براً وبحراً وجواً.

# چەند بەرپەرەك ژ قادسیا صەدامی یا پیروز



**جمال بروارى**

**دەمێ جەنگا قادسیا صەدامی دچیتە دناف سالا هەفتێدا یا پێدڤیە ئەم هندەك بەرپەرا ژ وان هەفت سالێت بەردەوام ژ سەرکەتنا ڤەدەین ل وان داستانێت مێرانیێ وزیرەکیێ‌و پالەوانیێ ئەوێت مێرخاسێت عیراقێ تومارکرین ل هەمی بەرۆکێت شەری ول درێژاهیا هزارو دوو سەد کیلومەترا.**

## چاوان شەر لسەر مە هاتە فەرزکرن

مە شەر نەدڤیا ومە نەڤێت ومە گەلەك هەول وبزاڤ کر کو گرفتارێت دناف بەرا مەو ئیرانێ بهێنە چارەسەرکرن برەنگێت ئاشتی‌و دبلوماسی بەلێ وان رێکا هەمیا سەر نە گرت دگەل رژێما ئیرانێ، چنکو هەر ژ رۆژا خومەینی هاتیە سەر حووکمی ل ئیرانێ دەهولێت شەری لێدان وان نیازو ئنیەتێت شەری هەبوون ودلێ وان یێ پر کەرب وکین بوو دژی عیراقا مە. هەلبەت هەر ژ مێژە عەجەما کەرب ژ

عيرقىٚ ڤمد بن وئەڤە ژی چاك يا خويا وئەشكەرايە دناف جەرێت ديروكێدا وگەلەك جارا عەجەما ول گەلەك سەرنعمێت ديروكێدا پێكول كريە ئاخا عيراقىٚ داگير بكەن ويكەنە بشكەك ژ دەولەتا عەجەما، بەلىٚ هەمى جارا سەرنەكەتينە وخو لبەر سينگا عيراقيا نە گرتينە وبەرەڤا خورا ڤەگەهەشتينە.

دنىٚ عەجەما ژ مێژە پێ پاكژ نەبوو بەرامبەرى عيراقىٚ، چنكو عيراق خوٚدان شارستانيەتە وخودان جهەكىٚ بەركەتيە ژ لايىٚ جوگرافى وخودان بەرهەم و سامانەكىٚ دەولەمەندە.

ولسەر دەمىٚ بووسلمانا فارسا هەر هەول و بزاڤ كريە شەرى بفروشنە عيراقىٚ بەلىٚ ديسان رەڤين كارى وان بوو وشكەستن بەهرا وان بوو ويا سەعدىٚ وەقاص بسەرىٚ وان ئينتدى ل قادسيا ئێكىٚ چوو جار ژ بيرا وان ناچيت بەلىٚ ما چى بێژين بو كتا بن چوو جار تێرنابيت ئەڤە كورتيەكا گەلەكا كێم بوو ژ دوژمناتيا فارسا دگەل وەلاتىٚ مە وئەگەرەك ژ وان ئەگەرێت كو عەجەمێت توخم پەرێس ئەڤ شەرە لسەر مە فەرزكرى بەلىٚ لسەر هندىٚرا كو ئەم هەمى دمما يا ددلىٚ فارسادا دزانين مە مەر حودا پاش ومە گەلەك بێهناخو فرەهـ كر ومە حەز نەدكر ئاگرىٚ شەرى هەل بيت بەلىٚ هەر وەكى مەتەلا كوردى دبێژيت كێر گەهەشتە سەر هەستى.

هەر وەك مەل پێشيا ڤىٚ گووتارىٚ گووتى مە گەلەك هەول دا ئاگرىٚ شەرى ڤەمرينين بەلىٚ هەر ئەو عەجەم بوون بزووت پێش دكرن ودڤيان ئاگرىٚ شەرى هەل كەن.

ل روٚژێت ئێكىٚ دەمىٚ خومەينى هاتيە سەر حووكمى تەڤن نەخش گێران دژى وەلاتىٚ مە، وهەر عيراق بوو حەز دكر تێكەلێت جيرانيا باش پەيداكەت دگەل ئيرانىٚ، بەلىٚ هەر رژێما توخم پەرست بوو خودا پاش وحەز جيرانيا چاك نەدكر.

ل روٚژێت ئەولى عيراقىٚ پيروزباهيا دامەزراندنا جمهوريەتا ئيسلاميا خومەينى كرو لسەر ئەزمانىٚ سەروكىٚ قوومانـدار صدام حسين بەلىٚ بەرسڤا خومەينى يارەق بوو وبێهنا شەر فروتنىٚ ژێ دهات بەلىٚ ديسا بێهنا عيراقىٚ يا فرەهـ بوو وژ رێكێت دبلوماس رانەوەستا وهەر دڤيا تێكەليا خوش كەت دگەل ئيرانىٚ رژێما خومەينى دەست ئاڤيتە درێژكرنا دەستێت خو دناف كاروبارێت مەێت نافخودا وكريارێت خراب كرن لسەر رێكا ديڤەلانكێت خو دژى ميللەتىٚ مە. و كونەكاريا وان كرى ل جاميعا مستنصريە نەموونەكا ئاشكەرايە ژ گونەهكارێت وان دژى ميللەتىٚ مە وەلاتىٚ مە.

پشتى هينگىٚ رژێما ئيرانىٚ دەست ئاڤيتە تووب بارانكرنا باژێرو وگوندێت مە لسەر توخيبا.

عيراقىٚ گەلەك راپوورت وگازندە هنارتنە وزەرتا دەرڤەيا ئيرانىٚ لسەر رێكا وەزارەتا دەرڤەيا عيراقىٚ وبو كومەلا دەولەتێت ئێك گرتى ئاگەهداريا وان كر لسەر گونەهكارێت ئيرانىٚ دژى وەلاتىٚ مە.

بەلىٚ ديسا فايدە نەكر وان هەمى راپوورتا سەر نەگرت چنكو رژێما ئيرانىٚ كارو كوكىٚ شەرى كر بوو وعەسكەرىٚ خو كێشابوو سەر توخيبى ودلىٚ داگيركرنا عيراقىٚ هەبوو ئەو بوو وان تفاقيا جەزائير ژ لايىٚ خو بتنىٚ ڤە تێك دان و رێكا هاتن وچوونا پاپوورا ل ئاڤا «شط العرب» گرتن ودەست ئاڤێتە كەڤ و گورا دژى عيراقىٚ، ودناف هەمى ئاميرەتێت پروپاگنديێت خوٚدا دئاڤيتە عيراقىٚ وبەلاڤوك دژى عيراقىٚ بەلاف دكرن. كورت وكرمانج هەمى نيازێت رژێما ئيرانىٚ هەر ژ روٚژا ئێكىٚ دەمىٚ هاتينە سەر حووكمى ێت خراب بوون وێت شەرى بوون وچوو ئنيەتێت چاك دلىٚ وان دا نەبوون وكريسكێت شەرى ژ ناف چاڤێت وان دچوون.

رژيما ئيرانىٚ ئەڤ شەرە لسەر مە فەرز كر وبوىٚ چەندىٚ وان پيلانێت ئيستعمارىٚ وئيمپريالزمىٚ بجهـ ئينانـدن زێدەبارىٚ سەهيونزمىٚ، چنكو بدلىٚ وان نەبوو رژێمەكا پێش كەفتى وەك شورەشا ١٧ ـ ٣٠ى تيرمەهىٚ ل عيراقىٚ دامەز رێت وچاڤێت وان بدەست كەفتێت شورەشا عيراقىٚ رانەبوون.

هەر وەكى سەروكىٚ قومانـدار صدام حسين دگووتارا

خودا گووتی ب هەلکەفتنا بیرهەتنا شورەشا ١٧ ـ ٣٠ی تیرمەهێ دەمێ گووتی: دەست درێژاهیا فارسا لسەر عیراقێ نەکو بتنێ یا ئیرانێ بوو بەلێ پیلانا زایونزمێ وئیستعمارێ بوو وان دڤیا تیروژکێت ئاقلی وتێگەهشتنێ دناف دلێ هەوەدا بەرزەکەن».

رژێما ئیرانێ ئاگرێ شەری دژی وەلاتێ مە هەل کر ل چاری ئیلونێ ل سالا ١٩٨٠.

## پاشڤەبرنا لەشکەرێ ئیرانێ.

ئەوا راستی بیت رژێما ئیرانێ شەر سەر مە فەرزکر ل ١٩٨٠/٩/٤. بەلێ هێزێت مە یێت چەکدار ل ١٩٨٠/٩/٢٢ شیان هێزێت ئیرانێ پاشڤە ببەن ل درێژاهیا توخیبیو هێزێت مە شیان بچنە دناف کوراتیا ئاخا ئیرانێدا ل دیز وێ نەخشا قوومانداریا گشتیا هێزێت چەکدار بوو داناندی وهێنرێت مە شیان بچنە دناڤ گەلەك بازێرێت ئیرانێدا وئالایێ عیراقێ لێ بلندکەن. ل محمرە ومهران ودیزفول وشوش وگیلان وقصر شرین وبسێتین، وگەلەك بازێرێت دی یێت ئیرانێ کەتنە لبن رەحما تورێت عیراقێ وهەر وەختەکێ عیراقێ حەزکربادا وان بازێرا ستینیت هێزێت مە یێت چەکداتر داستا نێت ء قارەمانێ ومێرخاسیێ تومار کرن دوان شەرا ول درێژاهیا وان سالێت ماینە دناف ئاخا ئیرانێدا وئەم دشیان ژ وان بازێرو ئەردادا نە دەرکەڤین ئەگەر مە ڤیابا بەلێ عیراقێ چوو تەماهی دناف ئەردێ ئیرانێدا نەبوو وئەڤە ژی هاتە دیارکرن هەر ژ روژێت ئێکێ دەمێ هێزێت مە یێت چەکدار چووینە دناف ئەردێ ئیرانێدا وگەهەشتینە وان ئارمانجا ئەوێت قووماندارِیا گشتی‌یا هێنرێت چەکدار بوو دانا ندین. ولسەر ئەزمانێ سەروکێ قوومانــدار صدام حسین دەمێ دگووتارا خودا دیارکری وگووتی:

«مە چی تەماهی دناف ئەردێ ئیرانێدا نینە ودلێ مە ناچیتە بووهوستەکێ ژ ئەردێ ئیرانێ وئەم دئامادەینە خو ژ بازێرو ئەردێ ئیرانێ ڤەکێشین ئەگەر رژێما ئیرانێ گوهـ بدەتە بانگێت ئاشتیێ ومایێ خو دمە نەکەت».

بەلێ رژێما ئیرانێ هەر وەکی مە گووتی تەڤنێت سایونزمێ وئیمپریالزمێ وئیستعماری ڤەدهاندن هەر ئاگرێ شەری خوش دکر وهەر ئەو دشکەستی بوون وهەر رەڤ کارێ وان بوو ل هەمی شەرادا ونەشیان جارەکێ ژ جارا بسەرکەڤن وهەمی دەما سەرکەتن بەهرا هێزێت مە یێت چەکدار بوو وهەمی وەختا ئالایێ عیراقێ یێ بلند ددەستێت کورێت میللەتێ عیراقێ بوو چنکو وان بەرەڤانیا وەلاتێ خو دکر ویەرەڤانیا ئاشتیێ دکر.

سەرکەتن بەهرا عیراقێ بوو چنکو عیراق یا حەق بوو وبەرەڤانیا هەقیێ دکر، ودزانی بوچی یا شەری دکەت وژ سەخمەراتی چی ویاوەریا کورێت میللەتێ عیراقێ یا بسەرکەتنێ مووکم بوو وهەمی میللەتێ عیراقێ دزانی رژێما ئیرانێ رژێمەکا شەر فروشە ونەیارا میللەتێ مەیە ودوژمنا مروڤایەتێیە.

ڤێجار هەڤرکی دناف بەرا دوژمنێت مروڤا ودوژمنێت ئاشتیێ وتەناهیێ ودوژمنێت شارستانیەتی و مروڤایەتیێ وشارستانیەتێ وئاشتی خوازیێ وراستیێ وپێش کەفتنێ هەلبەت سەرکەتن دێ بەهرا مروڤایەتیێ وشارستانیەتیێو پێش کەفتنێ بیت.

## ئاقل مەندیا سەروکێ قووماندار صدام حسین ل نەخشێت شەریدا.

ل هەمی داستانێت هاتینە توومار کرن لسەر دەستێ سەربازو مێرخاسێت سەروکێ قوومانـدار صدام حسین وسەرکەتنێت بەردەوام، هەمی دەما سەروکێ قوومانـدار صدام حسین ئەو بوو ئەندازیارەکێ شارەزا ل دانانا نەخشا

ـه وان شەرا دیماهیکا وان هەر سەرکەتن بوو.

سەرمدانێت بەردەوام ێت سەروکێ قوومانـدار صدام حسێن بو بەروکێت شەری وکوومبونێت بەردەوام دگەل قوومانـدارو وسەر قولا ول سینگێ شەری وئەو نەخشێت ژێهاتی ێت عەسکەری ئەوێت سەروکێ قووماندار صدام حسێن دادنان بو هەر شەرەکی وتێگەهەشتنا وی یا شارەزا ـ پلانێت عەسکەری دووربینیا وی بو دیماهیکێت هەر شەرەکی دهاتەکرن ئەو بوو نیشانا سەرکەتنێت دیروکی ئەوێت هێزێت مە ێت چەکدار تومار دکرن ل هەمی بەروکێت شەری دەمێ سەروکێ قوومانـدار صدام حسین سەر بەروکێت شەری‌دا دوگەل قوومانـدارێت عەسکەری پخش دادنان و دژڤریڤە میللەتی هەمێ وهێنرێت چەکدار دژتیین دێ دیماهیکا وی شەری بو دوجا مە بیت ودی سەرکەفین وقووماندارریا گشتیا هێنرێت چەکدار دێ مزگینیا سەرکەتنێ دەتە میللەتی.

وئەوشەرێت دژوار ئەوێت هاتینە کرن جە چی دناف ئخا ئیرانێدا ئان ژی لسەر توخیبی باشترین نیشانە بو ڤێ چەندێ ئەو شەرێت نەمونەیی ئەوێت هێزێت مە ێت چەکدار کرین ومەزنترین داستانێت میرانیێ توومارکرین جە چی ل شەرێت هێرش کرنە بسەر عەسکەرێ ئیرانێدا ئان ژی ل شەرێت بەرەڤانیێ هەر سەروکێ قوومانـدار صدام حسین بوو ئەندازیارەکێ بیر تیژ بوو وئاقل مەندو ل رێڤەبرنا وان شەرا هەمیا داستانێت شوش و سەربیل زەهاب وبێتین ومحمره وقصر شرین ودیزفول و (شیب وطیب وفکە) وروژ هەلاتا بەسرەو دجلە ومیسان وپەنجوین وگەردەمەند وچوارتە ومەندلی ومەهران ژوان داستانێت بەرکەتینە ئەوێت هێنرێت مە ێت چەکدار تومارکرین وبشارەزایا رێڤەبەریا سەروکێ قووماندار صدام حسین هەر ئەو بوو بەرێ بنیاتی دادنا بو وان هەمی سەرکەتناو دەورەکێ دیروکی هەبوو کو کێم قوومانـدارا ئەو دەور هەبوو دناف دیروکا کەڤن ونویدا ئامادەبونا شەخس یا سەروکێ قوومانـدار صدام حسین دناف وان شەرێت گران دا وی رێزێت سینگی ل چەپەرێت شەری وشیرەتێت ژێهاتی ئەوێت پێش کێش دکرنە قوومانـدارو سەربازا باشترین نەخشێت سەرکەتنێ بوون دیسا ئەو کاغەزێت بەردەوام ئەوێت سەروکێ قوومانـدار صدام حسین دهنارتن بو هێزێت مە ێت چەکدار وبهەمی بیرهاتن هەل کەفتنا ئەو ژی ئەگەرەکا دی بوو بوو مووکم کرنا هێنرو شیانا هێنرێت مە ێت چەکدار وباوەریا وان بسەرکەتنێ.

دیسا شیرەتێت سەروکێ قوومانـدار صدام حسین بو مەشق کرنا بەردەوام دناف هێنرێت چەکداردا ئەو ژی شیانەکا دی بوو و وهێنرەکا دی داناندنە سەر هێنرو شیانا هێزێت مە ێت چەکدار هەر وەکی سەروکێ قوومانـدار صدام حسین گوتی «خووها مشەق کرنێ، خوونا شەری کێم دکەت».

چاڤدێریا بەردەوام وسەخبێریا تایبەتی ئەوا سەروکێ قوومانـدار صدام حسین ددەتە لەشکەرێ مە یێ قارەمان وبەرهەف کرنا باشترین چەك و ئامیرەتێت شەری وفێرکرنێ ئەوێ ژی شیانا عەسکەرێ مە زێدەتر لێ کر ودەلیڤێت سەرکەتنێ بو پەیداکرن.

کورت وکرمانج ل هەمی داستانێت کورێت میللەتێ عیراقێ توومار کرین دناف هەمی شەراد ول درێژاهیا سەرێ حەفت سالا ل شەرێت دەشتێ وئاسمانی ودەریایی هەر سەروکێ قوومانـدار صدام حسین هوستایەکێ شارەزا بوو ل وان هەمی شەرا هەر بنیاتەکێ مووکم وراست ودرست دادنا بو وان سەرکەتنا وهەر ئەو بوو جەکێ تایبەتی بو عیراقێ دانای وهەمی جیهانێ بچاڤەکێ تایبەتی بەرێ خو دانە عیراقێ ومیللەتێ عیراقێ، هەر سەروکێ قووماندار صدام حسین بوو وشیرەتێت وی ێت ساخلەم بوون ئابووریا عیراقێ لسەر بنیاتەکێ درست هاتیە دانان وئابوورا شەرێ کری وئەف ئابووریە نە هاتە لاواز کرن ولبن سەروبەرێت شەریدا وگەلەك پروژێت مەزن هاتینە ئاڤاکرن

ل وەختی شەریدا ولبن ڤاڤدیریا سەروکێ قوومانداز صدام حسین میللەتێ عیـراقێ هەمێ بدەستـەکی تڤـەنـگ هەل دگرت وبەرەڤانیا عیراقێ دکەن وبدەستێ دی ل کارخانەو جەم وزەڤیا ول قووتایخانا عیراق ئاڤاد کرن.

## دەلیڤێت ئاشتیێ

هەر ژ روژێت ئێکێ ل شەرێ رژێمـا ئیـرانێ سەر مە فەرز کری عیـراقێ چوو دل نەبـوو وتـەمـاهیـا وێ نە دچوو ئاخـا ئیـرانێ، عیـراق یا دنـاف ئاخـا ئیرانێدا بوو وبانگێت ئاشتیێ دان وحـەز دکـر شەر بهێتـە راوەستـانـدن وگرفتاری بهێنە چارەسەرکرن برەنگێت ئاشتی ودبلوماسی.

عیـراقێ هەمی دەرگـەهێت ئاشتیێ ڤەکـرن بەرامبـەری ئیـرانێ، بەلێ هەر رژێمـا ئیـرانێ بوو ئەو دەرگـەهـ هەمی دگرن وتبلێت خو دگوهێت خو رادکرن دا گول وان بانگا نەبیت وشـەری رانـەوەستینیت عیراقێ هاریکاری کر دگەل هەمی وان بزاڤێت هاتینـە کرن بو راوەستـانـدنـا شەری برێکێت دبلوماسی وئاشتی عیراقێ هاریکاریەکا دلسوز کر دگـەل بزاڤێت خوەدان خێـر ژلایێ رێکخـراوێت دەولـەتی وکـومـەلا دەولـەتێت ئێـك گرتی ودەولـەتێت بووسلمـان ودەولەتێت بێلا.!

بەلێ هەر رژێما ئیرانێ بوو گرفتاری وئاستەنگ داناندنە بەر سینگـا وان بزاڤـا وحـەز نە دکـر شەر بهێتـە راوەستاندن شەری وهەر دەهولێت شەری لێدان ودرێژاهیی ئێخستە شەری.

عیراقێ گەلەك دەلیڤێت ئاشتیێ وراوەستاندنا دانە رژێما ئیـرانێ بەلێ هەر وان دەلیڤـا سەر نەگـرت، یا ژ رژێمـا ئیرانێڤـە دەمێ عیـراق دەلیڤێت ئاشتیێ ڤەدکـەت یا لاوازە ویێ هێزە ویا ماندی بووی وئێدی نەشێت شەری بکەت، بەلێ رژێمـا چەپـەل ودورنـدە بچاڤێت سەرێ خو دیت مە

چی بسەری ئینا وروژ بو روژێ هێزو وشیانا عیراقێ پتر لێ دهات وباوەریا وی بسەرکەتنێ زێدەتر بو وسەرکەتن لدیف سەرکەتنێ توومار دکرن.

ئنیـەت ونیـازێت عیـراقێ ژ دل بوون و ژ دلـەکێ پاقـژ دەست پێ دکر ول جهێ سەرکەتنێ عیراقێ ئەو دەلیڤە دانە رژێما ئیرانێ داکو ئاشتیو تەناهی ل ڤێ دەڤەرا بەرکەتی بەلاف ببیت.

ئەف نیـازو ئنیـەتـە چاك خویاو ئاشکەرابو دەمێ عیراقێ بریار دای هێزێت خو ڤەکێشاینە سەر توخیبێت دەولەتی هەر چەنـدە عیـراقێ دزانی چیـیا ددلێ رژێما ئیرانێدا ونیازێت وی بەرامبـەری عیـراقێ نە دراستن ووان دلێ داگیـرکـرنـا عیراقێ یاهەی.

وتشتی عیراقێ هزر کری ئەو بوو پشتی عیراقێ هێزێت خو ڤەکێشـاینـە سەر توخیبی، بەدەلی رژێمـا ئیـرانێ بو خو قازانجێ ژ ڤی دەلیڤەی وەرگریت وبهێتە سەر رێکا راست وگوهـ بدەتە بانگێت ئاشتیێ، دەست ئاڤێتە گەڤا ل عیراقێ وگەڤێت داگیرکرنا عیراقێ. یا ژوانڤە هەما یا بساناهیە دێ عیراقێ داعیرن ودێ کەنە پاریەك خوش ودێ کەنە پارچەك ژ ئیمپـراتـوریـەتا خومەینی خەونا بو دبینیت، وان نەزانی، عیـراق نەیـا بسـانـاهیە وبساناهی نا بیتە پاریەك خوش بوو کەسێ ونابیتە دیڤەلانك بو کەسێ.

ئیرانا دوژمن ل گەلەك ئەردا ولسەر توخیبێ عیراقێ خو جەربـانـد بهێنـە دناف ئاخا مەدا، ل روژهەلاتا بەسرە دوو سێ جار ل روژ هەلاتـا دجلە ولشـەرێ «تـاجـا شەرا» ول میسـان وشیب وطیب وفکـە ومـەنـدەلی ول سێف سعـد. بەلێ ل هەمی جارا برەڤینـا خورا نە دگـەهـەشتن وتـەرم وکەلەخێت وان دبوونە تومك بو تەیرو وتەولا.

دیسـان هەر پێڤـە نەچـوون چنکـو «کتـا بن تێر نا بیت» جارەکـا دی خو جەربـانـدنـەڤـە ل کوردستـانێ یا ژوانڤـە توخبێت کوردستانێ دڤەکرینە ورێکا ڤەوژارتیە دێ بساناهی دەربـازینـە دنـاف ئاخـا عیـراقێدا وان بەختێ خو یێ رەش

حەربندن ڤێ جاری ل کوردستانێ هاتن بەلێ چاوا هاتن
ەرڤرین، رەڤین بدەست نەکەت دول ونهالێت پەنجوین
ووبە گورستان بو دوژمنی، داربەرووێت پەنجوین ودار
هەڤرست ودار بەری وبەروداریێت چوارتە وگەردەمەند بوونە
هر ر هزار بزووت وبەر بوونە چاڤێت وانا. وبفرا سەرێ چیا
و تیزاب بەر بوو چاڤێت وان کورێت میللەتێ مەیێ کورد
ەڤێت کاوەی وصلاح الدینی وەکی شێرو پلنگا سینگێ
دوژمنی گرتن وەنەکرن هندی بهوستەکێ بسەر ئاخا مە
بکەڤنی.

هەمی خەونێت دوژمنی بئاڤێدا جوونە خارێ
ونەگەهەشتنە مرازێ.

بەلێ دیسان لجهێ سەرکەتنا بەردەوام عیراق حەژ
ئشتیێ دکەت وئاشتی خوازە وئەڤە هەل وێستا عیراقێیە
هەر ژ روژێت ئەولی ژ شەری وهەتا ئەڤرو ولدیف شەرتێت
سەروکێ قوومانـدار صدام حسین دانـاندین «هێنرێت هەر
دوو دەولەتا بهێنە ڤەکێشان بو توخیبێت دەولەتی کەس ژ
هەر دوو لایا مایێ خو دیێ دی نەکەت وئێخسیرێت هەر
دوو لا هەمی پێك بهێنە گهورین».

## دەورێ میللەتی

هەر ژ روژا بەرپا بوونا ئاگرێ شەرێ رژێما کەڤنە
پەرێس ل ئیرانێ لسەر مە فەرز کری هەر ژ وێ روژێ
هەتا نوکە هەمی میللەتێ عیراقێ ژ کوردو عەرەبا وهەمی
کێماسیێت دی دەورەکێ مەزن هەبوو ل وان هەمی
سەرکەتنێت بەردەوام ئەوێت هێزێت مە یێت قارەمان
تومارکرین ل هەمی بەروکێت شەری.

(شەرێ قادسیا صەدامی)دا پەیوەندیەکا گەلەك مووکم
پەیدا بوو لناف بەرا وەلاتی ومیللەتی وپارتێ وعەسکەری
وقووماندارێ.

عەسکەر دەمێ شەری دکەت شەری ناکەت وەك
دەزگەهەکا عەسکەری بتنێ ئەمرو فەرمانا بجهینیت دناف
پەروازی یاساو فەرمانێت عەسکەریدا، بەلێ عەسکەر یێ
شەری دکەت بوی گیانێ دناف دلێ میللەتیداو بزەندکێت
کورێت هەمی میللەتی وبگیانێ میللەتی ودناف بیرو
هەستێت میللەتی.

دەمێ هێنرێت مە یێت قارەمان قەستا مەیدانێت شەری
دکەن دچاڤێت وان دا ئارمانجەکا مەزن وژێهاتی دیاردبیت
ئەو ئارمانج عیراقە وسەرکەتنا عێراقێە ومیللەتێ عیراقێە.

زیرەکیو چەلەکیا کورێت میللەتێ عیراقێ وقوربانییێت
وان ژ سەخمەراتی عیراقێ بو دوژمنی دیارکر کو ئەوێ
دەستێ خو درێژکەتە عیراقێ بدلەکێ خراب ئەو دەست دێ
ژ قوقلکێ هێتە دەرێ دەوری میللەتی ل داستانێت
سەرکەتنێ دەورەکێ بەرجاف بوو ل هەمی مەیدانا ل
مەیدانێت شەری ول مەیدانێت ئاڤاکرنێ بشك داریا
میللەتی دناف رێزێت عەسکەرێ میللیدا ویشك داریا وان
ل بەروکێت شەری وپشتەڤانیا وان یا مووسم بو هێنرێت مە
یێت چەکدار.

دیسا دەورێ میللەتی گەلەك هێژا وبەرکەتیە دناف
کارخانەو وپروژادا ل زێدەکرنا بەرهەمی وپەیداکرنا هەمی
هەوجەیێت پێدڤی بو هێنرێت مە یێت چەکدار.

دەورێ پالا ل ڤەکرنا ب هزارەکا ژ کیلومەترا ژ رێك و
بارا وخوشکرنا رێکا بو هاتن و چوونێت هێزێت مە یێت
قارەمان ودرست کرنا پرو سکرا ل سینگێ شەری وپشەڤ و
روژ بێ راوەستان ولبەر توبێت دوژمنی ئەو ژی ژ وان
داستانێت بەرکەتینە ل سەرکەتنێت بەردەوام دناف شەرێ
قادسیا صەدامی یا پیروز.

دیسا دەورێ میللەتی قەت نا هێتە ژبیرکرن دناف دام
ودەزگەهێت بەرەڤانیا باش بزوختیدا (الدفاع المدنی)
ئەوێت بشەڤ و روژا شول دکرن وعیراق کریە کەلا هەمی
پیلانێت دوژمنا لسەر هاتینە شکاندن.

دیسا دەوری بملیونا ژ ژن ومێرا وژ گەنج وتولازا ئەوێت دناف هەمی جهێت ئابووری وخزمەتادا شول وکار دکرن، ل خزمــەتــێــت هاتــن و چوونــێ وســاخــلــەمیێ ول هەمی مەیدانێت دی.

دیسا دەورێ نڤیسەڤان وهوزانڤانا وهونەرمەندا دەورەکێ ژێ هاتی وبەرچاڤ بوو.

دیســا ژنکـا عیـراقێ دەورەك بەرکـەتی هەیـە دناف وان هەمی داستانادا ئەوێت خوشمێرو مێرخاسێت عیراقێ تومار کرین ئەو ژنکا خوشتڤیترین تشت لبەر دلی کریە قوربانی وخەلات بوو سەرکەتنا عیراقی دیروك دێ بحەرفێت زێری ناڤێ وێ تومار کەت وقەت ناهێتە ژبیر کرن.

ئەو ژنکا زێرو زینەتا خو دکەتە خەلات ژ سەخمەراتی عیراقێ دەورێ وی چوو جار نا هێتە ژبیر کرن.

هەر وەکی سەروکێ قوومانداز صدام حسین دگوتارەکا خودا گووتی وبەحسێ دەورێ میللەتی کری دناف شەرێ قادسیا صەدامیدا «میللەتێ عێراقێ بێ ئازاو وزیرەك وئامادە بو قووربــانیــا وبێ بێهنی فرەهـ دکـارێت بژیت ومعاملەتێ دگەل هەمی سەروبەرێت نەخوش بکەت، ژبەر هندێ ئەز دبێــژم دبێــژمـە دوژمــنـا بەریکـانا هەوە بسەرناکەڤیت عیراق بسەرکەت ودێ بەردەوام بیت لشەری هەتا سەرکەتنێ».

باوەریــا میللەتێ عیــراقێ بســەرکــەتنــا مەزن سەرکــەتنــا عیراقێ گەلەکا مووکمە، چنکو هەمی میللەت چاك دزانیت دوژمــنــی مە دڤـێــت کەنـیـنێ وبشکــورینێ لســـەر لێڤێت زاروکـێــت مە بکـــوژیت ودوژمنی دڤێت میللەتێ عیـــراقێ زەلیـل و بن دەست کەت وســەربــەخویا عیراقێ تێك و پێك دەت لەوا میــلـلەتــی سوزا دای هــنــدی دلــویــەك خوون دگیانیدا ما بیت قەت وەناکەن دوژمن بگەهیتە مرازا خو وهــنـدی ئیــرانــا دوژمن بزووتێت شەری پێش کەت وهندی درێژاهیێ بێخیتە شەری باوەریا مە بسەرکەتنێ دێ مووکمتر بیت، چنکـــو میللەت هێـــزو شیـــانـــەکـــا بێ توخیـــە ژ سەخمــەراتی بەرەڤـانیـا عیــراقێ وســەربــەخویا عیراقێ وژ سەخمــەراتی بەرەڤـانیـا وان دەست کەفتێت شورەشا ١٧ ـ ٣٠ی تیرمەهێ بو هەمی کورێت میللەتی پەیدتکرین.

هەمی کورێت میللەتی دئـــامـادەتـە بســەرو مال ڤە خو گوری ئاخـا عیـراقێ بکـەن دا هەمی دەما عیراقا سەربلندو وســەربــەخــو وئــازا بیت، وکــورێت وی بســەرفەرازی تێدا بژین. وچوو جار رێکێ نا دەنە دوژمنا مایێ خو دمە بکەن وژیارێ لمە تحل و نەخوش بکەن.

وەکی هەمی جارا هەمی پیــلانێت دوژمنـا لســەر ئێکاتیا لناف پەرا میللەتێ عیراقێ هاتنە پەلخاندن وشکاندن.

## دەورێ میللەتێ مەیێ کورد.

دەورێ میللەتێ مەیێ کورد دەورەکێ بەرکەتی بوو وەکی هەمی میللەتی ژ سەخمەراتی عیراقێ عیراقا کوردو عەرەبا وکێماسێت دی. خوونا کوردو عەرەبا ل گەلەك وارو نهالا ول دەشت وچیـــا تێکـــە ل بوو وئــاخـا عیـراقێ پێ هاتـە ئاڤـدان دا هەر بمینیت ئازا وســەربــەخو دەورێ میللەتێ مە یێ کورد دناف شەرێت شەرەفێ وکەرامەتێ وسەربلنداهیا عیراقێ دەورەکێ ژێهاتی بوو.

میللەتێ کورد. بمل بمل دگەل برایێت خوێت عەرەب چەکێ هەل گرتی وبـــەرەڤـــانیـــا عیـــراقێ دکـەن وسینگێ داگیراکەرا پێ گرتی.

بەرەڤـانیـا بەسرەو پەنجـەوین یا کری. ول شەرا هەمیا میللەتێ مە یێ کورد ل جهێ باوەریێ بوو.

پشــك داریــا میللەتێ مەیێ کورد دنـاف شەرێ قادسیـا صەدامی یا پیـــروزدا جە چی دنـــاف رێــزێت لەشکـەرێ میللیدا ئان دنـــاف رێــزێت لەشکـەریدا ئان ژی دنـاف رێـزێت هێنـرێت بەرەڤـانیـا نیشتمـانیدا، نیشـانا دلسوزیا میللەتێ مەیێ کوردە بو ئاخـا وەلاتی، ئاخـا عیـراقـا پیروز ئاخا باب و باپیرا وارێت شارستانیەتێ وپێش کەفتنێ.

دوژمن دەمێ دلێ خو دبەتە ئاخا عیراقێ، مەخسەدا دوژمنی هەمی عیراقە ژێری هەتا ژووری، دەمێ دوژمن تێرێت دبەتە سەر بەسرا ومیسان مەخسەدا وی نە بتنێ ئەو نەرێت بەلێ بەلێ نەخسەدا وی عیراق هەمیە مەخسەدا وی نە بتنێ بەسرایە، بەلێ بەسرا وسلێمانیە.

دوژمنی بەریکانێ لسەر مەکوردا دگرت وبو خو دگووتن ئەگەر ئەم درێکا کوردستانێدا چووین کورد دێ بو مەرێکێ قەوێترن ودێ بسـانـاهی چینە دنـاف ئاخا عیراقێدا بەلێ دوژمن وەکی هەمی جارا بێ خەلەت بوو وخەون ددیتن، ئەو خنزیرێ ل رۆژ هەلاتا بەسرا بریندار بووی ل دوول وبهـێنیت پەنجـوین سەکتی، میللەتێ کورد ل پەنجـوین وچوارتـە وگـردەمـەنـد وەنـەکـر دوژمن بسەر ئاخا عیراقێڤە بهێت. ورۆژا رووهـن ل دوژمنی کرنــە دوزەخ و شەڤــاتری. هەمی ئاخا عیراقێ یا پاکژ وپیروزە چوو جار دوژمنا نەحەبینیت.

رەشمال وجهێ مێهڤانداریێ ل بەسراو سلیمانیێ نیشانا دلسوزیا هەمی کورێت میللەتێ عیراقێنە بو ئاخا وەلاتی.

هەمی میللەتێ عیـراقێ ئێـك دەست دلن ژ زاخـو هەتا فاو کەلایەکا مووکمن چەپەرەك پیلانە سەرێ دوژمنی دێ سەر هێتە هەرشاندن وئالایێ عیراقێ دێ هەر یێ بلند بیت ل بەسرا ومیسـان وپەنجوین وچوارتە دگەردەمەندی.

## ستراتیجیەتا نوی

ل درێـژاهیـا سالێت پشتی ڤەکێشـانـا هێنـرێت مە یێت چەکدار بو توخیبێت دەولەتی ل سالا ١٩٨٢.

سـتـراتیجیـەتـا بەرەڤـانیـا ل جهدا، بەرەڤانیەکا یتوخیب بوو، وژ وان هەلـبـژاردنێت مە یێت بزحمــەت بوو وەل مە کری ئەم لسەر بچین ژ بەر گهورینێت هەرێمایەتی ودەولەتی.

وئەو گهورینێت گەلەك جارا دئاخفتنێت خودا سەروکێ قوومـــانـدار صدام حسین «خـودێ ژ یێ وی درێـژکـەت» بەحس ژێ کری ولسـەر ئاخفتی. نەخـاسمـە ئاخفتنا وی دگـەل ئەنـدامێت نڤیسینگـەهـا رێـك خستنـا بەغدایا پارتا بەعسا عەرەبیا هەمیشکی یا ژ رژێما ئیرانێڤە دەمێ عیراقێ هێزێت خو ڤەکێشاینە سەر توخیبێت دەولەتی ژ بێ هێزی ولاوازیا عیراقێ بوو، وعیراق یا مەجبور بوو وی تشتی بکەت.

نەخێـر عیـراق یا لاوازو وبێ هێـز نەبـوو دەمێ ئەو بریار دای. وەکی هەمی جارا رژێما ئیرانێ یا خەلەت بوو.

عیـراق دکـاریت جارەکـا دی بچیتـە دناف ئاخا ئیرانێدا ودشێت چی باژێـرێ دنـاف کوراتیـا ئیـرانێـدا داگیربکەت وچی دەمێ بڤێت.

دەمێ ئەو گهــورینێت مە بەحس ژێ کری نەمـاین ئەو گهــورینێت وەل قوومـــانـداریـــا مە کرین کو هێـزێت مە ڤەکیشیتـە سەر توخیبێت دەولـەتی وئـەم ڤان خالێت خارێ بەرچاف کەین کو ئەم ستراتیجیەتا عەسکەریا نوی بکاربینین:

١ ـ رژێما ئیرانێ یا بەردەوام بوو ل سەر شەری وئاگرێ شەری بلنـد دکـر دژ ی وەلاتێ مە وگـەلـەك جارا هەول دا بهێتە دناف ئاخا مەدا وچاڤدێرا ڤەنج ئنیەتێت رژێما ئیرانێ زانین لـ شەرێت رۆژ هەلاتــا بەســرە شەرێت ئێکێ وێت دووێ ولشەرێت ئەهوارا وپەنجوین ول ژووریا وەلاتی.

٢ ـ رژێمـا ئیـرانێ پێـکـول دکـر ئامیـرەتێت نەیاریا خو پێش بێخیت پشتی هەر شکـەستنـەکـا ڤێ دکـەتا نەخاسمە پشتی شەڤا نەهێ لسەر دەهێ ل سالا ١٩٨٦.

وکەرب وکینا رژێما ئیرانێ ئەڤ رژێمە پال دا هاریکاریا عەسکـەری وئـابـووری دگـەل ڤەوارا سەهیـونی زێدەکەت مەخســەد ژ ێ ئەو بیت گهـورینـەکێ بێخیتـە دناف خارطا مەوقفێ عەسکــەری وگــەفــا ل عیـراقێ وەلاتێت کنـارێ عەرەبی بکەت.

٣ ـ رژێما ئیرانێ چوو دخو نەهێلا وئەزمان ددەڤی‌دا هاتە خارێ کو بشێت جارەکێ ژ جارا بهێتە دناف ئاخا عیراقێدا. ڤێنیەتێت خو یێت چەپەل بکاربینیت وبهاریکاریا رژێما سوری ولیبی. وشەرێ فاو باشترین نیشانە لسەر ڤێ چەندێ.

ئەگەرێت ڤێ ستراتیجیەتا عەسکەری یا نوی دناف بەیانامـا ژمارە «٢٢٢٩» یا قوومانداریا گشتیا هێنرێت چەکداردا هاتە دیارکرن هەل بژاردنا ستراتیجیەتا نوی گەلەك رامان یێت تێدا هەین دکوورترن ژ تشتێ هاتیە گوتن ژلایێ عەسکەری وسیاسیڤە بـ ودا چاك ڤان رامانا بزانین پێدڤیە ڤان خالێت خارێ دەست نیشان کەین.

١ ـ چوونا هێنرێت عیراقێ دناف ئاخا ئیرانێدا هەر وەکی سەروکێ قووماندار صدام حسین گوتی بەرسڤدانەك بوو بو داخازیێت بەرەڤانیێ ژ میللەتی وئاخا عیراقێ وژ نەتەوا عەرەبی ئەم چووینە دناف ئاخا ئیرانێدا ژسەخمەراتی ئاشتیێ بەلێ رژێما ئیرانێ هاتنە «فاو»دا بدلەکێ نەباریێ وتەماهیێ.

٢ ـ ل چار سالێت بووری هێزێت مە یێت چەکدار گەلەك ئاستەنگ دکەتنە سینگی ژبەر ستراتیجیەتا بەرەڤانیا راوەستای ئان وەك یا راوەستای چنکو عیراقی ل جەبهەکا درێژ بەرەڤانیا سەربەخویا عیراقێ دکر ول هەر ئێرشەکا مەزن زەحماتیا نەیاریێ دمێت لسەر ئاخا مە هەتا ئێرشا بەرامبەر دکرو دوژمن وێران دکر وپاشڤە دبر.

٣ ـ قوومانداریا مە نەخاسمە سەروکێ قووماندار صدام حسین هەر زوی زوی گهورینێت نوی دەست نیشان کرن دنـاف شەرێ عیـراقێ وئیـرانێـدا، وبـو جیهـانێ هەمیێ ئنیەتێت رژێما ئیرانێ دیارکرن. وژبەر ڤێ چەندی عیراقێ ئەڤ رێکـا نوی گرت ورێکـەکـا راست و درست بوو، وبەرسڤدانەك بوو بو پێدڤێت نووکە وسەروبەرێ نووکە یێ شەری، وزێدەبوونا هێزو شیانێت لەشکەرێ عیراقێ وبـاوەریـا مووکم بسەرکەتنێ وژناف برنا نەخش و پلانێت دوژمنا. وئەم ڤێ تشتی چاك دبینین وبەرچاف دکەین دناف بەیانامـا گشتیا هێنرێت چەکداردا:

«عیراق و هێنرێت وێ یێت چەکدار دکارن بگەهنە هەر ئارمـانجەکـا قوومانداریا گشتیا هێنرێت چەکدار بو دەست نیشان کەت.

عەسکەرێ عیراقێ ئەوێ کاری بازێرێت ئیرانێ داگیرکەت وخو ژێ ڤەکێشیت بدلێ خو، ئەو لەشکەر دکاریت جارەکا دی وان بازێرا داگیرکەت، وئەوا مە کری ل مەهران دێ ل پاشەرۆژێ ل گەلەك بازێرێت دی کەین».

کورت و کرمانج قوومانداریا عیراقێ نەخاسمە سەروکێ قووماندار صدام حسین چاك دزانیت چاوا بەرسڤا نەیاریا دوژمنی بدەت ل پەیسکا عەسکەری وسیاسی. ونەخشێت سەرکەتنا عیراقێ دانیت.

وهندی رژێما ئیرانێ درێژاهیێ بێخیتە شەری چوو بدەستیڤە ناهێت ژبلی رەڤینێ وشکەستنێ وسەر شوریێ ودیماهیەك دێ سەرکەتن هەر بەهرا عیراقێ بیت ولبن ئالایێ سەروکێ قووماندار صدام حسین «خودێ ژیێ وی درێژکەت».

## سەرچاوکێت گووتارێ:


١ ـ روح النصر ـ صدام حسین ١٩٨١.

٢ ـ معاً لبناء العراق العظیم ـ صدام حسین ١٩٨٣.

٣ ـ لسنا طلاب حرب وانما دعاة حق ورساله ١٩٨١.

٤ ـ مبادؤنا القومیه تحدد علاقاتنا بالعالم ـ صدام حسین.

٥ ـ احتیاطی الثورة المضموم شعبنا العظیم وجیشه الباسل ـ صدام حسین ١٩٨١.

٦ ـ شعبنا وطریق الحریة ـ صدام حسین ١٩٨٢.

٧ ـ رەوشەمبیری نوی ژمارە ١٩٨٦/١٠٩.

٨ ـ روژناما الجمهوریة ژمارە ٦١٢٥ ص٣.

٩ ـ گوڤارا ئوتونومی ١٩٨٦.

# صفحات من قادسية صدام المجيدة

● جمال برواري

يتناول البحث العداء الفارسي القديم للعراق وشعب العراق منذ القدم ومحاولات الفرس لغزو واحتلال العراق وضمه للامبراطورية الفارسية التي يحلم الفرس بها.

وكذلك يتناول البحث الاعتداءات الفارسية على قطرنا ومنذ مجيىء خميني واستلامه السلطة في ايران.

ويتحدث البحث عن المساعي التي بذلتها القيادة السياسية في العراق لتجنب اشعال فتيل الحرب التي كان نظام خميني مصراً على اشعالها. وكذلك يتناول البحث الرد العراقي القوي للاعتداءات الايرانية من خلال مطاردة القوات الايرانية في داخل عمق الاراضي الايرانية واحتلال مدنه.

وتجاوب العراق ومن موقع القوة والأقتدار مع المساعي المبذولة لوقف القتال وحل المشاكل بين الطرفين بالطرق السلمية والدبلوماسية ورفض النظام الايراني جميع الوساطات واالمبادرات السلمية التي أقدم عليها العراق وتعاونه مع كافة الوساطات الدولية والاسلامية.

ويتناول البحث الدور البارز لكافة أبناء الشعب في معركتنا العادلة معركة قادسية صدام المجيدة. والملاحم البطولية التي سطرها جند العراق في كافة جبهات القتال وكذلك عن دور شعبنا الكردي في المعركة.

ويتناول البحث الاستراتيجية الجديدة لقواتنا المسلحة البطلة في ضوء متغيرات الحرب.

وقدرة العراق على احتلال اي هدف ترسمه القيادة العامة للقوات المسلحة كما فعل في مهران وما سيفعله مستقبلاً مع مدن ايرانية اخرى.

ويتناول البحث قدرة قواتنا المسلحة البطلة للاستجابة لحاجات وظروف الميدان وأقتدارها المتنامي كلما توفرت الامكانات الفنية والقتالية والتسليحية.

والايمان المطلق بالنصر واصرار عميق على دحر مخططات ونوايا المعتدين.



حميد علي

ژکەڤن دا تەماع کارا ودەست درێژا بەرێ خو ددا عیراقێ وداجوازا وان ئەو بو دەستی دانن لسەر چونکە جهەکی باشە وتێر خێرو خێراتە. . لبەر ڤێ چەندێ شەرێت دوژ وار دهاتنەکزن وب هزاران ژکورێت وێ کەفتن ساحێت شەرەڤێدا بەلێ عیراق ما هەژ ژکەفتنا خیلافەتا (عەباسی) پشتی (هولاکو) بغدا داگیر کری سالا ٦٥٦هـ - ١٢٥٨م وچو دبن حوکمێ (مەغولا وتەتەرا) وپاشیکا حوکمێ (مەغولا وتەتەرا) وپاشیکا حوکمێ (جلائری) هەتاکو (صفویا) داگیر کری ل زەمانێ پاتشاه (اسماعیل الصفوی) دەمێ (عثمانی) هاتینە سەر تەختی لوەختێ (سلطان سلیمان القانونی) سالا ١٥٢٤م.

وحوکمێ (عثمانی) نەیا بنەجهـ بو چونکە نەخوشی پەیدا بو دگەل (صفویا) ژ رەخەکێ وشەرێت بەردەوام دگەل (ئەوروپا) ژ رەخەکی دی .

لڤێرێ پاتشاه (طهماسب) لەشکەرێ خو برە (أذربیجان) وهەتاکو گەهشتیە (أرضروم) وسلطان سلیمان القانونی جارەکا دی لەشکەرێ خو برە روژ هەلاتی، بەلێ (طهماسب) خوکێشا ژ عەردێ داگیر کری وپەیوەندی

گریدان دگەل ئێك ل سالا [٩٦٢هـ - ١٥٥٤م] تفاق هاتە موهرکرن ئەڤەبون بنیاتێت وێ:

١ - هێلانا ویلایەتا (قارص)و (قلعە) بو عثمانیا.

٢ - خیچ کێشانا تخوبیێ شەهرەزور ل ژوریا عیراقێ.

٣ - تەناهیا حەجاجێت ئیرانێ.

ویشتی بورینا سالەکێ لسەر مرنا (سلطان سلیمان قانونی) وهاتنا کورێوی سەر تەختی وەفدەك هنارتن بو شاهێ (صفوي) سالا ٩٧٦ هـ - ١٥٦٩ ب سەروکاتیا (شە قولیخان) بو (استنبولی) ژبو نویکرنا هەڤال بەندێ دناڤ بەرا هەردو دەولەتا، (صفویا) شیان عیراقێ جارەکا دی بێخن لبن دەستێ خوڤە بەلێ (عثمانیا) جارەکا ستاندن ڤە وەختێ (سلطان مراد الرابع)و ب قوماندار یا وی عیراق مە بن حوکمێ (عثمانی)دا قەدەرا چوار چەرخا هەتاکو (تورك) دەرکەفتین بدیماهی دەمێ هاتینە شکاندن ل شەرێ جیهانی یائێکێ وموهرکرنا تەناهیێ دناڤ بەرا ئەمانا وینت دگەل ئێك ل ١١/١١/١٩١٨.

وکریارێت مێژوی یێت بەرێ دیارکرن کو دەولەتا ئیرانێ هەروەخت رادبو ب هێریشێت. لەشکەری دژی دەولەتا عثمانی) ل هەمی چەپەرێت تخوبی دەمی فەرسەت دکەفتی ددەستیدا. ئەڤ شەرێت هەنێ دهاتنەکرن دەمێ دەولەتا (عثمانی) مژویل دبو ب شەرەنیخێت وا دگەل ئەورپایان ئیرسی ژڤان دوژمناتیا ئەوێت بوین سەر تخوبیێ عیراقێ وئیرانێ ودەست درێژیا وان دسەروبەرێت عیراقێ وتایبەتی ل باژێریت ژوریا عیراقێ وپاتشاهێت بابان ئەوێت نەرازیبوناخو ئاشکەرا دکرن لسەر دەست درێژیا ئیرانێ دناڤ شولێت وان یێت نەپەنیو ئاشکەرا.

ل سالا ١٨٢٢ هێزێت فارسی رابون ب کریارێت دوژمناتی لسەر تخوبیێ دەولەتا (عثمانی) دەمێ ئەورپیا شەر دکرن ل روژئاڤای. و لەشکەرێت فارسی پێش دچون و دەڤەرا (لقارس و بایزید) داگیرکرن. . لوەختێ دەولەتا (عثمانی) مژویل ب شەرەنیخا دگەل دەولەتێت ئەوریی ونەدڤیان جەبهەك دی ڤەکەن دناف بەرا وان ودەولەتا فارسی بەلێ دوەختێدا بەرەڤانیا ڤان هێرشا کرن وتالان و دزی راوەستاندن لسەر تخوبیێ (عثمانی)دا.

و (عثمانیا) شیان ئیرانێ قانع کەن بو پێتڤی بونا تەناهیێ ل دەڤەرێ بو خوشیا هەردو میللەتا هوسا کومبون هاتنە گرێدان دناڤ هەردوا دا ل ویلایەتا (أرضروم) (عباس میرزای) سەروکاتیا لایێ ئیرانێ کرو (رؤوف پاشای) قوماندارێ هێزێت عثمانی سەروکاتیا لایێ (عثمانی) کر. ژبەر ئەگەرا ڤان کومبونا تفاقەك هاتە موهر کرن دناڤ بەرا هەردو دەولەتا دا بناڤێ تفاقا (ارضروم) یائێکێ.

ل دەمێ هاتیدا ئیرانێ گوهـ نەدا ونەچو لسەر ڤێ تفاقێ وبەردەوام بو ددەست درێژیێ دناڤ شولێت عیراقێ یێت نافخوی وب تایبەتی ل دەڤەرێت کوردال ژوری وروژ هەلاتا عیراقێ وکریارێت نەد رێدا مشەبون هەتاکو سالا ١٨٢٤ حکومەتا ئیرانێ دەست درێژیا خو ئاشکەر کر بەرامبەر دەڤەرێت (زهاو، کوی، حریر، سلیمانیێ) ودناف راچونا ئیرانێ کێشاو درێژ بوو پشتەڤانیا خوئاسیێ کەرێت کوردا کر داکو رابنە سەرخو.

وجارەکا تفاقا (أرضروم) یا دوویێ هاتە موهر کرن ب هاریکاریا (ئیرسی)و (بەریتانی) هوسا دەولەتا ئیرانێو (عثمانی) لێچونێت نویکرن بو گرێدانا سولحێ یا بەردەوام.

بەلێ جارەکا دی ئیرانێ تەماعیا خو ئاشکەرا کر لسەر خاك وئاڤا عیراقێ ودڤیا بگەهینتە بن دەست و جارەکا نەخوشی پەیدا بو دناڤ بەرا عیراقێ وئیرانێدا لدور (شط العرب)و هەشت سالا ئەڤ دلمانە ما بەردەوام دناڤ بەرا عیراقێ وئیرانی وهەمی رێك هاتنەگرتن بو هەڤالینێ ژبەر عینات وسەر رەقیا لایێ ئیرانێ وبەردەوامیێ لسەر گەڤا هەتاکو سالا ١٩٢٩.

لڤێ وەختێ عیراق رازی بو لسەر داخوازێت حکومەتا ئیرانێ د گەلەك بنیاتادا دەمێ شاهێ ئیرانێ (رضا بهلوي) بریسکەك هنارتی بو مەلیکێ عیراقێ (فیصل الاول) تێدا دلخوشیا خو دیارکر لسەر رازی بونا عیراقێ. وجارەکا دی

هەڤالـەتی بو دنـاڤ بەرا هەردو وەلاتـا دا لســەر بنگـەهێت موکوم بو خوشیێ و ئەناهیا هەردو میللەتا.

و وەفدێت رەسمی هاتنە لێك گوهورینی دەمێ ل ٢٠ نیسانا ١٩٢٩ وەفدەك عیراقیێ ب سەروکاتیا سەروکێ دیوانا مەلیکی سەیـدا رستم حیـدر چو بو تەهـرانێ وکـاغـەزەك ژ مەلیکی بر بو شاهێ ئیرانێ تێدا قەسێت خوشی وبرادەری، وحکومەتا بەریتانی رابو بدەورەکی بەرز دڤێ کریاریێدا.

بەلێ لایـێ ئیـرانێ نەمـا لســەر سوزا خو ورابـو ب کریارێت دوژمناتی جارەکا دی وژوان:

١ - تەعدایێت ئیرانی لسەر شط العرب.

٢ - زێدە چونێ لسەر عەردێ عیراقێ وئاڤاکرنا مەخفەرێت جەندرما.

٣ - دەست درێژایا عەشیرەتێت ئیرانی لسەر تخوبێ عیراقێ.

٤ - حکـومـەتـا ئیـرانێ ریبارێت ئاڤی برین وهشك کرن و ئەوێت تهێن ژ ئیرانێ بو عیراقێ.

وپشتی رابـونـا شورەشـا ١٧ تیـرمـەهـا نەتەوایەتی سالا ١٩٦٨ حاکمێت ئیـرانێ مەنـدەهوشی بون لسەر بەلاڤەبونا هزرێت هەڤپشکینێ ورژێما ئیرانی ترسا ژڤێ راستیێ وڤیا دربەکێ دانیتێ هەژ ژ روژا ئێکێ.

هوسـا ل ١٩ نیسـانـا سالا ١٩٦٩ شاهێ ئیـرانێ تفـاقا سالا ١٩٣٧ پویچ کر ژ لایەکی ئەوا کو پێك ئینانا تخوبی وتێکەلاهیا دناڤ بەرا هەردو وەلاتێت جیران دا.

ژ وی وەختی وهەتاکو ئادارا سالا ١٩٧٥ شاهی شەرەك دوژمنـاتی فەرزکـر لســەر شورەشێ دهـەمی مەجـالادا یێت پروپـاگـەنـدە وسیـاسی ولەشکەری.. ودەست درێژکرنە د سەرو بەرێت عیـراقێ یێت نافخـوی وسـەح سێت وی ل هەیڤا کانـونـا دووی یا سالا ١٩٧٠ پیـلان پێـك ئینان بو تێـك دانـا رژێـمـا شورەشـگـێـر ل عیـراقێ. وعنبـار وجـەبـەلخـانێت سەح وسێت خوو لەشکـەرێ خو لبـەر جماعەتا بارزانی بەر هەڤکر بو خو ئاسێ کرنێ داکو چەکی هەلگــرن دژی شورەشێ و هلو پەیـانـا شەری میللی دەمێ عەردێ ئیرانێ بویە خیتێت پشتەڤانیێ بو هاریکاریێ و تشت ومشتی وگوهاستنا بریندارا.

وئیرانێ وکەڤنە پەرێسێت وا ئەڤ نەخوشیە دوژوار کرن دنــاڤ بەرا هەردو لا دەمێ روژا ١٤/٤/١٩٧٢ کەتیبــەك تانکێت ئیرانی ب هاریکاریا لەشکەری وا وتوپێت هاون ل تخـوبێ عیـراقێ بورین ل نێـزیکا دەڤەرا خانقین وهیریش برنە مەخفەرا جەندرما. بەلێ هێزێت عیراقێ یێت چەکدار ئەڤ هێریشە پالدان وپویچ کرن دەمێ شەری ١٩ سەعەتا کێشای وتەلافەت گەهاندن هێزێت ئیرانی د چەکی وروحیێ دا.

وپشتی شەش سالا د شەرەنیخیێ دا شاهی خیچ کێشان ئامـادەکـرن بو ژێـك ڤەکـرنا عیراقێ وهەلوەشاندنا شورەشا نەتەوایەتی و هەڤپشکی بەلێ خەونێت وی بەر ئاڤ دا چون ودیت کو سەرکەفتن د جەنگێ دا دگەل عیراقێ شولەکا ب زەحمـەتـە ژ بـەر دەست هەلاتیا عیراقێ وئێك گرتنا هێزێت لەشکەری عیراقێ. هوسا ژی سالا ١٩٧٥ چاڤ پێکفەتنا جەزائرێ بو دناڤ سەروکێ قوماندار صدام حسین وشاهی بن گوردا.

و بەرزترین ئەگەرێت لێدانا شورەشا عیراقێ لنك شاهی ئەڤە بون.

١ - ژێـك ڤەکـرنـا هێـزێت بەرامبـەری عەرەبی دژی ئیسـرائیلێ وزەعیف کرنـا هێـزێت نەتـەوا ئەوێت کو بهێنە حازر کرن بو دویــر ئێخستنـا دوژمنـاتیـا ئیسـرائیلێ لســەر عەردێ عەرەبـا وهـاریکـاریا ئیرانێ وئیسرائیلێ و ئەمریکا نە شولەکا ڤەشارتی بو وراستی ژی ئاشکەرا بون وشول کرنا ژمــارێت زەخم ژ شارەزایێت ئیسـرائیلی دنـاڤ ئیـرانێ داو ئەفسەرێت سەح وسیا.

٢ - گەڤـدانـا رژێمـا شورەشگێر ل عیراقێ و ب تایبەتی بەلاڤــەکــرنــا هزرێت هەڤپشکینی و دانـا حوکمێ زاتی بو کوردێت کوردستـانـا عیـراقێ وپێـك ئینانا جەبها نیشتمانی ونەتەوایەتی وپێشکەفتی.

٣ - ئەو کریارێت دبن ل قلیچێ عەرەب ژ دوژمناتێت

ـی ـی دبنە دژی مەسلەحەتا نەتەوایەتی بو وەلاتێت عەرەب
ـێکی بونا بەرەڤانیا موکوم دێبیتە شولەکا نەتەوایەتی
ـیکفە.

ـ ـ ژێما ئیرانیٚ و ئمپریالی ئارمانجا سیاسەتا وان ئەوە
ـسەنگ بێخن د پینگاڤێت پێشکەفتی ئەوێت شورەشا
ـ ٣٠ تیرمەهێ ل عیراقێ دکەن بو قاییم کرنا ئابوریا
خـ ڤیو ئاڤاکرنا کومەلێ هەڤپشکی وپێکفە.

ـ ١٩٧٩ میللەتێت ئیرانی شاهـ ورژێما
ئخفـەیەرێس و پەریتی ئێخستن و هاتنا حکومەتا نوی
مبـەنێت ئیرانێ دلخوش کرن ود هزرا دا بو دێ ژیانەکی
فەحج بینن.

وغێ حەسیانێ حکومەتا شورەشگێر ل عیراقێ راپورتەك
هـرت بو حکومەتا ئیرانێ یانوی تێدا هەمی دیتنێت خوو
هرێت سیاسی بو گرێدانا تێکەلاهێت هەڤالینیٚ و جیرانیێ
یشتی چونا شاهێ بن گور.

و وەکی ئەم دزانین حوکمێ عیراقێ حوکمەك نەتەوایەتیٚ و
هەڤپشکینیێە هاتینە دەر ژ بیرو وهزرێت پارتا بەعسا
عەرەبیا هەڤپشکی دەمێ ئارمانجێت میللەتی دهەلگرێت و
ـشە روژێ. وهاتنا رژێما نوی ل ئیرانێ دوی وەختیدا
عیراقێ بچاڤەکی هویرو بەرپسیاری و مێژوی بەرێخودا
حوشی وتەناهیا تخوبیێ روژ هەلاتی داکو عیراق ژی
ـ ببیت بدەورێ خو بو هەلبژارتنا رێکا وێ بڤێت وڤیا
هێزەکی نوی زێدەکەت بو هێزێت دەڤەرێ بو بەرسینگ
گرتنا پروژێت ساهیونی و ئیمپریالی.

و سەروبەرێت شەرەنیخا عیراقێ وئیرانێ دەمێ شاهێ
بن گور هندەك شول هاتنە فەرز کرن بو شط العرب دەمێ
ناهێتە رازی بون دگەل مافێ عیراقێ یێ مێژوی، وئەڤ
تشتە چێ بو دەمێ رژێما ئیمبراتوری ودەست درێژیا
حوکمداریا ئیرانێ دکر وئیمپریالیێ ب هەمی هێزێت خوڤە
هاریکاری وپشتەڤانیا وی دکر دژی وەلاتێت عەرەب
وتایبەتی عیراق.

دەمێ شورەشا ئیرانێ رابوی ئاشکەرا بو کو رژێما
شاهی هاتە هەلکێشان ژ رهـ و ریشال ڤەو هەمی سیاسەت
هاتنە گوهورین ـ عیراقێ کەیف خوشیا خو دیار کر بڤێ
چەندێ وکرە رێکەك نوی بو گرێدانا تێکەلاهێت موکوم
وبنیاتی دگەل ئیرانا جیران.

ود هزرا عیراقێ دا بو کو هەمی نەخوشی وئاستەنگ دێ
هێنە چارەسەر کرن ئەوێت حوکمێ شاهی پەیدا کرین
دتێکەلاهێت عیراقێ وئیرانێدا.

بڤێ چەندێ حکومەتا شورەشێ ل عیراقێ داخوازا
ڤەگەراندنا تفاقا شط العرب کر ومەسەلا گزیرتێت عەرەبی
یێت سێ ئەوێت حکومەتا شاهی دەست دانایە سەر
ومەسەلا ئەهوازێ.

و تشتێ چێ بوی ئەوە سەروکێ رژێما ئیرانێ بخو
ئاشکەرا گوتی وەکی ژ بەری وی شاهی گوتی ب ٩ سالا
کو ئەڤ گزیرتە ئیرانینە وخو ژێ ناکێشن.

و مەسەلا ئەهوازی ومیللەتێ وێ رژێما ئیرانێ
دوژمناتیٚ و کەرب و کین زێدە کر بو وەکی شاهێ بەرێ.
ئینان هێزێت فارسی رابون ب کریارێت دوژمناتی
وبەردەوام و گولەباران کرنا باژێرو گوندێت عیراقێ ب
توپێت گران بو وەختەکێ درێژ.

دەمێ عیراقێ راپورتێت نەرازی بونێ دهنارتنە بو
حکومەتا فارسی تێدا نەرازی بونا خو ئاشکەرا دکرن لسەر
ڤان کریارێت بەردەوام.

وهێزێت چەکدارێت عیراقێ هەروەخت پالدانا ڤێ
دوژمناتیێ دکرن.

و دیماهیێ حکومەتا شورەشێ ل عیراقێ بریار دا ب
قوماندارییا سەروکێ هێژا صدام حسین بو دانانا رێکەکێ بو
ڤان تەعدایا و دەست دەرێژاهیا فارسی یا بەرەوام و لێدانا
دربەکێ مەزن بو هێزێت فارسی ئەو دربێ قاییم و دوژوار
داکو چو جارا ژ بیر نەکەت.

و سپێدەهیا روژا ١٠ ئیلولێ هێزێت مە یێت چەکدار
هیریش برنە هێزێت فارس و عەردێ عیراقێ ڤەگەراندن ئەوا
کو رژێما فارسی دەستێ خو دانایە سەر

و دویــر کەفتن ژ تفــاقــا سالا ١٩٧٥ و ڤەدەراهیـا ڤێ دەڤەرێ ئەوا کو هاتیە ڤەگەراندن (١٥) کم درێژاهی و (٨) کم پاناتی بڤێ چەندێ هێزێت مە یێت چەکدار شیانا خو موکـوم دکـەتن بو شولێ دکـەڤیتـە لسەر ستوی ژ بو بەرەڤانیا وەلاتێ خوشتڤی.

. و لسەر هندێ را سەروکێ قوماندار صدام حسین گوتی «مەچەنگك دگەل ئیرانێ نەڤێت . . بریارا مە جەنگك نینە بەلێ مە دڤێت هەمی پارچەکی عەردێ عیراقێ ڤەگەرینە ڤە ئەوێ فورسا بری ئەم تەماعیا عەردێ ئیرانێ ناکەین»

ئەوروژا عەردێ داگیر کری ڤەگەرایە ڤە لسەر دەستێت هیزێت چەکدارێت عیراقێ (زین القوس) و سیف سعد ب قوماندariya قومانداری پالەوان صدام حسین و لبن ئالایا وی داکــو ببیتــە روژەك مێـژ وی د جەرك و هونـاڤێت میللەتێ عیراقێ یێ هێژا. ولسەر ڤێ بنیاتی حکومەتا ئیرانێ تفاقا ٦ ئادارا سالا ١٩٧٥ وپروتوکولێت دگەل ژێ دویرکەفت ئەو ژی ژ بەر نەقەدرگرتنا تێکەلاهێت جیرانەتێ ودەست درێژایا دنـاف سەرویـەرێت عیـراقێ یێت نافخـوی ونەدانا عەردێ عیراقێ ئەوێ داگیر کری لدور تفاقا جەزائرێ پویچ کری.

هوسا جڤاتا قوماندariya شورەشێ ل عیراقێ ل روژا ١٧ ئیلولا سالا ١٩٨٠ بریار دا کو ئەو تفاق هاتە پویچ کرن ژلایێ وی ڤەژیك و ڤەگەراندنا عەردی ژ رەخێ قانوینی و بلەز لســەر شط العــرب ئەڤ بریــارە هاتــە گوتن ژ لایێ سەروکێ قوماندار صدام حسین ڤە د روینشتنا نەعەدەتی یا کومبونا کونفرانسا هریمایەتی وشول کەرێت پێشکەفتی یێت پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی ل ئاڤاهیا جڤاتا نیشتمانی.

رژێما ئیرانێ دوژمناتیا خو بکارئینا روژا ٤ ئیلولا سالا ١٩٨٠ دەمێ باژێرێت خانقین وزرباطیە و دەڤەرێت (نفط خانە) و (بدرە) گولە باران کری ب توپێت گران وبومبێت باڵەفرا، ژوێ روژێ وەرە رژێما فارسی رابو ب دوژمناتیا لەشکــەری دژی عەردێ عیـراقێ وبـاژێـرو میللەتێ وێ، عیراقێ زێرەڤانیا ڤێ کریارا دوژمناتی دکرو چو رێك نەمان وعیـراقێ بکـار نەئینـاین بەرامبەر برادەراو هەڤالا بـ رێکێت دبـلومــاسـی بەلـێ رژێمــا خمینێ چەپــەل بەردەوام بوو کریارێت نەد رێداو دەست درێژایا سەرو بەرێت نافخوی هوســا ژی قومـانـدariya پارتێ و شورەشێ بریـاردا بو برینـا دەست درێـژایـا رژێمـا خمینی وبکـارئینـانـا جەنگێ داکو دربێت مەزن دانن کویر ترین و دویر ترین عەردێ ئیرانێ ژوان باڵەفرخانە وبنگەهێت لەشکەری ل هەمی چەپەرێت شەری ل ئیرانێ.

ولـەشکـەرێ عیـراقێ یێ قارەمـان چون دشەرێ قادسیا صدامیدا هەژ ژ روژا ئێکێ ژ دەست پێکرنا جەنگێ بـ هەمی رەنگێت قارەمـانیێ وپـالـەوانیێ د مێـژ ویـا عەرەبیو سەرکـەفتنێت مەزن بنـەجهکـرن سەر هندێرا کو جودا بونا چەکیو رەنگی و کریارێت هونەری دناڤ بەرا هەردو لادا. قارەمــانێت عیــراقێ بەرەڤــانی کرن شینـا هەمی وەلاتێت عەرەب داکو دوژمناتیێ دویر بێخن ژ میللەتێ عیراقێ وتفال وژ ن ومێرو پیرەمێراو باژێرا بپارێزن ژڤی دوژمنێ چەپەل و چون دنــاڤ عەردێ ئیـرانێدا بەری کو رژێمـا خوین مێـژ شەهراخو داریت و بگەهینیتە عەرد ومیللەتێ مە.

شەر بەردەوامــەو دینمــاهیکێت وێ ئاشکـەرا بون لنـك میللەتێت ئیرانێ بەلێ رژێما نەزان خو خشیم دکەت لدور ڤێ چەنـدێ ویێ ل هیڤیـا هنـدەك دێـوانـە داکـو د هندادا بهێت وهێـزێت وی قورتــال کەن ژ هەلــوەشـانـدنێ و ژ پیلانێت رەشەکێت خمینێ خوین مێژ ئەڤەنە.

١ ـ لســەر هنـدێرا کو رژێمـا خمینی هێـزێت چەکدار ئامادەکرن بون ل روژا ٤ ئیلولێ بو دەست پێکرنا هیریشا بەرفــرەهـ لســەر عەردێ عیــراقــی بەلێ دنــاڤ را چونــا چەکـدارێت عەردی دنـاڤ عەر دێ ئیـرانێدا خیـچ کێشانا پیــلانێت هێــریشـا ئیـرانێ پویـچ کرن تەلافـەت و ژێـك ڤەکرن و شکەستن پەیدا کرن.

٢ ـ هێـزێت چەکـدارێت عیـراقێ جەبلخـانێت چەکێ ئەمریکی ستاندن د مدەهێ چوار هەفتێت ئێکێ ژ جەنگێ وهەر دوی وەختیدا بسەدان ژ توروموپێلا وتانکا پویچ کرن و لسەر بەیانێت رەسمی پیتر ژ ٣١٨ باڵەفرا هاتنە ئێخستن ژ

... و[illegible] هليكوپتەرا لسەر عەردێ عیراقیٚ و ساحێت ...ێت لەشکەری وپویچکرنا ٦٩٤ تانکاو دەست دانانا ... ٣٠٠ ئوتومبیلێت لەشکەری و هێزێت عیراقیٚ ٧٨ توپ ...جکرن و هێــزێت عیــراقیٚ یێت بەحـریٚ ١٠٦ گەمی ...نقوم کرن.

٣ ـ هەتــا نوکـە رەشـەکێت خمینی ل تەهـرانیٚ ژمـارا ...ـەت کوشتێت خو ئاشکــەرا ناکــەت وڤــان راستیـا ...ـریت ژ میللەتیٚ ئیـرانیٚ، بەلیٚ کوشتنـا سەربـازێت ...ی گەهشتە ب هزاران.

شەرێ قادسیــا صدامی هنـدەك بیـرو وهـزرێت قەنـج ...ـە ددلیٚ میللەتیٚ مەدا لدور شولێت خەبـاتیٚ وبزاڤیٚ ...ێت هەمەرەنگ دەمیٚ هێزێت چەکدارێت عیراقیٚ رابوین ... نمونیا قارەمانیا بابوو باپیرا، وشەرێ قادسیا صدامی بو شەرێ هەمیــا بیٚ جوداکـرن ودەورێ قو مانـدارێ هێـژا ... حسین مازن بو دەمیٚ ڤیانا وی کەفتیە ددلیٚ هەمیادا ...تی بویە بابیٚ هەمی کورێت عیراقیٚ ئەڤەنە پێشا هیکێت ...ـەچـونیٚ وئـەم راتبین دشـەرێ قادسیٚدا دەمیٚ هەمی ...ستەنگا تێخین وبەرسینگ گرتنا هێزێت تەماع کار دکەین ...وەلاتیٚ مەو سامانیٚ مەدا ژبو بنە جهکرنا سەرکەفتنیٚ.

ئێرە راپورتا راستیا بنگەهی ئاشکەرا دکەین کو عیراق ...یتیٚ بنـەجهـ دا وقـوماندار یا مێژووی وسروشتییٚ پارتا ...ـەوایـەتی وپێشکـەفتی یاکـو قومـاندار یا رژێما مە دکەت دبیتـە ئەگـەرا تەنـاهیٚ دسەروبەرێ عەرەبیدا بو بەرسینگ گرتنا پروگرامێت ئیمپریالیٚ و ساهیونیٚ و لایێ ئیستیراتیجی ڤە عیراقیٚ نەڤێت وەلاتێت عەرەب ژێك ڤەبن و پێتڤی بونا سـەرخورابونا نەتەوایەتی یە دەمیٚ تهێت لدور بیرو هزرێت پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی بو بەرسینگ گرتنا داگیر گرتنا ساهیـونیٚ ل فلستینیٚ و پویچکـرنـا هەمی پیـلانێت بیانی بو گرتنا وەلاتیٚ عەرەبی ژ بەر ڤیٚ ئەگەرێ عیراق بو ژمارە ئێك دخیـچ کێشـان وپـروگـرامێت هەمی هێـزێت تەمـاع کار بو دەست درێژیٚ بو خزمەتا کیانیٚ ساهیونی داکو پیٚ رابیت بو خمینی دل رەش دەمیٚ چەکی و شارەزا دەتیٚ داکو خمینی ب دەورێ خایینی رابیت بو خزمـەتــا ئیمپـریــالیـزمیٚ وساهیونیزمیٚ چونکە لنك ئیسرائێلی ئەوە کو عیراق خودانیٚ هێزا لەشکەریٚ قاییم مە دکاریت بدەورەکیٚ بەرز رابیت ل جەبها روژهەلاتی.

و دەمیٚ عیراق مژویل ب شەری ڤە دگەل ئیرانیٚ ساحا شەری ڤالـە دبیت لبـەر پیـلانێت ئیسـرائیلیٚ وسـەرکـەفتنـا عیراقیٚ د جەنگیٚدا دبیتە دربەك دوژوار بو ئیسرائیلیٚ هوسا چەکی دەتە خمینی داکو شەر بەردەوام بیت چونکە ئەڤە بو خزمەتا ئیسرائیلیٚیەو لسەر ڤیٚ تێکەهاندنیٚ یا ساهیونی بو دەورێ ئیـرانیٚ وفـایـدا شەری دژی عیـراقیٚ قومـانـداریـا ساهیـونی هاریکـاریٚ وپشتـەڤـانیـا خو دکەتن دگەل رژێما ئیـرانیٚ برەنگیٚ سیـاسی و پروپـاگـەندەو لەشکەری و تایبەتی دەمیٚ خسارەتا ئیرانیٚ ئاشکەرایەو عیراق یێ سەرکەفتییە.

جەنگیٚ هنــدەك تێکــەلاهێت ئیـرانی و ساهیـونی یێت نەپــەنی ئاشکــەرا کرن ژ بـەری شەر دەست پیٚبکـەت ب چەنـد هەیڤـا ئارمـانج ژێ ئەوە هاریکاریا مەجالیٚ تەناهیٚ دژی عیـراقیٚ ولێـك گوهـورینا سەح وسیا دەمیٚ دیار دبیت کو کیانیٚ ساهیونی نەدویر بو ژ بیریارا جەنگیٚ یاکو ئیرانیٚ کری ل ١٩٨٠/٩/٤ دەمـیٚ رێـڤـەبــەرێ سەح و سێـت لەشکـەرێ ساهیـونی گوتی براستی ل ئێـزگا دوژمنی بەری شەر دەست پیٚبکەت وگوتی:

(هنـدەك کریـارێت هاریکاریٚ و پشتەڤانیٚ دناڤ بەرامەو ئیــرانیٚ دبن بو شولیٚ پێکڤـە دژی عیـراقیٚ) و ئەڤـە ژی یا ئاشکەرا کر ی گوڤارا ڤی. سي. دي یا فەرەنسی ل هەیڤا دیماهیکا سالا ١٩٨٠ کو ئیرانیٚ چەك و ئامیرەتێت شەری یێت ئیســرائیلی وەرگـرتن و دڤی وەختیدا ڤیٚ هاریکـاریـا چەکی دیٚ ئاشکەراکەین.

١ ـ سەروکیٚ ئیرانیٚ یێ بەرێ (أبو الحسن بني صدر) ئاخــافت لدور هاریکـاریٚ د مەجـالیٚ لەشکـەریٚدا دژی عیــراقـیٚ دەمـیٚ چەك و تشتێت ئیســرائیلی وەرگــرتین بو بکارئینانا جەنگیٚ.

٢ ـ مسعـود رجـوی زەعیمیٚ دەزگـەهـا مجـاهدی خلق

ئەڤ راستیــە ئاشکــەرا کر ژ دەڤێ بنیصــدری د چاڤ پێکـەفتنا تەلـەفـزیونیو روژنامەڤانی یاکو هاتیە کرن دگەل تەلەفزیونا ئەمریکی ل ۲۰/۸/۱۹۸۱ .

۳ ـ راستیا ڤێ چەندێ ژ لایێ ساهیونیڤە.

دەمێ ئەم تاخڤین لسەر هاریکاریو پشتەڤانیا ساهیونی دگەل رژێما ئیرانێ هندەکێت دی تهێنە هزرا مە ژحاکمێت عەرەب ئەوێت هاریکـاریـا رژێما خومەینی دکەن و چەکی دەنە وا بو کوشتنا برایێ خو یێ عەرەب ئەو ژی رژێمێت قەذافیو اســدی نە ئەوێت هاتینــە فروتن بو خزمــەت وپیلانێت ئیمپریالیزمێو ساهیونیزمێ.

و رژێما لیبیا دەما کو پشتەڤانیا خو کری دگەل شورەشا ئیرانێ وی هزر دکـر کو ئەڤـە گەهـانـدنە بو شورەشا لیبی چونکە ئەو ژی خو حسێب دکەن موسلمان.

دەمێ ئاشکەرا بوی لپێشا هیکێ کو رژێما لیبی رازیبو دگەل رژێما ئیرانێ داکو خو دویربێخیت ژ مەسەلا کوشتنا (موسی الصـدر)و لسـەر بورینـا وەختیو لێـك گوهـورینـا مەسلەحێت نەد رێدا یێت پێکڤە هاریکاری موکوم بو دناڤ بەرا رژێما ئیرانێو لیبیو ئاشکەرا بو ئارمانجا ئێکێ ژڤێ تێکـەلاهیێ ئەوە پیـلانن لســەر پارتیێو شورەشێ ل عیراقێ دەمـێ دلێ قەذافی پر ژ کەرب و کینێ بەرامبــەر عیــراقێ ولدور ڤێ سیاسەتا نەساخ رژێما سوری ژی خودا دگەل وا ورژێــمــا سوری رابـــو بـ هنــدەك دەورێت خیــانــەت و پاشکەفتی ددەمێ ئاخافتن دهاتنە کرن بو تێکەلاهێت دگەل رژێمێ پشتی گرێـدانـا کریـارێ شولێ نەتەوا پێکڤە، ئەڤ رژێما هەنێ (سوری) شول دکر بنڤە برەنگەکی نەپەنی بو موکوم کرنا تێکەلاهیا دناڤ بەرا رژێما سوریا ورژێما ئیرانێ وپێلان دکرن لسەر عیراقێ.

و ژ بیــرامــە ناچیت دەورێ وی یێ چەپـەل ل لبنـانێ واسدی هزر دکر کو سەروبەرێت نوی ل ئیرانێ دێ بیتە ئەگــەرەك ژ ئەگــەرێت زەعیف بونــا رژێــمــا نیشتمـانیو نەتەوایەتیو شورەشگێر ل عیراقێ داکو بیتە رێکەك ڤەکری بو تەماع کاریێ دەمێ پیلانێت هاتینە ئاشکەرا کرن دگەل هندەك خایین ژ ئەنـدامێت قومـانداریێ یێت بەریێو رژێما ئیـرانێ بو پشتـەڤـان و هاریکـار بو ڤان خیچ کێشانا وپیلانا وتێکەلاهێت سوریو ئیرانێ بونە ئەگەرێت کێشانا دراڤی ژ رژێـمـێت زەعیف ل قلیچی داکــو دراڤی حاســل کەت و ئاستەنگێت ئابوریا خو چارەسەرکەت.

وئەو گوهورینا بوی ل ئیرانێو سەروبەرێت وێ و ژڤان راوەستـانـدنێت نەمروڤـایەتی ونە نیشتمانی ونە نەتەوایەتی ئەوێت ئیران پێ رابوی هندەك لایێت عەرەب لسەر چوین بونە ئاستەنگ بەلێ لسەر ڤێ هەمیێرا سەرکەفتنێت عیراقێ روژ بو روژێ مشــە دبـن و ل هەمی چەپــەرێت شەریو شەرکـەرێت قادسیـا صدامی بدلـەکی پاقش بەرەڤانیا خاك وئـاڤـا عیـراقێ دکـەن چونکـە ئەم خودان هەقین و بەرەڤانیا دەسکـەفتێت شورەشێ دکـەین وئـەڤـروکـە هەمی میللەتێ عیــراقێ بـ کوردو عەرەب وکێمـاسێت دی ڤە ئێـك دەستن ئێــك دلن بو پاراستنــا خاکێ وەلاتی ژ هێـریشێت مەژی هشك و دل رەشێت تەهرانێ وئالایا عیراقێ دێ هەر مینیت بلنـد ل شط العـرب ومیســان وگـەردەمـەنـد ب قومانداریا سەروکێ پالەوان صدام حسین خودێ بومە بپارێزیت.

## ژێدەر


۱ ـ تاریخ الأعتداءات الفارسیة علی العراق.
د. محمد حسین الزبیدی

۲ ـ أضواء علی الحرب العراقیة الأیرانیة.
صباح سلمان

۳ ـ قادسیه صدام والأنبعاث القومي
حسن محمد طوالبه

٤ ـ التعاون التسلیحي الأیرانی الصهیو ني.
منس سلامه
وحافظ عبدالله

٥ ـ التقریر المرکزي للمؤتمر القطري التاسع.

# قادسية صدام

• حميد علي •

كان العراق ومايزال قبلة انظار الطامعين والمستعمرين لما يتمتع به من موقع جغرافي واستراتيجي ممتاز وخبرات كثيرة الامر الذي جعل القوى الاستعمارية تتكالب للسيطرة عليه بشتى الوسائل وعلى هذا فقد تعرض العراق في تاريخه الطويل الى حروب طاحنة كثيرة وغزوات عديدة سقط خلالها الآلاف من ابنائه في ساحات الشرف يدودون عن تراب الوطن وحرمته.

وقد ظل العراق منذ ان سقطت الخلافة العباسية بعد احتلال هولاكو بغداد عام ٦٥٦ هـ - ١٢٥٨ م تحت حكم المغولي والتتري ثم الجلائرى الى ان احتل الصفويون عام ١٥٠٨ في ايام الشاه اسماعيل الصفوى ثم استولى عليه العثمانيون أيام حكم السلطان سليمان القانونى.

ولم يكن وضع الدولة العثمانية في هذا الوقت مستقرا حيث كانت على خلاف مستمر مع االصفويون جيرانها في الشرق وحروب متصلة مع الاوربيين في الغرب.

وقد استغل الصفويون انشغاله مع الاوربيين فجهز (الشاه طهاسب) جيشاً واستولى على اذربيخان وواصل تقدمه حتى وصل (ارضروم) فتوجه السلطان سليمان القانوزنى مره اخرى نحو الشرق ولكن طهاسب انسحب من الاراضي التي استولى عليها وعقدت معاهدة ومن اهم بنودها:

١ - تترك ولايه قارص وقلعتها الى الدولة العثمانية.
٢ - يجرى تحديد حدود شهرزور (شمال العراق).
٣ - يؤمن سلامة الحجاج الأيرانيين.

وبعد مرور سنة على وفاة السلطان سليمان القانونى ومجيء ابنه الى الحكم ارسل الشاه الصفوى وفدا برئاسة (شاه قولي خان) الى استنبول لتجديد التحالف بين الدولتين. وقد استطاع الصفويون ان يستعيدوا الطرق الى سلطانهم ولكن العثمانيين استولوا عليه مره اخرى ايام السلطان مراد الرابع وبقيادته العراق تحت السيطرة العثمانية حوالي اربعة قرون حتى خرج الاتراك منه نهائياً بعد اندحارهم في الحرب العالمية الاولى وتوقيع الهدنة بين الالمان والحلفاء في ١١/١١/١٩١٨.

وقد دلت الوقائع التاريخية على ان الدولة الايرانية كانت تقوم باعتداءات عسكرية ضد الدولة العثمانية على مختلف جبهات الحدود كلما سنحت الفرصة على الاكثر في الاوقات الحرجة التي تكون فيها الدولة العثمانية منشغلة في حروبها مع الايرانيين او الروس ومن هذه الاعتداءات ماكانت تقع على الحدود العراقية الايرانية وتدخلها الواضح في شؤون العراق.

وفي سنة ١٨٢٢ قامت القوات الفارسية بأستفزازات على حدود الدولة العثمانية حينما كانت تحارب الاوربيين في الغرب فتقدمت الجيوش الفارسية واحتلت منطقة (لقارس وبايزيد) ولما كانت الدولة العثمانية في شغل شاغل مع الدولة الأوربية لم تحاول ان تفتح جبهة ثانية بينها وبين الدولة الفارسية ولكنها حاولت ان تصد هذه الجبهات وتوقف اعمال النهب والسلب على الحدود والحيلولة دون تقدم الفرس داخل الحدود العثمانية

وقد استطاعت الدولة العثمانية ان تقنع ايران بأن السلام في المنطقة أمر ضروري لمصلحة الشعبين وكان من نتيجة هذه الاتصالات ان عقدت جلسات بين الجانبين في ولاية ارضروم. واستمرت التداخلات الأيرانية طويلا واخذت تشجع العناصر الكردية على التمرد والعصيان وقد تطورت هذه الأحداث سنة ١٨٢٤ واخذت الحكومة الايرانية تتدخل في امور العراق الداخلية علناً وفي سنة ١٩٢٩ اخذت العلاقات تتحسن بين البلدين بشكل بطيء وكان لرغبة العراق في اقامة علاقة حسن الجوار بين البلدين اثر كبير فقد استجابت الحكومة العراقية لطلبات تقدمت بها الحكومة الايرانية على شط العرب والتجاوزات على الاراضي العراقية وبناء مخافر الشرطة وتجاوز العشائر الايرانية على الحدود الشرقية وقطع الحكومة الايرانية الانهار من ايران الى العراق.

وعندما قامت ثورة ١٧ تموز سنة ١٩٦٨ القومية اذهلت حكام ايران ما طرحته من افكار اشتراكية ففي ١٩ نيسان ١٩٦٩/ اعلن الشاه من جانب واحد الغاء معاهدة سنة ١٩٣٧.

ونظمت مخابراته في شهر كانون الثاني عام ١٩٧٠ مؤامرة للأطاحة بالنظام الثوري وفتح خزائن ومخازن مخابراته وجيشه امام البارزاني للتمرد على الثورة وقد طورت ايران والرجعية الأيرانية هذا الخلاف الى مواجهة مباشرة بين البلدين وهاجمت منطقة خانقين.

وفي سنة ١٩٧٩ اسقطت الشعوب الايرانية الشاه ونظامه الرجعي وجاءت حكومة جديدة استبشرت الشعوب الأيرانية وطمحت قيادة العراق بأن ايران سوف تسعى لازالة كل الآثار السلبية ولكن النظام الأيراني صب حقد وكراهية. وماكان على العراق الا وان يضع حدا لهذه الاعتداءات والأنتهاكات الفارسية، وفي ١٠ ايلول قامت قواتنا بهجوم على القوات الفارسية واستعادت منها الاراضي العراقية التي كان يحتفظ بها خلافاً لأتفاقية ١٩٧٥ ودخل العراق الحرب المفروضة نتيجة لتعنت النظام الايراني واخذت القوى الأستعمارية والصهيونية تساند النظام الايراني وخاصة التعاون التسليحي الصهيوني لها ومساندة الأنظمة العربية كحاكم سوريه والقذافى ولكن بالرغم من هذا اندفع ابناء العراق بكل الفئات للدفاع عن ارض العراق العظيم ودحر الهجمات البربرية. ولكن بهمة رجال قادسية صدام المجيدة ودفاعهم عن مكتسبات ثورة ١٧ - ٣٠ تموز المجيدة سوف يكون لنا النصر الأكيد وبقيادة الفارس المقدام صدام حسين (حفظه الله).

# جاوان

● جەمیل رۆژبەیانی ●

**ئەم عێلە لە کوێ ژیاوەو؟ چی بەسەر هاتووەو؟ ناوەکەی (جاڤان)ە، یا (گاوان)؟**

**پێشەکی:**

سالـــی ١٩٥٦زا (١٣٧٥ کۆچـــی) زانـــای مەزنـــی مێژوزان و بۆ مێژوژیاو «دوکتور مصطەفا جەواد.» ـ جێی ـەهەشت بێ ـ لە کۆڕی زانیاریی عیراق دا وتارێکی زۆر ـە نرخی خوێنـــدەوە دەربـــارەی عێلی جاوانی کوردو ناوی وتـارەکـەی نابـوو «جـاوان القبیلة الكردية المنسية ومشاهير ـجـــاوانیین». وتـارەکـە بۆ گەلی کورد نرخێکی تایـەبـەتی هەبـــوو، وە زۆر دەنـگـی دایـــەوە، چۆن ئەو ڕاستی یـــەی دەردەخـــــت کە کوردەکـــان لە سەدەکـــانـی سەرەتـــای پەیـدابـوونی ئیسـلام دا زۆر بە دەسـەڵات و بە هێز بوون، هەر ئەوان بوون پشتیوانی یان لە خیلافەتی عەبباسی کردووە بەرامبـەر بە (بـوەیهی)کـان و (غـوز)ەکـان و (سـەلجـوقی) یەکـان و لەو جێیـانـەدا دەژیـان کە ئەمڕۆکە پێی ئەوترێ: پارێزگاکانی (دییالە ـ بابل ـ واسیط)و هەروا لە دەوروبەری بەغدا. ئنجا حیللە.

پاش لێبـــوونـــەوەی «مـــامـۆسـتـا مصطـەفـا جەواد» لە دوانەکەو، خوا حافیزی کردنی ئەوانەی هاتبوون بۆ بیستنی ئەو دوانـە، هەل پەیـدابـوو لەگـەڵ دوکتـوردا کەوتینە وت و وێژ ی خۆمانی، جا ئەو ڕوی کردەمن ووتی:

بیـروڕات دەربـارەی هەوارو مەڵبـەندی کۆنی ئەم عێلی جاوانــە چی یـــە؟ لات وانی یـــە لە پێشـــا لە دەوروبـەری (سیروان)و دەشتی (قەرەتەپە)دا نیشتەجێ بووبن؟»

لەوەرام دا وتم: دوکتور! من تا ئێستە دەربارەی ئەم عێلە ورد نەبـومـەتـەوەو لێی نەکـۆڵیومەتەوە، چۆن ئەم عێلە وەکو عێـــڵ، ناوی لە (شـەرەف نامـە)دا نەهـاتـووە. بەڵام پاش گوێلێبـــونم لەم وتـارە بە نرخـەی ئێـوە هەم وتـارەکـەتـان وەردەگێرم بە کوردی و هەم پەیجوییەکی باشی دەربارە دەکەم»

پاش ئەم دیدارە بە ماوایێ، وتارەکەم گۆڕی‌یە کوردی‌و لەسەر لاپەڕە زێڕینەکانی ڕۆژنامەی ژین بە زنجیرە وتار بلاوم کردەوە. هەندێ نەوەدوا جارێکی تر، لە کۆڕی زانیاری لەگەڵ (دوکتور مصطفا جەوادا) یەکترمان بینی‌یەوەو باسەکەمان تازە کردەوە و پێم ووت: «دوکتورا! من وام بۆ دەردەکەوێ کە ئەم عێلی جاوانە لەمەوبەر لە (جەوان ڕۆ) نیشتەجێ بووبن و لەوێوە بەرەوخوار بووبنەوە، وشەی (جەوان) هەر (جاوانە) کوردی‌یەکەیەو لە (جەوان)ی فارسی‌یەوە نەهاتووە!

دوکتور، قسەکانی منی زۆر بەخۆشی‌یەوە گوێ‌گرت، و لەوەرام دا وتی: «ئەم باسە لێ‌کۆڵینەوەیێکی قووڵتری دەوێ تۆ لای خۆتەوە کتێبە فارسی‌و تورکی‌یەکان بپشکنەو منیش هەوڵ و کۆششی خۆم ئەخەمەوە کار» لەم سەردەمەدا گێژەڵۆکەی ڕق و کینی ناهەمواری‌و ڕامیاری منی ڕافڕاندبوو بۆ دەوروبەری (بەصرە)، پاش ئەوەی کە لە (شمرتە) و (بەصرە) یەك دوو ساڵێکم بەسەربرد گوێزرامەوە بۆ (مەندەلی)، هەر کە شورشی ١٤ تەموز ڕوی‌دا گەڕامەوە بۆ کەرکوك، لەم ماوایەدا بەنامەو بە تەلیفون چەند جارێ لەگەڵ دوکتور (مصطفا جەواد) هەواڵمان لە یەك گیرابووەوە، بەلام لەم باسەوە نەء، لە باسی‌ترەوە، لەگەڵ ئەمەش دا دڵنیام کە دوکتور پاش ئەم وت وێژە لە بارەی (جاوان)ەو هیچی‌تری بلاونەکردۆتەوە،

سالانی ١٩٦٥ ـ ١٩٧٩زا. کە لە دەرەوەی نیشتمان بووم بە ڕێکەوت جارێکیان سواری تاکسی‌یێ بووم لێخورەکەی زرنگانە بە شێوەی زمانەکەم دا زانی کە من کوردم، لەبەر ئەمە بە کرمانجی‌ی ژوورو لەگەڵم کەوتە دەمەتەقێ، و من لێم پرسی: خەڵکی کوێی؟ وتی: (جاوون) لە وەرامەکەی دڵم کەوتە خورپەوە، چونکە من دەمێ بوو بەدوای ناوی (جاوان)دا وێڵ بووم.. ئنجا لێم پرسی: «جاوون» عێلە؟ یا جێگەیە؟ وتی هەم ناوی عێلەو هەم جێگە! ووتم: من دەمێکە بەدوای باسی ئەم عێلەدا وێلم، ئێوە لە کوێ دادەنیشن؟ وتی: لە شاروڵکەی (جاوون)و چەند گوندێکی تری دەوروبەری «دەماوەند»! ئەم دێیانە سەربەدیهستانی (ئەبەر شیو)ن لە ناوچەی ناوخۆیی بن دەسەلاتی قەضای دەماوەند، و بە زمانی کرمانجی‌ی ژوورو دەئاخێون، و فارسەکان بەم شاروڵکەیە دەڵێن (جابان) پاش ئەم دەمە تەقێ‌یە بۆم ڕوون کردەوە کە حەزم لە پشکنین و زانست هەڵێنجانە جا داوای لێ‌کردم بچمە دیدەنی‌یان بۆ (جاوان).

منیش حەزم لێ‌بوو، بەلام چونکە من ئابوور، بووم وجڵەوی دەسەلاتم بەدەس خۆمەوە نەبوو، لەم بارەوە بە پۆستەدا نامەیێکم نووسی بۆ بەڕێوەبەری زانستی‌و پەروەردەی هەرێمەکە و ڕوونووسێکم دایە قائیم مەقامی دەماوەند (کە ئەوان پێی دەڵێن فەرماندار) بۆ ئەوەی ئەوان خوڵکم بکەن بۆ سەرلێدانی ئەوێ. بەلام پاش ماوەیێ وەرامیان دامەوە کە ڕێی ئەو ناوە خوڵەپەتان و چەکە بۆ گەڕین (ئوتومەبیل) ناخۆشە، جگە لە پاسەشرەکانی خۆیان گەڕینی‌تری بۆ ناچێ، و بۆ کەسێکی ناشارەزا گەیشتنە ئەوێ زۆر ناهەموارە. جا لە وەرامی نامەکە تێگەیشتم باری ڕامیاری ڕێ‌نادا (وەك وتراوە!! ئەوی کەسە حەرفێکی بەسە) جا نەچوم وکەوتمە پشکنینی کتێبە مێژوویی‌و جوغرافیایی‌یەکان.

«مەسعودی» لە (مروج الذهب)دا نووسیویە: «ئەو چینە کوردانەی کە لە وولاتی «دینەوەر» و «هەمەدان»دا نیشتەجێ‌ن بێ‌گومان هەموو لە نەتەوەی «رەبیعە کوڕی نزارن. هەروا (ماجوران)ەکان، کە لە (کەیکان)ەکانی (ئاذەربایجان)ن و (هەزەبانی) کان و (سرات) و(لوریە)و (پاردلکان)و (بارینجان) و(باریسیان) و(خالیە) و(جبانارقیە) و(جاوانی)... تاد..[1]

ئەم عێلانەی «مەسعودی» ناوی بردوون، ناوەکانیان تووشی هەڵەی نووسیاری بووە، بێ‌گومان مەبەست لە

(ماجوران) یا (ماهجوران)ە ـ و مەبەست ئەو گۆرانانەیە کە دانیشتوانی ئەو شارانە بوون ناوی (ماهـ)ی پێوەبووە وەك (ماهـ البەصرە) (ماهـ الکوفە) ـ وەیا (باجوان)ە، کە هەردوو تیرەکە لەگەڵ (کەیکان)ەکان ـ واتا (کاکەیی)یەکان ـ پەیوەندییان هەیە تا ئێستە گۆرانەکانی پارێزگای (کرماشان) هەموو کاکەیین، هەروا (باجوان)ەکانی لای (موصل)یش هەر لەسەر رچی کاکەیین. . بەڵام ئەوە بە راست نازانم کە مەبەست لە (ماجوران) باجەلانەکان بڵێت (هەزەبان)یش ئەو عێڵە گەورە ناسراوەیە کە لە مێژودا دەیان پیاوی مەزنی وەك (صەلاح الدین ئەییوبی) تیاهەڵکەوتوە. (سرات)یش دەبێ (سورچی)بێ نەوەك (سوران) چونکە (سوران) ناوە بۆ ئەو هەرێمەی دەکەوێتە نێوانی دوزێی بچوك و گەورەوە (واتا پارێزگای هەولێری ئێستە). (شازەنجان)یش ئەو عێڵە بەهێزەیە کە دەوڵەتی (عەییاری)ی کوردی دامەزراند، و دوورنییە (زەنگەنە)کانی ئێستە پاشماوەی ئەم عێڵی (شازەنجانی)یە بن، کە لە بنەرەتا لە (زەنگان)ەوە، هاتوونە خوارەوە و، فارسەکان ناوەکەیان گۆریوە بە (زەنجان). (لوریە)ش هەر (لور)ەکانی خۆمانە بە هەردوو بەشەکەیەوە (فەیلی ـ بەختیاری) وەیاخود (پێشکۆ ـ پشت کۆ) ئەم چەند عێڵانە تا ئێستە ناوی خۆیان پاراستووە بەڵام (باردلکان) و(بارینجان) ناوەکانیان هەر بە هەڵەیی ماوەتە‌...و تا ئێستە راست نەکراوەتەوە (باریسیان)یش (مامۆستا ئەمین زەکی بەگ) کردویە بە (بازیان)و (خالیە)ش دەبێ (خێلانی) بێ‌و (جبانارقە)ش کە دیسان تووشی هەڵە بووە بە وەرگەراوی (گاوبارەکە)یە کە لەم کاتانەدا لە(تالش)و دەوروبەری زریەی (خەزەر) نیشتەجێن. (جاوان)یش ئەم عێڵەیە کە لەمەوبەر (مصطفا جەواد) سیپارەکەی دەربارە نووسیوەو، ئێمە دەربارەی دەدوێین.

وەك لە دەقەکەدا دیمان «مەسعودی» لە (مروج الزەهەب)دا بە پەیرەوی مێژوونوسانی پێش خۆی ئەم عێڵانەی بە رچەڵەك بردۆتەوە سەر (عەرەب). بەڵام وا دیارە بیروڕایەکەی بەر توانج و رەخنە کەوتووە، پاشان لێی پەشیمان بوەتەوە، ئا ئەوەتا لە کتێبی (ئەلتەنبیهـ ولئیشراف)ەکەیا ـ کە پاش مروج الذەهەب داینوە ـ نووسیویە: «کوردەکان عێڵەکانی: باذنجان ـ شاهجان ـ شازەنجان ـ نشاورە ـ بوذیکان ـ لوریە ـ جورقان ـ جوانیە ـ باریسیان ـ جەلالی ـ متسەکان ـ جابانارقیە ـ چروغان ـ کەیکان ـ ماجردان ـ هەزەبانیەو هی تری، کە لە قەڵەمرەوەکانی: فارس ـ کرمان ـ سیستان ـ خوراسان ـ ئەصفەهان ـ و سەر زەویەکانی چیاو ماهات (واتا دینەوەرو نەهاوندو پشتکۆ)و ئیغارین (واتا بەرەج و کەرەج)و هەمەدان ـ شارەزور ـ داراباد ـ صامغان ـ ئازەربایجان ـ ئەرمینیە ـ ئەران ـ بیلەقان ـ باب الئەبواب ـ جزیرە ـ بەین النەهرەین ـ شام ـ و دەربەندەکان دا دەژین، هەموو ئەم عێلانە بە نەتەوەی (کوردی کوری ئەسفەندیاری کوری مەنوچەهر) دەدەنەقەڵەم. .»[٢]

مەسعودی لەم کتێبەشا دیسانەوە ناوی عێڵەکانی بە هەڵە یادداشت کردووە. (بەڵام کاتی درێژەدان بەم باسە نییە). دەربارەی ئەوەی کە ئەم عێلانە دەچنەوە سەر (عەرەب) من تەنیا وتەکەی بەهەشتی (دوکتور مصطەفا جەواد) دوبارە دەکەمەوە کە نووسیویە: «گومان لەوەدا نییە کە پەیوەندی دانی کورد بە رچەڵەکی عەرەبەوە، لای ئەوانەی وردبینن و دەخڵیان بە لێکۆڵینەوەی زانستانەوە هەیە بۆتە بیریکی پروپوچ. . .»[٣]

ئەوەش کە (مەسعودی) لە (ئەلتەنبیهـ وەلئیشراف)دا نووسیویە:

ئەم عێڵە کوردانە لە نەتەوەی (کوردی کوری ئەسفەندیار کوری مەنوچەهر)ن، دیسانەوە لەویتر ناڕاست ترە لەبەر ئەم هۆیانە:

١ ـ ئەسفەندیار، کوری مەنوچەهر نی، کوری گوشتاسپ کوری لەهراسپ ە.[٤]

٢ ـ بە پێی شاهنامەو مێژووەکان ئەسفەندیار کوڕی کورد ناوی نەبووە

٣ ـ ئەوەی لە مێژوە کۆنەکانی ئێران دایە ئەوەیە کە یەکێك لە پادشایانی (ماد) ناوی (کوردان شاهـ) بووە، لەگەڵ ئەردەشێری ساسانیدا کەوتۆتە شەڕەوە، لە (کارنامەی ئەردەشیر)دا نووسراوە: «سپای ئەردەشێر بۆ شەڕ لەگەڵ کوردان شای مادی، خراپەڕی»(٥)

٤ ـ بەهرامی کوڕی بەهرام گوشەنس کە نازناوی (بەهرامی چوپین)، و لە نەتەوەی (گورگین میلاد)ی کوردە، و پادشایێتی ی ئێرانی لە هورمزی چوارەمی ساسانی (داگیرکردبو، ئەم پادشایە برایێك و خوشکێکی هەبوو ناویان «کورد» و«کوردی» بوو.(٦)

جگە لەمانە لە مێژوی کۆنی ئێران دا چ لە شاهنامەی فیردەوسیداو چ لە فەرهەنگی ناوەکان دا کەسێ بەیادا نایێ کە ناوی کورد بوبێ. ئەمانەی باسم کردن هەندێ بیروڕای کوێرکوێرانەبوو کە مێژو نووسە ڕەگەزپەستەکان زانستی ڕاستییان پێ حاشارداوە.

ئاخر چۆن نەتەوەیێکی چەند ملیونی دەکرێ بە وەچەی کابرایێ کە زۆرزۆر کۆن بێ دوو هەزار ساڵی لەمەوبەر ژیاوە؟ چ ئەم کابرایە (کوردی کوڕی ئەسفەندیاری مەنوچەهر)ی درۆکانی بێ، یا (کوردی کوڕی موردی کوڕی صەعصەعەی) خەیاڵی یا (ڕەبیعەی کوڕی نزار)بێ. ئەم جۆرە بیروڕا پڕوپوچانە لەم ساڵانەدا دیسانەوە لەلایەن هەندێ نەخوێندەواری وەکو (یونس سامەڕائی)یەوە تازە کراوەتەوە.

بالەم قسانە لابدەم کە زانایان بە ئەفسانەیان داوەتە قەڵەم، و بگەڕێمەوە سەرباسی (جاوان). لەو دەقانەی وەرمان گرتوە بۆمان دەرکەوت (جاوان)کان لە بەشی (چیا)دا ژیاون. مەبەستی مێژونووسان و جوغرافیا دانەرەکان لە (چیا) ئەو هەرێم و وڵاتانەیە کە دەکەونە نێوان زنجیرە چیای شاهۆ (زاگروس)و زنجیرە چیای هەڵەبەرز (ئەلبورز)ەوە هەر لە (حەلەوان)ەوە تا لای سەرەوەی (ڕەی) بە پانایی، و هەر لە (ئەصفەهان)ەوە تا دەوروبەری (ئاذەربایجان)ی خوارو بە درێژایی، بەم هەرێمە چیایی یە وتراوە (بلادالجبل) و(عیراقی عەجەم).

ئنجا با سەرنجێکی ئەو جێگەیانە بدەین کە (جاوان)ەکان تیانیشتەجێ بوون و هەن. وەکو کابرای (جاوان) وتی فارسەکان (جاوان)یان کردووە بە (جابان). شارۆڵکەی (جابان) ئەکەوێتە دیهستانی (ئەبەرشیو)ی سەربەناوچەی ناوخۆی قەضای (دەماوەند)و بیست و حەوت کیلۆمەتر لێیەوە دوورە، و ئەکەوێتە سەرەڕێی خۆڵەیەتان و چەگلی تاران ـ مازەندەران ـ بۆ لای باشۆری خۆرهەڵاتیی دەماوەند(٧) بەلام ئەم عێلی (جاوان)ە، کەی لە مەڵبەندەکەی خۆی هەڵکەندراوەو بەرەوخوار بۆتەوە بۆ قەڵەمڕەوی (حەسەن وەیهی)یەکان؟ وادیارە یا قات وقڕی یا بومەلەرزە، یا ئەمیرانی بوەیهی (کە لە صەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا پایتەختیان (ڕەی بووە) تەنگەتاوی‌کردون، و بەشێکیان گوێزاوێتیەوە بۆسای فەرمان ڕەوایی (حەسەن وەیهی)یەکان کە لەگەڵ (بوەیهی)یەکانا ناکۆك بوون و دوژمن، وسنووریان لە (هەمەدان)ەوە تا (ئەهواز)و لە (مەندەلی)یەوە تا زێی بچوك بووە. بەڵێ وادیارە کە لە سەردەمەدا گوێزاویانەتەوە، یەك سەر دەوروبەری چیای (شاهۆ)یان کردووە بە مەڵبەندو هەوار، کە زۆر بە دیمەن لە هەوارە کۆنەکەی خۆیان چووەو بەو هۆیەوە ئەو خاك و ئاوو سەرزەوییە ناوی ئەوانی پێوە نووساوەو بووە بە (جاوان ڕوو).

ئێمە گەرچی بۆ ئەم قسانە بەڵگەیێکی مێژوویی بە جەختمان نییە بەلام لە قسەکانی ئیبنالئەثیر ـ کە لە دەنگ و باسی ساڵی ٣٩٧کوچید (٠٠٦ر١ز١) بۆ یەکەم جار ناوی ئەمیرێکی (جاوان)دەبا کە لەسای دەوڵەتی حەسەن وەیهیدا بووە ـ ئەم ڕاستەقینەمان بۆ دەرئەکەوێ. ئا ئەوەتا لە ئەلکامل دا نووسیویە: «عەمید الجیوش (واتا

ڕێچیی ئەرکانی سپای بوەیهی) ئەبوالفەتح کوڕی عەنازی (عەیاری)ی ناحەزی (بەدری کوڕی حەسەن وەیهی) دانا بە جێگرلری شارێی (خوراسان) - واتا شارێی (بەغدا - حەلەب - کرماشان) «بەدر» لەم کارە توڕەبوو و ناردی (ئەبو جەعفەری حەجاج،ی کۆنە رەئیسی ئەرکانی بوەیهی‌یەکانی هەکرلایراو)ی بانگ کردە لای خۆیو کۆمەڵێکی زۆری لە کوردان بۆ کۆکردەوە وەك:

ئەمیر هینـدی کوڕی سەعـدی، ئەبوعیسا شادی کوڕی محەممەد،و ئەمیر وەرام کوڕی محەممەد (کە ئەمیان سەرۆکی جاوان بوو)و هەنـدێکی تـر. ئەمـانـەی بەڕێخست بۆ گەمارۆدانی بەغـدا. تا لەم کاتـەدا (ئـەبـوالحەسەن عەلی کوڕی میزیەدی ئەسەدی عەرەب)یش - کە لەوەبەر سەر بە (بەهاء الدولە)ی بوەیهی سولطانی بەغدا بوو، و لە تەکیا چووبـووە سەر (خـوزسـتـان)و بە توڕەیی گەڕابـووەوە - ئەویشیان کەوتە تەك، ئەم کۆمەڵە بەم جۆرە هێزێکی پتر لە دە هەزار سواریان پێك هێناو چونە سەر بەغداو گەمارۆیان دا... تاد[8]

ئەم شاڵاوە بۆ سەر بەغدا بووەتە هۆی ئەوەی کە عێلی جاوان وەکـو پێشـەنگ لە چیـاکـەوە بەرەو خواربێتـەوە بۆ پێدەشت، هەروا بووتـە هۆی ئەوەش کە ئەم (ئـەمیـرە) کوردانە هەم لەگەڵ یەکترا پەیوەندی دۆستاریەتی ببەستن، و هەم لەگەڵ ئەمیری (ئەسەدی)ی عەرەبدا.

تا ئەوەتـا خاوەنی (ئـەلکـامیـل) لە دەنگ و باسی ساڵی ٤٠٥ کۆچیدا (١٠١٤زا (کە هەر لەو ساڵەدا بەدر کوژرا) نووسیویە:

(لـە مانـگـی موحـەڕەم دا شەڕ قەومـا لە نێـوانـی ئەبـوالحـەسەن عەلی میزیەدی ئەسەدی)و کوڕانی دوبەیس (موضەر، نەبهان، حەسسان، طەڕاد)دا لەسەر ئەوەی ئەم چوار برایـە (ئـەبـوالغـەنـائیمی) برای (ئـەبـوالحەسن)یان، کوشتبوو، و خۆی ئامادە کردبوو بۆ تۆڵە لێسەندینان، جا عەرەبـەکـانی کۆکـردەوە، لەگـەڵ (شـازەنجـان)و (جاوان)و

خەڵـکی‌تـری لە کوردان و شاڵاوی کردە سەر ئەوانـە... تاد)[9]

ئەم دو شاڵاوە بووەتـە هۆی ئەوەی عیـلی (جـاوان) لە هەرێمی چیـایی بن دەسـەڵاتی (حـەسـەن وەیهی)یـەکـان ڕزگاربێو بکەوێتە پێدەشتەکانی ژێردەسەڵاتی (عەییاری) یەکانەوە، کە سەر بە سولکانی بوەیهی‌یەکانی بەغدابوون، و بە مردنی (بەدر) پتر بناغەی دەوڵەتی خۆیان قایم کردبوو.

بەم جۆر، جاوانـەکـان لە صەدەی پێنجـەمی کۆچیـدا ناوبـانگیـان دەرکـردو دەسەڵاتیان پەیداکرد. تا ئەوەتا ساڵی ٤٢٠ کۆچی (١٠٢٩زا) کە (غوز)ە تورکمانەکان شاڵاویان کردە سەر موصـل «قـەرەواشـی عەقـیلی» فەرمـان ڕەوای (مـوصـل) داوای یارمـەتیو کۆمـەکی کرد لە (دوبـەیس میـزیـەدی ئەسەدی)و (ئەبوالشەوکی عەییاری)و (ئەبوالفەتح کوڕی وەرامـی جاوانـی)و خەڵـکی‌تـری لە کوردان... تاد)[10]

پاش ئەم ساڵانـە جاوانـەکـان بەتـەواوەتی ناسـران و دەسەڵاتیان بەهێزتر بو و بەرەوخوارترەوە بوون بۆ (شارەبان - دەسکـەرە - بەلـەدروز - مەنـدەلی - گەرکـەرایا (کوت) - و دەوروبـەری بەغـداو خوارتـر. و لە ساڵی ٤٩٧ کۆچیـدا (١١٠١زا) بەتێکـەڵی لەگـەڵ (ئـەسـەدی)یـەکـان شاری (حیللە)یان دوروست کرد.

من ئیتر لەم باسە مێژوییەی (جاوان) وازدێنم، چونکە بەهەشتی (دوکتور مصطەفا جەواد) لە سیپارەی (جاوان)دا زۆر زانایانەو بە مروەتانە باسی (جاوان)و پیاوە گەورەکان و خوێندەورانی و هەستیاران، و بوێژان و هەڵکەوتوانی کردووە...

بەڵام من تەنیـا دیـاری بۆ دوو هەڵـە دەکـەم کە لە سیپارەکەی (مامۆستا مصطەفا جەواد)دا ڕوویداوە:

یەکـەم: وای بۆ دەرکـەوتـووە کە ناوی (جاوان میرخانی هەماوەند) لە (جاوان) ەوە هاتووە[11]. بەداخەوە ئەوانەش کە سیپارەکەیان بۆ جاری دووەم چاپ کردۆتەوە دیاردی یان

بۆ ئەم گومـانـە نەكـردووە كە پاشـان دەبێتـە هەڵـەیێكی مێژوویی. (جوامیر) ناوەكەی (جوامیر ئاغا)یە و لە دوشەی (جـوان) و(میـر) پێـك هاتـووە كە لە بنـەڕەتـا (جوان میر = جەوان مەرد)ە (واتـا میـردی گەنـج و جوان، میـردی ئازا، میردی سەخی). نەك (جاوان).

دووەم: وای بۆ دەرکـەوتـووە كە عێـلی جاوان پاش شالاوی (هولاكو)و ڕوخانی خەلافەتی عەبباسی، بوون بە عەرەب وتێكەڵ بە عەرەبەكانی فوراتی ناوەندبوون: (١٢)

من لام وایە (جـاوان)ەكـان تێكـەڵ بە عەرەب نەبون و پاش شڵەژانی دەوروبـەری بەغـدا گەڕوانـەوە بۆ ناو چیـای قاییم، بۆ هەرێمی (جەوانرۆ). بویە ناویان لە مێژودا خۆی شاردۆتەوە، پاشان بەناوی (جاف)ەو سەریان هەڵداوەتەوە.

بۆ ئەم بیروڕایەم ئەم بەڵگانەی خوارەوەم هەیە:

١ ـ جاوانـەكـان لە بنـەڕەتـا شێوەی زمانیان كرمانجیی ژوورو بووەو بە خۆیـان وتـووە (جـاڤـان)، كە چونـە حیللەو دەوروبـەری خوێنـدەوارو نووسـەرەكـانیـان كە زانیـویانە لە فارسـیو عەرەبـیدا پیـتی (ڤ) نییـە، هەروەك شێـوە فارسییەكە ناوەكەیان بە (جاوان) یادداشت كردووە. بەڵام جەماوەری عێڵەكە كە تێكەڵ بە عەرەبی (ئەسەد)بوون لە حیللە، وبـەعیـلاتیتـری دراوسێ ئەوان خۆیـان وتـووە (جـاڤـان) عەرەبـەكـان وایان زانیوە كە ناوەكە (جافان)ەو ئاوێكی دووەكییە بۆ دو عێـل بەكـارهێنـراوە، پاشـان كە زانیـویـانـە ناوەكـە دووەكی نییە، ویەكەییە، پێیان وتون (جاف)و لە ماوەی دوو صەت ساڵێكا خود (جاوان)ەكان بەم ناوە ڕاهاتون.

٢ ـ وشەی (جاف) كە بووە بە ناو بۆ ئەم عێڵە كوردە گەورەیـە تا دەورانی عوثمـانی صەفـەوی ـ واتـا صەدەی دەیەمی كۆچی (پانزەیەمی زایینی) لە هیچ مێژووێكا بەرچاو نەكـەوتـووە. ئەی لە پڕ لە كوێـوە باری؟ بێگـومان هەر ئەو (جـاوان) انـەی كە گەڕاونـەوە وڵات و ناوی (جـاف)یـان پەیـداكـردوە، لەسـەر دەمی ئەم دودەوڵـەتـەدا بوون بە دو بەشـەوە، ئەمـەیـان كە هەر لە (جـەوانـرۆ) ماوەتەوە بووە بە (جافی جەوانرۆ)و ئەو بەشەیان كە هاتۆتە خوارەوە بۆ خاكی كوردستانی ئەم دیو ناوی خۆی ناوە (جافی مورادی).

٣ ـ وشەی (جاف) عەرەبی نییە چونكە بە عەرەبی دەكـات وشـك و هیـچ واتـایی بە دەستـەوە نادا. بێگومان (فارسی)ش نییە چونكە بە فارسی (جاف) واتاییكی زۆر ناشرینی هەیە كە ڕەوای عێڵێكی كورد نییە، ئەوەش كە وتراوە ئەم ناوە دەبێ لە (جەفاكیش)ەوە یا (جافر)ە وە سووك بوو بێ بە ڕاستی بیـروڕایـەكی تازەیـە، هەروەك قسـەی كابرای ساویلكە وایە كە ووتی (قوروان) ناوی (جاف) لە قورئـانـا هەس ئەوە تا ئێـژی: (تـەتە جافا).. جا من بەم پێیە بڕوام وەهایە كە وشەكە لە (جاڤان)ەوە سووك بووە:

٤ ـ ئەوانـەش كە زۆر سادەیـانـە ناوی (جـاوان) یان بردۆتەوەسەر (گاوان) بەڕاستی جێی سەر سوڕمانە. ڕاستە فارسـەكـان وەكـو عەرەب زۆر جار (گـاف)یـان گۆڕیـوە بە (جـیـم) وەكـو ئەوەی ناوی (وەروگـرد) یان كردوە بە (بـروجـورد)و ناوی (زەرنگـان)یـان كردووە بە (زەنجـان)و (سـەنگـاوی)یـان كردووە بە (سەنجابی)وە زۆریتر. بەڵام هەرخود فارسەكان هەرگیز (گاوان)یان نەكردووە بە (جاوان) وشـەی (گـاوان ـ گاوبـان ـ گابـان) لە فارسیدا هەربـاوە. ئەگەر ناوەكە لە بنەڕەتا (گاوان) بوایە كوردە (جاوان)ەكانی دەمـاوەنـد ناوە بنـەڕەتیكـەیـان ئەپـاراست. ئا ئەوەتـا (جابانارڤیە) هەر بەخۆیان دەڵێن (گاوبارە) (جورەقان) هەر بە خۆیان دەڵێن (گەورك) (جوران) هەر بە خۆیان دەڵێن (گۆران):

٥ ـ ئێمـە ئەوەنـدە ئەتـوانین بڵێین كە ناوی (جـاڤـان) گوڕدراوە بە (جـابـان) چونكـە (ڤ)ی كوردی هەمیشـە لە فارسیدا (ب)یە وەكو (ئاڤ) ـ (ئاب)و (تاڤ) (تاب)و دەیانیتری..

٦ ـ ئنجا با بێینەوە سەر (جاوان)ەكانی لای (دەماوەند) ئەمانە ٢٧ ساڵ لەمەوبەر شەش هەزار كەسێ بون، لەگەڵ

تی)یەکان و (گوران)ەکان بە تێکەڵی ئەژیان ،و هێشتا
هەرشێوەی زمانی خۆیان پاراستووە ،بەڵام ئەوانەی
حەوین رۆ) شێوەی زمانی گۆران و کەڵوری هەرێمەکە،
ەتەکەی تێکەڵ کردون گەرچی ئێستەش شێوەی
ەتەکەیان لەگەڵ هەرێمەکانی (کرماشان، ئەردەڵان،
منی کۆن کەڵورو، باجەڵانەکان جیایی هەر هەیە.

جلوانەکانی دەماوەند لەم شارۆڵکەو گوندانەدا، لەگەڵ
تی)و گۆرانەکاندا، پێکەوە نیشتەجێ ن:

| | | |
|---|---|---|
| حعد | ٩٠٠ | کەس |
| ئب سەرد | ٧٥٠ | کەس |
| تیمورزا | ٩٠ | کەس |
| سەربەندان | ١٫٧٤٠ | کەس |
| میهرئاباد | ١٫٣٤٢ | کەس |
| سورخەدێ | ٤٥٠ | کەس |
| ێکرا | ٥٫٣٨٢ | کەس |

جگە لەمانە ل ئەوروبەری ئەصفەهان و چ ،
جێی تری ئێران داهەن [١٣] هەروا لە دیاربەکریش لە
قەڵای (شاتان)ی سەر بە (حیصن کیف) تیرەیێکی
(جلوان) ناو هەرماوە [١٤]

بالێرەشدا ئەوە دوبارە بکەمەوە کە (جابان)ی فەرماندەی سپا
ئە سەردەمی قەراڵیچەی ساسانی (پوران روخت)دا. [١٥]

هەروا (جابان)ی باوکی (مەءمون) کە یەکێ بووە لە یارنی
پێغەمبەری ئیسلام (١٥) لە بنەڕەتا لەم تیرەیە بوون.

سەرچاوەکانی ئەم ووتارە:

---


ئەلئە خبارالطیوالی ئەبوحەنیفەی دینەوەری
مروج الذهەبی مەسعودی
ئەلتەنبیە وەالئیشراف مەسعودی
ئەلکامیلی ئیبن الئەثیر.
ئەلمونتەظەم ئیبن الجەوزی
فەرهەنگی جوغرافیای رەزم ئارا
فەرهەنگی دیهخودا
فەرهەنگی موعین
جاوانی دوکتور مصطفا جەواد
هەروا شاهنامەی فیردەوسیو هەندێ کتێبیتری.


پەراوێز

(١) مروج الذهەب چاپی ئەوروپا لاپەرە ٢٥٤ بەرگی ٣
(٢) ئەلتەنبیە وەلئیشراف وەرگێراوی فارسیی ئەبوالقاسمی پایەند، چاپی تاران لاپەرە (٨٤)
(٣) جاوان نووسینی دوکتور مصطفا جەواد چاپی کوری زانیاری لاپەرە (٢٨)
(٤) ئەلئەخبار الطیوالی ئەبوحەنیفەی دینەوەری وەرگێراوی فارسیی صادقی نەشئەت چاپی ئاران لاپەرە (٢٧ ـ ٢٨ ـ ٨٤).
(٥) کارنامەی ئەردەشیری پاپەکان نووسینی دوکتور فەرەوەشی لاپەرە (٥١) ئەم دەقەی نامەکە بەڵگەیێکی زۆر بەهێزە لەسەر ئەوەی کە (ماد)ەکان لەدەورانی دامەزرانی ساسانیشا فەرمانرەواییەکی بچوکیان هەبووە دژی ساسانی راپەریوە
(٦) ئەلئەخبار الطیوال لاپەرە ٩٣ ـ ١٠٨
(٧) فەرهەنگی جوغرافیایی ئیرانی رەزم ئارا (١/٥٠)
(٨) ئەلکامیلی ئیبن الئەثیر (٩/١٩٣)
(٩) ئەلکامیل (٩/٢٤٩)
(١٠) ئەلکامیلی (٩/٣٩٠)
(١١) جاوانی دوکتور مصطفا جەواد لاپەرە (٤٤)
(١٢) هەمان سەرچاوە لاپەرە.
(١٣) فەرهەنگی جوغرافیایی ئیران، رەزم ئارا (١/پیتی ج)
(١٤) ئەلکامیل (١١/١٠٥)
(١٥) فەرهەنکی دیهخودا پیتی (ج)، هەروا لە زمانی ئیصابەی ئیبن حەجەری عەسقەلانییەوە.

# جاوان :

جميل الروژ بيانى

اين عاشت هذه العشيرة؟ وماذا حلّ بها؟ وهل كان اسمها (جاڤان) ام (گاوان)؟

لقد حدثنا الدكتور مصطفى جواد (رحمه الله) عن هذه العشيرة وامرائها وادبائها ورجالها المشاهير فى مقال قيّم، القاه كمحاضرة فى «المجمع العلمي العراقي» عام ١٩٥٦ م. فطبع فى مجلة المجمع العراقي العربية، ثم ترجم الى اللغة الكردية بعنوان (كاوان) ونشر فى رسالة منفردة.

كان الدكتور قد شرح فى هذا المقال حالة هذه العشيرة فى الاراضي الواقعة بين خانقين والفرات الاوسط وبيّن فيه انها استطاعت بالاشتراك مع عشيرة (اسد) العربية تأسيس مدينة (الحلة).

ولكن فات الدكتور ان يشير الى ان هذه العشيرة أقامت فى (جوانرو) امداً طويلا وان اسم (جاوان رو) نشأ من وجودها فيها، كما انه فاته ان يشير الى ان اسم (جاوان) تغير بعد سقوط بغداد وتقوّض اركان الخلافة العباسية بحملة (هولاكو - الى (جاف).

ومع انه اشار الى انفضاض هذه العشيرة بعد النكبة واحتمال اندماجها بالعشائر العربية فى الفرات الاوسط لكنه فاته التفكير فى ان هذه العشيرة عادت الى كردستان، وان عشيرة (الجاف) التي يظهر لها اسم فى التاريخ قبل حدوث الحرب بين الدولتين العثمانية - الصفوية ان هى الا (جاوان) القديمة.

وفاته كذلك ان يشير الى ان لهذه العشيرة بقايا غير نازحة من موطنها الاصلي فى الجبال حوالي قمة (دماوند).

اننا فى هذا المقال عالجنا بعض هذه النواقص وصححنا خطأين فى مقال المرحوم الدكتور.



# مرۆڤی چاخی بەستەڵەك

دوكتور جەماڵ رەشید ئەحمەد
كولیجی ئاداب /زانكۆی بەغدا

## پێشەكی:

یەكێك لەو گیروگرفتانەی مێژووی كولتوری مرۆڤی كۆن ـە گشتی و مێژووی كولتوری كۆنی ولاتی كوردەواری بە تیمتی، كەمێ لێكۆڵینەوەی لەسەر كراوە. ئەمە وەنەبێت هۆی كەم تەرخەمي هاونیشتمانانی ئەو ولاتانەو كەم ژمارەیی مێژوونوسانی بێت، بەڵكو بابەتەكە یەكسەر پەیوەندی بە چەند زانستێكی تری یاریدەدەری گرنگە هەیە وەكو ئەنثروپولوژیاو جیولوجیاو ئەركیولوجیاو مورفولوجیا (علم التشریح)... هتد، وە بەبێ ئەنجامی لێكۆڵینەوەی ئەو بوارانە ناتوانرێت بیروباوەڕێكی زانستانەی تەواو دەربارەی مێژووی سەردەمە سەرەتاییەكانی ولاتێك وە یا دەربارەی مرۆڤی چەرخی كۆن و پلەكانی كولتوری ئەو مرۆڤە بكرێت بە سنوور.

ئەمرۆ بە پێی (منطق) دەتوانرێت تیۆرییەكی مێژوویی بكرێت بە پاڵپشت، كە لەسەر تەنها بناغەیێكی ئەركیولوجی دامەزرابێت بە بێ ئەوەی لێكۆڵینەوەیێكی جیولوجی یا ئەنثروپولوژی تەواوی بۆ كرابێت، بەڵام ئەم جۆرە باسانە هەردەم و بە تێپەربوونی رۆژگارو بە پێی ئەو لێكۆڵینەوە هەمە جۆرانەی نوێ دەوڵەمەندترو پتەوتر دەبێت و ساڵ بە ساڵ هەڵس وكەوتی مێژوویی ڕوونتر دەبێتەوە و لە بواری زانست دا جێی خۆی دەگرێتەوە.

مەبەستی سەرەكی ئەم باسە روون كردنەوەی ژیانی سەرەتایی مرۆڤە لە كوردستان دا، بەڵام بە بێ دابەش كردنێكی زۆر، خوێنەری بەرێز هەست بەوە دەكات، كە سەرەتای لێكۆڵینەوەكە باسێكی گشتی چاخی بەستەڵەك لە جیهان دا دەكات، پاشان ژیانی سەرەتایی لە ولاتی كوردەواریدا شی دەكاتەوە. بە ئاواتم ئەم باسە هاوبەشی روون كردنەوەی لایەكی ئەو ژیانە كۆنە بكات و لە ئەنجامەكانی سوود وەربگیرێت.

## ژیانی سەرەتایی سەرزەمین

بە گشتی مێـژووی ژیـان لەسـەر رووی زەمین دا بە چەنـد مەلـوێنـێـك سالّ دا تێـپەریـوە، بەلاّم ژیـانی مرۆڤ بە تایبەتی تەنها بەشێکی دواییی کورتی ئەم ماوە درێژەی مەلوێنەها سالّی ژیـانی سەر رووی زەمینی گرتـوّتـەوە، ئەو بەشـەش دەکـەوێتـە چاخی سێیەم و چوارەمی تەمەنی زەمین کە بە لاتینی ترتسیر (Tertiary) و کواتیریز (Quaterrary) پێدەگوترێن. لەلای پسپورانی جیولوجیا چاخی چوارەم دابەش کراوەتەوە دوو بەش:

١ ـ چەرخـی پلایـستــوسین PLeistocene ، کە پتـر لە نیـو مەلـوێن سالّ دەوامی کردووە چوار ماوەی بەستـەلّـەکی لێرووی داوەو لەم باسەدا لێیان دەکوڵینەوەو، ئەو دەستکردانەو پاشماوانەی مرۆڤی ئەم چەرخە بوونەتە بەلّگەیێك، کە بزانرێت مرۆڤ لەم جۆرە مەرجـەی سروشت ژیـانێکی سەرەتایی هەبووەو پەیوەندی فسـیـولـوجی ئەم مرۆڤـە لەگـەلّ مرۆڤی نوێدا یەکێکـە لەو گیروگرفتانەی زانست و کە ئەمەیان مەبەستی باسەکەمان نییە.

٢ ـ هەروەهـا چەرخـی چوارەم ئەو پلەیـەیـە، کە دوایـین گەرمـایی پاش ماوەی چوارەمی چاخی بەستـەلّـەك پەیـدابـووەو مرۆڤـی نوێو هوشیـار لەو سەردەمـەدا ژیـاوەو بە هولـوسین HoLocene نیـوداوە. بەپـێـی ئەو پاشـمـاوانـەی مرۆڤ، کە دەگەرێنەوە چەرخی بەردینی کۆن و لەلایەن شوێنەوار ناسانەوە بە چەرخی (پـالیـولیث) ناسـراوە، سەردەمـەکانیان لەگەلّ چەرخی پلایستوسین دا یەك دەگرنەوە. وادەرکەوتووە چاخی پلایستوسین، کە نوێتـرین بەشی مێـژووی زەویـیـە، چاخی گۆرینی بەتێژی ئاووهەوا بووەو، لە نیوەی باکوری خرکەی (گۆی) زەوی پلەی گەرمـایی بەلای کەمـەوە چوار جار هاتـوّتـە خوارەوە، وشکـە سەرمـایێـك لەو ناوچـانـەوە بەرەو باشـوور هاتووەو زەوی توشی بەستـەلّـەك بووەو لە ئاوروپـادا، بەپێی لێکـۆلّینـەوەی جیولوجی دەرکەوتوە، سێ سەردەمی گەرمایی ئەم چوار جار بەستەلّەکەی جیـاکـردوّتـەوە، کەچی لە ئەمـریکـا بەلّگـەی چوارەم سەردەمی گەرمایی دۆزراوەتەوە.

بەلای هەنـدێ کەسـەوە، ئەم وشکـە سـەرمـایـە نەگـەیشتۆتە خوارووی کەرتەی ئاسیاو ئافریقا، بەلاّم لەو کاتەدا، کە چاخی بەستـەلّـەك هەمـوو سەرووی ئاسیـاو گشت ئاوروپـاو ئەمریکای باکـوری گرتبـوّوە، لەم ناوچـانەی خوارووداسەردەمی بارانێکی توندوتیژ بووە.[١] ئەو پێشنیارانەی پروفیسور زیونر[٢] کردبووی، دەربـارەی دابـەش کردنی چاخی بەستـەلّـەك بە چوار پلەوە بەم جورەی خوارەوە، لەلایـەن هەنـدێ مێـژوونـووسـانـەوە[٣] بە سەرچاوەیێکی باوەرپێکراو دانراوە:

ـ پلەی بەستەلّەکی یەکەم، نزیکەی پێش ٦٠٠,٠٠٠ سالّ رووی داوە.

ـ پلەی بەستەلّەکی دووهەم، نزیکەی پێش ٥٠٠,٠٠٠ سالّ رووی داوە.

ـ پلەی بەستەلّەکی سێهەم، نزیکەی پێش ٢٥٠,٠٠٠ سالّ رووی داوە.

ـ پلەی بەستەلّەکی چوارەم، نزیکەی پێش ١٢٠,٠٠٠ سالّ رووی داوە

پێش ٢٠/٠٠٠ سالّ پ.ز ئەم پلەی بەستـەلّـەکـەی چوارەم کۆتایی هاتووە.

بەشێوەیێکی گشتی ئەم چوار پلەیەی چاخی بەستەلّەك لەلای پسپورانی جیولوجیا نێوی تایبەتیان بۆ نیشان کراوەو کاتەکانیشیان هەر هەمان دەم دەگرنەوە، بەلاّم لە ئەمریکادا ئەو پلانە بە نێوی ناوچەیی نێودارن و لەکوردیدا دەتوانرێت هەر دوو کۆمەلّە نێو، بەکاربهێنرێت بەم جۆرەی خوارەوون:

| لە ئاوروپادا | لە ئەمریکادا |
| --- | --- |
| ١ ـ پلەی گونتز Gunz | جیرسیان Jerseyan |
| ٢ ـ پلەی میندل Mindel | کەنسان Kansan |
| ٣ ـ پلەی ریس Riss | ئیلینویان ILinoian |
| ٤ ـ پلەی ڤورم Wurm | ویسکونسین Wisconsin |

هەنـدێ جاریش ئەم پلانـە بە شێوەی یەکـەم و دووهـەم و سێیەم و چوارەم دەبینرێت بەلاّم هەر پلەیەکیش چەند بەشێکی ناوچەیی هەیە، کە لێرەدا مەبەستی باسەکەمان نییە.[٤]



...ی ئەوهەوا لە سەردەمی بلایستوسین دا

...یی سەرهەڵدانی سەردەمی بلایستوسین نیو وەیا سی ...سەر چواری ئەو کاتەی خایاندووە، کە سەردەمەکە خۆی پێدا تێ‌پەڕیوە. ئەوەی ئەم سەردەمە لە سەردەمانی دی جیادەکاتەوە ...ەیە و بلاوتیکی زۆری بووە، ئەگەرچی لێ‌کۆڵینەوە نوێیەکانی ...ەو پیشان دەدەن، کەوا ماوەی سەهۆڵ بەندانیشی ...ەوەیت، لەگەڵ نێزیک بوونەوەی کۆتایی هاتنی ئەم ...سەردەمە، زەوی ڕووی لە ساردبوونەوە کردووە، نزم بوونەوەی ...ی لە هەردوو تەوەری باکوورو باشووردا، لە کۆتایی‌دا ...ئەوروپاو ئاسیاو ئەمریکای باکووردا گرتەوە[٥] ئەم سەهۆڵ ...بەندەکە کارێکی زۆری کردۆتە سەر ڕووەك و گیاندارانی سەر ...خرکەی زەوی هەروا کاری کردۆتە سەر گۆڕینی ڕێچکەی ...ڕووبارەکان و پەیدابوونی گۆمان و لێواری زەریایان، بۆیە زۆر لە گیانداران ڕوویان لە شوێنانی تر کردو مەڵبەندی خۆیان جێ‌هێشت، لە هێندێك جاردا وای‌لێ‌هات هێندێك جۆرە ڕووەك و گیاندار بە یەکجاری لە نێو بچن. دیاردەی کەم بوونەوەی قەوارەی ڕووبارو گۆم و زەریایان بووە هۆی زیادبوونی کێشی سەهۆڵ لەسەر ڕووی زەوی‌داو کەم بوونی کێش لەنێو ...ی ئۆکیانۆسەکان داو ئەمەش کاریگەرێکی تەواوی کردە سەر پێوەندی نێوان وشکانی‌و تەرایی زەریاکان و ناوچەی باراناوی بەرەو هێڵی نێوەراستی خرکەی زەوی گوازرایەوەو ئەو شوێنانەی جاران دەشت و بیابان بوون بە دەشتێکی بەپیتی ئاووهەوای ...ێنك و پڕ لە ڕووەك گۆڕا.

زۆر لە زانایانی ئەرکیۆلۆجیا لەوانەی، کە لە کەرەستەی هەڵ‌کەندراوی ڕووەك و گیاندارانی سەردەمانی کۆن دەکۆڵنەوە، چەرخی پلایستوسین دابەش دەکەنە سەر سێ کات:-

١ - سەردەمی پلایستوسین نزم

٢ - سەردەمی پلایستوسین نێوەڕاست

٣ - سەردەمی پلایستوسین بەرز

ئەو ماوەی، کە سەردەمی پلایستوسینی نزم گرتبوویە خۆی ماوەی هەرە زۆری ئەو ماوەیەی گرتبۆوە، کە هەر سێ سەردەم تێکرا بڕیویانەو بردوویانەتە، سەر، قۆناخی هەرە زووی بڕێتی بووە لە سەردەمی ڤیلافرانشیان، کە دوو ملیون ساڵ لەمەوبەر دەستی پێ‌کردووەو لە دەوروبەری ٧٠٠,٠٠٠ وەیا ملیون ساڵێك پێش ئێستە بە واتا لەپێش دەست پێ‌کردنی سەردەمی گونتزی سەهۆڵ بەندانەوە کۆتایی پێ‌هاتووە. وای بۆ دەچن، کەوا سەردەمی پلایستوسین نزم لە نێوەڕاستی سەهۆڵ بەندانی یەکەم دا، کە کەوتۆتە نێوان سەردەمی (گونتزو میندل)ەوە لە دەوروبەری پێش ٥٠٠,٠٠٠ تا ٩٠٠,٠٠٠ ساڵ کۆتایی پێ‌هاتبێت. هەروا بەو ئاڵ وگۆڕە بنچینەیەوە پێوەستە؛ کە لە جیهانی گیاندارانی ئەو ساوە ڕوویداوەو بە تایبەتی لە ئەوروپادا.

بەڵام سەردەمی پلایستوسین نێوەڕاست لە سەرەتای سەردەمی میندلی سەهۆڵ بەندانەوە دەستی پێ‌کردووە، تا کۆتایی سەردەمی ریسی سەهۆڵی بووەو ئەو ماوەیەی نێوەڕاستی سەهۆڵی مەزنی دووەمی گرتۆتەوە، کە کەوتبۆ نێوان سەردەمی میندل و سەردەمی ریسی سەهۆڵی، بەم پێیە ساڵانی ٥٠٠,٠٠٠ تا ١٥٠,٠٠٠ی گرتۆتەوە.

لە کۆتایی‌دا سەردەمی پلایستوسینی بەرز لە سەرەتای ماوەی ناونجی سەهۆڵی سێیەم، کە کەوتبۆ نێوان سەردەمی ریس و سەردەمی ڤۆرمی سەهۆڵی گرتبۆوە، بەم پێیە لە ساڵانی ١٥٠,٠٠٠ تا دەوروبەری ١٠,٠٠٠ ڕابردووی گرتۆتەوە، لە هێندێك بەشی خرکەی زەوی‌دا چەند جۆرە گیاندارو ڕووەکی تایبەت بەم سەردەمەوە تا ١٠ هەزاران ساڵ لەمەوبەر مابۆوە. سەبارەت بە کوردستان و سەرووی میزۆپۆتامیاو قەفقاسیاو ناوچەکانی زاگروس و توروس جۆری سروشت و مەرجی ژیان

جیاوازی‌یێکی نەبووە لەگەڵ ئەو بارە گشتی‌یەی جیهان بێ‌گومان ئەم جۆرە ئاوو هەوایە لە چەرخە کۆنەکان دا یەکاویەك بەم شێوەیە نەبووە، پاشان لە نێوەڕاستی سەردەمی پلیستوسیندا، کە ئەمیش کۆنترین مێژووە بۆ دەست نیشان کردنی سەرەتای جۆری مرۆڤ، ڕووداوەکانی سروشت جیاوازی یێکی زۆری نەبووە لەگەڵ ڕووداوەکانی ئێستادا، بەڵام لە کۆتایی چاخی سەهۆڵ بەندانی دوایی‌دا کە ئەویش سەردەمێکە نزیکەی ١٠,٠٠٠ ساڵی خایاندووەو دەشت و بیابانەکانی ئەو وڵاتانەی کە ئاوروپایی‌یەکان بە نێوی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست نێویان دەبەن بەرەو وشك بوون دەڕۆیشت لەگەڵ ئەمەش دا ناوچە شاخاوی‌یەکان و دۆڵەکانی ئەم هەرێمە دارستانێك و لەوەرگایێك و هەوایێکی فێنکی پاراستبوو واتە ئەو ناوچانە مەرجێکی زیاتری تێدا هەبووە، کە بۆ ژیانی مرۆڤی کۆن دەستی داوە، ئەگەر پیشەی (ڕاوکردن)مان بە یەکەمین هۆی ژیان وەرگرتبێت بە تایەتی لە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس و البزر، کە کەوتوونەتە باشووری دەریای قەزوین هەموو شاخەکانی کوردستان بە گشتی و زۆربەی ناوچەکانی ئەرمینیاو ئاسیای بچوك، کە زنجیرە شاخەکانی باکوری لەگەڵ شاخی تۆروس دا لە سەردەمی (میوسین)دا پەیدابوون، بەڵام ئەو زنجیرە شاخانە کە لە باشوردان بەرەو کوردستانی عیراق درێژدەبنەوە، لە سەردەمی «پلیوسین»دا شێوەی خۆیانیان وەرگرتووە، ئەوجا گردو تەپۆڵکەکانی خوارووی ئەم هەرێمە پەیوەندی‌یان لەگەڵ سەردەمی (پلایستوسین)دا هەیە.

لە کۆتایی ئەم پێکهاتووە جیۆلۆجی و جوگرافیەدا دەتوانرێت سروشتی ناوچەکە هەندێ ڕوون بکرێتەوەو، بگووترێت، کە شاخەکانی کوردستان تەنها دوو چاخی سەهۆڵینی بە سەردا هاتووە، وەکو دیارە ئەم ناوچەیە لە کۆتایی چاخی سەهۆڵ بەندانی چوارەم دا سەردەمێکی باراناوی کورتی بە سەردا هاتوە.

ئەم سەردەمە دەکەوێتە نێوان هەزارەی شەشەم تا چوارەمی‌پێش زایین، کاتێك کە ڕووبارەکان لافاوێکیان هێناوە بە توندو تیژی‌یێك و بە شێوەیێك، کە ڕێرەوی ڕووباری دیجلەو فوراتی دەست نیشان کردوە بۆ ساڵانی داهاتوو. ئەم لافاوە پارچەیێکی ئەستووری لە قوڕولیتاوی بە جێ‌هێشتوە کە لەم زەوی‌یەدا دۆزراوەتەوە بە تایبەتی ناوچە جۆر بە جۆرەکانی وڵاتی میزوپوتامیا. .

ئەم ڕووداوە بە لای ئەو گەلانەی کە لە گشت وولاتی میزوپوتامیاو دەورو بەری نیشتەجێ بوون زۆر گرنگ بووە، چونکە بوو بە هۆی ڕوخاندنی زۆربەی شوێنەواری شارستانیەتی ئەو وڵاتانە.

هەروەها سومەری‌یەکان سەردەمی دەسەڵات داریی پاشایانیان دابەش کردبووە سەر دووبەش، بەشی یەکەمیان سەردەمی پێش لافاو، دوهەمیان دوای لافاوو ژیانی ئادەمیزاد لای سامی‌یەکان کرابووەوە دوو بەش، ژیانی پێش لافاوو ژیانی دوای لافاو کارەساتی ئەم لافاوە لە داستانی گەلگامیش دا دیسان نوسراوەو باس کراوە.

ئاشور پانیپال کە دوایین پاشای ئیمپراتوریەتی ئاشورەکان بووە، ئەم داستانەی وەرگێراوەتە سەر زمانی ئاشوری و بەرچەقەی‌کردووە، چونکە هەواڵی ئەم ڕووداوە هەر لە هەزارەی دووی پێش زایین زۆر باوبووەو لە وێژەی نەتەوە خاوەن کولتوورە کۆنەکان دا بیرباوەڕی تازەبوونی ژیان و شارستانیەتی سەرڕووی زەوی‌و دوبارە پەیدابوونی ئادەمیزاد پاش لافاوە مەزنەکەی چەسپاندوە. هەروەها ئەم ڕووداوە ناوبراوە بووە بە بناغەی هەر سێ ئاینە جیهانیەکانی ناسراو (جوو و فەلەو ئیسلام).

لەبەر ئەم هۆیانە تا پێش یەك دوو سەدە لەمەوبەر بیروباوەڕی یەکسانی مرۆڤایەتی شتێکی باوەڕپێ‌نەکراو بوو چونکە وا دەزانرا کە چەند جۆرێك مرۆڤایەتی‌و شارستانیەتی جیاواز لە سەر ڕووی زەمین پەیدا بووە، بەڵام پێشکەوتنی زانیاری‌و تەکنیك و فراوان بوونی ئاسۆی زانیاری جوگرافی‌و ئەرکیولۆژی‌و پەیدابوونی پەیوەندی نێوان میللەتانی پێشکەوتوو و پاشکەوتووی ئەم جیهانە توانی ئەو پەردەیە لابەرێت لە سەر ڕاستی کارەساتی جیهان و یاسا گشتی‌یەکانی مێژووو گواستنەوەی مرۆڤایەتی لە چەرخەکانی پێش مێژووەوە بۆ مێژوو لە سەر بناغەی زنجیرەیێکی تێکەڵاوی بە یەك بەستراوەوە ئەم یەکیەتی‌یە لەو ڕۆژەوە

پێشکەوتبوو. کەوا مرۆڤ بۆ یەکەم جار لە سەرەتای ژیانی‌دا دەستی‌کردووە بە بەرهەم هێنان و کارکردن و زانینی نهێنی‌یەکانی پەیوەندی نێوان ئامێری کارەکانی‌و هۆی بەرهەم هێنان لەگەڵ هێزی بەرهەم هێنان دا کە لە بەرچاوی بووەو هەروەها چۆن کە تەکنیکی زاڵ ببێت بە سەریان دا.

بێگومان مرۆڤی بالآرێک (بە تایبەتی مرۆڤی زاناو بەهۆش دەرکەوت تەنها دوای تێپەڕبوونی کاتێکی دوورو درێژ بە سەر ئەو مرۆڤە کە لە ئادەمیزادی دەکردو هەندێ لە پاشماوەکانی لە لایەن زانایانی ئەرکیولوژی دۆزرایەوە کە ئەم کەرەستەو پاشماوەیە هەر یارمەتی‌دان بۆ گەڕان بە دوای شوێنەواری پێش کەوتن کە مرۆڤ ئەو کاتە پێ گەیشتبوو تا مرۆڤ لە گەڵی‌دا وای لێ‌هاتبوو کە بووبووە گیانێکی بە هۆش و بیردار.

کولتور دابەش نەکرا بە سەر هەرێمەکان دا، کە هەر یەکەیان رەوشتێکی تایبەی هەبێت و تیادا کۆببێتەوە یەك لە تەنیشت ئەوی‌تردا، تەنها پلە بە پلە نەبێت، کە بوویبوو بە رەوشتێکی تایبەتی بۆ ژیانی مرۆڤان (خەڵك) لە مێژوودا، چونکە هەر کۆمەڵێکی مرۆڤ لە دەوروبەرێکی تایبەتی‌دا دەستی‌کردوە بە پێشکەوتن کە لەگەڵ مەرجەکانی ژیانی‌دا رێ‌دەکەوێت و بە پێی چەند هۆیێکی کاتی‌و شوێنەواری ئەو جێگایانەی کرد بە تایبەندی خۆی. بێجگە لەوەی کە لەگەڵ هەست و ئەخلاقی‌دا، رێ دەکەوت.

تێك شکانی یەکیەتی کولتوررو بەش بوونی بە چەند لقێك ئەنجامێکی (منطقی)یە بۆ ئەو بەرزیەی ژیان کە مرۆڤ هێنایەدی. لێرەدابەپێویستی دەزانم، کە بڵێم، ئەم لێ‌کوڵینەوەیە باوەش ناکات بەو بابەتانە کە پەیوەندیان لەنێوان (علم التشریح)و پاشماوەی کۆنترین ئادەمیزاددا هەیە، کە کۆمەڵێکیان لە (جاوە)و لە باکوری چین دۆزراوەتەوە (واتە مرۆڤی پیتیکانثروپس ئیریکتس، پیتیکانثروپس روبستس، پیتیکانثروپس موجیوکرنتس) کە دەتوانن هاوبەشی لەگەڵ مرۆڤایەتی (هۆمو Homo) بکەن، هەرچەندە هێشتا نەبوون بە پۆلێك لە بەشی (سابینز Sapins) لە شێوەی (هومو ئیریکتس واتە مرۆڤی بالآرێك) کە سەردەمەکەی بە پێی لێ‌کۆڵینەوەی ورد دەگەڕێتەوە چاخی (پلایستوسین)ی نێوەڕاست. ئەمڕۆ هێندە بایەخ بە هاوڕەگی نێوان ئەم ئادەمیزادە کۆنە لەگەڵ مرۆڤی (نیاندرتال)ی پێشکەوتوودا لەلایەن کۆمەڵایەتی‌و خزمایەتی نادرێت، لە لایەکەوە، وە لەلایەکی‌ترەوە نێوان ئەم و مرۆڤێکی‌تری نوێ (هۆموساپینز)، کە نازانرێت یەکەم جار لە کوێ پەیدابووەو چۆن لە جیهان دا بڵاوبۆتەوە و پاشان زاڵ بۆتە سەر مرۆڤە کۆنەکەو نەی‌هێشتووە لەسەر رووی زەمین بمێنێت، بەڵکو گرنگ لێرەدا زانین و ناسینی پەیوەندی‌یەکانی کولتوررو تەکنولوجیایە نێوان ئەم کۆمەڵە مرۆڤایەتیانەو رۆڵیان (دەوریان) لە گۆڕینی دیاردەکانی سروشت بۆ بەرژەوەندی ژیانی خۆیان. .

سەبارەت بەو هەرێمە، کە مەبەستی ئەم لێ‌کۆڵینەوەیە، تاکو ئێستا ئەو هەوڵانە، کە بە هەڵ کەندنی چەند شوێنێك کراون زۆر شتیان روون نەکردۆتەوە سەبارەت بە مرۆڤی سەردەمی نیوان سەهۆڵ بەندانەکان ،تەنها ئەوە نەبێت کە پەیوەندی بە چەرخی جیۆلۆجی چوارەمەوە هەیە واتە بە چەرخی پالیولیتی نێوەڕاست و بەرزو چەرخی موستیری کە بە نێوی (نیاندرتال) بە نێوبانگەو، مەرجی ژیانی ئەو مرۆڤەی تیادا ئامادە بووە، چونکە هەرێمەکە لەم سەردەمەدا بە جەنگەڵێکی زۆر داپۆشرابوو و زۆربەی شوێنی شینایی بووە، بۆتە هۆی کۆبوونەوەی هەمە چەشنە گیان لەبەرێك و ئاژەڵ لەگەڵ بەردەوام بوونی سەردەمی باران بارینی دوایین کە هەر بەردەوام بووە تا چەند هەزار ساڵێك پێش پەیدابوونی نوسین لەلایەن سۆمەری‌یەکانەوە.

پاشماوەی ئەم مرۆڤە لە هەشت شوێنەواردا دۆزراوەتەوە لەم هەرێمەدا [ئەگەر پاشماوەی ئەو ئێسکە دارزاوانەی بەگومان لێ‌کراو کە لە ئەشکەوتی کورین لە تورکیا بخەینە سەر] وەکو ناوچەی ئەزیوتیە، کەرمەل (ئەشکەوتی بطن وأسحول)، شوکبە، قەفزە (لە فەلەسطین)، بێهستون (لە ئێران) شانەدەر (لە کوردستانی عێراق)دا. رەنگە ویوی ئەم پاشماوانە ئەوە دەردەخات کە ئەو سەردەمانەی ئەم شێوە مرۆڤە جیاوازن لە یەکتری بەڵام ئامێرەکانی کارکردنیان (ادوات العمل)و شمەکی

بەکار هێنانیان لە یەك دەکات بەلای زۆریان هەر وەکو (رالف سولیکی) لە سالانی ١٩٥٦ و ١٩٥٧ دا روونی کردەوەو ئەو پەیوەندییانەی دۆزییەوە لە نێوان فەلەسطین و کوردستان دا هەر چۆنێك بێت، بەگشتی مرۆڤ بە هەموو جۆرە جیاوزییەکانییەوە، لەو سەردەمانەدا بەردی بەکار هێناوە بۆ دورست کردنی ئامێرەکانی، هەروەها ئاگری بەکار هێناوە بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی خۆیو دۆزینەوەی خەلووزی دارین لە زروفێك هیچ گومان ناهێلێ کە چەند شێوەیێك لە پێشرەوی مرۆڤ ئاگری بەکارهێناوە بەپێی ئەو دۆزراوانەی ئەشکەوتی خوارووی (چوکوتین) کە پاشماوەی (سینا نثروپوس - مرۆڤی چین) تیادا ژیابوو لە تەنیشت پاشماوەی ئاگردانین دا.

ئادەمیزاد ئاگری بەکارهێناوە بۆ هەزاران سال پێش ئەوەی فێری داگرساندنی بێت، لەبەر ئەوە دوور نییە کە مرۆڤی نیاندرتالی ئەو ناوچانە کە لە سەرەوە باس کرا (تورکیا، کوردستان، فلسطین) ئەم شتەیان بەکارهێنا بێت، بەتایبەتی لە زنجیرە چیاکانی خوارووی کوردستان و ژووروی میزوپوتامیا کە تا ئێستا ئاگری بن زەوی تیادا گلپەی دێت.

بێ گومان ئامێرە بەردینەکان گرینگییێکی زۆریان هەیە لە ژیانی مرۆڤ دا لەبەر ئەوە ئەم سەردەمەیان ناو نا چاخی بەردین، ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کە مرۆڤ تەور و چەکوشی لە دار دروست کراوی بەکار نەهێنابێت. بێجگە لە جەوال، کە لە پێستی گیان لەبەر دروست دەکران و جل وبەرگی خۆیان کە لە کەول دەیان دوری و هەروەها کێرد (چەقۆ)ی بەردین بە تیژکردنی ئەمانە هەموو زەمان و کات توانی بیان فەوتێنێت تەنها ئەوانەی دوایین نەبێت کە بەردو ئێسك دەگرێتەوە. سێ جۆر ئامێر هەبووە، ئەو بەردانە کە لووس دەکرین و ئەو ئامێرانە کە بە کەرت کردن و رێك خستنی، یان بە کون کردن دورست دەکرێن. لەگەل پێش کەوتنی پیشەسازی ئامێر دورست کردن و چەك پەیداکردن رێگەی راوکردنیش بەرەو پێش کەوتن چوو و گۆشت زیاتر بەکارهێنرا لە خواردنی رۆژانەدا دەربارەی کۆنترین شێوەی ئامێری کاری مرۆڤ لە چاخی بەردین دا ولز دەلێت: «لە پاشماوەکانی کۆنترین مرۆڤ، کە شێوەی مەیمونی هەبووە، چەند ئامێریکی بەردینی کارەو دەتوانرێت بە دەست هەل بگیرێت و، سەردەمیشیان دەگەرێتەوە پێش چاخە بەستەلەکان بەلام لە سەردەمەکانی نێوان چاخەکان ژیانیان بەردەوام بووە.»[٦]

بناغەی بیروباوەری وێلز لە راستیدا دەگەرێتەوە ئەنجامی ئەو ئامێرو پاشماوانەی، کە لە دورگەکانی جاوەو ترینیل دۆزراونەتەوە و دەگەرێنەوە سەردەمێك پەیوەندی بە چاخی جیولوجی (پلیوسین)ی دواییەوە هەیە. لەو ناوچانەدا سەرەرای ئەم پاشماوانە، هەندێ کەللەی ئادەمیزاد، کە نیزیکی شێوەی کەللەی مەیمونی شەمپانزییە پتر لە هی مرۆڤ، دۆزراونەتەوە بەلام پێ ولاقیان هی مرۆڤە. ئەمانە بە نێوی (پیتیکانتروپوس ئیروکتوس) واتە (مروڤی مەیمون) نێوبانگیان دەرکردوە. ئەم جۆرە مرۆڤە توانی لە سەرەتاو نێوەراستی چەرخی (پلیوسین)دا بژیت، لەگەل ئەمەش دا رەوشتی مرۆڤانە لە دەوری سێیەمی ئەم چەرخەدا (تیرتسیر (Tertiary) لەم گیان لەبەرەدا پەیدا بووە.

ئەمرۆ گومان لەوەدا نەماوە، کە مروڤی (جاوە) شێوەی مرۆڤێك بووە، مرۆڤی نوێی ئەم سەردەمە دەگەرێتەوە سەر هەمان شێوە و ئەم شێوە مرۆڤەش لە راستیدا لەلایەن دوکتورێکی هولەندی بە نێوی ئیوجین دیبوا لە جاوە سالی ١٨٩١ز دۆزرابۆوە، پاشان چەند جاریدی هەر لە جاوە ئەم شێوە مرۆڤە دۆزراوەتەوە، پاشان هەر هەمان شێوە لە چین نزیك (پیکین) لە ئافریقا (ولاتی تەنزانیا)و لە ئاوروپا (هایدلبێرگ)و شوینانیدی دۆزرایەوەو هەر بە (مرۆڤی جاوە یا Homo erectus واتە مرۆڤی بالارێك) نێو بانگی دەرکرد. تەمەنی ئەم هەلکەندراوانە دەگەرێتەوە پێش ماوەیێك نێوان ملوێنێك تا ٥٠٠ هەزار سال. پێوەندی ئەم مرۆڤە لەگەل مرۆڤی (لە مەیمون چوو) یان مرۆڤی هوشیار بابەتێکە دان وسەندنی زۆر لەسەرەو پسپوران تاوەکو ئەمرۆ دەربارەی رێك نەکەوتوون[٧] بەلام ئەوەی گرنگە لەم بابەتە سەرەرای ئەو شتومەکانەی ئەم مرۆڤە هەندێك شوێنەواری

ئاگـردان بۆ خواردن لێ نان و خۆگـەرم کردنـەوە بە دیـار کەوتووە بەتایبەتی ئەمە لە (چین)دا پتر بەرچاو کەوتووە.

پاش ماوەیێك، لە دەوری چوارەم دا (کواتیریز (Quaternary) مرۆڤێـك لەسـەر زەمین دا پەیـدابـووە، لە نێـوەراستی چەرخی پلایسـتۆسین دا ژیـاوە، بە (پیتیکـانتـروپـوس) نێودار بووەو[8] لە ناوچـە هەمـە جۆرەکـانی سەر زەمین ژیـاوە. سەرەڕای ئەوەی فێـری ڕاوکـردن و ئاژەڵ کوشتن و ئێسکی گیـان لەبـەرەکـان و بەتـایبـەت ئێسکی (مـامـوث) لەم سەردەمـانەوە بەجێ‌ماوە بەڵام ئێـسکی خاوەنـەکـانیـان بەدەگمـەن دیـار دەبێت، جۆری ئەم مرۆڤانەش لەناوچووەو بەپێی تەرتیبی لەشیان لە مەیمون دەچن.

هەروەکو ڕالف ل. بیلز، هاری هویجز دەڵێن کەوا:

«هێشتـا چەنـد گیـروگـرفتێـك و پرۆسێسێـك هەیـە وڕوون نەکراونەتەوەو بڕیاریان لەسەر نەدراوە دەربارەی پێوەندی (مرۆڤی نە مەیمون چوو) لەگەڵ (مرۆڤی هۆشیاردا)»[9]. هەروەکو لەمەو بەر دیسـان دەست بۆ هەمان بیروباوەڕ نیشان کرا.

(نیاندرتال - مرۆڤی چاخی بەستەڵەك)

نیاندرتال کۆمەڵێك مرۆڤ بوون، کە تایبەتیەتی ئەنترۆپولۆژی و شێوەی ژیانیان لە مرۆڤی ئەمرۆ جیای کردبونەوە. ئەم جۆرە مرۆڤە لە زۆر ناوچەکانی ئاورووپاو دەوروبەری زەریای سپی نێوە ڕاست دا لە سەردەمی پلایستوسین دا ژیاوە.

نیاندرتال بە نێو ئەو دۆڵە، کە بە نیاندر لە ئەڵمانیادا ناسراوە نێوبانگی دەرکردووەو کەوتۆتە سەرووی جۆگای دوسێل Dussel کە لە ڕووباری ڕاین دەبێتەوەو بە هەفت میل لە ڕۆژهەڵاتی شاری (دوسیلدۆرف)ەوەیە،[10] لەوێ‌دا لە ئەشکەوتی فیلدهوفەر ساڵی ١٨٥٦ کرێکارەکان پاشماوەی ئێسکی چەند مرۆڤێکیان دۆزیوەو چوارده پارچە لەو ئێسکانە بە دەست پرۆفیسوری ریال شوێلێ لە (ئێلبیـرفیلد)دا مامـوستـا جوهـان کارل فولـرۆت بە ساغی مابونـەتـەوە، پاشـان ئەوەی مابـۆوە لەلایەن دەزگەی ئەنترۆپۆلۆژی ئەڵـمـانـی German anthropologist Herman Schaaffhausen کۆکـراونـەتـەوەو هەوڵ دراوە بە شێـوەیێکی ورد لێیان بکۆڵرێتەوەو لەگـەڵ ئێـسکـی مرۆڤی نوێ‌دا بەراورد بکـرێن و لەو کاتـەوە پاشماوەی ئەم مرۆڤە بەردەوام لەلایەن شوێنەوارەکان بایەخی پێ‌دراوە.

لەبەر ئەو مەبەستەی ڕابوردو دوابەدوای ئەو پاشماوانەی مرۆڤی دۆڵی نیاندر ساڵی ١٨٨٦ ئێسکی دوو لەشی هەمان شێوە مرۆڤ لە ئەشکەوتی سپای Spy لە بەلجیکادا دوزرایەوە ئەوەی پێوەندی بە ئامێری بەردینی داتاشراو و ئێسکی گیان لەبەرو هەندێ شتی‌تر هەیـە، دەتـوانـرێت بینـە بەڵگـەیێك بۆ ئەو بیردۆزانە، کە دەڵێن گینسی (جنس)ی ئەم مرۆڤە لەناوچووە.

پاش پتـر لە سەدەیێـك و دوای هەڵـکـەنـدنێکی فراوانی شوێنـەواران بۆ دۆزینـەوەی پلەکـانی پێش کەوتنی مرۆڤـایـەتی و لێ‌کۆڵینەوەی سەردەمەکانی ژیانی پێش مێژووی، زانیاری‌یێکی زۆر کەوتە بەردەست دەربارەی مرۆڤی نیاندرتال و ناوچەکانیان و شێوەی سەردەمی ژیانیان و ڕەگەزیان و لەناوچوونیان.

سەرەتـای ژیـانی مرۆڤی نیـاندرتال هێشتا زۆر ڕوون نی‌یە، لەوانەیە لە دەوری کۆمەڵگایێکی مرۆڤایەتی ئاورویا ژیابن، کە سەردەمیـان دەگـەڕێتـەوە چاخی بەستەڵەکی ریـس Riss GLacial Stage نزیکە ١٠٠ هەزار - ١٥٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر.[11]

هەرچـۆنێـك بێت بەڵگـەی ئەم سەردەمـە، کە پاشمـاوەی مرۆڤەکانی لە فەرەنسادا لە پێنج - شەش شوێن دا، بە ڕێگای چەنـد ئێسکێك و کەللەو هەنـدێـك ئامێـری بەردین لە هەنـدێ وڵاتـانی‌دی‌دا دۆزراونـەتـەوە. ئەم نمونانە، بەپێی شی‌کردنەوەی مورفـولـۆژی (علم التشـریـح) توانـرا شێوەی کەللەی سەریان و دانیـان و ئێسکیـان لە کۆمـەڵـە مرۆڤێکی کۆنتر (هومۆئیریکتوس) جیـابکـرێنـەوە و لەگـەڵ پلەی نزیکایەتییان بە سیفات و ڕەوشتی مرۆڤی نوێ (هوموساپینس). ئەو پارچە ئێسکانە زۆر بە سوود بوون لە ڕوون کردنـەوەی شێـوەی لەش و بینـای تایبـەتی تەنی نیـانـدرتـال و زۆر خزمـەتی ڕاستی‌یێکی کرد، ئەویش ئەوەیە کە سیمـای مرۆڤ لە سـەردەمـی بارانی مەزن دا Great Interglacial age سیمـایێکی نیـانـدرتـالی تایبـەتی بە ئاشکرا دەرنەخستووە، لەبەر ئەمە پسپۆرو لێ‌کۆڵەرەوان ئەو نمونانەیان بە نمونەی مرۆڤی هومـوسـاپینس زانیوەو کات و شوێنی ڕەگەزی نیاندرتال هەروەکو وتـرا هێشتـا نازانـرێت. ناسینـەوەی کۆمـەڵی مرۆڤی نیاندرتال، یەکـەم جار، پێـوەنـدی بە سەردەمی دواتـرین چەرخی بارانی

ژمارەیێکی زۆر لە پاشماوەی ئێسکی ئەم مرۆڤانە بە ساغی دۆزراونەتەوەو دەگەڕێنەوە پلەی ڤۆرم نێوان نزیکەی ۸۵,۰۰۰ - ۳۵,۰۰۰ ساڵ هەرچی پەیوەندی بە شێوەی ژیانی ئەم مرۆڤانەوە بێت، چ بە ئامێرەوەو چ بە پەیکەری ئێسکیەوە (الهیکل العظمی) لە جیهان دا نیشانەی ژیان و گوزەرانیەتی لە پلەیێکی ئەرکیولوجی‌دا، کە بە (موستیری) نێوبانگە..

ڕێک خستنی کولتوری ئەم مرۆڤە دەتوانرێت بە دۆزینەوەی مەڵبەنـدی ژیانیان بزانرێت و، لەم بوارەدا سەدەها بەڵگە کەوتـوتـەدەست چ بە بەردی داتـاشـراو و چ بە ئەشکەوتی دەست لێدراو، بەڵام هەندێک جار ئەم بەڵگانە لە شوێنێکی کراوەداو لە دەرەوەی ئەشکەوتەکان دا دۆزراونەتەوەو هەندێک لەم بەردانە کون کراون و بەشێک لەم کونانە بە شێوەیێکی زانایانە هەڵ کەندراون و هەندێک جاریش شوێنی بچوکی وا بینراوە تەنها مرۆڤی پێش مێژوو توانیبێتی بەکاری هێنابێت بۆ ماوەیێکی کورت. لە هەمان کات دا شوێنی وا بەرچاو کەوتووە، کە مەڵبەندێکی دائمی ئەو مرۆڤانە بووبێت. لەگەڵ ئەوەش دا هەندێک جار دیاردەی ژیانی ئەم مرۆڤانە لەم شوێنانەدا دیار نی‌یە، بەڵام ڕێک خستنی بەردەکان و ڕێو شوێن و دروست کردنی پەناگاهـ... هتد نیشانەی هەبوونی ئەو مرۆڤانەن.

لە لایەکی ترەوە بەکارهێنانێکی فراوانی ئاگر نیشانەکەی لەو سنوورەدا بەدیار دەکەوێت، ئوجاغ و پاشماوەی ئاگردانیان هێشتا هەر لەبەر چاوەو پاشماوەی ڕەژوو بە ئاشکرا تێی‌دا دیارە شان بەشان ئێسکی گیان لەبەرەکان کە ڕاویان کردوون.

لێرەدا پێویستە بگوترێت، کەوا بە ئاشکرا جیاوازی نێوان ئەو گروپانەی مرۆڤی کۆنی گۆشت خۆرو سەوزەخۆر (ڕووەک خۆر) دیـارەو، هەنـدێکیـان گۆشتی هەمە جۆری گیـان لەبەریـان بەکارهێناوە وەکو هی ئاسک، ئەسپەکێوی‌و مەرو بزنەکێوی‌و بەرازو گاو مانگا.. هتد. لەپاڵ ئەمانەش دا تەنانەت ئێسکی ماسی‌و باڵداریش خوراوە. هەندێک لەم بابەتانە لەگەڵ پاشماوەی ڕەژوو، گەنم و دانەوێڵە لە هەمان جێ پارێزراون.

هەرچۆنێک بێت پلەی توانای تەکنولوجی مرۆڤانی نیاندرتال



**بەراوردێک لەنێوان مرۆڤی کرومانیون و نیاندرتالی کلاسیک**

ئاوڕوپاوە هەیە کە بە ئینگلیزی بە نێوی Last IntergLaciaL age ناسراوە. ئەم کۆمەڵە مرۆڤە چەناگەیان، دانیان و بەشەکانی ئێسکانیان و لەژێر ڕۆشنایی پاشماوەکانیان کە لەو پێنج شەش شوێنەدا وەکو چیکوسلوڤاکیاو ئەلمانیاو فرەنساو ئیتالیا دۆزراوەتەوەودا دەرکەوتووە، کە ڕەگە مرۆڤێکی تایبەتین. پاشان هەندێک نمونەی ئەم کۆمەڵە بە ڕوونی سیفاتی لەشیانی دەرخست، کە کەللەیێک (جمجمە) تایبەتی‌و تەنێکی ئێسکی (هیکل عظمی) کورت و چەماو و پان و ئێسکێکی ڕوویی پان بەرەونـاوەوە چووبوو لەگەڵ بۆشایی‌یێک، کە جوانی‌یێکی دابۆوە ئەو ڕووە، لەلایەکی ترەوە دەستی ئەم کۆمەڵە مرۆڤە درێژ بووەو ئەم دیاردەیە جیایان دەکاتەوە لە کۆمەڵی مرۆڤی نوێ.

ـە شێـوەیەکی باش لە کردەوە بەردینـەکـانیـان دیـارە، هەروەهـا ئێسکیش وەکو چەك و ئامێر لەلایەن ئەمانەوە بەکارهاتووە، بەڵام تەر بۆ ئەو مەبەستە کەمتر بەکارهاتووە، تەنها وەکو چەك نەبێت بۆ ڕوەی فیل، کە لە ئەلمانیادا پاشماوەی بەجێماوە.

ئەلایەکی‌ترەوە، تەکنولوجیای بەردین، بەتایبەتی لە هەوڵدان ـۆ ئامادەکـردنی هەنـدێك پارچەداری ڕمی‌کراو بۆ ئەوەی بەردی ئەشترلوی پێ‌ببەسترێت، لەو مەڵبەندانەی نیاندرتال دا بە دیار ئەکـەوێت. ئامێـری بەردین هەمـە جۆرەو ژمـارەیێکی سەرەکی هەیە، کە دەبنە نمونەی ئامێری ئەو سەردەمە، چ بەشێوەو چ بە ئەرەستـە. زۆربـەی ئەمـانـە بە سێت (دەرزەن) جیـاواز جیـاواز دۆزراونەتەوەو هەندێك لە پسپۆرانی ئەرکۆلۆژیا وای‌لێ‌دەکۆڵنەوە کە ئەم پاشمـاوانـەی شێـوە ئامێـرانـە ڕووی ژیـانی هەر لایێکی تیـمتی ڕوون دەکاتەوەو لە یەك جیایان دەکاتەوە.

ئەوجا بێینەوە سەر هەندێك خوو‌وڕەوشتی مرۆڤی کۆن سەبارەت بە مردن و بیـروبـاوەڕی دەربـارەی ئەنجـامی ئەو دیـاردە ئاڵۆزە. شـاردنەوەی مردوو لای نیاندرتالەکان شتێکی سەیر نەبووە بەڵکو داب و نەریتێکی بنەڕەتی بووە چ بە گۆڕکردنی تەنها مرۆڤێك یا کۆمـەڵێـك مرۆڤ پێکـەوە، بۆ ئەوەی لەگـەڵ خێـزان و منـداڵیان پێـکـەوە بن. ئەو گۆڕانـە بە کۆمـەڵ بێـت یا تاك و بە هەر جورێکیش بێت بەڕاستی شێـوەی ژیـانی ئایینی ئەو کەسـانـە پیشـان دەدات، کە خاوەنی ئەو مەڵبەندانە بوون.

لەلایێکی تـرەوە ئێسکی ئادەمـزاد، کە بە شێـوەیێکی کەم و بەشکـاوی لەوگـۆڕانـە دیـارە، ناتـوانێت بێێتـە بەڵگـە بۆ ئەوەی بگـوتـرێت، نیـانـدرتـال گۆشتی ئادەمـزادی وەکـو خۆراك بەکـارهینـابێت. هەنـدێ جاریش ئێسکی گیـان لەبـەریش وەکو ورچ و بزن و هتد لەگەڵ ئێسکی ئادەمزادا لەیەن دەچن، کە بە شێوەی ڕەوشتی ئایینی نێژراون. شیوەیێکی گشتی ناتوانین زۆر لە (باوەڕو) ئایینی نیـانـدرتـال بگـەین، هەرچـەنـدە هەنـدێـك دیکـورات و وێنـەی لەسـەر بەردی (مـانگـەنیـزی، ئۆکسیـدی‌و ئاسینین)ی کێشاوە، کە هەستی ئایینی پیشان دەدات.

زۆرترین ژمارەی پاشماوەی ئەم مرۆڤە (هەندێ جاریش بە نیاندرتالی کلاسیك نێو دەبرێت) لە ڕۆژئاواو ڕۆژئاوای خوارووی ئاورووپا دۆزراوەتەوە، لەوانە بەلجیکاو فەرەنساو ئەلمانیاو ئیسپانیاو ئیتـالیـا، ئا لەم شوێنـانەدا نیاندرتالێکی بەهێزی خڕو کورتەباڵاو ئێسك پتەو ژیاوە، ئەم مرۆڤە (صندوق)ی مێشکی لە کەللەی‌دا فراوان و پان بوون و هەروەها کەللەی پشی بە ئێسکێکی پتەوو پشـت پان دروسـت بووە، و ڕووی خڕو گەورە و ئێـسکـێـگـی کوڵمی بچـوك بەبێ بۆشـاییـەك لە ژێـری‌دا کە بتـوانێت ئەو چرچیانە فراوان بکات و هەروەها دندانیکی پان و مەلاشوییکی پان لەگـەڵ سنگێکی پان و بربـڕەی پشتی کورت و ماسـوڵکـەی پان و چوڵـمـەیـەکی (عظم الترقـوة) درێژ و باریك و بازوییکی بەهێـزو ڕانـێـکـی چەمـاو و پێـیـەك وە دەسـتێکی پان بەڵام پەنجەکانیان کورت بووە. قوڵێك و قاچێکی وا لە کۆتاییان دا پان دەبوون و پاژنەیێکی ئێسك درێژ تەواو دەبوو. وا دەزانرێت کە ئەم مرۆڤـە لە ڕۆیشتن دا شل بووەو ئەژنـۆی چەمـاوەو بینـای ئێسکی گیانی سنورر بۆ شێوەی ڕویشتنی داناوە.

بەو جۆرە ئەو مرۆڤانە، کە بە نێوی (هومو نیاندرتال Homo Neander thalsis ناسـراون، لە سـاڵـی ١٨٦٤ز هەسـت بە هەبـوونیـان کرا پاش ئەوەی، کە ئێسکـەکـانیـان لە ئەشکـەوتی فیلدهوفەر دوزرایەوە. (لە راستیش دا دوو ئێسکە پەیکەر لەمانە زووتر لە سەدەی نوزدەهەم دا دوزرابوّوە بەڵام هێشتا نەزانرابوو کە هی نیاندرتالن). ئیستا ئاشکرا بووە کەوا ئەم مرۆڤانە نمونەی زنجیرە مرۆڤێکن لە (صنف)ی ئادەمیزاد، و دەتوانرێت بگوترێت کەوا صنفێکی وون بوون، پاشان صنفی (هوموساپینس Homo Sapins پەیدابووە.

پاشمـاوەی ئێسکـە پەیکـەری مرۆڤی نیـانـدرتـال لە وڵاتـانی نێـوەڕاستی ئاورووپـادا (چیکـوسلوفـاکیا، هونگاریا)و ڕۆژهەڵاتی خوارووی ئاورووپـادا (یـوگـوسـلافیـا، یونان) لە قرم و خوارووی ڕوسیـاو خوارووی ڕۆژئـاوای ئاسیـا (فـەلـەستین و کوردستـانی عیراق)و هەروەها لە نیوەڕاستی ئاسیا (ئوزبەکستان)و سەرووی ئافریکا (مەغریب و شوینانی‌تر) دوزراوەتەوە.

ئێسکـە پەیکـەرەکـانی ڕۆژهـەڵاتی ئاورووپـاو ڕۆژئاوای ئاسیا (بەتایبەتی هی کوردستان) بەبێ گومان هی مرۆڤی نیاندرتالن. بەڵام هەنـدێـك لەوانی‌تر سروشت و شێـوەی ژیـان هەنـدێـك

گۆرانی لە گیانیان دا پەیداکردوە.

نیاندرتال هەندێ جار وا دەردەکەوێت کە جیاوازە لە هەمان مرۆڤ لە خوارووی ڕوژهەلاتی ئاورووپا دابووەو ئەمە وەکو ئەنجامێك بۆ ئەو توندوتیژیەی چاخی بەستەڵەکی دوایین دەگەڕێتەوە تا کاری کردۆتە سەر شەپولی چینەکانی لەنێو کۆمەڵەکانیان داو سەر ڕەوشتی سروشتیان دا، ئەم دیاردەیانە لە چەند سەردەمێك دا هەر دوو بارە کراون.

لە راستیدا هەڵبژاردنی زۆربەی جنس وەیا جنسیکی زۆری هەڵبژێراو ئەنجامی مەرجە گاریگەرەکانی ژینگە (بیئە)و تەنانەت کاری کردوتە سەر گۆڕینە مورفولۆژیەکان (بینای لەش و) سەر و مان و نەمانی گروپە مرۆڤایەتیەکان. ئەم کارەساتە لە کۆمەڵگای نیاندرتالە پێشکەوتووەکان دا progressive Neanderthal بە ڕوونی دیارە.

چاك بوونەوەی ئاووهەوا لە هەمە جۆرە ماوەکانی چاخی کۆن لەگەڵ پێشگرو پاشگریان دا. لەبەر ئەمەو پاش لێکدانەوەیێکی ئەرکیولوجی ئەو پێشکەوتنە کولتوریەی مرۆڤی نیاندرتال زۆر چاك بە دیار کەوت.

ئەو بابەتە گرنگە، کە پێویستە لێرەدا باس بکرێت ئەوەیە، کە پەیدابوونی مرۆڤی نیاندرتال لەسەر زەمین دا یەکێکە لە دیاردە گرنگەکانی ئەم سروشتە بەلام بەداخەوە تاکو ئیستا ئەو پەیدا بوونەو پاشان لە نێوچوونی ئەم جۆرە مرۆڤە یەکێکە لەو گیروگرفتانە، کە بە ڕوونی بڕیاری لەسەر نەدراوە. لەلایێکی ترەوە ئەو جیاوازیە کولتوریەی هەمە جۆرە مەڵبەندو چینەکانی ژینگەی ئەم مرۆڤە بەگشتی ئەو تاریکیەی دروست کردوە. لە ئاورووپادا نزیکەی هەموو ئەشکەوتەکان و مەڵبەندە بەردینەکان، کە مرۆڤ تیایان دا گوزەرانی کردوە، تەمەنیان دەگەڕێنەوە نێوان کۆتایی چەرخی موستیری (یا سەردەمی ژیانی نیاندرتال) لەگەڵ چەرخی پالیولیثی بەرزدا (چاتیلپرونی Chatelperronian یا سەرەتای ئەو ریگنەشی Aurignacian). دواترین نیشتە جێی ئەم مرۆڤە هەردەم وا دەرکەوێت، کە پێوەندی لەگەڵ مرۆڤی (کرومانیون Cro - Magneon) دا هەیە، کە نوێترین تیپی (هوموساپینس Homo Sapiens) ە لە ڕۆژئاوای ئاورووپادا ئەم مرۆڤەی پالیولیثی بەرزە دەگەڕێتەوە سالانی ٣٢,٠٠٠ پ.ز کەچی لە نێوەڕاستی ئاورووپادا (پولەندەو هونگاریا) پێوەندی بە ٣٨,٠٠٠ سال لەپێش زایینەوە هەیەو لە ڕۆژئاوای ئاسیادا هەمان سەردەم دەگەڕێتەوە. بەپێی (رادیومەتریك) نوێترین مەڵبەندی موستیری لە خوارووی ڕۆژئاوای فەرەنسادا دۆزراوەتەوە دەگەڕێتەوە ٣٣,٠٠٠ سال پ.ز.

لە کۆتایی ئەو سەردەمانەی پێشوو ئەنجامی چاك بوونەوەی ئاووهەوا بەرزبوونەوەی پلەی گەرمایی یە نێوان ٣٧,٠٠٠ سال ـ ٣٥,٠٠٠ سال پ.ز وکاری کردۆتە سەر کولتوری کەرەستەیی ئادەمیزاد.

هەرچۆنێك بێت هێشتا تاریکییێکی زۆر هەیە بۆ بڕیاردان لەسەر نیشان کردنی سەردەمی ئەو گۆڕینە کۆمەلایەتی و مادی یەی ژیانی مرۆڤ و پرۆسێسی و ون بوونی نیاندرتال و ڕێگاچۆل کردنی بۆ مرۆڤی کرومانیون.

**کوردستان لە چاخی ژیانی سەرەتایی دا**

لێکۆڵینەوە جیولوجیەکان لە چیاکانی کوردستان دا، کە تیپی (ئەلپ)ی ئاورووپاییان هەیە، پەیدابوونیان بەرەبەرە بووە. بۆ وێنە زنجیرە چیاکانی باکوور لەگەڵ چیاکانی توروس دا لە چەرخی (میوسین)دا بە دیار کەوتووە، کەچی ئەوانەی باشوور، کە دەکەوێتە کوردستانی عیراقەوە، لە چەرخی (پلیوسین)دا جێ خۆی گرتۆتەوە. بەلام چیا نزمەکان و تەپۆلکەو گردو دەشتە خوارووەکان لە چەرخی (پلایستوسین)دا بەدیار کەوتوون. ئەم بیروباوەڕانەش ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەن، کە لە چینەکانی زەوی و بەردی چیاکانی کوردستان دا کراوە.[12] لەمەوە ئەوە دیار دەبێت، کەمەرجەکانی پرۆسێسی جیولوجی چیاو ڕووبارو دوڵ و دەشتەکانی ئەم ناوچەیە لە چەرخی (پلایستوسین)دا شێوەی خۆی گرتۆتەوە، واتە ئەم شێوە سروشتەی نیشتمانی کورد پێش نزیکەی نیو مەلوێن سال هەرهەمان وێنەی هەبووەو لە کۆتایی پلەی چوارەمی چاخی بەستەڵەك دا ئەم دیاردەیە جێگیربووە.

هەر وەکو زانراوە ئەم چاخە جیولوجی یەی پلایستوسین لەگە چاخی ئەرکیولوجی (پالیولیث) هاودەمە[13]، ئەم چاخەش

ئیمەش کراوەتە سێ ماوەی ناسەرەکی: چەرخی بەردینی نزم، ناوەڕاست و بەرز. ئەم جۆرە دابەش کردنەش سێ کولتووری سەرەکی سەرەکی لە ئاورووپادا پێك هێناوە:

١ - کولتوری ئابیڤیلی Abbevilian

٢ - کولتوری کلاکتونی Clactonian

٣ - کولتوری ئاشولی Acheulian

چەرخی بەردینی نزم، کە لە پلەی بەستەڵەکی یەکەم تا ناوەڕاستی پلەی بەستەڵەکی سێیەم (نزیکەی ٣٠٠,٠٠٠ - ٤٠٠,٠٠٠) ساڵی خایاندووە بەداخەوە لە کوردستان دا تاکو ئێستا پاشماوەی کولتووری ئەم چەرخە نەدۆزراوەتەوە، کە ساختەکەی بە کولتووری (تەوری دەستی) بەناو بانگەو کۆمەڵی مرۆڤی ئەم سەردەمە بە شێوەی (لەمەیمون چوو) بەکارهاتووە. بەتوانەکترین پلەی چەرخی بەردینی ناوەڕاست پلەی (موستیری Mousterian)ە، لە نێوەراستی پلەی بەستەڵەکی سێیەمەوە تاکۆتایی پلەی بەستەڵەکی چوارەمی خایاندووەو باشترین نمونەی مرۆڤی ئەم پلەیە مرۆڤی (نیاندرتال)ە، کە لە کوردستان دا یێجگە لە پاشماوەو دەزگاکانیان، هەروەها ئێسکی تەنیان بەتەواوی دۆزراوەتەوەو لەلایەن چەند پسپۆڕێك، بەتایبەتی شوێنەوارزانی ئەمەریکی رالف سولیکی بە تەواوی

لێ کۆڵراوەتەوە. ئەم پاشماوەیە هی سەردەمێکە کە مەبەستی سەرەکی ئەم باسەی ئێمەیە.[١٤]

ئەو پشکنینانە، کە لە سەدەی بیستەمەدا لە نێوەڕاستی ئاسیاو خۆرئاوای رۆژهەڵاتی ئاورووپاو ئەوجا لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا (بە تایبەتی لە کوردستان دا)، وای دەرپات کردەوە، کە مرۆڤی نیاندرتال تەنها گینسێکی مرۆڤ نەبووە بە دۆڵی نیاندر پێوەست بێت لە ئەلمانیادا یان تەنها گەیشتبێتە فەرنسا، بەڵکو ئەو جۆرە کۆمەڵە مرۆڤە بە زۆر شوێنی جیهان دا بڵاوبووبووەوە، بەڵام مەرجی جوگرافیی و ئاووهەوا کارێکی زۆری کردۆتە سەر پێشکەوتنی فسیولۆژیو بیرکردنەوەی، لەبەر ئەوە هەندێك جیاوازی کەوتۆتە شێوەو رەفتاریان. دەتوانرێت ئەم دیاردەیە بەرچاوبکەوێت لە جیاوازی نێوان فۆرمەکانی پەیکەری ئێسکی

دۆزراونەتەوە و، بەراوورد بکرێت لەگەڵ ئەوانەی ناوچەی زەریای سپی نێوەڕاست و لەمانەش نیاندرتالی کوردستان، کە بە (پارێزەر Cincervative ناسراوەو هەروەها ئەوانەی فەلەستین، کە لەمان هەندێك جیاوازن و بە (پێشکەوتوتر progresive)[١٥]

بەنێوبانگن ئەم جیاوازییە گومانی خستبۆوە نێو پێوەندی مرۆڤی نیاندرتال بەگشتی لەگەڵ مرۆڤی چەرخی بەردینی نوێدا هەرچونێك بێت دەتوانرێت بگوترێت، کە نیاندرتالی کوردستان (بە شێوە کلاسیکییەکەی) پێوەندی بە چەرخی بەردینی کۆن دا (پالیولیث) هەبووەو دووریش نییە ئەم مرۆڤە بە چەند پلەیەك دا تێپەڕیوەو لەبەر مانەوەی ئەو شێوە ئاووهەوایەی سەردەمی خۆی لە هەندێك ناوچەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا، رەگی نەپساوە، بەڵام بەپێی مەرجەکانی پێشکەوتنی فسیولوجی هەندێك گۆڕینی هاتۆتە سەر بینای لەشی و پەیوەندی کیشی لەگەڵ مرۆڤی هۆشیاردا لە چەرخی بەردینی نوێدا پەیداکردووە. ئەمە بە پێچەوانەی هاورەگی خۆی لە ئاورووپادا کە بە بۆنەی داپۆشینی بەستەڵەکی دوایین دا، هەر بە یەکجاری فەوتاوە.

زاناکان وای بۆچوون، کە نیاندرتال وەکو هوموساپینس لە چەند ناوچەیەك دا، دوور بوون لە زەویی سەهۆڵاوی، بەڵام ئەوانەی، کە لە زەویی سەهۆڵاویدا ژیاون بە نیاندرتالی کلاسیك ناسراون پێشکەوتنیان زۆر خاو بووە بەڵکو هەر فەوتاون، یان ژیانی رۆژانەیان زۆر قورس بووە. لەبەر ئەمەیە لەنێوان ئەمان و مرۆڤی پلەی دوایینی چەرخی پالیولیث سەردەمێکی بچراو بەدیار دەکەوێت.

لە راستیدا سەرەتای هەڵ کۆڵینەکان و پشکنینەکانی چیاکانی کوردستان بە دەست زانای شوێنەوار خاتوو دوروثی أ. گارود لە ساڵانی (١٩٢٧ - ١٩٢٨ز)دا بووە پاش ئەوەی لە پاشماوەکانی مرۆڤی کۆنی وڵاتی فەلەستین کۆڵیوەتەوە، هەمان شێوە پاشماوەی لە ئەشکەوتەکانی (هەزارمێردو زەرزی)دا لە کوردستان دا دۆزیوە، کە پێوەندی بە چەرخی (پالیولیث)ەوە هەیە.[١٦] ئەشکەوتی زەرزی زۆر گەورە نییەو کەوتۆتە ناوچەی

تەنی ئەم مرۆڤە، کە لە نیوەڕاست و ڕۆژئاوای ئاوروپا سورداش ئەو ،ئامێرانەی، کە خاتوو گارود دۆزیبوونیەوە، لە شێوەیەکە بە نێوی مایکرولیت بە نێوبانگە کاتیشی دەگەڕێتەوە چەرخی میزولیت (چەرخی بەردینی نێوەڕاست).

ئەشکەوتی هەزارمێرد دەکەوێتە ڕۆژئاوای سولەیمانی بە (نزیکەی ١٣کم)و زۆر کەس چووە بۆ دیتینی وەکو (سپایزەر و کەسانی‌تر) کە لەڕاستی‌دا وەکو گارود بایەخیان پێ‌نەداوە. ئەم ئەشکەوتە لە نێوخۆی‌دا لە شەش ئەشکەوت پێك هاتووە، لە ساڵی (١٩٢٨ز)دا دەست کرا بە هەڵ کەندنیان و ئەو شتانە کەتێدا بینراوەتەوە دەگەڕێنەوە پێش نزیکەی ٥٠ هەزار ساڵ لەمەوبەرو هەرهەمان شێوەش لە ئەشکەوتی شانەدەردا دۆزرایەوە، بەڵام نە لە ئەشکەوتی زەرزی‌و نە لە هەزارمێردا ئێسکی مرۆڤی ئەو سەردەمانە نەدۆزراوەتەوە.

هەروەها لە ناوچەکانی کوردنشینی ئێران دا چەند شوێنێك لێ‌کۆڵراوتەوە ساڵی ١٩٤٩ز وەکو ئەشکەوتی (تەنگی پابدا) لە ناوچەی بەختیاری‌دا لەلایەن گریشمان شی‌کراوەتەوەو ئەو ئامێرانەی کە لێرەدا بەرچاو کەوتوون دەگەڕێنەوە نێوان سالانی ١٥,٠٠٠ و ١٠,٠٠٠ ساڵ پ:ز.[١٧]

پاش شەڕی جیهانی دووهەم پشکنینی شوێنەوارەکان هەندێك فراوانتر بووبوو بەتایبەتی لە کوردستانی خواروواو ئەم پشکنینانە لەمەودوا زۆربەی زۆری لەلایەن ئەرکیولوجە خۆماڵی‌یەکان دەکران و ساڵ بەساڵ پشکنینی بێگانەکان کەمتر دەبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا هەر نێوی گارود، برایدوود R.J. Braidwood و دوکتور رالف سولیکی و خێزانەکەی رۆزا سولیکی‌و چەند کەسانی‌تر وەکو بەنێو بانگترین شوێنەوار دەدرانە قەڵەم، هەزارمێردو زەرزی‌و شانەدەرو چەرمو وزاوی چەمی شانەدەر بە نێوی ئەوانەوە پێوەست بوون. ساڵی ١٩٤٩ز دوکتور ناجی الأصیل، کە سەرۆکی بەشی شوێنەواری عیراق بوو، توانی لە (بەردەپەلکە)، کە کەوتۆتە سەرووی ڕۆژهەلاتی چەمچەماڵەوە، چەند ئامێریکی بەردین، کە دەگەڕێنەوە چەرخی پالیولیث بدۆزێتەوە.[١٨] بەڵام ساڵی ١٩٥١ هەمان شوێن لەلایەن دوو ماموستای ئەمریکی کۆڵراوەتەوەو هەندێ پاشماوەی چەرخی موستیریان هی پێش ١٢٠,٠٠٠ ساڵ دۆزیوەنەوە. بێجگە لەم شوێنەش لە (کەریم شار)و لە (پەلەگەورە) ئەمریکی‌یەکان دەستیان کردبوو بشکنین، ئەوجا ساڵی ١٩٥٤ز گروپێکی ڕۆژهەلات ناسی ئەمریکی لەلایەن ئینستیوتی شوێنەوارناسی شیکاگۆ بە لێ‌کۆلینەوەی ناوچەکانی ڕووباری زاب دەست پی‌کرد، هێشتا پێش ئەمانیش دوکتور رالف سولیکی ساڵی ١٩٥١ دەستی کردبۆوە پشکنینی ئەشکەوتی شانەدەر کە تا شەستەکان هەر خەریکی بووە. ئەشکەوتی شانەدەر کەوتۆتە شاخەکانی برادوست بەسەر ڕووباری زێی گەورەدا دەڕوانێت و بە هەڵکەندنی ٤٥ پێ توانی دوکتور سولیکی چوار چینی نشینی مرۆڤی تێدا بەدی بکات و ئەم چینانەی بە پیتی ئینگلیزی ABCD ناو ناو چینی D قوڵترین جێ‌نشین بوو و ئەستوری نزیکەی ٢٨ پێ بووە. لەم شوێنەدا پاشماوەی خوڵەمێش (ژیلەمۆ)و ئاگردان و چەند ئامێرێکی بە ئێسك و بەرد دروست کراو، کە نیشانەی ژیانی مرۆڤی. چەرخی بەردینی نێوەڕاست بووە، بە ڕوونی بەدەرخست و هەروەها ئەو دەستگرو کونکەرانە، کە لەوێ‌دا دۆزرانەوە پەیوەندی‌یان لەگەڵ (کولتوری موستیری)دا هەیە. ئێسکەکانی گاو مەڕو بزن، لەو مەڵبەندەدا دەبنە بەڵگەی ئەوە، کە بزانین ئاوو هەوای ئەو سەردەمە فێنکی‌یێکی (مام ناوەندی) هەبووە. بە گشتی پاشماوەکانی ئەشکەوتی (هەزار مێرد)و شانەدەری D هاوچەشن و هاو جوری پاشماوەی کولتوری موستیری (بەردەپەلکە)ن ئەمانە لەهەمان کات دا هاوجۆرن لەگەڵ ئامێرەکانی ئەشکەوتی (گلی‌سور) لە شاخەکانی بێستون دا.

لەلایێکی‌ترەوە ئەو پاشماوانەی ئەشکەوتی زەرزی هەندێك جیاوازی‌یان هەیە لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا کە لە سەردەمی پالیولیتەوە ماون، هەروەها لەگەڵ ئەوانەش دا، کە لە برادوست و (شانەدەر C) دا دۆزراونەتەوە. ئەم کولتورە لەلایەن خاتوو گارود بە «کولتوری زەرزی» ناونراوە چونکە تێکنیکی دوورست کراوەکانی شێوەییکی تایبەتی خۆی هەیە. لێرەدا جۆرە

هەندێکیش دۆزراوەتەوە، کە بە چەشنی (نەتوفی - نطوف)ی بە ناوبانگە ئەو چەشنە بۆ یەکەم جار لە وڵاتی فەلەستین دا دۆزرابووەوە. پسپۆرەکان سەردەمی پاشماوەکانی زەرزی دەگەڕێننەوە بۆ کۆتایی پالیولیتی پاشین، کە سنووری کۆتایی لەگەڵ سەردەمی میزولیت دا نزیک دەبێتەوە (چەرخی بەردینی نێوەڕاست). وە لە بەرزترین چینەکانی زەرزی هەندێ پارچەی بەرد تاشراوی خڕو تیژکراو و سێ گۆشەیی بینراوەو تا ئێستا بە مۆرکی لێ کۆڵراوەتەوە، بەڵام پەیوەندی نێوان (پالیولیت و میزولیت)دا لەم کولتورەدا بە ڕوونی دیار نییە.

هەڵکەندراوەکانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست وا دەگەیەنن، کە کولتورەکانی سەردەمی پالیولیت بە هەمان پلەکانی پێشکەوتن و پەرەسەندن دا تێپەڕیوە. هەرچونێك بێت لە لایەکی ترەوە ئامێرەکانی ناوچەی (نەتوف) بەو ئامێرانە دەچن کە لە کوردستان و نێوەڕاستی ئێران دا دۆزرانەتەوەو، ئەمە دەمانگەیێنێتە ئەنجامێك، کە بڵێین، ئەو مرۆڤانەی ئەم ناوچە قۆناغە پەیوەندییان بەیەکتر بەستوەو تێکەڵاوی لە کولتوریان دا هەبووە، تەنانەت ئەو پەیوەندییە لەگەڵ نێوەڕاستی ئاسیاو هیندستانیش دا هەبووە. لەم سەردەمە دوورو درێژە کۆنەدا، مرۆڤ بە شپرزەیی ژیاوە، لە سەرەتادا کێوی بووە لەگەڵ ئەم ڕاستییەش دا مرۆڤ وەکو هەبوونێکی (کائن)ێکی جیاواز لە کولتووردا، پەیوەندی بچراوە لەیەکتری لەم هەرێمانەداو لەهەر یەکە لەم شوێنانەدا مەرجەکانی سروشت و ئاووهەوا سنووری بۆ ئەو هەبوونە داناوەو لە هەندی شوێن دا وەکو وڵاتی میسرو کوردستان و میزوپوتامیاو هیندستان دا ئەو مەرجانە بوونەتە هۆی پێشکەوتنی ئابووری‌و کومەلایەتی‌و فسیولوجی‌و پاشان دینی‌و سیاسی‌و لە بەرژەوەندی ئادەمیزاد بووە. لەبەر ئەمەیشە لەم وڵاتانەدا پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵ زۆر لە پێش شوێنانی‌تر لە جیهان دا بەدیدەکرێت.

بەم جۆرە دەتوانرێت بگوترێت پێشکەوتن بە گشتی لە ناوچەکانی هەمە جۆری جیهان دا لە یەك سەردەم دا نەبووە بەڵکو ئەو پێشکەوتنە لە هەندێ شوێن زووتر ڕوویداوەو کوردستان یەکێکە لەو شوێنانە. ناوچە بەرزەکان و شاخەکانی کوردستان، مەڵبەندی مرۆڤی ڕاوکەر بووە چونکە هەموو جۆرێ مەرجی ژیانی سەرەتایی تێداهەبووە و، ئەم ڕاستیەش بەدیتنی ئێسکی هەمە جۆری گیانلەبەری ئەو سەردەمە کۆنە لە هەڵکەندراوەکانی ئەو ئەشکەوتانە بەدی دەکرێت کە لەبەر بەفرو سەرما خزاونەتە نێویان.

بۆ دۆزینەوەی شوێنەواری ئەم جۆرە ژیانەی مرۆڤی بەردینی کۆن لە کوردستان دا، پسپوری ئەرکیولوجی بە نێوبانگ رالف سولیکی R.soLecki لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵی خۆیدا دەست دەکەن بە پشکنین، لە سێ مەڵبەندی ناوچەی شانەدەردا (لەسەر ڕووباری زێی گەورە ئەشکەوتی شانەدەر، گوندی شکێفت و زەوی چەمی شانەدەر، کە لە کۆتاییدا ئەنجامیکی بە سوودی دایەوە دەستیان و گرنگی‌یێکی زانستی هەبوو بۆ ئەرکیولوجیا بە گشتی.

لە کاتی هەڵ کەندنی ئەشکەوتی شانەدەردا ساڵانی ١٩٥١ - ١٩٥٣ز وا بۆ سولیکی دەرکەوت کە چینەکانی کولتوری (هەمە جۆری پلەکانی ژیانی مرۆڤی ئەو سەردەمە) جیاوازن لەیەکتری. لەڕاستیدا شانەدەر یەکێکە لەو ئەشکەوتە مەزنانەی کوردستان و هەموو مەرجی ژیانێکی ئاسودەیی تێدا هەبووە. ئەمڕۆ پانایی بەردەرگای ئەشکەوتەکە ٨٢ پێیە (نزیکەی ٢٠ مەتره)و بەرزایی دگاتە ٢٦ پێ (پێنج مەتر)و لە ناوەوە ئەشکەوتەکە ١٧٥ پێیە )نزیکەی ٤٠ مەترە) درێژەو بەرزایی دەکاتە ٤٥ پێ (نزیکەی ١٠مەتر) لە زەمینەکەی ئەمڕۆو لە کاتێك دا ئەو بەرزاییە دەگاتە ١٣٠ پێ (نزیکەی ٣٠مەترە) کتوپڕ میچەکەی لەگەڵ زەمینەکەی یەکتری دەگرنەوە. لە کاتی هەڵکەندنەوەدا ساڵی ١٩٦٠زدا دەرکەوت، لە کۆتایی ئەشکەوتەکەدا کونێك هەیە کە دەگاتە هۆڵێکی گەورەی دووهەم.

بەم جۆرە سولیکی دەستی‌کرد بە هەڵ کەندنی ئەم ئەشکەوتەو ئەو چینانەی سەردەمی ژیانی مرۆڤی تێدا بەم جۆرەی خوارەوە دابەش کرد:

١ - چینی A بەرزترین چینە لە ئەشکەوتەکەدا لە سەردەمی (نیولیث)ە

٢ - چینی B دەگەڕێتەوە سەردەمی میزولیث




**کەللە سەری مرۆڤی (لە مەیمون چوو)**

٣ ـ چینی C دەگەڕێتەوە سەردەمی درەنگی (کۆتایی) پالیولیت. رالف سولیکی نێوی ئەم سەردەمەی ناوە بە (برادۆست) بەنێوی ناوچەکەوە.

٤ ـ چینی D دەگەڕێتەوە نێوەڕاستی سەردەمی پالیولیت، واتە پلەی موستیری

پاش ئەم کارە مەزنەی سولیکی وادەرکەوت، کە ئەو ئامێرانەی سەردەمی پالیولیتی ئەشکەوتی شانەدەر پەیوەندی بەسەردەمی جیولوجی (پلایستوسین)ەوە هەیە.[19]

هەروەها دەرکەوت، کە چینەکانی ئەم ئەشکەوتە لە چەند سەردەمێکی جیاوازدا مەڵبەندی ژیانی مرۆڤ بووە بەبێ پسانەوەو لە نێوان ئەو شتانە، کە لەم مەڵبەندانەدا دۆزرانەوە، هەندێك ئامێری کار بووە وەکو کێردی بەردینی تیژکراو و چەکوشی دەستەدار، کە دەگەڕێنەوە سەردەمی میزولیث (شانەدەر چینی B هەروەها ئێسکی گیان لەبەر (وەکو مانگا، بزن و مەڕ)و پشتی کیسەڵ و پاشماوەی ئێسکی ماسی. ئەمانە هەموویان دەبنە بەڵگەیێك بۆ ئەوەی بتوانرێت بگوترێت، کە ئاووهەوای ئەو سەردەمانە لەم ناوچانەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا فێنك (معتدل) بووە. بەڵام لە هەمووی پتر سرنج ڕاکیشەرە دۆزینەوەی چەند ئێسکە پەیکەریکی (هیکل عظمي) مرۆڤی نیاندرتالەو لە چەند تەمەنێکی جیاوازدا ئەم دۆزینەوەیە زۆر گرنگە بەلای زانستی شوێنەوارییەوە چونکە چەند گیروگرفتێکی ئەرکیولوجی بەمەوە روون بۆوە.

لە ساڵی ١٩٥٣ز پەیکەری ئێسکی منداڵێك دۆزرایەوەو لە هەڵ کەندراوەکانی ساڵانی ١٩٥٦ ـ ١٩٥٧ کەللەو چەند پارچە ئێسکی سێ لاو دۆزرابۆوە. یەکەمیان باش پارێزرابوو و زۆر چاك شێوەی نیاندرتالی دەربڕیوە. ئێسکی ڕووی دەرپەڕیوەو ناوچاوانی نزم و سەری پان بووە، برۆکانیشی پۆقیبوونە دەرەوە. ئەم پاشماوانە لە سەرووی چینی چوارەمی (چینی موستیری ـ D) ئەشکەوتی شانەدەردا دۆزراونەتەوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەی سولیکی ئەم شێوە ئێسکە کەللانە لە (کۆمەڵی نیاندرتالی پارێزەرن Concervativ Neanderthal type) و جیاوازە لە (کۆمەڵی نیاندرتالی پێشکەوتوو progressive Neanderthal type) کە لە ئەشکەوتی کەرمەل لە فەلەستین دا دۆزراونەتەوە، بەڵام ئەمانە نزیکایەتی‌یان لەگەڵ ئەو کۆمەڵە هەیە، کە لە La Chapelle Aux Saints دۆزراونەتەوە.[21] ئەم وتەی سولیکییە ئەوە دەگەیەنی، کە مرۆڤی چاخی بەستەڵەك (نیاندرتال) لە کوردستان داو لە شاخەکانی زاگروس دا تیپی خۆی بۆ ماوەیێکی درێژ پاراستووە، کەچی ئەوەی ولاتانی رۆژهەڵاتی زەریای سپی نێوەڕاست تێکەڵاوی هەر دوو شێوەی نیاندرتال وهو ساپینسی تێدا دیارە، واتە ئەو گۆڕینە فسیۆلوجی‌یە لە تەنی مرۆڤ دا لەو شوێنانەدا زووتر ڕووی داوەو ماوەی ژیانی نیاندرتال لەوێدا کورتر بووەو مەرجی مانەوەی ئەم مرۆڤە لە ولاتی کوردەواریدا هەر بەردەوام بووە.

ئەم بیروباوەڕە تا پلەیێك لەگەڵ ڕاستیدا ڕێك ناکەوێت چونکە تیپی نیاندرتالی کوردستان، بە پێی کات، کۆنترە لەوەی فەلەستین نەك لەبەر زوروفی جوگرافی و ئاووهەوای هەمان چاخ، کە هەردووکیان تێیدا گوزەرانیان کردووە. پاشان شوێنی فەلەستین و کوردستان دەکەوێتە هەمان ناوچە، کە بەفر لە چاخی بەستەڵەك دا گرتبوویەوەو، ئەو ڕەوشتەی مرۆڤی کەرمەل، کە لە مرۆڤی هۆشیار نێزیکی دەکاتەوە، دەبێتە بەڵگەی ئەوەی بگوترێت کە کاتی ژیانی درەنگتر بووە تا ئەوەی شاخەکانی



ئێسکە پەیکەرێکی نیاندەرتال
کەرمەل ـ فەلەستین



دوو وێنەی داتاشراوی مرۆڤی نیاندەرتال

تورکیستان.

لەلایەکی ترەوە، پاش دۆزینەوەی ئیسکە نیاندرتالیەکان لە ساڵانی ١٩٥٦ ـ ١٩٥٧ز لە ئەشکەوتی شانەدەردا، سولیکی لە ساڵی ١٩٦١ز دەنووسێت کەوا ئامێرەکانی کار، کە لەگەڵ ئەم ئیسکانەی نیاندرتال دا دۆزرانەوە لە شانەدەردا زۆر نێزیکن بە تیپە لەگەڵ ئەوانەی فەلەستین دا، کە لە چەرخی لیڤالواز و موستیریە، بەڵام دەگەڕێنەوە کاتێکی درەنگتر لە پلەی دوایینی چەرخی لیڤالوازو موستیری (Levalloiso mousterian) لە کەرمل دا[٢٢].

بەپێی بیروباوەڕی سولیکی نیاندرتالی شانەدەر ئامێرێکی وای بەکارهێناوە، کە بە تیپ نوێتر بووە لە تیپی ئامێری کاری نیاندرتالی فەلەستین، هەرچەندە خۆی لە کاتێکی کۆنتردا ژیاوە. بەم جۆرە وادەردەکەوێت، کە سولیکی دەیەوێت بڵێت، کە مرۆڤی شانەدەر ئامێری پێشکەوتوو و تیکنولوجیایێکی بەرزتری بەکارهێناوە، تا دەگاتە بیروباوەڕێك و بڵێت، کە لە هەمان کات دا (واتە چەرخی موستیری) لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا دوو هەوای (مناخ) جیاواز هەبووە، ئەمیش دەبێت بە گومان وەربگیرێت.

هەروەها سولیکی دەڵێت «لە کاتی پێشکەوتنی ئامێری کاردا و گواستنەوەیان لە نێوەڕاستی پالیولیتەوە بۆ کۆتایی ئەم چەرخە لە شانەدەردا، پلەیێکی پساو هەیە (Hiatus) سولیکی وای‌دەبینێت، هۆی ئەم پسانەوەیە پەیدابوونی پلەیێکی سەرمایە و نیاندرتال لەو کاتەدا فەوتاوە، لە نێوان ٤٥,٠٠٠ ـ ٤٠,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر بووە، بەڵام ئەم بیروباوەڕەش ناتوانرێت وەکو ڕاستی‌یێك وەربگیرێت، چونکە ئەو پلەی سەرمایی‌یە بە هیچ جۆرێك نەگەیشتۆتە ناوچەکانی باشووری چیاکانی کوردستان و ئەو مرۆڤە بە سووکی دەیتوانی لەو سەرمایە ڕزگاری بێت. لەلایێکی ترەوە گیان لەبەرەکان بەردەوام بوون لە ژیان داو لەهەمان سەردەم داو لە زۆر ناوچەکانی جیهان دا، واتە ئاووهەوا نابێت بە هۆی سەرەکی فەوتاندنی مرۆڤ چونکە پلەی هۆشی بەرزترە لەو گیان لەبەرانە کە نەفەوتاون. پاشان کە گەرمایەك پەیدابووە مرۆڤ دووبارە گەڕاوەتەوە ناوچەی شانەدەرو لە هەمان ئەشکەوت دا جێگیر بووەو پاشماوەکانی چینی C,B,A ئەشکەوتەکە ئەم دیاردەیە ڕوون دەکەنەوە. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین هۆی ئەو پلەی پسانەوەیە نێوان چینی D,C دەگەڕێتەوە ئەو گواستنەوەی کاتی نیاندرتالە نەك فەوتانی ڕەگەزەکەیان. هێشتا ئەم پرۆسێسە، پاش پتر لە چارەکە سەدەیێك، بە تەواوی لێیان نەکۆڵیوەتەوە، هەرچیش بێجگە لە نووسینەکانی سولیکی گووتراوە تەنها نێوی ئەو ئەشکەوتەو پاشماوەکانی‌یەتی و هیچی‌تر. لەم بوارەدا دوو پرسی گرنگ هەمیشە دێنە کایەوە:

١ ـ چۆن مرۆڤ لەم ئەشکەوتەی شانەدەردا پێشکەوت؟ ئایا ئەو پێشکەوتنە بە تەنیا، یان لەگەڵ کۆمەڵانی‌تر بووە؟ چ پەیوەندی‌یێکی لەگەڵ هاوگینسی خۆی لە فەلەستین دا هەبووە؟ ئایا ئەم مرۆڤە لە کوردستان دا فەوتا، یان نەوەی بەجێ‌هێشت؟

٢ ـ ئەو نەوەیەی مرۆڤی شانەدەر چ پەیوەندی‌یێکی بە مرۆڤی چەرخی میزولیت و نیولیتەوە لە هەمان ناوچەدا هەیە؟. لە ڕاستی‌دا وەڵامی ئەم پرسیارانە ئاسان نی‌یە تاکو ئەنجامی لێ‌کۆڵینەوەی جیولوجی و ئەرکیولوژی و مورفولوژی و مێژوویی بەتەواوی لە کوردستان دا نەگاتە پلەیێکی بەرز، بەڵام لەگەڵ ئەم گیروگرفتەدا دەتوانرێت وێنەیێکی سەرەتایی بۆ ژیانی ئەو مرۆڤە بکێشرێت. بێ‌گومان ئەم مرۆڤە ڕاوکەر بووە. بەواتایێکی‌تر هەمیشە لە هاتووچوون دا بووەو مەڵبەندێکی تایبەتی نەبووە، بەڵام وا دیارە لە زستان دا مەڵبەندێکی وەکو ئەشکەوتی شانەدەری بۆ ماوەیێك بەکارهێناوە نەك تەنها لەبەر سەرما بەڵکو بۆ پاراستنی خواردەمەنیشی. لەگەڵ گۆڕینی مەناخ نێوان ٤٥,٠٠٠ ـ ٤٠,٠٠٠ ساڵ پێش ئەمرۆ، وادیارە ئامێری کارو ڕاوی گۆڕینێکی هاتۆتە سەرو هەروەها ئەو گۆڕینە لە خواردەمەنی‌دا ڕووی داوە. بە گۆڕینی جۆری خواردن دەبێت گۆڕینێکی فیزیکیش لە لە شی‌دا ڕووی دابێت. لەلایێکی‌ترەوە مرۆڤی شانەدەر هەر بەو ناوچەیەوە پێوەست نەبووە، بەڵکو ئازاد بووە لە گوزەرانی‌دا بۆ هێنانەدی ئەنجامی ڕاوەکەی.

ئەم جۆرە مرۆڤە وەکو گوترا هەتاکو ئێستا لە هەشت مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا پاشماوەی دۆزراوەتەوە، کورین لە تورکیا کە لە چەند پارچەی دانی نیاندرتال بووە، هەروەها لە

ئەزیوتیە (لە ئەشکەوتەکانی البطن واسخول لە چیای کەرمەلدا)و شوکبەو قفزة لە فەلەستین داو بێستون لە چیاکانی زاگروس داو لەدوایی‌دا لە شانەدەردا لە کوردستانی عیراق دا. ئێسکی مرۆڤانی ئەم مەڵبەندانە وای دەرخستوە کە هەموویان لەهەمان کات دا نەژیاون. یەکەم جار ئێسکی نیاندرتال لە شانەدەردا لە چینی موستیری‌دا بە قوڵایی ٧,٣٠مەتر دۆزراوەتەوەو بە چاکی پارێزراون و هەموو شێوەی تەنی نیاندرتالی بە روونی پێوەیان دیارە. سۆلیکی کاتیان دەباتە ٦٠,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر، پاشان ئیسکی سێ کەسی‌تر دەدۆزێتەوەو کاتیان دەگەڕێتەوە ٤٥,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر.[٢٣] بە هەموویان دەبنە هەفت مرۆڤی نیاندرتال، بەڵام لە چینە بەرزەکانی (شانەدەر A) دا ئێسکی مرۆڤێك دۆزراوەتەوە لە چەرخی نیولیث بووە کە زۆر جیاوازە لە شێوەی نیاندرتال.[٢٤] لە نێوان ئەو ژمارە ئێسکانەی نیاندرتال یەکێکیان هی منداڵێکە لە تەمەنی نزیکەی شەش ساڵی‌داو ئەویتریان لاوێکە لە شانزدە ساڵی‌داو لە ملی‌دا هەندێ پارچەی (گوێ‌ماسی) هەڵ واسنراوە، لێرەدا ئەوەی سرنج ڕاکیشەر بێت هەندی پاشماوەی بویاغ، کە لە گەڵا دروست کراوە، بەجێ‌ماوە، لەگەڵ چەکوشی بەردین دا هەروەها لەو سرنج ڕاکێشەرانە ئێسکی مرۆڤێکە لە چل ساڵی‌دا دەستێکی بە چەقۆی بەردین براوە هەروەکو دوکتور د.ت ستیوارت دەڵێت، وادیارە لە کاتی دایك بوونی‌دا دەستێکی ئیفلیج بووە. بیجگە لەمانە پاشماوەی گوڵ و هەندێ گیاو رووەکیش دوزراوەتەوە.[٢٥] لەو ڕاستیانەی بۆ ئێمە روون بۆتەوە ئەوەیە، کە نیاندرتال باوەڕو ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەبووە دەربارەی ناشتنی مرۆڤ لە گۆڕداو خاوەن جۆرە داب و نەریتێکی ماتەماوی بووە. وێنە دەربارەی ئەم دیاردەیە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا ئەو لێ‌کۆڵینەوانە بوو، کە لە ساڵی ١٩٧٠دا لە لوبنان دا کراو، بێجگە لەو شتانەی کە بە نیاندرتال پێوەستە، ئێسکی ئاسکێك و بەشێوەیێکی تایبەتی لای لەشی ئەو مرۆڤە دانرابوو،[٢٦] کە بەڵگەی جۆرە باوەڕێکی ئاینی‌یە، ئاسك ڕۆڵێکی هەبووە لەو باوەڕەدا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵی مرۆڤی نیاندرتالی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست (هەروەها کوردستان) کۆمەڵێکی خاوەن هۆش و بیربووە، دەشبێت ئەم مرۆڤە لە نێوان چیاکانی زاگروس و توروس و لوبنان و فەلەستین دا لە هات وچوون دا بووبێت و پەیوەندی‌یەکیان لەگەڵ یەکتری‌دا هەبووبێت و، ئەم دیاردەیەش بێ‌گومان ئەنجامی پێویستی‌یە ئابوری‌یەکانی بووە، کە بە ڕاوچیەتی هێناویەتی‌یەدی‌و پلەبەپلەو بەکارهێنانی گۆشتی گیان لەبەر هەروەها ماسی، ئامێری ڕاو و کارکردنی پێشکەوتوتر بوو، کە لە بەردو لە ئێسك دروستی دەکردو، وبە پێشکەوتنی هەمەلایەکی ژیان ئەنجامی فراوان بوونی ئاسۆی بیری ئەم جۆرە مرۆڤە بووەو. برینی دەستی یەکێك لە نیاندرتالەکانی شانەدەر بە ڕەوشتێکی پزیشکانە بەڵگەی ئەو فراوان بوونەیە لە زانستی سەرەتای‌دا، کە تا درەنگ لە مێژوودا هەر هەمان ڕەوشت بەردەوام بووە. ئەم جۆرە ئامێرانە، چ بۆ کار، چ بۆ برینی لاشە، لە زۆر مەڵبەندەکانی ڕۆژهەلاتی نێوەراست دا بە شێوە لەیەك دەکەن. بە وێنە ئامێری چەرخی موستیری شانەدەر (چینی D) بە تیپ زۆر بە تیپی هەزار مێرد دەکات (چینی C) و هەروەها لەوەی بەردە پەلکەو ئینجا لەوەی ئەشکەوتی (گلی‌سور) لە بێستون دا، هەتاکو لەوانەی کە لە سوریاو لە شوێنانی‌تر دوزراونەتەوە. ئەو ئامێرانەی چینی بەرزی چەرخی پالیولیتی درەنگ دیسانەوە لەیەکتری دەکەن و لە کوردستان دا لە چەند شوێنێکی دوور لەیەك دۆزاوەتەوە وەکو باڵی گەورە، بێخال، ئەشکەوتی براك و شنگار، کە هەموویان لە دێرینخانەی عیراق لە بەغدا پارێزراون. ئەو پاشماوە کولتوری‌یەو ئامێری کارانە، کە دەبنە بەڵگەی گواستنەوەی ژیانی مرۆڤ لە پالیولیتی بەرزەوە بەرەو چەرخی میزولیث دەتوانرێت لە هەڵ کەندراوەکانی (کەریم شارو مەلفەعات و گرد چای) بەرچاو بکەوێت. ئەمانە نیشانەی ئەو پێشکەوتنەی ئادەمیزادن لە وڵاتی کوردەواری‌دا هەروەها پلەی گواستنەوەیانە بەرەو چەرخی (نیولیث)داو، هۆی ئەو فینك بوونەی ئاووهەوایەیە، کە لە گشت وڵاتانی خوارووی ڕۆژئاوای کەرتی ئاسیا ڕوویداوە. بە واتایەکی‌تر هەموو جۆرە مەرجێك پەیدابووە لەم وڵاتانەدا بۆ پێشکەوتنی کشتوکاڵ و پەیدابوونی لێرو جەنگەلستان، کە دەبنە هۆی کۆبوونەوەی مرۆڤ تێداو پێشکەوتنی بەرەو ژیانێکی

..زتر و چاکتر و گۆرانەوەی مەرجی بەرهەم هێنانی لە ڕاوەوە بۆ ..یلانی زەوی، وا دیارە ئاوو هەوای چاخی میزولیث و هەروەها ..ولیث زۆر جیاوازی لەگەڵ هی ئەمڕۆدا نەبووە، چونکە ئەو ..انە کە بۆ ئاگردان لە (پالەگەورە) بەکارهاتوون هێشتا هەر لە همان ناوچە دەڕوێن.

..ە لایێکی ترەوە، لەم چاخانەدا بەشێوە ئامێرەکان پەیوەندییان ..ە وانەوە هەیە کە لە ناوچەکانی زەریای قەزوین دۆزراوەتەوە بۆ ..ـە ئەوەی لە ئەشکەوتی زەرزی دۆزراوەتـەوە، کە سێ گۆشەو ..یکی زانایانـە تیژکـراوەو ئەمـانـە هەروەهـا لە شانـەدەریش ..ـراوەتـەوەو بە کۆمەڵ لە ناوچـەکـانی قەزوین دا باو بووە. لە ..ـەگـەورە) هەروەهـا شـیـوەی هەندەسی وا باو بووە، کە دوو ..ووی بە جیاوازی ڕووتوش کراوە.[٢٧] لە هەمان کاتیش دا ئەم ..ـەیوەنـدییـانـە لەگـەڵ ئامێرەکانی کولتوری (نطوف)دا هەیە کە ..گەڕێنەوە هەمان سەردەم.

مرۆڤ لە چەرخی (میـزولیث)دا تەنهـا لە ئەشکـەوت دا ..ژیـاوە بەڵـکـو دەسـتـی کـردووە بە ژیـان لە دەرەوەی ئەم ..شکەوتانەدا لەبەر هۆی ڕاوچیەتیان و کوچ کردنیان و بێ گومان ..ەم هۆیـە ئەو پەیـوەنـدییـانـەی مرۆڤـانی کوردستـان لەگـەڵ ..وچـەکـانی قەزوین دا پەیداکردووە، لەگەڵ ئەوەش دا، بەهۆی ..ۆڕینی وەرزەکان ڕوویان بەرەو دەشتەکانی خواروشیان ..کردووە.

ئەوەی شایـەنی باسـە لێـرەدا، پاشمـاوەی ئەو ڕووەکـانە، لە ..ئەشکەوتەکانی ئەم سەردەمانە بینراون هێشتا هەر لە هەمان ئەو ناوچـانـەدا دەڕوێن و، ئەمـانە بەپێی (کاربونی ١٤)[٢٨] توانراوە ..ـوور بۆ کاتی ژیـانی ئەو سەردەمـە دانێ بە وێنـە ئەوەی لە (شـانـەدەر B) دۆزرایـەوە توانـرا بەم جۆرە کاتـەکەی لە سنووری ١٠٠٤٠ ساڵ (+ - ٤٠٠/٩٧٤) پ.ز بزانـرێـت و چینـە نوێکانی (زەرزی)ش بگەڕێنەوە ١١٠٠٠ - ٩٠٠٠ ساڵ پ.ز. بەم جۆرە دەزانـریت، کە هەردوو مەڵبـەنـد دەگـەڕێنـەوە هەمان سەردەم. هەر لەم سەردەمەش دا شێوەی هەندەسی ئەو ئامێرانە ون دەبیت چ لە کوردستان و چ لە ناوچەکانی قەفقاسیادا، واتە ئەم شێوەکارانە لە کەریم شار، گردچای، مەلفەعات و هەروەها لە زاویچەمی شانەدەردا دەگۆڕێنە شێوەی (مایکرولیت).

پلەبـەپلە دانشتـوانی کەریم شار لە کۆکـردنـەوەی مێـوەهات و سەوزە، گوراونەتەوە سەر ژیانی کشتوکاڵی لەم سەردەمەداو هەر بە یەکجـاری لە ئەشکـەوت دوور کەوتـونـەتـەوە. ئەم دیـاردەیـە هەروەهـا لە ئەشکـەوتی زەرزیدا بەدیـار دەکـەوێت پاش ئەوەی هەندێ پاشماوەی ڕاوکردن لێرەدا دۆزراوەتەوە، کە نیشانەی پلەی بەجێ هێشتنی ئەشکەوتەکە بووە. وە بەجێ هێشتنی ئەشکەوت بە دروست کردنی خانوو بووە، کە زیاتر بە بەرد دروست کراوەو بە ڕوونی لە خانـووەکـانی مەلفـەعـات دا دیـارە، ئەو خانووانە کە هەندێ داسی سەرەتایی لێ دۆزراوەتەوە بەڵام ژمارەی ئەم جۆرە نیشتەجێیانە لە فەلەستین دا پترە تا کوردستان. لە پاڵ ژیانی سەرەتایی کشتوکاڵ دا، شوانکارەیی و بەخێوکردنی ئاژەڵ شێوەی فراوانی وەرگـرتـووە، هەروەکـو لەو ئێسکـانـە هەمـە جۆری ئەو گیان لەبەرانە لەو شوێنانەدا بەدیار کەوتووەو گواستنەوەی شێوەی ژیـان لە میـزولیثـەوە بۆ نیـولیث لە کەریم شاردا بە پەیـدابوونی پیشەسازی گڵێنەیی هەستی پێ دەکرێت، کە لە چینە بەرزەکانی ئەم مەڵبـەنـدەدا ئەو پیشـەسـازییـە لەگـەڵ کولتـوری گڵێنـەی (چـەرمـو)دا لای چەمچـەمـاڵ یەك شـێـوەن و بە نـێـوی گڵێنـەی (شورشی نیولیث) ناسراوە.

گواستنـەوە لە چەرخی میـزولیثـەوە بۆ نیـولیث لە ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاست دا لە دەوروبەری ساڵانی ٩٠٠٠ - ٧٠٠٠ ساڵ پ.ز ڕووی داوەو ئەو شت ومەکانەی ئەم سەردەمە لە کوردستان دا بە شێوە بەتەواوی جیاواز بۆتەوە لەوەی لە فەلەستین دا دۆزراوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوانەی ناوچەی قەزوین دا زۆر ڕێکن.

## سرنج و سەرچاوەکان

١ - بڕوانـە: رالف لنتـون، شجـرة الحضـارة، الجـزء الأول. القاهرة ١٩٥٨، ص٤٦، ترجمة أحمد فخري

٢ - F.E. Zeuner., Dating the Past. London 1958, P. 145

٣ - بۆ وێنە بڕوانە: G. Roux., Ancient Iraq. London 1966 P. 48.
هەروەها بڕوانە وەرگێراوە عەرەبییەکەی ئەم کتێبە:



**مرۆڤی جاوە ( چەپ ) و مرۆڤی چین ( راست )**

جورج رۆ، العـراق القـديم بغـداد ١٩٨٤/١٩٨٦، ص٦٧ ترجمة حسين علوان حسين.

٤ - بۆ ئەو بەشانە بروانە:

رالف . بيلز، هاری هويجـز، مقـدمـة في الأنثـروبـولـوجيـا العامة. الجزء الأول، القاهرة - نيويورك ١٩٧٦، ص٢١٧ - ٢١٨، ترجمة د،محمد الجوهری، د. السيد محمد الحسيني.

٥ - هەمـان سەرچـاوەی پێشـوو. هەروەهـا بروانـە جورج رۆ، هەمان سەرچاوە، ل٦٧.

٦ - بروانـە: - Wells H.G., The OutLine OFHistory London - Toronto and Melbourne 1923, P.34

٧ - دەربارەی لێدوانی ئەم بیروباوەڕانە بە وێنە بروانە:

Leakey L.S.B. amd Vanne M. Goodall., Unveiling Mdn's Origin,s Cambridgc, Mass., Schenkman publisng Company

٨ - بۆ ئەم تیوریانە بروانە:

I. Auguta, Z. Burian., Jizn Drevnego 2.chelovek_Prage 1971.str-29.

بە زمانی روسی.

٩ - بروانە:

رالف ل. بیلز، هاری هویچر، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠

دەربارەی گەشەکردنی ژیان و پەرەسەندنی مرۆڤایەتی و بارگۆرینی کولتـووری ئادەمیـزاد لەسـەر رووی زەمیـن دا بروانـە ئەم لێکۆڵینەوانەی خوارەوە:

Brace, Loring, The Stages of Human EvoLution: Human and CuLturaL Origins, Englewood Cliffs, N.J., Prentice - Hall, Inc 1967. Scott Foresman amd Company, 1967.

Braidwood, Robert J., Pri storic Men. Scott, Foresman and Company, 1967.

Buettner - Janusch, John, Origins of Mam: Physical Anthropology, New Yew York, John Wiley and Sons. Inc, 1966

Campbell, Bernard G, Human Evolution: An Introduction to Man,s Adaptations, Chicago, Aldine Publishing Co, 1967

Coon, Carleton S, The Origin of Races, New York, Alfred A. Knopf, Inc, 1963

Howell, F. Clark, Early Man, New Yew York, Time Inc, 1965.

Le Gros Clark W. E, The Fossil Eridence for Human Evolution. An Introduction to the Study of Paleoanthropology, 2nd ed. Chicago, utniversity of Chicago Press 1964

Monttagu, M. F. Ashley, An Introduction to Physical Anthropology. 3rd Edition, Spring Field, III, Charles C. Thomas, 1960

Simpson, George G, The Meaning of Human Erolution, New Haren, Yale University Press 1952.

Washburn, Sherwood L - (ed) Social Life of Early Man, New York, Viking Fund Publications in Anthropology, No. 31, 1961

١٠ - دەربـارەی ئەم بابـەتـە بروانـە ئینسـوکلوپیدیای بەریتانی،

ـمتی نیاندرتال.

١٠ - بروانه هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١ - دەربارەی ئەم بیروباوەڕانە سەیرێکی ئەم سەرچاوانەی حوزموه بکە و بەتایبەتی ئەوانەی ڕایت، کە لە بڵاوکەرەوەکانی ـەرگێی شوینەواری ئەمەریکایی (BASOR) بڵاوی کردوتەوە:

H. H. Boesch. Das Klima des Nahem Osten
Vierteljahresscher d. Naturforsch Ges.
Zurich (1941), 86, S. 8 - 61

H. E. Wright. Geoloical Setting of four prehistoric Sites
in north Eastern Iraq - Amer. Schools of
Oriental Research, Bull. 128, P. 11 - 24. (1952

H. E. Wright, Late Pleistocene Clim ate of Europe
a review Geol. Soc America, Bull. 72, P. 933 - 983

F. E. Zeuner, Dating the Past. London 1958

K. P. Oakley, Mam the Tool- Maker, London 1958

هەروەها بروانە لێکۆڵینەوەیەکی ڕایت ١، (سومر)دا:

H. E. Wright Jnr, Geological Aspects of the
Archaeology of Iraq - Sumer, XI (1955), PP. 83 - 90

H. E. Wright, Jnr and B. Howe, Preliminary Report
On Soundings at Barda Balka, Sumer,
VII (1951), PP. 107 - 10

١٣ - بڕوانه جورج رو سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦

١٤ - سەبارەت بە چەرخی بەردینی بەرز، پلەی (نیولیث)و ـەرشی کشتوکاڵ لە مێژووی وڵاتی کوردەواریدا، کە یەکێکە ـە هەرە دیاردە مەزنەکانی ئەو چەرخە، بەندی چوارەمی، بەشی ـەکەمی نامەی دوکتوراکەمەو لێرەدا مەبەستمان نی‌یە.

١٥ - Ralph Solecki, The 1956 - 1957 Season
at Shanidar, Iraq - Sumer,
Vol - XIv, 1958

١٦ - D. GARROD., The Paleolithic Of Southern
Kurdistan, Cxcavations the
Care of Zarzi and Hazar Merd
Bulletin No 6, American School
of Prehist. Research, New Haren - 1930.

١٧ - R. GHRISHMAN., Iran. London 1954, P. 27

١٨ - NAJI - AL - Asil, Barda Balka, Sumar, V (1946)
PP. 205 - 6

١٩ - Ralph Solecki, The 1956 - 1957 Season
at Shanidar, Iraq. Sumer,
Vol - XIv, 1958. P. 106

٢٠ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

22 - Ralph Solek., Sumer. Vol. XvII, 1961, P. 61

هەمان بیروباوەڕ لەلایەن گارودەوە باس کراوە دەربارەی کردەوەکانی مرۆڤی چینە نزمەکانی ئەشکەوتی هەزارمێرد کە دەگەرێنەوە چەرخی لفالوزی - موستیری، لەلایەن جورج رۆ دووپات کراوەتەوە. بڕوانە: جورج رۆ، سەرچاوەی پێشو، ل٧١، وەرگێڕاوە عەرەبی‌یەکەی ل٥١ چاپی ئینگلیزیەکەی

٢٣ - هەمان سەرچاوە ل٨٧

٢٤ - طه باقر، فؤاد سفر هەمان سەرچاوەی ڕابوردوو، ل - ٢

٢٥ - 25- R.SoLecki ., Sumer. VOL. XVLLL, 1962, p.107.

٢٦ - Za Rubejom. Raskopki V Shanidar, 25 Juni - 1 JuLi.
Moskova 1971, Stv.28

گۆڤاری (زەروبیژۆم) بە زمانی روسی.

٢٧ - V.M. Masson., Srednyaya Aziya iDrevnii vostok. M -
L 1964, str 140

بە زمانی روسی.

٢٨ - یەکێك لە ئیزوتوپاتی تیشکدار، کە (کاربۆنی ١٤)یە، هەردەم لەسەر ڕووی زەمین دا هەیە، چونکە خۆی ئەنجامی کەوتنی تیشکی هەبوون و ئەوتۆمی نەیترۆژینە. ئورگانەکانی زیندووی ڕووەك و گیان لەبەر هەندێك کاربۆن (ئیزوتوپ) لە هەوا دەمژێت و، ئەم مژینە بە مردنی ئەو ڕووەك و گیان لەبەرانە دەوەستێت و لەبەرئەوەی کاربۆنی ١٤ (ئیزوتوپ) نیو ژیانی هەیە (٥٥٦٨ + ٣٠سال).، بەم جۆرە دەتوانرێت ڕێژەی سەدی (النسبة المئوية) ئەم کاربۆنە (ئیزوتوپ)ە لەو گیانەدا سنووری بۆ دابنرێ.

# أنسان العصر الجليدي

الدكتور
جمال رشيد أحمد
قسم التاريخ ـ كلية الآداب
جامعة بغداد

كان ومـايزال نشوء الحياة بصورة عامة وظهور الجنس البشـري وتطـوره بصـورة خاصة من الامور التي اشغلت ولاتــزال تشغــل بال الكثيـرين من المتخصصين وغيـر المتخصصين في المجتمـع . ولعـل الآراء تتفق تقـريبـا وبصـورة مبـدئيـة عنـد علماء الجيولوجيا والباليونتولوجيا وكذلك الآثار والتاريخ على أن ماتركه أقدم أجناس البشر من آثــار تتصـل بالمـرحلة الثـالثـة (تـريتسـر) والـرابعـة (كـواتيـريز) من الدهر الأخير لعمر الارض الذي بدأ قبل بضعــة ملايين من السنين ، وقـد مر انسـان هذا الـدهـر بمـراحـل معقـدة من التطـور أدت إلى تواجد اختلافات جوهـرية في آراء الآثار والبايالوجيا والانثروبولوجيا ، لكن الحفــريــات التي جرت في جاوه أكـدت بأن الانسـان المعـروف فيمـا بعـد بـ (انسـان جاوه) كان نوعـاً بشـرياً ينتمي الى جنس الانسان الحديث منذ ان عثر على آثاره الطبيب الهـولنـدي الـدكتور ايوجين ديبوا عام ١٨٩١م .

وقـد عثـر على امثـال هذا النوع في بكين وتنزانيا واتضح انها جميعاً تنتمي الى نفس المجموعة التي سميت أخيراً بـ (هوومو ايريكتوس Homo Erectus أي الانسان المنتصب القامة) .

كل الآثار التي ظلت بشكل واضح بجانب الهياكل العظمية نوع آخر من الانسان عاش خلال العصور الجليدية حيث اتخذ الكهوف مسكناً له، وتلك الآثار هي جوهر موضوع البحث، حيث وجدت لأول مرة في وادي نياندر على مجرى نهر دوسيل بقرب مدينة دوسيلدورف بألمانيا، ويرجع تاريخ الآثار الى ماقبل اكثر من نصف مليون سنة.

المراحل بعدما مازارت كهفي زرزى وهزارميرد في منطقة السليمانية بالعراق.

يتطرق البحث الى التفصيلات التي تتصل بهذه العصور الجليدية وماتخللتها من مراحل مطيرية والظروف التي عاش فيها الانسان الذي عرف بالنياندرتال (نسبة الى ذلك الموقع الألماني)، ثم يسهب في الحديث عن اوصافه ونمط حياته وعلاقته بالانسان العاقل (كرومانيون).

اعقبت هذه المحاولة الأولية التحريات الجدية التي قامت بها البعثة الأمريكية برئاسة رالف سوليكى منذ بداية الخمسينات في كل من كهف شانــدر وزاوى چمى شانــدر واظهــرت التحريات عن مجموعة من الهياكل العظمية لانسان العصر الجليـدي (النياندرتال) وقد اعقبتها المحاولات الجدية التي قامت بها مديرية الآثار العراقية خلال سنين عديدة واضافت محاولاتها معلومات وافية الى نمط الحياة الأولى للانسان في هذه البلاد.

بعد شرح واف لحياة وعصر انسان النياندرتال ينتقل البحث الى التكلم عن تواجد آثار العصر الجيولوجي الأخير (البلايستوسين) في الشرق الأوسط وبالأخص في البلاد التركية وجبال زاكروس وطوروس وفلسطين ولبنان وكذلك في شمال افريقيا. وقد ادت هذه الظاهرة الى اهتمام الآخرين بهذه المناطق. فقامت الباحثة الآثارية دوروثي گرود بإجراء التحريات الاولية في كل من فلسطين وكردستان منذ العشرينات من هذا القرن لتقصي آثار أقدم انسان اتخذ من هذه الجبال موطنا له، فاكتشفت بعض الأدوات من تلك

يقارن البحث صفات نياندرتاليو مستوطن شانـدر المحافظة مع صفات اولئك من بني جنسه في فلسطين الذين اشتهروا بالنياندرتاليين المتقدمين، كما يتضمن البحث المميزات التي تميزت بها أدوات العمل لدى هؤلاء وعلاقاتها مع بعضها شكليا ثم التطورات التي تجري على هذه الادوات عبر المراحل التي يمر بها الانسان والتي تتواجد في الطبقات المختلفة لهذه المواقع مع مقارنة بعضها مع البعض الآخر وخاصة ماوجدت منها في شمال بلاد مابين النهرين وآسيا الصغرى وغربي ايران.

# ئیبنولمستەوفی

## مستــەوفـی و وەزیــرو میــژوونــووس و وێژەوانی هەولێره

د. محسن محمد حسین
ئوستادی یاریدەدەری بەشی مێژووی
كۆلیجی پەروەردە زانكۆی بەغدا

لە خوارایی كتێبــەكــەی خۆی ناونــاوە «نبــاهــة البلد الخامل بمن ورده من الأماثل»، ئەوەبوو ئەو ولاتە سست و خەوالــووە هاتــەوە هۆش و كەوتــەوە تەكــانــدنی تۆزو خۆڵی گردەوەبــووی سەدەهــای سەر شانی مانــدووی. بێ گــومــان ولاتێكیش بۆ ئەوەی هەمیشــە بە ئاگــابێت نابێت رێگــای تەریكی بگــرێت و دوورەپــەرێــزیو كونــج نشینی بەســەر خۆیدا بســەپێنێت، بگــرە كارێكی وەهــاش دەكــات كە خەڵــكــی رووی تێ بــكــەن و سەری لــێ بــدەن. ئەم پێشكــەوتنــەش هەتــا باری ولاتــەكــە نەزەنگیو گەنجینــەی پرنــەبــوو، نەهــاتەدی. ئەوەبوو ئیتر لەوە بەدواوە، لە سایەی رژێمی (پیرۆ) ئەتابەگی یەوە، پارەوپوولی ولاتەكە نەدەچووە دەرەوە، ئەو رژێمــەش كە لە رژێــمــی سەلــجــوقی یــەوە كەوتبووەوە، وەكو ئەو، دەوڵەتی كردبوو بە چەند دەوڵەتۆكە (ئیقلیم)یــەكی بچــووكتــرو هەریــەكــەشیــان لێ پــرســراوی ئەتــابــەگی خۆی هەبــووە كە بەگــوێــرەی توانــای خۆیو پێــداویستی مۆڵگــەی (مــەركــەزی) دەوڵــەتــەكــە سەربــازی داوەتێ، دەنــا لەوە بتــرازێ ئیتر سەربــەستی كاری خۆیو سەربــەخــۆ بووە. لەبــەر ئەوە ولاتــەكــەو هەمــوو ولات و شارێكی تری وەك هەولێر گەشەیكردو بووژایەوە.

### كورتەباسێكی ژیانی ئیبنولمستەوفی:

**(ئەبولبەرەكات ئەلموبارەك كوری ئەبولفەتح ئەحمەد كوری ئەلمــوبــارەك كوری مەوهــوب)ی لەخــمــیــە، نازنــاوی (شــەرەفــودین)ەو بە (ئیبنــولمستــەوفی ئەربیلی) بەنــاوبــانگە. پیــاوێكی باش و خاوەن چاكــەو گران و بێ فیــزبــوو. لە نیــوەی مانگی شەوالی سالی (٦٤ەی)ك تەمووزی (١١٧٠ی)زدا[1] لە قەلاكــەی هەولێــر هاتــووەتــە دنیــاوە، واتــا پاش كۆچی دوایی زەینــوددین عەلی كوچــك كە دامــەزرێنــەری ئەتابــەگی یــەكەی**

هەولێـــرو، باوکی ئەلمـــەلیك ئەلموعـەززەم موزەففـەروددین گۆگـبـــۆری بووە. تا هاتـنـــەوەی گۆگـبـــۆری بۆ هەولێـــر (ئیبنولمستەوفی)ش بوو بە لاویکی تەواو و تەمەنی گەیشتبووە بیـــست و دوو ساڵ، واتـــا هاوزەمـــانی فەرمـــانـڕانی هەردوو کوڕەکـــەی زەینـــوددین عەلی کوچـــك (یـــوسف نیـــالتگین و گۆگبـــۆری) بووە. کاتێکیش گۆگبـۆری مرد، ئیبنـولمستـەوفی وەزارەتی هەولێـــری لەدەست بوو. پاش ئەوەش بە چوار ساڵ وتـــا ساڵی ٦٣٤ی ك/١٢٣٦ی ز مەغـــۆل گەیشتنـە هەولێرو کەوتنە تاڵان وبڕی.

ئەوجـــا ئەویش شارەکـــەی جێهـێـشـــت، تا لە موســـڵ گیـــرسـابـــەوەو لەوێ ئارامـــی گرت و هەر لەوێش لە ساڵـــی ٦٣٧ك/١٢٣٩ز)دا کۆچی دوایی کرد.

**بنەماڵەکەی:**

ئیبـنـــولـمـستـــەوفی لە بنـــەمـــاڵـــەیێکی دەست ڕۆیشتـــوو خۆش گوزەران و ڕۆشنبیـرە. مێـژوونـووسی وێژەوان کەمالوددین ئەلمـوبـارەك کە بە «ئیبنـوششەعارلموسلی» بەناوبانگە، دەڵێت: باپیرەی، سەرۆك ئەبـولبـەرەکات ئەلموبارەك کوڕی مەوهوب لە نەوەچەکانی مەلیك نوعمان کوڕی ئەلمونذیر کوڕی ماءئەسسەماء بووە کە یەکێکــە لە شاکـــانی حیـرە. لە سەردەمی فەرمـانـڕانی (ئەبولهەیجاء ئەلحوسەین کوڕی ئەلحەسەن کوڕی موسا کوڕی جەکـــۆ کوردی هەزەبـــانی)دا ـ کە لێ پرســراوی هەولێـر بووە ـ هاتووەتە ئەم شارەو لە دیوانی ئەم شارەدا بووە بە (مستەوفی). ئەمـانـە لە بنـەماڵەیێکی ڕەسەن و بەرێزو فەرمانداربوون. خۆیو باوك و باپیری باوك و مام و براکانیشی هەموویان بە (مستەوفی) ناسرابوون. ئەلموبارەك ئەبولبەرەکاتی (ناوبراو)یش شاگەوهەری ڕستەی بنـەمـاڵـەکـە بووەو. . . سەرۆکـایـەتیی خێـزانـەکەش، سەرەنجـــام، کەوتـە دەست خۆی.[2] واتـا ئەم خێـزانـە هەر لە زووەوە بەر لە سەردمی ئەتابەگی‌یەوە لە هەولێر بوون و، فرمانی (ئیستیفاچی)ش تا ماوەی زیاتر لە سـەدەیەکیش هەر بە دەست پیاوانی ئەم خێزانەوە مایەوە.

ئەگـــەر لە بارەی ڕۆشنبیـری‌یـەوە سەرنجیـان بدەین، دەبینین باوکی شاعیـر بووە[3]. (صـەفیـوددین ئەبـولحـەسـەن عەلی)ی مامیشی خاوەن ڕۆشنبیـری‌یێکی بە پێـزبـووەو، کتێبی «نصیحة الملوك»ی گۆڕیوەتە سەر زمانی عەرەبی کە کتێبێکی بایەخدارو جێ‌دەست دیارە لە وێڵی فەرمانڕانیو هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەت داو، لەلایەن (حوجەتولئسلام ئەبو حامد محەممەدی غەزالی)یـەوە بە زمـانی فارسی دانـراوە، ئەم دانـەرەش ناسراوو لەناو خەڵکیدا بەناوبانگ بووە.[4]

**مامۆستا قورئان لە سنگەکانی:**

هەرچەندە ڕۆشنبیریی ئیبنولمستەوفی بەری داریڕۆشنبیری‌پڕ میوەی بنەماڵەکەی بووە، لەگەڵ ئەوەش دا قوتابی‌یێکی چالاکی چەند مامۆستاییێکی زاناو قورئان لە سنگی بلیمەت بووە کە لەو ماوەیـەدا هاتنـە هەولێـرو لە لایـان خوێنـدوویەتی. واتا ئەو کاتە دەزگای ڕۆشنبیریی هەولێر بەهۆی ئەو ڕۆشنبیرانەوە هەموو جۆرە زانستێکی عەرەبیو ئیسلامی تێدا بە سانایی ئامادەبووەو قوتابیان پێویستیـان، بۆ وەرگـرتنی زانـست بە گەڕان و سەرلێ‌دانی هەند شاران و شارانی‌تر نەبووە، چونکە ئەو شارە، لەو سەدەیەدا بووبوو بە مۆڵگەی پرتیشکی زانست، بەوەش دا دیارە کە دەزگاگەلێکی خوێنـدن و فێـرکـردنی زۆری تێدابووە. جارێ، هەر قوتابخانە، چواری تێــدابـــووە، چوار خانـەقـاو بنکـەیێکی (حـەدیث)یشی لێبـــووە، سەرەرای ئەوانـــەش لە مزگـــەوتـــەکـانیدا حوجـرەی فێرکردن، بووە. هاتنی ئەو خاوەن قەڵەم و زانایانەش بۆ هەولێر ـ کە ئیبنولمستەوفی نەی‌هێشتووە ناویان کوێربێتەوەو باسی‌کردوون ـ بە یەکجاری پلەو پایەی زانستی لەم شارەدا داکوتاو قایم کرد.

ئەو پلەو پایـــەی زانـــستی‌یـــەش کە ئیبنـــولمستـــەوفی خۆی بەدەستی‌هێنـــا، بەڵگـــەی ئەم باســـەمـــانـە کە گوتمـان دەزگـا زانستی‌یـــەکـانی ئەم شارە زۆر بەهێـز بووەو ئەو زانـایـانـەش کە ڕوویان لەم شارە کردووە خاوەن پلەوپایەی پتەوی زانست بوون. خۆشی ـ ڕەنگە لەبەر ئەو بنەمایانە بێت کە خستمانە پێش چاو ـ بۆی نەلـوا کە لە هەولێـرەوە بۆ وەرگـرتنی زانـست پێ‌بنێتـەدەرەوەو

شارەکە جێ بهێڵێت.

هەڵکەوتووترین کەسێکیش لە حەدیث و وێژەو ڕێزمان و بیرکاریدا کە ئیبنولمستەوفی سوودی لێوەرگرتبێت و لێوەی فێربووبێت: مووەففەقوددین محەممەد کوڕی یوسف ئەلبەحرانی ئەلئەربیلی بووە کە هەر لە هەولێر لە ساڵی (٥٨٥ی)ك/ (١١٨٩)زدا کۆچی دوایی کرد. ئەو پیاوە بلیمەتە، خەڵکی هاوژیانی خۆی بە زانای ئەو سەدەیەیان دادەنا، چونکە لە هەموو کەسێك زیاتر شارەزای زانستی «عەروز»و کێش بووە، لە هەمووشیان لە ڕەخنەی شیعردا زیرەکتربووەو زیاتریش چاك و خراپی ناسیوەتەوە.[٥] سەرەڕای ئەوانەش لە زانستی پێشینان دا دەورێکی چالاکی بووە، بە تایبەتیش لە بیرکاریدا. ئنجا دەستیداوەتە ڕێزمان و تێیدا قاڵ بووەو گەیشتووەتە ئەنجام و لەوپەڕییەوە هێشتا تۆزی پای دیاربووەو بووە بە چرایێك لەم زانستەدا، وەکو ئیبنولمستەوفی قوتابیی دەڵێت:[٦] بووە بە ئایەتێك لەم زانستەدا. ئیبنولمستەفی لە تافی لاویدا وێژەو شیعری لەلا خوێندووە[٧].

هەروەها، لەلای «محەممەد کوڕی ئەبوحەنیفەی بەغدادی کە لە ساڵی (٥٧٢ی)ك/ (١١٧٦ی)زدا چوبوو بۆ هەولێر واتا لە ماوەی فەرمانڕانیی (یوسفی نیالتگین)ی برای گۆکبۆریدا، خوێندوویەتی. ئەم ئەبو حەنیفەی بەغدادییە کە لەوێ بە شانوباڵی باوکی مستەوفیدا هەڵیدابوو، لە پاداش دا، کردی بە مامۆستاو ئەدەب دێری کوڕەکەی و لە هەولێردا تا ماوەیێکی درێژی ٢٣ ساڵ مایەوە، واتا تا ساڵی (٥٩٥ی)ك/ (١١٩٩ی)ز، کە هەر دوو کوڕە مەلیکەکەی سوڵتان ئەلمەلیك ئەلعادیل (سەیفوددین ئەبوبەکر)ی ئەیوبی: ئەلمەلیك ئەلموغیث فەتحولڵا عومەرو ئەلمەلیك ئەلقاهیر بەهائوددین هاتنە هەولێر. ئیتر ئەوەبوو کاکی ئەدەب دێری بەغدادیمان پەیوەندیی پێوەکردن و ئەوانیش لەگەڵ خۆیان دا بردیان بۆ وڵاتی میسرو لەوێ مایەوەو لە ساڵی (٦٠٢ك)/ ١٢٠٥ز هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.[٨]

لەسەر دەستی (ئەبولحەرەم مەککی کوڕی ڕەییان کوڕی شەبە کوڕی صالح ئەلماکسینی)ی ئەدەب زان و ڕێزمان ناسی گەورەش دا کە لە ساڵی (٦٠٣ی‌ك/ ١٢٠٦ی‌ز)دا ماڵئاوایی لە ژیان کرد، فێری وێژەو ڕێزمانیش بوو.[٩] ئیبنولمستەوفی لە هەولێر لەگەڵ پیاوانی ئەو سەدەیەو ئیمامی حەدیثی وەکو (ئەبو حەفص عومەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەلوعەممیر ئەلموئەددیب) کە بە (ئیبن طەبەرزەدی بەغدادی) بەناوبانگ بووەو لە ساڵی (٦٠٧ی‌ك/ ١٢١٠ز)دا مردووە، هەروەها لەگەڵ (ئەبو عەلی حەنبەل کوڕی عەبدولڵا کوڕی ئەلفەرەج)ی بەغدادیی حەنبەلی کە لە ساڵی (٦٠٤ی‌ك/ ١٢٠٧ز)دا مردووە. پەیوەندیو شناسایی گرتووە. وەکو ئیبنولمستەوفی خۆی باسی دەکات ئەو دوو زانایە لەسەر دەست نیشان کردنی خۆی هێنراون بۆ هەولێر، ئەوەبوو سوڵتان موزەففەروددین گۆکبۆری کاتێك بنکەی حەدیثی دامەزراند، کەسێکی شارەزاو زانای وەها لە شارەکەدا نەبوو کە شایانی وانەوتنەوە بێت لەو بنکەیەدا، بۆیە پرس ورای بە من (ئیبنولمستەوفی کرد)و پێی ووتم چی بکەین باشە؟ منیش ووتم: مەشایخی (حەدیث لەبەران)ی لە بەغداوە بۆ دێنین کە حەدیث زانن بە وانە دەی‌ڵێنەوە، ئەوجا ئەو دوو ناوەم بۆ هەڵ دا کە «کتێبی ئەلموسنەد)ی ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل بە وانە بڵێنەوە کە کتێبێکی حەدیثەو بەناوبانگە. ئیتر گۆکبۆری نامەیێکی بۆ دیوانی ئەلعەزیز (واتا بۆ بەغداد) نووسیو داوایانی کردو خەرجیی تەواویشی بۆ دابین کردن و هەردووکیان لە ساڵی (٦٠٢ی‌ك)دا گەیشتنە هەولێرو لە بنکەی حەدیث لەوێ جێگەیان بۆ ئامادەکرا، پاش تەواوکردنی وانەکان و بەجێ هێنانی فرمانەکەیان بەرەو دیمشق کەوتنەرێو لەوێشەوە گەڕانەوە بۆ بەغداد.[١٠]

ئەوەی ڕاستیش بێت ئەو کاتە هەولێر دەست کورتیی ڕۆشنبیریی پێوەدیاربوو، بەوەش دا دەردەکەوێت کە کەسێکی وەهایان دەست نەکەوتووە حەدیث بگێڕێتەوە بۆ لە هەندەرانەوە زانایانیان بۆ هاوردووە.

ئیبنولمستەوفی، هەروەها زانستی لە «ئەبویاسر عەبدولوەهاب کوڕی هیبەتولڵا کوڕی ئەبوحەببە»و «ئەبولموزەفەر ئەلموبارەك کوڕی تاهیرولخوزامی»و «ئەبو لمەعالی نەصرولڵا سەلامەی هیتی»و «ئەبو محەممەد عەبدوللەتیف کوڕی شێخ

ئەوینەجیب ی سەهرەوەردی)[11] و لە کەسانی تریش وەرگرتووە.

**ماڵەکەی:**

مێژوونووسان هەموو دەڵێن کە ماڵی ئیبنولمستەوفی بووبوو بە کۆڕگـای پیـاوچـاکـان و سەرلێدەران و غەریبـان[12] . هەر پیـاوچـاك و زانـایێـك بگـەیشتـایـەتـە هەولێـر دەست بەجێ بە دیـاری‌یێکی ئەوتـۆوە کە پێی هەڵسـابێت چووەتـە خزمـەتی و لە دی‌دا جێی خۆی کردووەتەوە، بەتایبەتیش ئەدیبان لە لای ئەو بازاڕیـان بەبـرەو و گەرم بووە[13] . (ئـەلـیـونـیـنـی) هەواڵی کۆبوونـەوەییکی وێـژەوانیی ماڵی ئیبنـولمستـەوفی دەگێـڕێتـەوەو دەڵێت! شەوێکیـان «ئـەبـولمـەجـد مەجـدوددین ئەسعەد کوڕی ئیبراهیم» کە ئینشانووسی دیوانی هەولێر بوو لە سەردەمی مەلیك گۆگبۆری‌دا بە هەرزەکارێکی جوان دا، لە دەفرێك دا، هەندێ میـوەی بۆ ناردن کە بەهێ و سێـویشی تێـدابـوو، بەم بۆنـەیـەوە کۆڕەکە هەستی شیعریان بزووت و کەوتنە شیعر ووتن. هۆنەری بەناوبانگی هەولێریش حوسامووددین عیسا کوڕی سنجەر کوڕی بەهرام کوڕی خماتگین کە بە «ئەلحاجری ئەربیلی» دەناسرا لەو کۆڕەدا بوو، شیعـرێکی لەنـاکـاو بۆ هات و هەنـدێ تەشبیهـاتی نایابی پێوەدیاربوو.

**قوتابیو میوان و پێداهەڵبڵێکانی:**

لە خەڵکی هەولێر گەلێ کەس وانەیان لەلا خوێندووە، بەڵام ئێمە لێرەدا باسی ئەوانە دەکەین کە لە هەندەرانەوە هاتوون بۆ لای یا بۆ ماوەیێـك و سەردەمێـك هەر لە ماڵـەکـەی‌دا ماونـەتەوەو زانستیان لێوە وەرگرتووەو ڕۆشنبیرێکی ناسراوەە دەنگ بڵاوبوون. ئەوەتـا زەکییـوددین عەبـدولعـەزیم کوڕی عەبـدولقـەوی کە بە (ئـەلمـونـذیری) ناسراوەو ساڵی (٦٥٦ی‌ك/ ١٢٥٨ی‌ز) کۆچی دوایی‌کردووەو بە نووسەرێکی گەورەی ئەو سەدەیەو شارەزاییکی تەواوی ژیـانی پیـاوە هەڵ کەوتـووەکـانی دادەنرێت، دەڵێت کە ئیجازە (بەڵگەنامە)ی لە مامۆستا ئیبنولمستەوفی وەرگرتووە[15] ، مەبـەستی لە ئیجـازەی گێـڕانـەوەی حەدیثی پێغـەمبـەرە. ئیبن خەلـەکـانیش شتێـك دەڵێت لە وتەکەی (ئەلمونذیری) دەچێت، ئەوەتـا دەڵـێـت: زۆرم گوێ بۆ شل کردووەو زۆرم لێ‌بیـست، گەلێکیشم لەو فەرمایش و گێڕانەوەو خوێندنەوانەی بیستووە کە بۆ ئەو زانـاو شێخـانـەی خوێنـدووەتەوە کە لە هەندەرانەوە هاتوونەتە خزمـەتی بۆ هەولێـر .[16] «ئـەلمـونـذیـری»ش کە باسی ئیبنـولمستـەوفی مامـۆستـای دەکـات بە: «شێخی زۆر بەڕێـزو پیـاوچـاك و پیـرۆزی کوڕی شێخی زۆر بەڕێـز» ناوی دەبـات. هەرچی کەمـالـوددین ئەلمـوبـارەك کوڕی ئەبـوبـەبکـر کوڕی حەمـدانـی باسـکـراوە (٦٥٤ی‌ك/ ١٢٥٦ی‌ز) کە بە (ئیبنوششەعاری موصلی) ناودارە، وا دەردەکەوێت کە لە هەموو کەسێك زیاتر هۆگری بووبێت، ئەوەتا ئەمیش وەسفی دەکات و بە (زانـاو وێـژەوان و لەبـەرکـارو نووسـەرو ڕێزمان ناس و هۆنەرو کتێب دانـەر) ناوی دەبـات، جگـە لەوەش سیفـاتی زیـاد لە ڕاستیشی دەداتـە پاڵ و بە «هـۆنـراوەی مرواری»و «گـەوهـەر»و «زێر»یش ناوی دەبات و «خاوەن بیرو هەستی گەش»و «مانگ و خۆری هەولێر»و «زاناو پێشەوای ئەو شارە» یشی پێ‌دەڵێت، کە (گوایا) جیهان وێنەی ئەوی هێشتا نەدیوە. ئنجا دەڵێت: خاوەن چاکـەی تەواوە، دڵ فراوان و دەست بڵاوە، (مـەفاخیر)ی زۆرە، تابڵێی فامیـدەو هۆشمـەنـدو عاقڵە، بەجـۆرێـك، کە خواوەنـد بەرگی چاکەو کەرەمی بە باڵا دا پۆشیوەو، لە هەموو خەڵکی ئەو سەرزمانەی خۆی زاناتربووە. . . . هتد.

(ئیبنـوششـەعـار) لە بەرایی ساڵی (٦٢٥ی‌ك)دا گەیشتبـووە هەولێـر و دەڵـێـت: ڕووم لە ماڵـە ئاوەدانـەکـەی کرد، دیتم ڕووخـۆش و هۆشمـەنـدە، گومان ڕاست و زیرەکە، نەفس پاك و چاوتێـرەو هەسـتێکی مەزن و بەرفـراوانی مرۆڤـایـەتیی پێـوە چەسپە.[18]

ئیبنـوششـەعـار وەکـو خۆی دەڵێت، شەش ساڵ لە خزمـەتی مامـۆستـاکـەی‌دا ماوەتـەوەو، تەرجـەمـەی حاڵی گەلێ هۆنـەری هێناوەتەوە، بەتایبەتیش ئەو هۆنەرە هەولێری یانەی کە بە هۆنراو بە شانوباڵی ئیبنولمستەوفی‌یان دا هەڵ داوەو پلەو پایەیان ڕووناك کردووەتـەوە: وەکـو محـەممـەد کوڕی ئەحمـەد عومـەر کوڕی ئەحمـەدی (ئـەربیلی ئەلکفـرعـزی) کە لاوێکی هۆنـەری چاك بووەو قوتابیی ئیبنولخەبازی ڕێزمان زانی بەناوبانگی موسل

بووه، له هۆنراوێك دا دەڵێت:

**لانـال قلبـي منـكـمـو أمـلا**

**ان كان يومـاً عن محـبـتـكـم سلا**

**وحـرمـتُ ماارجـوه من لقـيـاكُـمُ**

**ان حلّ في قلبـي سواكـم اوحـلا.**[19]

واتا: «ئەگەر دڵم ڕۆژێك نەبێت لە لاتان

کۆستی کەوێت، بێبەش بێ لە ئومیدو جاتان

خۆ ئەگەر لە ئێوە بەولاوە کەسیتری ویست

ئەوا بێ بەش بێ، کەر بێ، ئامانجی دیدارتانی نەبیست.»

هۆنـەری قورئـان دۆست و چاکـەخـوازو ئایین پـتـەوی وەکـو (یـونس کوری سەعیـد کوری عیسـا)ش پیای‌دا هەڵ داوه. ئەم هۆنەره وەکو ئیبنوششەعار دەڵێت له مزگەوت دا شەهیدکرا، لەو شەرەی شەوالی (٦٣٤ی‌ك)دا کە تەتار ملیان له هەولێر ناو کەوتنە کوشتار، ئەو، قەصیدە دالی‌یەکەی بۆ ئیبنوششەعار خوێندبووەوه.[20]

هەروەهـا هۆنـەری وەکـو «یـلمـان کوری کەیـلوك کوری عوسـمـان)ی هەولـێـری‌و، (مـحـمـەد کوری یونس کوری ئەبـولبـەرەکـات)ی موسڵی‌و (مـحـمـەد کوری مەککی کوری عەبـدوڵـلا)ی هەولیـری‌و (محـەممەد کوری ئەلحوسوین کوری ئەبـوبـەکـر)ی موسڵی‌و (محـەممـەد کوری محـەممـەد کوری ئەلموبارەك کوری جبریل)ی هەولێری‌و (یەعقوب کوری نەصر کوری یەعقـوبی بەغـدادی ئەلـدارقـززی)و هۆنـەرانی‌تـریش هەموویان بە شانوباڵی‌دا هەڵیان داوه.[21]

هەرچی (یـاقـوتـولحەمەوی) جوگرافنووسی بەناوبانگیشە دوو جار سەری لە هەولـێـر داوەو[22] وەسـفـێـکی تەواوی شارەکـەو قەڵاکـەی‌و گوزەرو بازارەکـەی‌و کاریـزە سازگـارەکـانی سەردەمی موزەفـفـەرودديـن گۆکبـۆریی، نووسیـوەو، دێتـە سەر باسی ئیبنـولمستـەوفی‌و دەڵێت: گەیشتمـە هەولێـر، لە پیـاوچـاك و چاکـەخـوازی وەکـو (ئـەبـولبەرەکات ئەلموبارەك کوری ئەحمەد کوری ئەلموبارەك) کە بە مستەوفی بەناوبانگە، کەسێکی‌ترم لەو شارەدا بەو پلەو پایـەیـە نەدی، لە وێـژەدا تەواوێ قاڵـەو داڵـدەو دۆستی وێـژەوانـانـە، چاکـەی بە سەریـانـەوه هەیـە، دینـدارە، پەیوەندیی بە سوڵتانەوە هەیەو دەزگاو دەستەڵاتێکی وەکو وەزارەتی پێدراوە. حەدیسی زۆری لەوانە وەگرتووه کە هاتوونەتە هەولێرو چەنـد کتێبێکیشی دانـاوە، هۆنراوی خۆیشی بۆ خویـدرر ... بە خەتی خۆشی چەند پارچەیێکی بۆ نووسیومەتەوە، وەکو:

**تذكـريـنـكَ الـريـحَ مرّت عليـلةً**

**على الـروض مطلولاً، وقـد وَضُـحَ الفجـرُ**

**ومـابَـعُـدَتْ دارٌ ولاشـطَّ منـزلٌ**

**إذا نحـن ادنَـتـنـا الامـانـيُّ والـذكـرُ**

واتـا: «شنـەی بای شەمـاڵی بەرەبەیان کە بەسەر گوڵزاری پڕ ئاورنگ دا هەڵ دەکات تۆم دێنێتەیاد

ئێمە کە یەك ئاوات و یەك دڵ و یەك دەنگ بین نەماڵ دوورەو نەمەنزڵیش بێ‌پایان. . . . هەردووکمان گوشاد.»[23]

**کتێبە دانراوەکانی:**

وەکـو مێـژ وونـووسـان باس دەکـەن، ئیبنـولمستەوفی گەلێك کتێبی داناوە، ئەمانەن:

١ - کتێبی «النظام في شرح شعر المتنبي وابي تمّام»، دە بەرگە.

٢ - کتێبی «ابيات المحصّل في نسبة ابيات المفصّل»، دوو بەرگەو باسی ئەو بەیتانەی تێدادەکات کە (زەمەخشەری) لە کتێبە «المفصّل في النحو»ەکەی خۆی‌دا بە بەڵگە هێناوی‌یەتەوە.

٣ - کتێبی «سرُّالصنعة»، وەکو ئیبنوششەعار وەسفی دەکات، بەرگێکی جوانـەو بۆ «وەلییـوددین ئەبـوثـەنـاء محـەممـەد کوری محـەمـمـەد ئەلحـەررانی»ی وەزیـرەکەی ئەلمەلیك ئەلموعەززەم موزە فـفەرودین گۆکبۆری، دای‌ناوە.

٤ - کتێبی «أبـاقـمـاش» کە وێـژەیێکی زۆرو گەلێ وتـەی ‌ئەگمەنی تێدا خرکردووەتەوە.[24]

٥ - کتێبی «مـوجبـات الصبـوة وعـزائم السلوة» بریتی‌یـە لە بابەتی دڵداری‌و بنەماکانی، هۆنراوەی تەڕو گەرمی پڕ تاسەشی تێدایە.

٦ - کتێبی «في صناعة البديع»

٧ - کتێبی «الممتع المزمن» باسی هۆنەرانی بەرایی دەوڵەتی

ـــــى دەکات لە (بەششار بن بورد)ەوە بیگرە تا هۆنەرانی ـەرـیمەنی خۆی.

٠ - کتێبی ]الخیل».

٩ - کتێبی «جامع الاوراق»، هۆنراوو چیرۆك و دەنگوباس و ـەی ئەستەق و وتەی بەسوودی تێدایە.

١٠ - کتێبی (قناعة الناظر وکفایة المحاضر)، پارچە هـ.ـری جوان و هەڵبژاردەی تێدایە.

١١ - کتێبی «مشارق الانوار ومطالع العذار»

١٢ - کتێبی «الامثال والاضداد» لە بارەی دزینی چاك و ـەی خراپی هۆنراوەوە دەدوێت و بە گوێرەی هونەرەکانی هۆنراو ـەش بەشە.

١٣ - کتێبی «حاجة الکاتب والشاعر في ضرورة الشعر»، ـە کتێبەدا باسی زانستی (عەروض)و کێشی هۆنراو دەکات.

١٤ - کتێبی «تأریخ اربل» او «نباهة البلد الخامل بمن ورده ـن الاماثل في تأریخ اربل»، ئەمەش ئەو کتێبەیەتی کە ناوی ـبنولمستەوفی لەناو مێژوونووسان دا پێ بەرز بووەوە، بریتیشە لە ـەرحەمەحاڵی پیاوانی هەڵکەوتووی هەولێرو ئەو مەلیك و ـهیدو زاناو هۆنەرانەی کە روویان لەم شارە کردووە. وەکو مێژوونووسان دەگێرنەوە،(٢٥) ئەم کتێبە بریتی بووە لە چوار ـەرگ، تەنیاش (سەخاوی) دەڵێت: (پێنج بەرگە)(٢٦) وەکو «ـفرنز رۆزنتاڵ» لە سەخاوییەوە وەریگرتووەو لە کتێبەکەی خۆی ـلم التأریخ عند المسلمین)دا باسی کردووە، لەوانەشە ـووسەرێك لەبەری نووسیبێتەوەو کردبێتی بە پێنج بەرگ. ئەوەش کە ئەو بەرگانە مابێتەوە تەنیا بەرگی دووەمە، ئەمەش لەبەر ـووسەو (ئەسڵەکەی نییە)و پاش تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر کۆچی دوایی ئیبنولمستەوفیدا نووسراوەتەوە.

دکتۆر (سامی ئەصصەقاری) بەڕێزیش کە ئوستادی مێژووە لە کۆلێجی وێژە لە شاری (ریاض) لە عەرەبی سعوودی، سەرنجی لەبنج و بناوانی کتێبەکە داوەو زۆر بە وردیو لەسەرخۆ لێی کۆڵیوەتەوەو لە زانکۆی (کامبرج) کە لە ئینگلستانە، پێش زیاتر لە دە ساڵ پلەی دوکتۆرای لەسەر دراوەتێ.

وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنیش، سپاس بێت، لە ساڵی ١٩٨٠دا چاپی کردووە.

ئەم کتێبە، کە ناوی شاری هەولێری نەهێشتووە لەبیر بچێتەوەو پرشنگی بکوژێتەوە، بە بەرنامەی دانانەکەیداو بە ناوەرۆکەکەیدا، لە کتێبی (تأریخ بغداد)ی (خەطیبی بەغدادی)و لە کتێبی (تأریخ دمشق)ی (ئیبن عەساکیر) دەچێت و وەکو ئەوان وایە. ئەم کتێبە کە دەزگاو پلەو پایەی زانستی سەرلێدەرانی ئەو سەدەیەی ئەو میرنشینە دەداتە بەرتیشك و ڕوونیان دەکاتەوە، باری ڕۆشنبیریی میرنشینە کەمان تەواوی بۆ دەخاتەڕوو، ئەو بارو دۆخەی کە ڕێگای بۆ بنەماڵە زانست گۆشەکانی وەکو بنەماڵەی بەناوبانگی (خەلەکان)و بنەماڵەی (ئەلمستەوفی)و بنەماڵەی (ئیبن مەنعە)ی خاوەن پلەو پایەی قایمی زانستی مێژووی سەردەمی ئەو ناوچەیە، خوش کرد کە هەڵ کەون و بینەکایەوە. جگە لەوانەش دەیەها ناوی زاناو وێژەوانان لە بواری جۆراوجۆری ڕۆشنبیریدا کەوتە پرشنگ دان و ڕەوشایەوە.

ئەم تەکانە زانستیی‌یەش، بێگومان، ئەگەر هۆو بنەمای پێویستی بۆ نەرەخسابا ڕووی نەدەدا. وادیارە کە ئارامیی بارودۆخی ڕامیاریو ئابووریو پەیدابوونی کاربەدەستانی زاناو زانست دۆست، کە بە گەرمی ڕەورەوەی بەختیاریی کۆمەڵەکەیان بەرەو پێشکەوتن پاڵ دەنا، هۆو بنەمای گرنگی ئەو گەشەسەندنە بووبن.

کۆششی (سوڵتان موزەففەروددین گۆگبوری)یش لەم بوارەدا لە هی هەمووان زیاتر بووە، جگە لەویش هەردوو نوێنەرەکەی زەینوددین عەلی کوچکی باوکی گۆگبوری: (سەرفەتکین)و (قایماد)یش لەو کۆششەدا دریغییان نەکرد.

**توانای هۆنەریی ئیبنولمستەوفی:**

بنەماو بنچینەی ڕۆشنبیریی پڕپێزی ئیبنولمستەوفی ئەوە بووە کە بایەخێکی تەواوی بە خوێندن و لێکۆڵینەوەو ڕەخنەی وێژە داوەو تێیدا قووڵ و قاڵ بووە. بگرە ناوبانگی وێژەو دەنگ دانەوەی وێژەوانیی ئەو گەلێك لە سیفەتی تری مێژوونووسیو وەزیریو مستەوفیتی‌یەکەی، لە گوێرەی ئەو

سەدەیەی خۆی، پرشنگدارتر بووە، بەڵگەی ئەوەش ئەو هەموو کتێبانەیە کە لەم بابەتەوە دای‌ناوە، وەکو باسمان کرد. کەچی لە بابەتی تـرەوە، لە کتێبی «تأریخ اربل»ەکەی زیاتر هیچی‌تری ئەوتۆی نی‌یەو ئەم کتێبەش ئەگەر سەرنجی بدەیت بە کتێبێکی تانوپۆ تەواوی مێژوو دانانرێت بگرە زۆرتر تەرجەمەی حاڵە.

لەو بەیتە زۆرانەوەی کە لە کتێبێکی زۆردا لێرەو لەوێ بەرچاو دەکەوێت، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چ بایەخێکی بە وێژەو بە تایبـەتیش بە هۆنـراو داوە. لەمـەڕ هۆنـراوەوە، ئیبن خەلـەکـانی قازیو مێـژ وونـووس و وێـژەوانی کوردی هەولێری وتوویەتی کە ئیبنـولمستـەوفی دیوانێکی هۆنراوی هەیە زۆر بەچاکی دای‌ناوە. لەو هۆنـراوانـەی، دوو بەیتی هەیـە کە دڵبـەندی سپی پێستەو بە جوانتـریـان دادەنێت لە گەنم ڕەنگـان، ئەو دوو بەیتـە بوون بە ویـردی سەرزمـان و بە بەڵگـە هێنـانەوەی نووسەرانی وێژە. دوو بەیتەکەش ئەمەیە:

**لاتـخـدعـنـك سمـرةٌ غرّارةٌ**
**ما الـحـسـنُ الاّ للبيـاض وجـنـسـهِ**
**فالـرمـح يقـتـل بضـُهُ من غيـرهِ**
**والـسـيـفُ يقـتـلُ كلُّهُ من نفـسـه**

واتا:

نەخەڵەتیێ بە گەنم ڕەنگ ـ جوان سپی‌یەو سپی جوانە ڕم بە نووکی گیـان دەردێـنـی ـ شـمـشێـر هەمـووی بێ‌ئـامـانـە

هۆنراوێکی‌تریشی دەڵێت:

**يالـيـلةً حتـى الـصـبـاح سهـرتُـهـا**
**قابـلتُ فيـهـا بدرهـا باخـيـهِ**
**سمَـحَ الـزمـانُ بهـا فكـانـت لـيـلةً**
**عذُبَ الـعـتـابُ بهـا لمـجـتـذبـيـهِ**
**احـيـيـتُـهـا وأمـتـهُـا عن حاسدٍ**
**ماهـمُّـهُ الا الـحـديـثُ يشـيـهِ**
**ومـعـانـقـى حلو الـشـمـائـل اهـيـفٌ**
**جُـمـعـتْ ملاحـةُ كلّ شيء فيـهِ**
**يخـتـالُ معـتـدلاً فان عبـث الـصَـبـا**
**بقـوامـه متـعـرضـاً يثـنـيـهِ**
**نشـوان تهـجُـمُ بي عليـه صبـابـتـي**
**ويـردُنـي وَرَعـي فأسـتـحـيـيـهِ**
**عَلِقَـت يدى بعـذاره وبـخـده**
**هذا اقـبـلُهُ وذا أجـنـيـهِ**
**لو لم تخـالـط زفـرتـي انـفـاسُـهُ**
**كانـت تنـمُّ بنـا الـى واشـيـه**
**حَسَـدَ الـصـبـاحُ الـلـيـلَ لمـا ضمَّـنـا**
**غيـضـاً ففـرَّق بيـنـنـا داعـيـهِ**[٢٧]

واتا:

«شەوێ بێداربووم هەتا بەیانی ـ مانگم گەیاندە خۆری ئاسمانی

گەردوون ئەو شەوەی لە بۆ ڕەخساندم ـ خۆش بوو سکاڵا بۆ گوێگرانی

بۆ من شادی بوو، بۆ حەسود ماتەم ـ زمانی لاڵ بێ بۆ دوو زمانی

دەست لە ملانی شۆخێکی جوان بووم ـ ناسك و نازدار پڕبوو لە جوانی

شەماڵی بەیان کە کەوتە سروە ـ باڵای نەمامی دەبووە کەوانی

جۆشی شەوقم هروژمی هێنا ـ بەڵام داوێنی پاکم نەی‌توانی

چنگم گیردەکرد لە پرچ و گوڵی ـ ئەوم ماچ دەکرد ئەمم دەهانی

ئەگەر هەناسەی خۆشی نەبوایە ـ کزەی دەرونم خەڵك پێی دەزانی

شەو کە بەو جۆرە داڵدەی ئێمەبوو ـ بەیان لە داخا یەکسەر ڕمانی» ئەمەشی وتووە:

**رعـىٰ الـلّهُ لـيـلاتٍ تقـضَّـتْ بقـربـكـم**
**قصـاراً وحـيّـاهـا الـحـيـا وسـقـاهـا**
**فمـا قلتُ ايـهِ بعـدهـا لمـسـافـرِ**
**من الـنـاس الا قال قلبـي آهـا.**[٢٨]

واتا:

شەوگارانی شەو لەتەك ئێوەدا ـ ڕۆژم کردەوە خوا بێ بەیاری

هەڵ کا بارانێ زەمینەی پاکی ـ ئاودا بە جارێ خاك و دیاری دڵی تامەزرۆ بۆ گوفتەی میوان ـ بە رەفتەنی‌یان بەردی لێ‌باری.

شەوێکیان ئیبنولمستەوفی لە مزگەوتێکی لای ماڵی خۆیانەوە دەهـاتـە دەرەوە، لەپـر دوژمنێکی نەنـاس بە چەقـۆیـەکـەوە هەڵی‌کوتایە سەری‌و چەقوی بۆ دڵی داهێنایەوە بەڵام بەر قۆڵی کەوت و شەبـەقێکی گەورەی تێ‌کـرد، دەست بەجێ تیمـارگـەر (سـەرتـاش)یـان بۆ هێنـاو برینـەکەی تیمارکردو وەکو قۆناغە بۆی بەست. ئەمیش، وەکو (ئیبن خەلەکان) دەڵێت، بەم بەیتانەی خوارەوە داد بۆ (ئـەلـمـەلـیـك ئەلـمـوعـەززەم موزەففـەروددین گۆگبـۆری) دەبـات. (ئیبن خەلـەکـان) وەکـو دەگێڕێتەوە، ئەو کاتە منداڵ بووەو کارەساتەکەی لەبیر ماوە.[٢٩]

بەیتەکانیش ئەمانەن:

یاایـهـا الـمـلك الـذي سطـواتـهُ

من فعـلهـا یـتـعـجـبُ الـمـریـخُ

آیـات جودك محـكـمٌ تـنـزیـلهـا

لانـاسـخٌ فـیـهـا ولامـنـسـوخُ

اشـكـو الـیـك ومـابـلـیـتُ بمـثـلهـا

شنـعـاء ذكـرُ حدیـثـهـا تأریـخُ

هی لیـلة فیـهـا ولـدت وشـاهـدی

فیـمـا ادعـیـت الـقـمـط و التمـریـخ.[٣٠]

واتا:

ئەی ئەو شایەی کە لە بکوژی‌و ببڕیی تۆ

مەرێخ تا ئێستا سەری سوورماوە

ئاباتی بەخشش‌ت ئەوەند پتەو نازڵ بووە

هیچ ناسخ و مەنسوخی تێدا نەماوە

دادم بپرسە، دەردێ کە دووچاری بووم

ئەوەند چەپەڵە مەگەر مێژوو بی‌گێڕێتەوە

شەوێکەو من تێیدا لە دایك بووم

بەڵگەم قۆناغەو لەشی چەورمە وەکو ساوا

ئیبنولمستەوفی دەی‌ووت: لە خەودا دوو بەیتم هۆنی‌یەوە، ئەمانەن:

وبـتـنـا جمـیـعـاً وبـات الـغـیـور

یعضُ یدیـهِ علیـنـا حنـقْ

نود غرامـاً لو انـا نبـاع

سواد الـدجـی بسـواد الـحـدقْ[٣١]

**پلەو پایەی فرمانەکانی لە سەردەمی گۆگبۆری‌دا:**

وەکو لەوەوپێش باسمان کرد ئیبنولمستەوفی لە بنەماڵەیەکە کە لە هەولێـر دەمێکی دووروودرێـژ فرمـانی ئیستیفـایان لە دەست دا بووە، ئەم فرمانەش، لە هەولێر، وەکو رۆڵەی ئەم شارە (ئیبن خەلـەکـان) دەڵـێـت پایـەیـێـکـی بەرزەو پلەیـێـك لە خوار وەزارەتەوەیە.[٣٢] چونکە لە رووی فرمانی بەرێوەبردنی کاروباوی ئابـووری‌و مالی دەوڵـەت و چەسپـانـدن و نووسین و شارەزایی چاوگەکانی ماڵی میری‌و لایەنی خەرج کردنی‌یەوە بە یەکێك لە فرمـانـە گەورەو سەرەکی‌یـەکـان دادەنـرێت.[٣٣] کاربـەدەستی (ئیـسـتیفـاء)یش داوا لە کارگـوزارانی بەردەستی دەکـات کە حسابێکی دیاری‌کراوی لە کات و ساتی دیاری‌کراودا بۆ بهێنن و رێژەی خەرجیش لە کاتی دیاری‌کراودا دەست نیشان دەکات و لیستـەی داواکـاریش رێـك دەخـات.[٣٤] (قـەلقـەشـەنـدی)ش دەڵێت: کاربـەدەستی ئیستیفـاء پلەو پایـەی ئەوەنـدە گەورەیە کە «جەمسەری دیوان»یان پێ‌گوتووە.[٣٥] ئەم ناوەش وەنەبێ سەیر بێت، چونکـە مستـەوفی لێ‌پـرسراوی چاودێری‌کردنی حساباتی دەوڵەت بووەو هەموو (کەشفێك)یش بەدەستی خۆی نووسیوە، بۆشی هەبـووە هەمـوو نووسـراوێکیش بگۆرێت و لای‌ببات.[٣٦]

کۆکـردنــەوەی بەروبـوومی مالات و دەغـڵ و ولاغ و پارەو ئەو شمەکانەش کە بژمێردرێت یان بکێشرێت یان بپێورێت و گەلێ شتی‌تریشی لە ئەستۆ بووە.[٣٧]

ئەم جۆرە فرمانداری‌یە، لە ولاتی هەولێردا بەر لە سەردەمی ئەتـابـەگی‌یـەکـانیش دا هەر بووە، واتـا لە سەردەمی میـرنشینی «هــەزەبـانی‌یـەکـان»یش دا هەر هەبـووە، ئەوەبـوو بنـەمـاڵـەی باپیرەگەورەی (ئیبنولمستەوفی) لە رۆژانی فەرمانرانیی میری ئەو میرنشینەدا، واتا لە رۆژانی فەرمانرانیی (ئەبولهەیجاء ئەلحەسەن کوری ئەلـحـەسـەن کوری موسـا کوری جەککـۆی کوردی هەزەبانی)دا هاتنە هەولێرو باپیرەگەورەی لەو سەردەمەدا فرمانی (سـەرکـاری) (ئیستیفـاء)ی لە دیـوانی ئەو میـرەدا وەرگـرتـووە.

(ئیبنوشـشـەعار) دەڵێت:

«بنەماڵەی باپیرەگەورەی‌و وەچەکانی هەموویان بە «مستەوفی» ناسـراون، چونکـە زوربـەی زۆریـان فرمـانەکەیان بەرکەوتووە، ئەوەبـوو باپیـرەی لە باپیـرەگـەورەیـەوە بۆی مایـەوە، لەویشەوە بۆ باوکی‌و مامی‌و هەردوو براکەی، (ئیبنولمستەوفی)ش لەراستی‌دا شاگـەوهـەری ڕستـەی ئەم بنـەمـاڵە بەرێزە بووەو، سەرۆکایەتیی بنەماڵەکەش سەرنجام هاتە دەست خۆی.»[٣٩]

هەرچی (ئیبن خەڵـەکـان)ە تەنیـا باسی کاروفـرمـانی باوکی (ئیبنــولمستــەوفی)و صەفییــوددین ئەبـولحـەسـەن عەلی کوڕی ئەلمـوبـارەك)ی مامی دەکـات. وابـزانم (ئیبنـوشـشــەعـار) زیاتر شارەزای مێژووی بنەماڵەکە بووە، چونکە ئیبنولمستەوفی کە بوو بە کاربــەدەستێکی ئەوتـۆ گەورە، ئیتـر (ئیبنـوشـشــەعـار) چەنـد ساڵـێکی دوورودرێــژ هەر لەگــەڵی‌دا مایــەوە، هەرچی (ئیبن خەلەکان)ە زووتر لە بەرایی تەمەنی‌دا هەولێری بەجێ‌هێشت.

ئیبنـولمستـەوفی کە ئەم فرمـانداری‌یەی وەرگرت، لە زانستی هەڵــووڕانـدنی کاروبـاری دیـوان و چەسپـاندن و بەجێ‌هێنانی یاسـادا زۆر بەکـارامـەیی‌و لێ‌زانی بردی‌یـەسەرو[٤٠]، تا ماوەی چل ساڵیش بەخۆرایی‌و بەبێ مووچە ئەم کارە گرنگەی بەڕێوەبرد.[٤١] دووریش نی‌یە ئەم خۆرایی‌یە بۆ ئەوە بووبێت کە لە گومــانی موزەففــەروددین گۆکبــۆری بێ‌وەی بێت، چونکـە گۆگبۆری گەلێ کاربەدەستانی دیوان و گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەی سزادابوون و بەندی کردبوون.[٤٢]

لەگـەڵ ئەوەش دا، (ئیبنـولمستـەوفی)ش لە بەڵای بێ‌ئـارەق دەرنەچوو، ئەوەبوو ئەمیشی گرت و زنجیری گرانی لە مەچەکی تونـدکـردو حەوت هەزار دینـاریشی لەسەرکرد بە ماڵ، کە ناچار هەنــدێکی بە قەرزو قۆڵــەو ئەوی‌تـریشی لە بەروبـوومی باخ و موڵکەکانی خرکردەوەو خڕ نایەدەستی. کاتێکیش وەزیری پێشوو (شەرەفوددین ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی ئەلوالی ئەلموصلی)و براکەشی (تاجوددین) لەلایەن گۆگبۆری‌یەوە گیران و بەندکران، ئیبنــولمستــە فی لە ساڵی (٦٢٩ی‌ك/١٢٣١ی‌ز)دا بەرداو، وەزارەتـی هەولێــری پێ‌سپــارد. ئیبنــولمستــەوفی. وەکــو (ئیبنـوشـشـەعـار)ی قوتـابی‌ی، دەڵێت، وەنـەبێت بەم پایە تازەیە دڵ خۆش و قایل بووبێت، لەگەڵ ئەوەش دا لە هەڵسووڕاندنی کاروبــاری سوڵـتــانــی و پێش خستــنی دەزگــای دەوڵــەتی‌دا کارزانی‌یێکی نایــاب و لێ‌زانی‌یێکی پرتــوانــای نوانـد.[٤٤] بە گەڕانــەوەی ئیبنــولمستــەوفی بۆ فەرمــانــڕانی‌و پێش کەوتن و بەرزبـوونـەوەی‌و بوونی بە وەزیـر، خەڵـکـەکـە دڵ خۆش بوون و ئومێدیـان تازەبـووەوە. بەڵام لە وەزارەت دا ئەوەنـدە نەمـایەوەو، موزەففــەروددین گۆگبــۆری لە ساڵی (٦٣٠ی‌ك/ ١٢٣٣ی‌ز)دا ئەمــری خوای بەجێ‌هێنـاو ئیبنـولمستـەوفی)ش قایـل نەبـوو لە وەزارەت دا بمـێنـێتــەوە. میــر (شــەمســوددین باتگین کوڕی عەبـدوڵـڵای ڕومی کە هەولێـر خرایـەسـەر دەوڵـەتی عەبباسی، خەلیفـە (مـوستـە نصیـر بیـلا)ی عەببـاسی کردی بە فەرمانڕانی هەولێـر، ئەمیش گەڵێـك هەوڵی لەگـەڵ (ئیبنـولمستـەوفی)دا، کەبـی‌کـات بە خوێنــەری خۆی‌و کاروبــاری دیــوانــی بۆ بەڕێوەبـەرێت و دەستـەڵاتی فراوانی ئەمرو نەهی بداتێ‌و هەموو کاروبــارێکی پێ‌بسپێــرێت و مووچـەیێکی باشی بۆ ببـڕێتـەوە مانگـەومـانـگ بگـاتەدەستی، بەڵام هیچ سوودی نەبوو، گوێی لێ‌نــەگــرت و وتی: من پیــربــووم و توانــای بەڕێــوەبـردن و سەرپــەرشتیی کاروبــاری میـریم نەمـاوەو کەڵکی ئەرکی گرانم نی‌یــەو فرمــانــی گرنـگـی وەهــام بۆ هەڵ ناســووڕێ. واشی پێ‌چاکتربوو کە ئیتر لە وەرگرتنی پلەوپایەی دیوانی خۆی بە دووربگرێت و[٤٥] لە ماڵەکەی خۆی ئیتر لەوە بەولاوە نەهاتەدەرێ.

خەڵکیش ـ بە واتای (ئیبن خەلەکان) ـ کە لە ڕەمەزانی ساڵی (٦٢٦ی‌ك/١٢٢٩ی‌ز)وە هەولێــری بەجێ‌هێشتبــوو، چوبــووە شام و میـصــرو لەوێــوە دەنگــوبــاسی (ئیبنــولمستــەوفی)ی دەقـۆستـەوە)، هەمیشـە لە خزمـەتی (ئیبنـولمستەوفی)دا بوون. ئەمــیش بەم جۆرەی مایــەوە تا تەتــار لە ساڵــی (٦٣٤ی‌ك/١٢٣٧ی‌ز)دا هەولێریان داگیرکردو (ئیبن ئەبـولحـەدیـد)[٤٦] وتەنی: وەك هەناوی کەرسواریان لێ‌کردو ئەو کارەسـاتـە ترسنـاکەیان بەسەر شارەکەو دانیشتوانی شارەکەدا هێنا کە بەنـاوبـانگـە ـ (ئیبنـولمستـەوفی)ش لەگـەڵ ئەوانـەدا بوو کە دالّدەیان بردبووەبەر قەڵاکەو لەوێ خۆیان حەشاردابوو، بەوەش

ـه جنگی ئەو بگروبکوژانە دوورو بیٚوەی بوو. کاتێکیش دۆخی ـر کەوتەوە هێمنی، بەدروودین لوئلوئی) کاربەدەستی موصل، ـە دووی ناردو هێستـرو حوشتـری بۆ بەرێخست و کتێب و ـەـویـەلی چی هەبـوو، بارکـراو (هـەولێری) بەجێهێشت و لە ـەوێی (٦٣٤ی‌ك/ ١٢٣٧ی‌ز)دا خۆی و بارخانەکەی گەیشتنە موصل. لەوێ (لوئلوء) بە رێزو بە گەرمی‌یێکی تەواو پێشوازی ـرد و لەو ماڵەدا دای‌نا، کەبۆ ئەوی ئامادەکردبوو.[٤٧]

هەشـە لای وایـە کە (ئیبنـولمستـەوفی) لە موصـل دووبـارە ـەوتێتەوە چلاکی رێك‌خستنی کاروباری دیوان و سەرپەرشتی ـەکانی‌و سوودیان لە کارزانی‌و کارامەیی وەرگرتبێت.[٤٨]

ئێمـە لەو بروایـەدا نیـن کە ئەو پیـاوە دووبـارە ی‌هەڵ چۆوبێتەوە، چونکە ئەوەبوو، لەسەردەمی موزەففەروددین ـۆگبـوری)دا قایـل نەبـوو کە لە دیوانی هەولێردا ئیش بکات و، ـەردەمی (شـەمـسـوددین باتگین)ی نوێنـەری خەلیفـە عەبـاسی‌یـەکـەش دا (وەکـو باسمـان کرد) دیسـان قایل نەبوو، ـەنیشی کاتێك گەیشتە موصل نزیك بووبووەوە لە حەفتا، ئەو ـەنەش ئەوە نی‌یە کە بتوانێت ئەو ئەرکە گرانانە بە باشی حی بەجێ‌بکات.

**کۆچی دوایی:**

(ئیبنـولمستـەوفی) کەمتـر لە سێ ساڵ لە موصـل مایەوە، لە ـۆژی یەك شەممەی (٥)ی موحەررەمی ساڵی (٦٣٧ی‌ك/٧ی ـی ١٢٣٩ی‌ز)دا هەر لەوێ ئەمـری خوای بەجێهێنـاو لە گۆرستانی (ئەسـابیلە) لە دەرەوەی (بابولجەصصاصین) بە خاك سپێردرا. واتا نزیکەی (٧٢) ساڵ بە مانگی عەرەبی، یان (٦٩) ـنی شەمسی ژیـاوە، لە هۆنـەرانیش گەلێکیـان بە هۆنـراوی جوان بۆی لاوانـەوە، لەوانـەش (ئـەبـولعـەزیـز یوسف کوڕی ـەنەفیس)ی هەولێری هۆنەرە کە بە (شەیتا نوششام) بەناوبانگەو ـە ساڵی (٦٣٨ی‌ك/١١٤١ی)زدا کۆچی دوایی کردووە، وتویەتی:

ابـو الـبـرکـات لو درت الـمـنـایـا
بانَّـك فردُ عصـركَ لم تصـبـكـا
کفـى الاسـلام رزأفـقـدُ شخـصـي
علیـه باعـیـن الـثـقـلیـنِ یُبـکـی[٥٠]

واتا:

ئەبولبەرەکات مەرگ نەیزانی ـ تۆ کەڵەمێردو دانای زەمانی
ئەگینا نەدەهات یەخەی تۆ بگرێ ـ نەدەبوو پیاوی وەکو تۆ بمرێ
وەیشوومەی ئیسلام ئیتر بەسێتی ـ مەرگی دوایی تۆ دوانەفەسێتی
جیهان لەبۆ تۆ خڕ دەناڵێنی ـ ئینس وجن بە چاو خوێن دەبارێنێ

هەرچی ئیبن خەلەکانە دەڵێت:

ئەگە ترسی داکێشان و درێژەپێدان نەبوایە، باسێکی زۆری ژیـانی (ئیبنـولمستـەوفی)و هەواڵ و بەسـەرهات و دوورو درێژیی حاڵ و گوزەران و پێداهەڵ دانیم دەکرد، چونکە ئەو پیاوە ـ خوای لێ‌خـۆش بێـت ـ پیـاوچـاکـی سەردەمـی خۆی بووەو لەو دواکـاتـەی‌دا، لە هەولێـر خاوەن چاکـەو چاکەدۆست و سەرداری وەکو خۆی نەبووە.[٥١]

**کۆتایی**

ئا بەو جۆرە، کوانووی ئەو هۆشمەندی‌یە لە بڵێسە کەوت و کوژایەوە، ئەو بریسکەیەش کە بۆ ماوەیێك دەجریوایەوە کزبوو، نەما. شارەکەش، وەکو (دکتۆر ئیحسان عەبباس)ی لێك دەرەوەو لێکۆڵەر دەڵێت، گەڕایەوە سەر سستی‌یەکەی جارانی[٥٢]

بەم جۆرە ئاشکـرایـە کەوائیبن المسـتوفی لە باسکـەی‌دا هەر وەکو دیاردەیێك بوو لە دیاردەکانی مێژووی هەولێرەی ئەتابەکی، ئەگەر لە درەوشانەوە وناوبانگی‌دا بێ یاخود لە کەوتن وکۆتایی پێ هێنـانی‌دا، کاتێـك حوکمی ئەتـابـەکی لەهـەولێردامەزرا هەندێ رونـاکی خستـۆتـەسـەر مێـژووی رۆشنبیـری ئەم شارە، کۆتایی ژیانی ئیبن المسـتوفی هەروەکو دادانەوەی پەردەیێك بوو لەسەر ئەو مێژووە.

دەتوانین بڵێین ئەم مێژووە دەشێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت تا ڕادەیێـك لەرێگـای ناسینی ژیـانی ڕۆڵـەی دوو خێـزانی بەنـاوبـانگی هەولێـر ئەویش خێـزانی (ئیبن المسـتوفی) وخێزانی (ئـیـبن خلکـان) هەروەکـو چۆن باسی دەوری خێـزانی ئیبن

المستـوفی دەكـرێ هەروەهـا دەوترێ لەبارەی پەیوەنـدی بە دامەزراندنی دەزگا زانیارییەكان لەهەولێر وەكو قوتابخانە خانەی وتنەوی حەدیسی پێغەمبەر (د.خ) هەروەها دەزگای بەڕێوەبردن (وەزارەت) وەدەزگـای دارایی (الاستیفتـاء) ـ هەروەهـا بۆمـان دەركـەوت، ئەوەی سەرنـج رادەكێشێت بەنـاوبـانگی ڕۆشنبیـری ئیبن المستـوفی لەدەرەوەی هەولێـر تەنهـا لەسـەر كتێب ودانـەرە زۆرەكانی كەوا هەموو بابەتێكی گرتەوە چ ئەدەبی‌وچ زمانەوانی نەوەستـا وەبـەس بەڵكـو ناوبـانگیـەكـەی لەوەدا بوو كاتێـك كتێبەناسراوەكەی لە مێژووی ناوخۆیی دانا:

**پەراوێزەكان:**

١ ـ المنـذری، التـكـملة لوفیـات النقلةجـ٨ ل:٣٢٢ ابن خلكان، وفیات الاعیان جـ٤ ل١٥١

٢ ـ ابن الشعار، عقود الجمان، جـ٦ ژیان نامەی (المبارك بن احمد)

٣ ـ المنذری، (هەمان چاوگەی پێشوو) لاپەڕەی ٣٢٣

٤ ـ ابن خلكان، (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، هەمان لاپەڕە

٥ ـ ابن خلكـان ١٠٤/٣. أبـو الفـداء، المختصـر ٧٧/٣٠ السیوطی، بغیة الوعاة. ٢٨٦/١

٦ ـ السیوطی: ٢٨٦/١، لە ئیبنولمستەوفی وەریگرتووە.

٧ ـ ابن خلكـان ١٠٤/٤ ابن قاضی شهبـة. دەستـنـووسـە (طبقات النحاة واللغوین) جـ ١،ل١٣٣

٨ ـ ابن الشعار، عقود الجمان، (جـ٦ ژیان نامەی محمد، بن محمـد بن ابی حنیفـة] الصفـدي، الـوافی بالـوفیـات، جـ ١ل١٤٣ ـ ١٤٤

٩ ـ المنذري، التكملة، جـ ٨ل٣٢٢ ابن خلكان، وفیات، ٣٦٥/٤

١٠ ـ ابن المستوفي، تأریخ اربل، ل١٥٩/١٦٠

١١ ـ المنذري، ٣٢٢/٨

١٢ ـ المنذري، ٣٢٢/٨ هەمان لاپەرە شذرات الذهب ١٨١/٥

١٣ ـ ابن خلكان، ل:١٤٧ الیافعی، مرآة الجنات: جـ٦/٩٦

١٤ ـ الیونینی، ذیل مرآة الزمان، ١١٣/١

١٥ ـ المنذري، التكملة، ٣٢٢/٨

١٦ ـ وفیات الاعیان: ١٤٨/٤

١٧ ـ سەیری یونینی بكە، (ذیل مرآة الزمان ٣٣/١) الذهبی، العبـره/٢١٩ الخـزرجی، العسجـد المسبوك، پ٥٢٨ ـ ٥٢٩ شذرات الذهب ٢٦٦/٥

١٨ ـ عقودالجمان (جـ٦پ١٨)

١٩ ـ ن.م جـ٧ پ

٢٠ ـ عقود الجمان جـ١پ٢٨٢ب

٢١ ـ تەرجەمەی حاڵیان لە (عقود الجمان)دا هەیە.

٢٢ ـ وفیات الاعیان، ١٢٨/٦٠

٢٣ ـ معجم البلدان ١٣٨/١

٢٤ ـ ابن خلكان ١٤٧/٤ ـ ١٤٨ الیافعي. مرآة الجنان ٦/٤ الحنبلي، شذرات الذهب ١٨٧/٥

٢٥ ـ ابن خلكـان، السیـوطي، البغیـة ٢٧٢/٢ طاش كبـری زاده، مفتـاح السعـادة ٢٩٦/١ ابن العمـاد الحنبلی ١٨٧/٥ الخوانساری، روضات الجنان ٦٥٧

٢٦ ـ الاعلان بالتوبیخ لمن ذم التأریخ، ص١٢١

- ـ بن خلكان، جـ٤ ل١٤٨
- ـ . هـ . ل ـ

- ـ ئمه (وەکو ئیبن خەلەکان) دەڵێت: لە ساڵی (٦١٨)دا
... داوه، کە ئیبن خەلەکان هێشتا لە دەساڵان زیاترنەبوو،
حیکە لە هەولێـر ساڵی (٦٠٨ی‌ك/١٢١١ی‌ز) لەدایـك بووە
... ت الاعیان) ژیان نامەی زینب ام المؤید الشعری.
- ٣:

- ـ وفيات الاعيان. ١٤٩/٤
- ـ هـ . س . ل .
- ـ هـ . س . ل١٥٠ سەیـری لاپـەڕەی ٩٢ی (تأريـخ آل
ـــحوق)ی (ئەلبەنداری)ش بکە.

- ـ لقلقشندی، صبح الاعشی: ٣٠/٤
- ـ بن مماتی، قوانين الدواوين، ل٣٠١
- ـ لقلقشندی، صبح الاعشی: ٤٦٦/٥

- ـ لنويری، نهاية الارب: ٣٠٢/٨
- ـ هـ . س . ل
- ـ بن الشعار، ١٧/٦

- ـ ن . م . ص
- ـ ابن خلكان، ١٤٧/٤
- ـ ابن الشعار

- ـ ن . م: ٩پ٩٣
- ـ ن . م ٤پ١
- ـ ن . م پ١٨

- ـ ن . م وابن خلكان ١٥١/٤
- شرح منهج البلاغة، ٨١/٣

٤٧ ـ ابن الشعار، سەیری (ابن خلكان)یش بکە
٤٨ ـ د. سواد عبد محمد الرويشدی. امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ل:١٩٦
٤٩ ـ (بـاب الجصّـاصين) یەکێکـە لە دەرگـاکـانی موسـڵ و کەوتبووەوە باشوری خۆرئاوای شارەکەوە (د. سوادی الرويشدی. مصـدر سابق ل٢٧٢) ڕەنگـە نزيـك بووبێت لەو جێگـەیـەی کە ئێستـا شەقـامی (ابن الاثيـر)و شەقـامی (نينـوێ)ی تێـدا لەیەك دەدەن (سعید الديوەجی: الموصل في العهد الاتابكی، ل:١٢٢)

٥٠ ـ ابن خلكان ١٥٢/٤. اليافعی، مرآة الجنان ٩٧/٤
٥١ ـ ابن خلكان هـ . ل .
٥٢ ـ المقدمة جزمی (٧) لە کتێبی (وفيات الاعيان) ل(١٥) ئیستیفاچی: دیوانی پارە کۆ کردنەوە بووە.

**سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە:**


١ ـ ابن ابی الحديد، ابو حامد عزالدين عبدالحميد بن هبة الله المـدائنی (ت٦٥٦هـ/١٢٥٨م) شرح نهج البـلاغة، دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦٣.

٢ ـ ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن ابي بكـر بن خلكـان (ت ٦٨١هـ/١٢٨٢م). وفيـات الاعيـان وانباء ابناء الزمان. تحقيق د. احسان عباس. ط دار الثقافة بيروت١٩٦٨.

٣ ـ ابن الشعار. ابو البركات كمال الدين المبارك بن ابي بكر بن حمدان (ت ٦٥٤هـ/١٢٥٦م)، عقود الجمان في شعراء هذا الزمان وێنەگیراوی تەنیا نوسخە دەستنووسەکەی نامەخانەی سلێمانی‌یە لە ئەستەموول.

٤ ـ ابن العمـاد الحنبلی، أبـو الفـلاح عبـدالحي بنّ العقـاد

(ت١٠٨٩هـ/٦٧٨م) شذرات الـذهب في اخبـار من ذهب. مطبعة القدسي. القاهرة ط ١٩٣١م.
٥ ـ ابن قاضي شهية، ابو بكر بن احمد بن محمد الاسدي (ت ٨٥١هـ/١٤٤٧م) طبقـات النحـاة واللغويين، وێنەگیراوی دەستنـووسێکـە لە نامـەخـانـەی مەرکـەزیدا هەیە، ژمارە (م خ ١٢٤ق ١، ٢)
٦ ـ ابن المستوفى، ابو البركات شرف الدين المبارك بن احمد الاربلي (ت ٦٣٧هـ/١٢٣٩م) تأريخ اربل. تحقيق د. سامي بن السيد خماس الصقار. منشورات وزارة الثقافة والاعلام ـ العراق ـ بغداد ١٩٨٠
٧ ـ ابن مماتي، الاسعد بن الخطير المهذب المصري (ت ٦٠٦هـ/١٢٠٩م) قوانين الـدواوين، تحقيق عزيـز سوريـال عطيه. طبعة مصر ١٩٤٣م.
٨ ـ البـنـداري، قوام الـديـن الـفـتـح بن علي (ت٦٤٢هـ/١٢٤٣م) تأريخ دولـة آل سلجـوق. صبـع شركة طبع الكتب العربية. مطبعة الموسوعات ١٩٠٠م.

٩ ـ الخزرجي، ابو العباس اسماعيل بن العباس الغساني (ت ٨٠٣هـ/١٤٠٠م) العسجـد المسبوك والجـوهـر المحكوك في طبقـات الخلفـاء والملوك (دراسـة وتحقيق د. شـاكـر محمـود عبدالمنعم. رسالة ماجستير، ١٩٧٠.
١٠ ـ الخوانساري، محمد باقر الموسوي الاصفهاني (الفه سنة ١٢٨٧هـ/١٨٧٠م) روضات الجنان طبع حجري ١٣٦٧هـ
١١ ـ الـذهبي، ابـو عبـدالله شمس الـدين محمـد بن احمـد الدمشقي (ت٧٤٨هـ/١٣٢٧م) العبر في خبر مَن عَبَر. تحقيق د. صلاح الدين المنجد، فؤاد سيد مطبعة حكومة الكويت. ١٩٦٦.
١٢ ـ الـسخـاوي، شمس الـدين محمـد بن عبـدالـرحمن (ت٩٠٢هـ/١٤٩٦م) الاعـلان بالتـوبيـخ لمن ذم التأريـخ. مطبعة الترقي. دمشق ١٩٣٠.
١٣ ـ السيـوطي، جلال الـدين عبـدالـرحمن بن ابى بكـر (ت ٩١١هـ/١٥٠٥م) بغيـة الـوعـاة في طبقات اللغويين والنحاة. تحقيق محمد ابو الفضل ابراهيم مطبعة عيسى البابى الحلبي ١٩٦٥.
١٤ ـ الـصـفـدي، صلاح الـديـن خليـل بن ايـبـك (ت٧٦٤هـ/١٣٦٣م) الـوافي بالـوفيـات. ط دار النشـر فرانـز شتاينر. فيسبادن، المانيا
١٥ ـ طاش كبـرى زاد ه، احـمـد بن مصطـفـى (ت٩٦٨هـ/١٥٦١م) مفتاح السعادة ومصباح السيادة. نشر دار الكتب الحديثة، مطبعة الاستقلال الكبرى. القاهرة ١٩٦٨.
١٦ ـ الـقـلـقـشـنـدى، ابـو الـعـبـاس احمـد بن علي (ت ٨٢١هـ/١٤١٨م) صبح الاعشى في صناعة الانشاء. المطبعة الاميرية.

١٧ ـ المنـذري، ابـو محمـد زكي الـدين عبـدالعظيم بن عبـدالقـوى (ت ٦٥٦هـ/١٢٥٨م) التكملة لوفيـات النقلة، تحقيق د. بشـار عواد معـروف. مطبعـة عيسى البـابي الحلبي. القاهرة ١٩٧٦.
١٨ ـ النـويـرى، شهـاب الـدين احمـد بن عبـدالـوهـاب (٧٢٣هـ/١٣٣٢م) نهاية الارب في فنون الادب. دار الكتب المصرية. القاهرة ١٩٥٤.
١٩ ـ اليافعي، ابو محمد عبدالله بن اسعد بن علي اليمنى المىكي (ت٧٦٨هـ/١٣٦٦م) مرآة الجنان وعبرة القطان. ط٢ منشورات مؤسسة الاعلمي للمطبوعات
٢٠ ـ ياقـوت الحمـوي، ابـو عبـدالله شهـاب الدين ياقوت بن اللهالحموي الرومي (ت ٦٢٦هـ/١٢٢٨م). معجم البلدان. ط دار صادر ـ دار بيروت ١٩٥٥.
٢١ ـ اليـونيني، ابـو الفتـح قطب الـدين موسى بن محمـد البعلبكي (ت ٧٢٦هـ/١٣٢٦م) ذيـل مرآة الـزمـان. ط حيـدر آباد. الدين ١٩٥٤م

ملخص البحث

# ابن المستوفي

## مستوفي اربيل ووزيرها ومؤرخها واديبها

د. محسن محمد حسين
استاذ التاريخ الاسلامي المساعد / قسم التاريخ
كلية التربية ـ جامعة بغداد

يتحدث البحث عن تأثير النظام الاتابكي في تنشيط الحركة الثقافية في الاقاليم التي صارت بنوع من الاستقلال، وهذا ماحصل في اربيل في ذلك العهد. فكان ان ظهرت اسر علمية مرموقة عديدة، لعل اولاها كانت اسرة ابن المستوفي التي قدمت الى هذه المدينة في وقت سابق، في عهد صاحب اربيل ابي الهيجاء الحسين بن الحسن بن موسى بن جكو الكردي الهذباني، وعمل ابناء هذه الاسرة في الاستيفاء منذ وقت مبكر، وكادت هذه الوظيفة تحصر فيهم، فقد اشتغل فيها جد (ابن المستوفي) الاكبر، وجده وابوه وعمه واخوانه، اضافة اليه. وكان الاستيفاء اشبه بديوان المال او الخراج ومولد ابن المستوفي كان في قلعة اربيل في شوال ٥٦٤ هـ/ تموز ١١٧٠م، عقب وفاة مؤسس امارة اربيل الاتابكية زين الدين علي كوچك والد الاميرين صاحبي اربيل (يوسف نيالتكين) والملك المعظم (مظفر الدين گوگبوری) الذي قطعت في عهده اشواطاً بعيدة في مختلف الانشطة الاقتصادية والعسكرية والادارية والثقافية، وصار عهده يمثل اكثر صفحات تاريخ هذه المدينة اشراقاً وعطاء. وقد عاصر ابن المستوفي في هذا العهد برُمته، واسدىٰ خدمات جليلة لاتقدر بثمن الى اربيل في عدة

مجالات، وكان له دوره البارز في ادارة المملكة وتصريف شؤونها المالية، ورفع الحركة العلمية فيها الى الامام. وكان والده شاعراً، وعمه (ابو الحسن علي) ترجم كتاب (نصيحة الملوك) لحجة الاسلام ابي حامد محمد الغزالي من الفارسية الى العربية.

ثم يتحدث البحث عن شيوخ ابن المستوفي، والمعروف عنه انه تتلمذ على نخبة من رجال عصره الذين زاروا اربيل في ذلك العصر الذهبي. وان المكانة العلمية التي بلغها ابن المستوفي تؤكد بوضوح قدرة المؤسسات الثقافية في اربيل على رفد الحياة بنخبة من المفكرين، وكذلك تؤكد المستوى الرفيع للذين زاروا هذه المدينة، إذ لم يتسن لابن المستوفي ان غادر مدينته للتزود بالمعارف، هذا وقد صار بيت هذا المفكر الاربلي محجاً للقادمين الى اربيل إذ لم يصل اليها احد من الفضلاء الا وبادر الى زيارته وحمل اليه مايليق بمقامه.

حتى تحول هذا البيت الى منتدى ثقافي يجتمع فيه اهل الفكر، وكانت تلك الاجتماعات فرصة لاحتكاك ابن المستوفي بهم والاطلاع على ثقافتهم. وبالمقابل تتلمذ عليه العديد من رجال العصر من الارابلة والزوار، بينهم المؤرخ الكبير (المنذري) وكاتب السير الشهير (ابن خلكان) ومؤرخ سير شعراء العصر (ابن الشعار) الذي رافقه احدى عشرة سنة.

ويلقى البحث الضوء على مؤلفات ابن المستوفي التي ناهزت عشرة مؤلفات في فنون الادب والنقد واللغة، اضافة الى كتابه المعروف «نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل في تاريخ اربل» الذي اشتمل على تراجم رجال الفكر الاربليين او الذين زاروا أربل. اما شاعرية ابن المستوفي فقد اشاد بها ابن مدينته المعروف (ابن خلكان وذكر طائفة من اشعاره ولاسيما في الغزل، كما ذكر بعضها البلداني الشهير ياقوت الحموي الذي زار اربيل لمرتين والتقى ابن المستوفي، وكذلك ذكرها السيوطي وابن الشعار وغيرهم.

وقد تقلّد ابن المستوفي وظائف ادارية في دولة گوگبوري، ولاسيما وظيفة الاستيفاء التي كانت معروفة في اربيل قبل العهد الأتابكي. وقد ابدىٰ اشغاله لهذه الوظيفة براعة في علم الديوان وضبط قوانينه، وظل يخدم الديوان الاميري مدة اربعين سنة دون مقابل، إذ لم يقبض خلالها مرتباً، ثم ولاه گوگبوري وزارة اربيل، وابدىٰ مقدرة فائقة في ادارة المهمة الجديدة والنهوض بادوات الملك، وقد استبشر الناس كثيراً بتوليه المنصب رغم ان عهده فيه لم يطل، إذ مات صاحب اربيل ورفض ابن المستوفي ان يستمر وزيراً، ولم ينفع معه إلحاح الامير شمس الدين باتگين الرومي الذي انتدبه الخليفة العباسي المستنصر لحكم اربيل بعد فتحها اثر وفاة گوگبوري والحاقها بدولة الخليفة. ورغم ان باتگين هذا منحه صلاحيات واسعة في الامر والنهي وطلب منه ان يكون نائبه، وسلم اليه مقاليد الامور وقطع له جارياً سنياً يصل اليه رأس كل شهر. الا انه اعتذر، واحتج بانه صار شيخاً، ليس بوسعه تنفيذ مايوكل اليه من مهمات، وآثر حياة العزلة، وانزوىٰ في بيته بالقلعة، وكان الناس يلازمون خدمته.

وحين هاجم المغول اربيل واستباحوها، وجرت عليها وعلىٰ أهلها حوادث فاجعة مازال التاريخ يردد صداها الاليم، كان ابن المستوفي في جملة من اعتصم في القلعة وسلم من انتقام المغول، وحين هدأت الاوضاع، ارسل بدرالدين لؤلؤ صاحب الموصل في اثره، وارسل اليه جمالا وبغالا لتحمل كتبه وحاجاته. فغادر اربيل الى الموصل في شوال ٦٣٤هـ/ ١٢٣٧م، واستقبله الصاحب المذكور بالاكرام والتبجيل، وانزله في دار جهزت له، وبقي في هذه المدينة نحو ثلاث سنوات، وتوفي ودفن فيها سنة ٦٣٧ هـ/ ١٢٣٩م.

وقد رثاه العديد من الشعراء، فقد كان من محاسن زمانه. وبه انطفأت جذوة اربيل، وخفت نباهة البلد التي لاحت فترة من الزمن، وعادت المدينة الى سابق خمولها.

# چەند بیرەوەرییەکی مێژوویی

ـ أحمد خواجه ـ

پێش بانگی جەنگی یەکەم (١٩١٤) ئینگلیز خۆی ئامادەکردبوو، وە باشیش لە رەوشتی گوزراش ئاگاداربوو، بە ناوی زانایانی نەوتەوە، دەستە دەستە پیاوانی سیاسی و عەسکەرییان دەنارد بۆ رۆژهەڵاتی ناوەراست.

ئینگلیزە سیاسیەکان لەگەڵ شێخەکان بە و هێندێك و دەسەڵاتدارانی عەرەبی پشتی دۆستایەتی و برایەتیان بەست. بە بۆنەی شارەزاییان لە کاروباری نەوتدا، کاربەدەستانی ئینگلیز خۆیان گەیاندە لای شێخەکانی کەنداو (خەلیج).

لەو کاتەدا لێپرسراوانی بەریتانی وەکو میستەر موررو لە کوێت کار بەرێوەبەری ئینگلیز و بەجێهێنەری پێویستی کارسازی سیاسی و ئابووریان بوو، وە لە پیاوە دانا راهیەکانی ئیمپراتۆریەکەی عوسمانیش وەکو سولەیمان نەزیف و زۆریتر، کە لە بەسرە متصرف بوون، جێی باوەر نیە ئاگادار نەبووبن.

لە ساڵی ١٩١٤ی چەرخی بیستەم دا، بەو بەرنامەو ئاواتەیانەوە، کە زیندە خەویان پێوە دەبینی شادبوون، بانگی جەنگ بە جیهاندا بلاوکرایەوە. بەبێ وێستان و قوڵت و کۆسپ لە پرو ناکاو بەو سوپاو چەکە ئامادەکراوەیانەوە پەلاماری (فاوە ـ بەسرە)یان دا.

له کاتێکدا ئینگلیز له (هیندی)و، له گەڵه ژێردەستەکانی ت‌یان له ئاسیادا، سوپایێکی گەورەو دەم به خوێنەوەیان گەیاندبووە سەر عیراق و به کوشتی دەدان، بەداخەوە ئیمپراتۆرە مەزن و خەواڵوەکەی عوسمانی که هێشتا نەگەیشتبووە چاوگلۆفتن، دەیویست به هێزی ژاندرمەی ناو شارو هەندێ عەسکەری پەراگەندەی ناشی بەربەستیان بکات.

لەو کاتەدا بێگومان وەکو باوەڕ به قورئانی پیرۆزو ئایینی ئیسلام هەبوو، ڕێزی خەلیفەی موسلمانانیش زۆربوو، گەلی عیراق کەوتە جەمبوش و بزوتنەوە به ناوی (غەزا)وە، کۆمەڵ کۆمەڵ پەلاماری چەکیان دەداو دەچوون و خۆیان دەنا به بەر کوورەی ئاگرینی چەکە کوشندەو جەنگی سوپا هەرەمەکەی ئینگلیزەوە.

پاش ماوەیێك و بنج بەست وبوونی ئینگلیز له خوارووی عیراقدا، عوسمانیەکانیش له فیرقەکانی عەسکەرە پەراگەندەکانیانەوە، هێزێکی گەورەو ئازای برسیو ڕووت و پەرێشانیان هەڵ دەبژاردو دەیان ناردن و له دەشت و بیابانەکاندا به کوشتن لەناو دەچوون. تا دوو ساڵیش بەرامبەر به چەکی ئینگلیز، چەکی عوسمانی ـ هەرە چاکەکەیان ماوزەری نۆ فیشەك خۆری گوللە قورقوشم بوو، که پاش (٥٠) فیشەك قورقوشمەکە وەکو ڕۆنی تواوە به لولەکەیدا دەچۆڕایەوەو تفەنگەکە له کار دەکەوت. به زمانی تورکی (ئۆ بەرەندۆرفدە، ماوەزەر سیلاح فابریقەسی) لێنووسرابوو.

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ سەر پاشماوەی باسی پێشوو، وە ئەو ڕووداوانەی که لەلایەن کاك حەمزە عوسمان ئەرکانەوە له گۆڤاری[1] ناوبراودا، واته (رەسملی تأریخ مجموعەسی ـ ئەنقەرە) لاپەرە (٦٥٠)دا، باسی دلاوەریو گیان بەختکردنی گەلی عیراق دەکات، بەتایبەتی شێخی خاوەن پەنا «عجێمی پاشای سعدون پاشا»و دەڵێت:

له ڕۆژانی گەرمەی جەنگی یەکەمدا له (ناسریە، منتفك)ەوە نێردرام، بۆ (نوهەیلە) بێگومان بەسواری ئەسپ. به دەشت و چۆڵە لماویەکاندا بەبێ ڕچەو ڕێگا کەتینەڕێو ڕۆیشتن. بەڵام پێویستمان به پەیغام و ڕێبەرێکی شارەزای ئەو ناوچەو ڕێگایەبوو. . . پیاوێکی وریاو زیرەك «فەرحان» ناوێکم دۆزییەوەو لەگەڵ چەند ژاندرمەیێکی ئازاو پێشداری فەرحان کەوتینەڕێ. پاش گەیشتن به بارەگەی فەرماندەی هێزەکەمان «یاربان سەیف الله بەگ»و بەجێ هێنانی کارە پێسپێراوەکەمان گەڕاینەوە بۆ شوێنی پێشوومان، که گەیشتینە نیزیك «شەهەیلە» ڕۆژی ڕوونمان لێبوو به شەو، له هەموو لایەکەو لم بەباوە به سەرو ڕوومانداد دەبارێ. زۆر پەریشان بووین، دەستمان له ژیان شوشت. به نەشارەزاییو نائومێدی وەکو کوێر دەرۆییشتین. لەو سەخڵەتیو هیوابڕانماندا له دوورەوە قەڵانتووی تیپە سوارێك بینرا بەرەو ڕوومان دەهاتن و وردە وردەیش لێمان نزیك دەبوونەوە، تا بەیەکتر گەیشتین.

سوارەکان نیزیکەی سەد سوارێك دەبوون، سەرکردەکەیان لاوێکی بەڕێزو وتوویژ خۆش و شیرین لەگەڵماندا کەوتە قسەکردن. به زمانێکی نەرم و شیرینەوە پرسیو ووتی:

ـ بۆ کوێ دەچن، چ جۆرە یارمەتیەکتان پێویستە؟!

وەڵاممان دایەوەو جیابووینەوە. .

بەڵام من تا ئەو سوارانەم له چاو وون بوو به دوایاندا دەمڕوانیو نەم دەتوانی چاویان لێلادەم. هەست و بزوتنەوە جوان و ڕێك و پێکەکەی ئەو لاوەم لێبوو گرێیێکی ناودڵ و فەرامۆشم نەدەکرد.

له فەرحانم پرسی، ووتم:

ـ ئەو لاوە بەڕێزە کێ بوو؟ ووتی:

ـ ئەو شاسوارە له هەموو ناوچەکانی مونتەفیك، تا دەگاتە ئۆرفە بێپرس و بێترس سەردارو حوکم فەرما «عجێمی پاشا کوری سەعدون پاشا»یە. چەند ساڵێك لەمەوپێش لەلایەن حکومەتەوە له بەندیخانەی حەڵەب باوکی به ژەهر

ـعرمان خواردکراو مرد. ئێستایش له هەموو ئولکەی عیراقدا ـه خانەدان و ئازاو دەستدار دەناسرێن و خانەدان و ـنویانگن. .

پاش ئەوەی قسـەکـانی فەرحـانم بیست ناوی «عجێمی پـاشـا»م هاتـەوەبیـر. ئەو وەختـەی له بەغداد بووم ناوی ئەو شێـخـه خاوەن شکـۆیـەم دەبیست، که بووه به ملۆزمی ـەریـەسی سوپـاکـەی ئینگلیـزو ئارامی تێدا نەهێشتوون و هەمـوو هیـواو بەرنـامـەیانی شێواندووەو زۆر شتی گەورەیان ێ دەگێرایەوە. . له سوارەو له پیادە به هەزاران چەکداری هەبـەو ئەمـرۆ سەرفـەرمـانـدەی هێـزی عەرەب و چۆڵ نشینەکانەو له جەنگدایە. .

فەرحـان بەسـەر سرمانەوە لەسەر قسەکانی دەرۆیشت، گوایا پاش گەیشتنی ئینگلیز به (فاو ـ بەسرە) ئیتر لەم ماوه چۆڵ و بێئاوەدا لەلایـەن نیشتـەنیـەکـانی ئەم بیـابـانـانەوە هاتوچۆ نەك بۆ رێبوارو کاروان، بۆ سوی میری تا باڵندەش توانای گوزەرکردنی نەدەکرد. به یەك جار سەرانسەر شێواوو شڵەقاوبوو، لەو رۆژە تەنگ و چەڵەمەیەدا لەلایەن عجێمی

پاشاوە زۆر به ئاسانیو به تەواوی ئاساییش و ئاسودەیی له ناوچەکەدا گەڕایەوەو ترس و بیم نەما.

ورده وردەو هاتنی هێـزی سوارەی دوژمن ـ زوبـەیـر ـ گیـراو، شعیبـەش کەوتـه ناو چەمبەریانەوەو ڕێگەی بەسرەو شعیبەمان نەما. کەوتینه جوست و جۆو تەنگی دۆزینەوەی ڕێـگـەی بەرنـامـەی جەنـگ بۆ بەربـەستی دوژمن له پێشکـەوتن. لەو وەختـەدا لەلایـەن فەرماندەی هێزی میللی عجێمی پاشـاوە. فەرمـانی هێـرشێکی ناگـەهـانیو گیـان بەختکردن به له شکری سوارەو پیادەکانی درا، وه بەو بەرگه سادەیەی خۆشیەوە له چەپ و ڕاستی کۆری جەنگدا، وەکو بروسکـه، قارەمـانـانـه هاوکـاری جەنگـاوەرەکـانی دەکـردو پەلامـاری هێـزی ئینگلیـزیـان دەدا، تا مەردانه هێزی لای ڕاستمانی له پەریشانی ڕزگارکرد.

**عیراق لەدەست دەچوو. عجێمی پاشام چۆن بینی؟!**

عجێمی پاشایش ژیانی ڕابوردووی خۆیو عیراقی لەدەست چوو. دوایی ژیان و دانیشتنی

له ئۆرفـه بریـارداو پەسـەنـدکرد. پاش ئەوەی ماوەیێکی بەسـەردا چوو، ڕۆژێـك له ئەنقـەره بەرەنگـاری ئەو پیـاوه جێگابڵندو مەزنەبوو. ئەو شێخه، ئەو پادشا دلێرو قارەمانەم له بەرگێکی چاکەت و پانتۆڵ له جیاتی بەرگه عەرەبیەکەی خۆی، له جێگەی پاشماخ و عەگالی ئاوریشمی جارانی، به شافقەیەکەوە دەژیا.

بەرامبـەر بەو دیمـەنـەی که لەوەوە دووربوو بیبینم خۆم پێنـەدەگیـرا، له هەر دوو چاومـەوە فرمێسکی دڵ تەنگیم ڕشت. کڵپـەی سۆزی لێکـدانـەوەی دەسەڵاتداریو ژیانی جارانی ئەو مەردە، ئەو پیاوه گەورەیەیە، ڕووناکی له دڵ و هەنـاونـدا نەهێشت. بەڕاستی نەم دەزانی به چ زمـانێـك دڵسۆزیو یادی کۆنی خۆم دەرببڕم. . .

ڕاسته مێژوو، کەرو نابینا نییە. زمان تەرو ڕەوانە، ئەگەر منیش نەیڵیم و ئەو له چاکەو خراپەووتن ناترسێو ڕاناوەستێت.

له کاتـی بان جەنـگـی ١٩١٤دا، که دەنـگـی خۆ ئامادەکردنی دەوڵەته چەکدارەکان بلاوبووەوە وەکو ئێستا هۆی گەیـانـدنی دەنـگ وبـاس له هەناسەیەکدا به هەموو کون و قوژبنی کەرتەکانی جیهان نەدەگەیشت، چونکه ئەوسا، بۆ وێنه: له کەرکوکەوە نامەیێك بۆ سولەیمانی به سێ ڕۆژ و بۆ بەغداد به ده ڕۆژ دەگەیشت، زۆر جاریش تووشی جەردەو پیـاو خراپـان دەبـوو، لەنـاو دەبـرا. پۆسته به سواری بارگیر دەنێـردرا. خۆ ڕۆژنـامـه، یان چاپـەمـەنی وەکـو نوشتـەی پیاوچاکان دەست دەکەوت و دەخوازرایەوەو به دەگمەن دەبینرا.

مانـگـی جارێـك، یان دوو جار بەنـاوی (ئـەژانسی حەربی)یەوە، یان (دۆزان)ێك به زمانی تورکیو به دەست

نووســـراو بهــاتـــایــه . . له ژن، له منــاڵ، پیــرەمێــردی ڕۆڵـەوون بوو، یانـ له (چـەنـه قەلعه)و هەندەران له کۆڕی جەنگـدایـه، دەرگـای پۆستەخانه دەگیراو دەتەنراو چاوەڕێی گەیشتنی پۆستەچی (پۆسته هێن) دەکرا به پاڵەپەستۆو هاوار. . .

ئەو دۆزان وز ئەژانســـه تورکیــه به دەست نووسـراوانـه لەلایـەن تەلعـەت چاووشی پوستەچی چاو پڕوپوشاوییەوە، که تەمەنی له شەست ساڵ زیاتر بوو، به نیخەنیخ و دەنگە نووسـاوی‌و کۆکـه کۆکـەوە ئەیخوێندەوە. زۆر کەسیش هەر تێ‌نـەدەگـەیشت یان نەدەبیسـرا. . . سەرەڕای ئەم هەمـوو دەردە دەرگـــای تەلخـانـەیش داخـرابـوو، سولـەیمـانییـەوە ویستابوو، بەر دەرگاکەی گرتبوو، ئەی‌گوت: دەنگە دەنگە مەکەن (پاشا لەسەر خەتە). . . دەردی گەورەش ئەوەبوو نە دەزانرا کەی وەڵامی تەلگراف دەست دەکەوێت، تا له یادو بیردا نەدەما. .

له سەرەتـای ئەو بەهـارەی گەلاڕیـزانی گیـانی مرۆڤدا، مرخێش مرخێش کوڕه لاو بۆ عەسکەری (پیر بۆ بەرگری، یان ڕەدیفی، یان به ناوی مستحفضی)ەوە ڕاکێش دەکرا، پیاو بۆ شەڕو ئاژەڵ (مەڕ، گا. . هتد) بۆ خواردن، ووڵاخ (ئـەسپ. . . ئێستـر، گوێـدرێژ. . .) بۆ بارو ڕاپێچ دەکراو دەست به ڕەش بگیر کرا.

لەو ڕۆژە ڕەش و سەخڵەتی‌و نـاهـــەمـــوارانـــەدا لەلایـەن فەرمـانـدەی گشتی عیـراقـەوە، جەنـەڕاڵ (خـەلیل پاشا)وە تەلگـرافێـك بۆ شێـخ محمود هات دەڵێت پاش (؟)دەگەمە سولـەیمـانی. پاشـــان هات. پاش چەنـــد سەعـــاتێــك گفتـوگـۆکـردن لەگەڵ شێخ محمود دا، ڕووەو کەرکوك ملی ڕێگای گرت و ڕۆیشت. .

خەلیل پاشا بەسواری ئوتومبیلێکی دروستکراوی ئەو باوە هاتبوو، ئەیان ووت ئەوە پاشایه له جیاتی ئەسپ به سواری ئاوو ئاگــر هاتـــووە، له ترسی ووزەنـدی ئەو دەعبـایـه وردو درشت دوورەپەرێز ئەوێستاو بەسەر سرمانەوە دەیانڕوانی. . .

دوای ماوەیێکی کەم ولاَت شلەفـا، چەکـداری سوارەو پیادەی ناوچیا، که دەستی حکومەت نەدەگەیشتەناویان له عەشــایـرو ناو شارو لادێ‌و فیـــراری عەسکـەری به ناوی (غـەزا)وە به چەك و کوڵێ خواردەمـەنی خۆیـانـەوە دەستـه دەستـه به هەزاران ڕژانـه ناو شاری سولـەیمـانییـەوە. به سەرکـردەی شێـخ محمـودی نەمـر ملی ڕێگـاگیـراو ڕوو به بەغداد ـ بەسرە، تا گەیشتنه بارەگەی (شعیبه)و چوون به پیر مەرگەوە.

بەر له حەسـانـەوەو پشـوودان، دەستەویەخه بەرەنگاری ئاگری تۆپ و فڕۆکەی نەبینراوی ئینگلیز بوون. له یەکەم ڕۆژدا، زۆریان لێ‌کوژ را، ئێسك و خوێنیان ئاوێتەی ناو لم بوو. . وادیاربوو، که دوژمن زۆر ترس و بیمی له هێرشی کوردەکـان پەیـداکـردووە، بۆیه بەبێ بەزەیی‌و بەبێ ووچان دەسەلاَتی خۆی پیشان دەدا.

لەو دەشته ڕەقەن و وشك و گەرمایەدا، له هەموو دەردێك گرانتـرو گرنگتـر دەردی بێ ئاوی‌بـوو. حکـومـەت توانـای ناردنی دوو کونـــده ئاوی نەبـــوو بۆیـــان بنێـرێت. «شێـخ محـوود»یش به ناچـاری بەخـۆی‌و لەشکرەکەیەوە گەڕایەوەو هاتـــەوە بۆ سلیمـــانی. . . له هەمـووی سەیـرتـر، لەگـەڵ گەیشتنـەوەیـان بۆ شاری سلیمـانی. حکـومـەت ئەم جارە داوای لێ‌کرد بچن بۆ پێنجوین و له دەستی ڕووس ڕزگار بکـەن. خۆش و ناخـۆش فەرمـانی ئەو فرمانەشیان به شێخ محمود بەجێ‌هێنا. چوون و سەرکەوتن.

ڕۆژێ شێخ محمود له میانەی باسەکەیدا ووتی: هەرگیز گەورەیی‌و خانەدانی عجێمی پاشام لەبیر ناچێتەوە، لەگەڵ گەیشتینـه شعیبـه باوەڕێکـراوێکی خۆی به نیزیکەی سەد سوارەوە نارد بۆ خۆشی گەیشتن و پرسیـــاری پێـویستیمـان. بەڕاستی دڵسـۆزی خۆی پیشـانـدایـن. بەلاَم سوارەکـان له خۆشی ئێمـه به دەم ڕمبـازیـیـەوە به بەردەممـانـدا هۆشەیان دەکـردو دەیـانگـوت «حیف ئەحمـد کاکه سونی منیش زۆر

سوپاسی ئەو هاتنەیانم کرد.

لە باوی ئیمپراتۆرە گەورەکەی خۆماندا، لە هەموو شت هەرزانتر «گیان»بوو. پیاوی چینەری دەغل ودان نەما. گرانی ناوچەی فەرمانرەوایی حکومەتەکەی واگرتەوە، لە کۆلانی ناو شارەکان و لەسەر رێگای دێهاتەکان بۆ پارچەنانێك پربوو لە دەربەدەرو، لاشەی لەبرسان مردوو، یان لە نالەنالی پەك کەوتووەکان جەرگی دەبری...

لەگەڵ ئەو ژیان و دەردانەدا، عەسکەریش بە پاچ و بێلەوە بە مالانـدا وەك هەڵـۆی برسی دەسـوورانـەوەو ناو ژووری خێزانـانیـان هەڵ دەکەنـد، حەوشـەکانیان وێژان دەکـردو بۆ خواردەمـەنـی شاراوە دەگـەران... داری گۆرستـان و دەری شار تەواوکـرا. بەدبـەختـانـە دارێـك نا دارێکیـان لە بنمیچی خانـووەکـەیان دەبرییەوە. لەو سەرماو زوقمی زستـانـەدا خانـووەکـە دەرمـا بەسـەر ئەو خێزانـە پەریشـان و نیـوەگیـانانەدا. ئەمەیە نەختێ لە باسی ژیانی کۆنی گەل.

لە کارەساتی ئەو عەسکەرو جەنگاوەرانەی ناو سەنگەر، کە بەرامبـەر بە دوژمن لە سوپـەرو جەنگـدان، ئەوانیش برسی، تینـور، بێ بـەرگ و پێـلاو، زۆریـان بە تفـەنگی بێ فیشەکەوە رەق دەبوونەوەو دەمردن، حکومەت لە جیاتی پۆستـاڵی عەسکـەری بەشی جوتێـك کالـە زەوێڵە چەرمی دەدانێ، ئەوانیش لە جیاتی پێڵاو دەیان کولاندو بە ناچاری دەیانخواردو لە ئەنجامی پەرێشانیدا فیراریان دەکرد.

لە رۆژانی مانگـدا هەرجـارە «١٠ تا ١٥» لاویـان بە بەرچـاوی گەلـەوە دەنـا بە بەر دەست رێـژی تفـەنگـەوەو دەکـوژران. لەگـەڵ ئەوەشـدا، کە ئەنـدامـانی دادگـای عەسکـەری، ژیـان و پەریشـانیـیان دەزانی، بەدبـەختانە بەبریاری «خیانەت لە دینی دەوڵەت» بە کوشت دەدران.

بەپێی کەم وزیاد هەندێك لەم باسە راستە کە لەلایەن خۆمـەوە بینـراوەو ئێستـا دەیخـوێنینەوە، بەڵام زمان درێژیو راستگۆییەکەی مێژوویش لە کاتی خۆیدا پترو پوختەتریش بۆ ئەوەی دواییمان روون دەکاتەوەو دەگێرێتەوەو چاویش لە هیـچ رووداوو کارەسـاتێـك ناتـروکێنێ، چونکـە مێـژوو و مێژوونووس سەربەست و ئازادە.

**باوی عوسمانی نەماو ئینگلیز هاتە کۆرەوە:**

باوی خۆشیو ناخـۆشی ژیـان لە ئیمپـراتـۆرە گەورەو فراوانەکەی عوسمانیدا بەسەرچوو. ئینگلیز بە خۆیو سوپا هەرەمەکەی کە ژێردەستەکانی گەلی ئاسیا پێك هاتبوو، بە تۆپ و فرۆکـە زۆرەکـانیـەوە لە (بەسرە - کوێت)ەوە گەیشتە سەرچیاکانی عیراق و بوو بە فەرمانرەواو خۆی دامەزراندو، بوو بە ملۆزم.. وامان زانی کە گەل لە پەرێشانی حکومەتە نەخـۆش و نووسـتـووەکـەی پێشـووی رزگـاری بووە. بەڵـێ!... ئیـنگلیـز هات. خواردەمـەنی زۆری هێنـاو هەمـووی بە پارەی باش فرۆشـت بە هەژارەکـانـی پاش گرانی... نەمان دەزانی ئەمانیش بو بۆنەی جەنگەوە شیـرازەی ئابـوریـیان پچـراوەو دەیانەوێ بە تفاقی خواردن و نرخی فرۆشتنی توتن و پیتی چانـدگـاکـانی کوردستـان بکەونەوە چینەکردن و پارە کۆکردنەوەو دارایی پێکەوەنان..

ئەمـانیش (ئینگلیـزەکـان) بەرامبـەر بە گەل پێشینەکەمان کەمتـر بەدکـاریـان نەدەکـرد. لە رووی هەڵـەی پیـاوە سیاسیەکانیانەوە، کە خەریکی گیرفان پرکردن بوون بێجگە لە کوژراوی زۆری خۆیـان لە کوردستـانـداچـاکـەیـەکیـان بەجێ نەهێشت، کە شایانی یادکردنەوویان بێت، تەنیا ئەوە نەبێت کە «ئـەرو سپیخـانـە» یەکیـان لە ناوجەرگەی شاری سولـەیمـانیـدا دامەزراند تا لە رووی بێ پزیشك و دەرمان و چاودێرییەوە بوو بە هۆی بلاوبوونەوەی زۆر نەخۆشی پیس و کوشندە.

## ملخص البحث

# مذكرات تاريخية

احمد خواجه

تتناول هذه المذكرة تحرك ومساعي بريطانيا لاحتلال العراق والبلدان الأخرى قبل اعلان الحرب عام ١٩١٤م حيث ان الانكليز عقدوا علاقة صداقة مع بعض الشيوخ تحت غطاء خبرتهم فى شؤون البترول فاستطاعوا الاتصال بهم. وفي عام ١٩١٤ اثر انتشار نبأ اعلان الحرب العالمية الاولى هاجمت بريطانيا بجيوشها واسلحتها الجاهزة - الفاو - البصرة. لقد كانت الدولة العثمانية - الرجل المريض - تريد ان تواجه هذا الجيش المسلح باحدث الاسلحة بجندها التى لم تكن تقوى على الصمود والمواجهة، لذلك كانت ترسلها الى محرقة الموت لافتقارها الى امتلاك ابسط الاسلحة الحديثة المتطورة.

بعد ذلك يتناول الكاتب دور (عجيمي باشا) في معاداة الانكليز والتصدي لهم في منطقة منتمك بما كان يمتلك من قوة وامكانات هائلة في افشال مخططات الاحتلال، والشجاعة الفائقة التي ابداها والمحاربون الذين كانوا معه ضد الاحتلال الانگليزي. ثم ينتقل الى مشهد آخر كيف ان الجنرال خليل باشا ارسل برقية الى الشيخ محمود بانه سيصل سليمانية حيث توجه بسيارة التى كانت مثار دهشة الناس واستغرابهم حيث كانوا يقولون بان هذا الباشا بدلاً ان يمتطي حصاناً ركب الماء والنار.

وبعد مدة قصيرة اضطربت البلاد وتوجهت مئات الناس من ابناء العشائر والهاربين من الخدمة العسكرية الى السليمانية وانضموا الى الجيش الذي كان يقوده الشيخ محمود، فغذوا السير الى بغداد - بصرة الى ان وصلوا الى الشعيبة وواجهوا الموت ولاقوا شتى صنوف العطش والحر، واستشهد عدد كبير منهم في الساحات المكشوفة، فلم تكن للحكومة العثمانية امكانية ارسال الماء الى المقاتلين لذا اضطر الشيخ العودة الى السليمانية ولكن اغرب من هذا فان الحكومة طلبت من الشيخ الذهاب الى پينجوين لتحريرها من الغزاة الروس، فلبى الشيخ طلبها فتوجه الى هناك وحقق النصر، ثم يتناول الوضع المعاشي آنذاك حيث حلت المجاعة وحصدت مئات الالوف من الناس، وفتك البرد والزمهرير بهم الى جانب قتل الناس بتهمه (الخيانة عن دين الدولة)... انتهت الدولة العثمانية وزحفت الجيوش البريطانية بعد احتلالها بصرة - كويت نحو اعالي الجبال في العراق وثبتت مواقعها، (وقد حملت معها مواد غذائية هائلة الا انها باعتها لفقراء ما بعد المجاعة، وما كنا نعرف بان الحرب انهكت قواهم الاقتصادية)».

# ڕاپەڕینی کوردەکان لە ئێران

(بەسەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوللا لە ساڵی ١٨٨٠دا)

نووسینی جەلیلی جەلیل

فەسڵێکە لە کتێبەکەی جەلیلی جەلیل «ڕاپەڕینی کوردەکان لەساڵی ١٨٨٠دا».

وەرگێڕ لە ڕووسییەوە:
دکتور کاوس قەفتان

لەسەرەتای مانگی تەمووزی ساڵی ١٨٨٠دا، موتەسەریفی ورمێ، عەبدولقادری کوڕی شێخی ڕاسپارد، باجەکانی ناوچەی سوماوی کۆبکاتەوەو بیدات بە کاربەدەستان.[1] عەبدولقادر ڕازی نەبوو ئەو ڕاسپاردەیە بەجێ بهێنێ. ئەوسا موتەسەریف کەوتە بەکار هێنانی سیاسەتی دووبەرەکی نانەوە. ئەوەبوو هات یەکێك لەسەرۆکە کوردەکانی سوماوی - ڕاسپارد - کەناوی عەلی خان بوو - ئەو باجانە کۆبکاتەوە.[2] عەلی خان بۆ ئەم مەبەستە (ماشە)ی، کوڕی نارد بۆ سوماوی[3] شێخ عوبەیدوللاش ویستی پشتی عەبدولقادری کوڕی بگرێت. لەبەرئەوە ناچار بوو ڕێ وشوێنی جەنگی بگرێت. ئەوەش سەروزیاد بوو وا لە عەلی خان بکات واز لەو ڕاسپاردەیە بهێنێ و فەرمانەکەی موتەسەریف بەجێ نەهێنێ. (ماشە) بۆ ئەوەی بچووکێتی خۆی پیشانی شێخ بدات، ڕوویکردە هەکاری بۆ لای شێخ. عەلی خانی باوکیشی موتەسەریفی ورمێ ئاگادار کرد کە لەبەر ئەوەی شێخ بەو جۆرە هاتە وەلام، ئیتر پێی ناکرێت ڕاسپاردەکەی موتەسەریف بەجێ بهێنێ.[4]

بەدرێژایی مانگی ئاب، ڕووداوی وەها لە کوردستانی ئێراند سەریان هەڵدا، بوونە هۆو هاندەری نوێ بۆ هەڵچوونی کوردەکان.

هەمزاغای سەرۆکی خێڵی مەنگووری ناسراوی کورد، پاش کۆبوونەوە کەی شەمدینان، چالاکانە کەوتە خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو ڕاپەڕینەی ئەمڕۆ یان سوبەی ئەتەقییەوە.[5]

هەمزاغا گەلێك لە سەرەك خێڵەكانی تری رام كردبوو لابدەنە لای راپەرینەكە. ئەو پلانەی لە كۆ بوونەوەكەی شەمدینانـدا بۆ پێك هێنانی راپەرینەكە. لەلایەن گەلێك دانیشتوە كوردەكانی ئێرانەوە پەسندكراو پێشوازیكرا. كۆنسوڵی رووسیا لەوان ئەو هەواڵەی گەیاند، كە كوردەكان كە لەلایەن كاربەدەستانی ئێرانەوە زۆریان لێ ئەكرێت وئەرووتێنرێنەوە». سەریان بەرز كردۆتەوە و قین دایگرتوون. لەسەری ئەروات و ئەنووسێت «ئەوان [كوردەكانی ئێران ـ وەرگێر] بە ئەو پەڕی شادییەوە پێشوازی شێخ ئەكەن و بەرزگار كەری دائەنێن، هەموویان، بگرە كەس نەماوە لانەداتەلای.».[٦] بەڕێوەبەری ساوجبلاق، بەرامبەر كردەوەكانی هەمزاغا، كەوتە ئازار دان و چاوترساندنی خەڵكەكە. ئەوسا هەمزاغا بانگی راست بوونەوەی عەشرەتەكەی خۆیداو پەنای بردە بەر شێخ و داوای پشتگیریو یارمەتی لێ كرد. لەمانگی ئابدا، شێخ عوبەیدوڵلا هەزار چەكداری بە سەرۆكایەتی عەبدولقادری كوڕی نارد بۆ یارمەتیدانی مەنگوور.

بەپێی ئەو پلانەی دانرابوو. ئەبوو لەیەكەم هەنگاودا هێزی هەرە گەورەو چەپۆك هاوێژ بەسەرۆكایەتی عەبدولقادرو هەمزاغا، ساوجبلاق و دوایی تەورێز داگیر بكات. هێزی دووهەمیش بە سەرۆكایەتی موحەمەد سدیقی دووهەم كوڕی شێخ ئەبوو ورمێ بگرێت. هەرچی هێزی سێهەمی كە بە سەرۆكایەتی خەلیفە موحەمەد سەید بوو، ئەبوو هەموو ئەو ناوچانە بگرێت كە كەوتبوونە رۆژ ئاوای گۆماوی (ورمێ)وە، لەوانەش شاری سەلماس و خوی. شێخ عوبەیدوڵلا خۆی سەركردەی گشتی ئەم دوو هێزەی دوایی بوو.[٨] هێزەكەی هەمزاغاو عەبدولقادر بێ ئەوەی لەلایەن هێزەكانی سەر سنووری ئێرانەوە بەرهەڵستی بكرێت، گەیشتە مەرگەوەڕ. لەوێش سەرۆكە كوردەكانی ئەو ناوچەیە چوونە ریزی هێزەكەوە. لەوانە: مەحمود ئاغا بە ٥٠٠ ـ ٦٠٠ كوردەوە، راپەریوەكان رووبان كردە ناوچەی شنو، لەوێش (٤٠٠) كەس هاتنە ریزیانەوە.

لە (١٠)ی، ئەیلولدا، شۆڕشگێران دەورو بەری مەنگووریان گرت، لەوێش زیاتر لەهەزار سوارە هاتنە ریزیان. لە (١٥)ی، ئەیلولدا گەیشتنە دەورو بەری لاهیجان كە عەشرەتی پیرانی تیا ئەژیا. كامساراكان ئەوە روون ئەكاتەوە كە ئەوان [واتە راپەڕیوەكان ـ وەرگێر] «وەفاو ئیخلاسێكی تەواویان بۆ بیروڕای یەكێتی كورد هەبوو».[٩]

عەشرەتی پیران، خاوەنی دووهەزار پیادەو هەزار سوارە بوو. بەم جۆرە راپەڕینەكەی كورد لەم ماوەیەدا گەیشتە سنورێكی فراوان.

ئەو نامەیەی شێخ لەسەرەتای دەست پێ كردنی راپەرینەكەدا، بۆ كاربەدەستانی ئێران و نوێنەرانی دەوڵەتە بێگانەكانی، نارد سروشتی راپەرینەكە، هۆیەكانی، هەروەها هەڵسەنگاندنی راستەقینەی دەوری شێخ لەو راپەرینەدا روون ئەكاتەوەو مانایەكی گرنگی هەیە.

ئەو دوو نامەیەی شێخ بۆ (كوهرانی)ی، میسینێری ئەمەریكایی نارد لە ورمێ، بەراستی مایەی سەرنج لێ دانن. شێخ لەو دوونامەیەیدا، داوا لە كوهران ئەكات كۆنسوڵی بەریتانیا [واتە لە ورمێ ـ وەرگێر ـ] لەو هۆیانە ئاگادار بكات كە كوردەكانی بەرەو راپەڕین هان دا.

لە نامەی یەكەمدا كەلە (٢٥)ی، ئەیلولدا نووسراوە، شێخ گەلێك وێنەی راستەقینە دەربارەی زوڵم و زۆری كاربەدەستانی ئێران بەسەر كوردەكاندا ئەهێنێتەوەو بەبەڵگە دەری ئەخات، كەتاقەرێگای سەرفرازی كورد، رێگای راست بوونەوەو راپەرینە.

شێخ لەو نامەیەدا ئەنووسێت، كە لەساڵی ١٨٧٩دا، شەجا الدولە، پەنجا شێخی تەبەعەی هەڵواسیو شیخی تاوان بار كرد كەهۆی زیانی سەد هزار تومەنە. نوێنەرانی كاربەدەستانی ئێران فەرەجوڵلا خانی یەكێك لە سەرۆكە كوردەكانیان تا رادەی مردن كوتاو ئازارداو ئیبراهیم خانی خەڵكی شنۆشیان بەبیست هەزار تومەن جەزادا. بە زۆر نامووسی ئافرەتانی كوردیان ئەتكاندو گەلێك زۆرداری

ـتریان لێ وەشایەوە کە داخ و رقی گەلی کوردیان گەیاندە ـڕەدی تەقینەوە.

عوبەیدوڵڵا لەکۆتایی نامەکەیدا داوا لەمیسیۆنێرە ئەمەریکاییەکە ئەکات ئەم هەموو ڕووداوانە بە کۆنسوڵی ـبەریتانیا بگەیێنێ. «بۆ ئەوەی ئەگەر هاتو کێشەکەی کوردستان گەیشتە ئەو رادەیەی باسی بکرێت، لە تواندا هەبێت تێی بگەن».(١٠)

عوبەیدوڵڵا لەنامەکەیدا، ئامانجی ڕاپەرینەکەی کورد ـخاتە ڕوو، وای پیشان ئەدا کەدژی زۆرداری ئیقبال خانی موتەسەریفی ناوچەی ورمێیە.

هەرپێش ئەمەش شێخ لە نامەیەکیا کەلە (١٥)ی ئەیلولدا بۆ موتەسەریفی ورمێی نارد، لەم باسە ئەدوێ. واتەچۆن کاربەدەستانی تورکیا وئێران دڵ ڕەقانە لەگەڵ گەلی کوردو کوردستاندا ئەجووڵێنەوە، ئەو گەلەی جارەهای جار بەخۆڕایی و بەدرۆ و دەلەسە تاوان بار ئەکرێت. [ئەم مەبەستە کەم و زۆر لەگەڵ ناوەرۆکی نامەکەی پێشوودا پەیوەندییان بەیەکەوەنییە - وەرگێڕ].

عوبەیدوللا نکوولی لەوە نەئەکرد لە کوردستاندا دزی و جەردەیەتی و ڕووت کردنەوە نییە، «ئەوانیش (واتە کوردەکان - نووسەر -) بۆیان هەیە چاویان لە کردەوەی خراپ و نارەوابێت، بەڵام بۆچی تاوان بارو بێ تاوان بەیەکەوە بسووتێن؟ دەنگ وباسی خراپ دەربارەی کوردەکان بڵاو ئەکرێتەوە. هەتا کوردە کانیش ڕێز لە سەرۆك و بەریوە بەرەکانیان ناگرن.»(١١) [ئەبێ نیازی لە کاربەدەستان بێت، چونکە ئەوساو لەو ڕۆژانەدا، کوردەکان ڕێزیان لەسەرۆکەکانی خۆیان، سەرەك عەشرەت یان شێخ و دەرەبەگ بێت ئەگرت - وەرگێڕ].

شێخ ڕاستەو خۆ ئەو عەشرەتانەی دەست نیشان کرد کەمایەی گەرە لاوژەو یاسا ژێر پێ خستن و ئازاردانی دانیشتووەکان بوون. بەڵام شێخ ئەوەی لەیاد نەکرد هۆی ئەو دیاردەیە بەوە ڕوون بکاتەوە کە کاربەدەستان هەرگیز ئاوریان لەو عەشرەتانە نەئەدایەوە، وەك (شکاك) لەئێران و (هەکاری) لەتورکیا. هەر ئەو گوێ پێ نەدان و ساردی نواندنە ئەبوونە هۆی تیژ بوون و تەشەنە کردنی ئەو جۆرە کردەوانە.(١٢) «لەبەر ئەوە - شێخ لەسەری ئەڕوات - کوردەکانی عوسمانی و ئێران یەکیان گرت و بریاریان دا گەلێکی یەکگرتوو واتە یەك تاقە نەتەوە پێك بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێز لێ گرتنی یاساو رژێم لە ناو وڵاتەکەدا پشتگیری بکرێت و بچەسپێت و بەنووسین بەڵێنیان داوە (واتە کوردەکان - وەرگێڕ)و سوێندیان خواردووە، ڕەگی گەرەلاوژە لە نیشتمانەکەیانا لە بنەوە هەڵکێشن».(١٣) [ئەمە لەکوێ و قسەکانی تری پێشووی لەکوێ؟ دوو جیهانی جیاوازن! بۆ ئەوەی وێنەی ڕاستەقینەی شێخ عوبەیدوللا بخرێتە بەرچاو ئەبێ هەموو پارچە پارچە لەیەك دابچڕاوەکانی لەیەك بدرێت، ئەمەش بەدەستی مێژوو نووسێکی زۆر وەستا دێتەدی - وەرگێڕ -].

شێخ عوبەیدوڵڵا، بۆ ئەوەی سەرکەوتنی دووارۆژی ڕاپەرینەکەی مسۆگەر تربکات هەوڵیدا چەند کەسانێکی گەورەو پایەداری ئێران بە لای خۆیدا ڕاکێشێت. ئەوەبوو لە (٢٩)ی، تشرینی یەکەمدا نامەیەکی نارد بۆ عەباسی میرزا، ئەوەی خۆی بە خاوەنی ڕاستەقینەی تەختی شاهێتی ئێران دا ئەنا. شێخ ئەو نامەیەی بە دوو کەسدا بۆ نارد. حوسەین گولی و عەبدولرەحیم. ئەمەی دواییان ئەوەی پێ سپیردرا بوو بە ناوی شێخەوە داوا لە عەباس میرزا بکات لەگەڵ کوردەکاندا یەك بکەوێت.

بەڵام عەباس میرزا ئەو دوو کوردەی گرت و بە نامەکەی شێخەوە ناردنی بۆ لای شاە.(١٤)

زۆری نەبرد ڕاپەرینەکە بە هەموو ناوچەکانی کوردا تەنییەوە. لەنیوەی یەکەمی ئەیلولدا، کوردەکان دەورو بەری لاهیجان و سەردەشتیان گرت. هێزی ڕاپەریوەکان کە بە چەکداری دانیشتووەکانی ناوچەکان تەواو پڕ بوو بوو، بووە هەرەشەیەکی پڕ لە مەترسی.

«ئیستە ـ ئێرانییەك لە نامەكەیدا كەبۆ ناسیاوێكی ناردووە ئەنووسێت ـ نەك (٢٠) هەزار كورد بەڵكو هەموو كوردستان ڕاست بۆتەوە.». [١٥]

بەلای كەمەوە هەموو عەشرەتە كوردەكانی ئێران لایان دایە لای شێخ عوبەیدوڵلا، لەوانە: مەنگوور (٥ هەزار تفەنگ)، مامەش (٥ هەزار)، زارزا (٨ هەزار)، موكری (١٠ هەزار)، دیبۆكری (١٠ هەزار)، گاوریك، شكاك، جاف (٥٠ هەزار)، پیران، ئاهو (ئاگو)، زوودیو هی‌تر. [١٦]

ڕۆژنامەی (وەقت)ی، توركی، ڕاپەرینە جەماوەرییەكەی كوردی لە ئێران وەهاروون كردەوە كە «كوردەكان زوڵم و زۆرێكی زۆریان لێ ئەكرێت و باج و سەرانەیەكی زۆریان لێ ئەسەندرێت». [١٧]

ڕاپەڕیوەكان بێ ئەوەی بەرهەڵستییەكی ئەوتۆ بێتە ڕێیان، بەرەو ساوجبلاق (سنە)ی، شاری سەرەكی و گەورەی كوردستانی ئێران كەوتنەڕێ. موتەسەریفی شارەكە كەدی دانیشتووانی شارەكە پشتگیری ڕاپەرینەكە ئەكەن بڕیاری‌دا لەگەڵ ڕاپەڕیوەكاندا بكەوێتە گفتوگۆ. لە ئەنجامدا موتەسەریف بڕیاری‌دا بە خۆی و دەست و پێوەندەكانییەوە شار بەجێ بهێڵێ و ماڵ و موڵك و چەك لەگەڵ خۆیدا نەبات. پاش ئەمە كوردەكان بێ ئەوەی یەك تەقە بكەن شاری ساوجبلاق (سنە) یان گرت. [١٨]

شێخ عەبدولقادر حەكیم ناوی كرد بە سەرداری ناوچە داگیر كراوەكان. حكومەتی مووەقەتەی كوردستان دامەزرا.

ئیمام جومعە لە سنە بەیاننامەیەكی بڵاو كردەوە، لەو بەیاننامەیدا بانگی شەڕی پیرۆزی دژی شیعەكانی؟ ئێرانی‌دا. ئەم بەیاننامە ئاینییەی ئیمام جومعە دەورێكی سلبی هەبوو. [كە ئیمام بێت ئەبێ شیعی مەزەب بێت، ئیتر چۆن دژی شیعەكان بەیاننامە بڵاو ئەكاتەوە بەتایبەتی لەئێراندا؟ ـ وەرگێڕ]. چونكە بیرو باوەڕەئاینییەكەی تەنگەبەر بووە هەوڵ و كۆششی سەرفرازی نەتەوەیی لاوازكرد، لەتەك ئەوەشدا بەرهەڵستی شیعەكانی ئێران و هەموو غەیرە ئاینیەكانیشی لە كورد وروژان. [١٩]

بەیاننامەكەی ئیمام جومعە لەگەڵ ئامانجی سەرەكی و بنەڕەتی ڕاپەڕیوەكاندا ـ واتە دەست خستنی سەرفرازی نەتەوەیی ـ یەكی نەئەگرتەوە.

لە (٢٣)ی، ئەیلولدا، كوردەكان دەورو بەری شووشەوانیان گرت، لە (٢٧)ی ئەو مانگەشدا شاری ئەشتارووگیان گرت. [٢٠]

كەویستیان لە ڕووباری تاتاو بپەڕنەوە، لەلایەن شیعە ئێرانییەكانی ناوچەكانی دەورو پشتەوە بەرهەڵستی كران. دووای ئەوەش چەند ناوچەیەكی‌تر وەك میانداو لەڕووی كوردەكاندا وەستان. ئەو هێزانەی بە سەرۆكایەتی هەمزاغا بوون، وازیان لەو شارە هێناو بەجێیان هێشت و ڕوویان كردە زاوارا، ئەو شارەی پاش بەرهەلستییەكی دوو هەفتەیی خۆی دا بە دەستەوە. كوردەكان سزایەكی باشی ئەوانەیان دا یارمەتی هێزەكانی ئێرانیان دابوو. پاش ئەمە هەمزاغا میانداوی گرت. هێزە ئێرانییە شكاوەكانی میانداو زاوارا، هەوڵیان دا خۆیان كۆ بكەنەوەو ڕێگا لە كوردەكان بگرن ونەیەڵن بگەنە شاری مەلیك ـ كاندا. لە ناوەڕاستی ئەیلولدا، كوردەكان پاش شەڕێكی خوێناوی توانیان ئەو شارەش بگرن. [٢١]

زۆری نەبرد هێزەكانی كورد گەیشتنە تەبرێز. ئەم گورج و گۆڵی و چالاكییەی كورد نواندی و ئەو نزیك بوونەوە چاوەڕوان نەكراوە لەتەبرێز، شارەكەی تۆقاند. خەڵكی شارەكە كەوتنە خۆیان و دەستیان كرد بە قایمكاری كردن. كۆنسوڵخانە بێگانەكان خێرا كەوتنە كۆ كردنەوەی ئەرشیفەكانیان، بەو نیازەی دەربازیان بكەن. هەر ئەو ترس و پەژارە پەكی چالاكی پۆستەو هەواڵ گەیاندنی خست[٢٢] بە واتەی پەیام نێری ڕۆژنامەی (تایمس)، سەركەوتنەكەی كورد لەبەر ئەوەبوو، دانیشتووە كوردەكانی

...تـەکـە بە چاوی رزگـار کەر سەیـری عوبـەیـدولـلایـان ئەکرد.[٢٣] لە رۆژانی بەیەکاچووندا لەگەڵ هێزە ئێرانییەکانی سەر سنووردا، نەجـارێـك و نەدوو، رووی ئەدا سەربـازو ...ـمەرە کوردەکانی سوپای ئێران، هەڵ ئەهاتن و ئەچوونە ...ـری راپەڕیوەکانەوە.[٢٤]

...ـەو رۆژانـەی هێـزەکـانی کورد بەرەو ناوچـەکـانی کوردو ...ـوچـەکـانی ئێـران ئەکشـان، عەبـدولقـادر هەردەم ئەوەی ...ـوپارە ئەکردەوە نابێ هێزەکانی کورد دەست درێژی بکەنە سەر ژیـان و ماڵ و موڵکی خەڵکـەکـە. هاونیشتمـانـە ...ـووسـەکـان ئەوانـەی لە ئێـران ئەژیـان سوودیـان لەم ...ـنگـەوازەی عەبـدولقادر دی. شولژێفسکی مووچە خۆری ...ـووس لەتەبرێز. لە بیرەوەرییەکەیدا کە لە (٢٠) تشرینی ...ـوەمی ١٨٨٠دا نووسیویتی ئەڵێ «ئەروتیون نەزار بەگ [هـاونیشتمـانێکی رووس بووە نووسـەر - ] بەدرێـژایی ئەو ...ـوەیـە لە ساوجبـلاق بووە. چەنـد جار شێخی دیوە [شێخ عەبدولقادر - نووسەر]. شێخ چەند کەسێکی لەگەڵدا نارد بۆ ئەوەی عەمـارەکـانی هاونیشتمـانـە رووسـەکـان لەشـار ...ـەدەست درێژی بپارێزن، داواشی لێ کرد کە ئەگەر هاتوو هێزەکان پێویستیان بەگەنم و جۆ بوو ئەوە پێیان بفرۆشێت و پـووڵەیان لێ وەربگرێت».[٢٥]

ئەو هێـزەی بە سەرۆکـایـەتی عوبـەیـدوڵـلا پەلامـاری ورمێدا قۆرتی هاتـەرێ. کاربـەدەستـانی ئێران بەیارمەتی هێزە ناوچەییەکانی ئەوێ، بۆ ماوەیەك خۆیان پێ‌گیرا.

دۆخـی ناوەوەی هێـزەکـانـی کوردی دەوری ورمـێ کەبـەسـەرۆکـایـەتی عوبـەیـدوڵلا بوو، کەمێك ئاڵۆزی تێ کەوت. کاربـەدەسـتـانـی ئێـران بە یاریـدەی هێـزە جەنگـاوەرەکـانی ناو شار توانیـان ماوەیـەکی درێـژ خۆیـان راگـرن و بەرهـەڵستی بکـەن. عوبـەیـدوڵـلا کە ئابڵوقەی ورمێ دابـوو، لە ٢١ی تشـریمی‌یـەکـەمدا دوو کەسی بەنامەوە نارد بۆ شاری ورمێ‌و داوای لە دانیشتوانی شار کرد بە خواستی خۆیان شارەکە بدەن بەدەستەوە.

مەلا گەورەکـانی شار لە وەڵامی ئەوەدا ئیخـلاس و مل کەچێتی خۆیـان پیشـانی شێـخ دا. بەرامبـەر بەمە، ئیقبال الدولەی بەرێوە بەری شاری ورمێ کەوتە خۆ کۆ کردنەوەو قایم کردنی دیوارەکانی شارەکە.

ئەوسا شێخ بڕیاریدا پەلاماری شارەکە بدات. ئیقبال الـدولـە بەو نیـازەی وەخت دەست بخـات، پەنای بردە بەر ئابۆتی کۆنسۆلی بەریتانیاو داوای لێ‌کرد بکەوێتە نێوانیانەوەو ناوبژیان بکات. «ئیقبال الدولە داوای لێ‌کردم - ئابۆت لەو نامـەیـەیـدا کە لە (٢٢)ی، تشـرینی یەکـەمـدا نووسیـویـتی، ئەڵێت - داوای لێ‌کـردم پیـاوەتی لەگـەڵـدا بکەم و وا لە شێخ بکەم لەگەڵیا بچێتە مەیانی گفتوگۆوە تا ئیقنـاعی بکـات بۆ ماوەیـەك واز لە شەر بهێنێ. بەڵکـە لەو ماوەیەدا بتوانێ دەنگی خۆی بەپایتەخت یان تەبرێز بگەیێنێ.»[٢٦]

ئابۆت گورج هاتە مەیانەوە و کەوتە کار. هەر ئەو رۆژە کەوتە رێ. بەو نیازەی خواستەکەی ئیقبال الدولە بە شێخ بگەیینێ‌و داوای لێ بکات بۆ ماوەیەك پەلاماردانی شارەکە بوەستێنێ.

بەڵام شێـخ گفتی نەدا لەگـەڵ ئیقبـال الـدولە دانیشێ‌و گفتـوگـۆی لەگـەڵـدا بکـات. عوبـدیـدوڵـلا ئامـانجی راپـەرینـەکـەی کوردی بۆ ئابـۆت روون کردەوە. هەروەهـا ناحـەزیو نا بەدڵی خۆی بەرامبـەر کاربـەدەستـانی ئێـران دەرخـسـت. هەر دووای ئەمـە شێـخ، خەلیفـە سەیـد موحەمەدی دونیا دیدەی ناردە لای ئابۆت، بەو نیازەی وا لە ئابـۆت بکـات بروا بەنیـاز پاکی‌و پەیـوەنـدی چاك خوازی عوبـەیـدوڵـلا بەرامبـەر بە دەوڵـەتە ئەورووپاییەکان بکات و عەدالەتی راپەرینەکەی کوردی بۆ دوو پات بکاتەوە. سەید موحـەمـەد دۆخی کوردەکـانی بۆ ئابـۆت روون کردەوە، ئەو دۆخـەی لەوەدا نەمـابـوو چاوی لێ بپـۆشـرێت، ئەوەی بۆ دەرخست چۆن کاربـەدەستـان و مووچـە خۆرە ئێـرانییەکان یاسـا ئەخـەنـەژێـرپێی. بەتـایبـەتی کردەوە نارەواکـانی

موتەسەریفی ورمێ دەست نیشان کرد. لە ئەنجامی ئەم کۆبوونەیەوە، ئابۆت لە بیرەوەرییەکانیا ئەمانە ئەنووسێت: «شێخ نیازی وایە لە هەموو ئەو عەشرەتانەی تورکیاوئێران بدات کە خەریکی تالآنیو جەردەیین، چونکە ئەو دوو دەوڵەتە ئەوەیان لەباردا نییەو لەدەستیان نایە سنوورەکانیان لە جەردەیی و تالآنی کردن بپارێزن و یاسا بچەسپێنن و مافی رەوا بە گاورو موسڵمانەکان بدەن و بەیەك چاو سەیریان بکەن و رێگا بۆ گەشەکردنی خوێندەواریو پیشە سازیو قوتابخانەو کڵیسەکان پاك بکەنەوە. ئەوەی ئەو ئەیەوێت، تەنیا یەك شتە ئەویش پشتگیری کردنی مەعنەوی دەوڵەتە

ئەوروپاییەکانە. شێخ داوا ئەکات تاقی بکرێتەوە، ئەگەر نەیتوانی سەربەخۆییەك پێك بهێنێت ئەوە با لەبەردەم دادگای نوێنەرانی ئەورووپا موحاکەمەبکرێت و ئەنجامی ئەوەش چی ئەبێت با بێت.»[٢٧]

ئابۆت لە نوێنەری شێخی گەیاند کە دووبەرەکییەکەی نێوان کوردو ئێرانی بەلاوە گرنگ نییەو گوێیەکی ئەوتۆی ناداتێ.

لەوەش زیاتر، ئابۆت کە ئاگای لەوە بوو (٣٠٠) ئاسوورییە شاخاوییەکان بە سەرۆکایەتی میترۆپۆڵ مار ئیۆزیف، لایان داوەتە تەك کوردەکان، هەوڵیدا ئاسوورییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی لە دەورو بەری گۆماوی ورمێ ئەژیان، لەدووا رۆژدا نەدەنە تەك کوردەکان.[٢٨]

هەربۆ ئەو مەبەستە خێرا خۆی گەیاندە کڵێسەو لەوێ لە خەڵکەکەی گەیاند کە بەریتانیا هەمیشە چاوی لە چاکەو چارەنووسی دانیشتووە گاورەکانە، لەبەر ئەوە ئەبێ لە بزووتنەوەکەی کورد دوورە پەرێز بوەستن.

هەر لەسەرەتای بزووتنەوەکەدا، ئاشکرا دەرکەوت، شێخ تا چ رادەیەك حەز بە چاکەو پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ دانیشتووەکاندا ئەکات، بەتایبەتی لەگەڵ دانیشتووە گاورەکان و ئەورووپاییەکان دا. (واتە ئەو ئەورووپاییانەی لەئێران ئەژیان - وەرگێر -). شێخ بە هەموو جۆرێك هەوڵی ئەدا پارێزگاری ژیان و ماڵ و موڵکی دانیشتووە گاورەکان بکات. هەر بە فەرمانی شێخ سەدەها ئالآی شین رەنگ دروست کران بۆ ئەوەی لەسەر ماڵی گاورەکان دابنرێن و لەماڵەکانیتر جیا بکرێنەوە.[٢٩]

عوبەیدوللا بەو نیازەی دانیشتووان لە ناوەرۆك و سروشتی رزگاری خوازی راپەرینەکەی دڵنیابکات، فەرمانی دا کە دەست درێژی و تالآنی کردن لەو ناوچانەی شەریان تیادا ئەکرێت قەدەغەیە. بە واتەی پەیام نێری رۆژنامەی «ستاندارت»ی ئینگلیزی، شێخ فەرمانی هەڵواسینی سێ کوردیدا لەبەر ئەوەی دەست درێژیان کردۆتە سەر دانیشتووە بێ دەسەلآتەکان.[٣٠] لە (٢٣)ی ئەیلولدا، کاتێك شێخ بریاریدا، پەلاماری ورمێ بدات، ئابۆتی لە پەلاماردانەکەی ئاگادار کرد، بۆ ئەوەی گاورەکانی ورمێ پیا بگەن شارەکە بەجێ بهێڵن.[٣١]

داوای لە ئابۆت کرد لەگەڵ سیمۆن ئاغای ئەرمەنیدا شار بەجێ بهێڵێو شار بەجێ هێشتنیش بۆ دانیشتووەکان رێك بخات.

(واتە دانیشتووە گاورەکانی شار - وەرگێر).

«بەو پێشنیازە رازی بووم - ئابۆت لە بیرەوەرییەکانیا ئەنوو سێت - » بەیانی سەعات نۆ لەگەڵ دکتۆر کوهران و دوو پۆستەچییە ئێرانییەکانم روومان کردە دەروازەی گەورەی شارەکە...».[٣٣]

بەڵام ئیقبال الدولە کەوتە گوللە بارانیان و ناچاری کردن بگەرێنەوە. شێخ کە بەمەی زانی داوای لە ئابۆت کرد بەڵگە نامەیەکی بداتێ تا لە دووا رۆژدا بە بەڵگە دەرکەوێت کردەوەکەی شێخ تا چ رادەیەك پیاوانەو مەردانەبووە، بەڵام ئابۆت خواستەکەی بەجێ نەهێنا.

ئابۆت نەی ویست ئەو هەستی دۆستایەتییەی شێخ بەرامبەر بە ئەورووپاییەکان هەیبوو بەفیرۆ بدات. لە ئەنجامدا بە رەزامەندی شێخ گەشتێکی درێژی کرد. لە

حـ ـيزموه دەستی پێ کرد، چووه تەرگەوەرو شنۆو سولدزو سـمو گەرایەوە تەبرێز.

ئەم گەشتـەشی بەو نیـازە کرد شونـاسی لەگەڵ لەدۆخی تورتەکـانی ئەو ناوچـانـە پەیـدا بکات و نیازی دووا رۆژی تورتەکان دەست نیشان بکات.

تورکیا بە ئەوپەڕی ئاگایی‌و ورياييەوە ئەيروانییە تەشەنە کردنی رووداوەکان لە ئێران دا. تورکیا لە سەرێکەوە کە بۆ سوودی خۆی ئەگـەڕا، یارمـەتـی پێـك هێـنـانـی ـ ـپەڕینـەکـەیدا، (بـەو نیـازەی راپـەڕینـەکـە دژی ئێرانی بروسیٰ بێت)، لە سەرێکی تریشـەوە لە سەرکـەوتنـەکـانی کورد ئەسڵەمییـەوە. لەبـەر ئەوە هەر لە سەرەتـاوە کە هێشتا ـ ـپـەڕینـەکـەی کورد لە خۆ کۆکـردنەوەدا بوو، ئەستەمبووڵ کەوتە خۆ ئامادە کردنێکی جەنگی تەواو. دەستەی ئەرکانی هێـزی چوارەم، بە برووسکـە فەرمـانی پێدرا بێ‌وەستـان بکـەوێتـە سەربـازگرتن (رەدیف). بانکە گەورەکانی ئەستە مبوول، وەك: زەریفی، فۆستێرو هی‌تر، داوایان لێ‌کرا تا رادەی (٥٠) هەزار لیرە بە حەواڵە بۆ پێویستی جەنگی لە ئەرزرووم و وان و سیواس و کاستامۆن و تەرابزوون خەرج بکـەن. لەژێـریشـەوە بە نهێنی والی ئەرزرووم ئاگـادارکرا «دەست بگرێتەوەو هیچ خەرج نەکات و بەهەر حالێك بێ (٣٠) هەزار لیرە یەك کۆ بکاتەوە.». ئوبیرمیللەر کە دەرکی بەو خۆ ئامادە کردنە نە ئەکرد و ئاگای لێی نەبوو، گورج لە ئەرزروومـەوە بالێـوزی رووسیـای لە ئەستـامبـووڵ ئاگـادار کرد: «بـا جەنـابی پایـە بڵـنـدتـان شەرەفی ئەوەم بدەنێ، ئاگادارتان بکەم کە ئەو هەموو جەلبەو خۆسەرقاڵ کردنەی لە لەشکـرگـای عوسمـانیـدا روو ئەدات بە خۆڕایی نی‌یـە، هەموو هێزەکە، (نیازی لە هێزەکەی ئەرزرووەمە ـ وەرگێر)، پرسـەربـازکـرا، سەر بازەکـان بەچـەکەوە ئامادەن، لەمەش زیـاتـر ئەگـەر خراپ بۆی نەچـووبم، ئەهستـەمبوول داوای کردووە خێرا وەجبەکانی تری بەسەرباز گیراوەکان کۆ بکـرێنـەوە.»[35] [کـەواتـە ئوبیـر میللەر هەستی بە شتێـك کردووە لە کایـەدایـە بەڵام سەری لەم سەرو ئەو سەرەکـەی دەر نەکردووە ـ وەرگێر ـ].

هەر لە رۆژانی راپەڕینەکەدا، هێزی جەنگی عوسمانی لە ئەرزرووم کۆ بوونەوە، لە وانەوە، لە مووش و بتلیس و ئەرزنجانەوە، (١٦) بەتالیۆن رەوانەی ئەرزرووم کران، لە ئەرزنجـان و مامـا خاتـوو نیشـەوە (٢٨) تۆپی قەڵایی هەرە گەورەی بۆ هات. بارەگای گشتی هێزی چوارەم بەخێرایی لە ئەرزنجانەوە رەوانەی ئەرزرووم کرا، ئەو هێزانەش لەوێوە رەوانەی وان کران، کە نزیك ترین شوێن بوو لە ناوچەی رووداوەکان لە کوردستان.

لە تشـرینی یەکـەمـدا (٥٠) هەزار پێـادەو (٦٠) هەزار (رەوەند) و(٤٠) هەزار رەوەند دووایش ٢٠ بەتالیۆنی پیادە نێـردرا بۆ سامی پاشـا لە وان. شان بەشـانی ئەمـەش لە ئەستـەمبـووڵ کەوتنە بەخراپ ناوهێنانی شێخ بەخراپی بەو نیازەی لەکەداری بکەن.

حکـوومـەتی تورکیـا کەوتـەوە بەکـارهێنـانی داردەستـە خۆشـەویستـەکـەی. واتـە ئەم ئەو سەرۆك و سەرۆکی کورد لەیـەك راست بکـاتـەوەو بیـانکـات بەگژ یەکتردا. دەنگ و باسێك بڵاو بۆوە گوایە سوڵتان نیازی وایە لە ئەرزروومەوە تا وان و دیاربەکرو مووسڵ هەرێمێکی تایبەتی کوردستان پێك بهـێـنـێ‌و عەبـدوڵـڵا پاشـای خەڵـکی سلێـمـانـی‌و دەسنگـەخۆرەکـەی خۆی بکـاتە سەرداری ئەو هەرێمە. . سوڵتـان لەوە دڵنیـابـوو کە عەبـدولـڵا پاشـا رقی لە شێـخ عوبەیدوڵلایە. هەواڵێکی تریش بڵاو بۆوە، گوایە عەبدوڵلا پاشا بە لە شکرەکەیەوە لەگەڵ عوبەیدوڵلادا بەیەکاچوو بەو نیازەی کوردەکان لغاو بکات و بیانخاتە ژێر رکێفی سوڵتانەوە.[36]

لەم دۆخـە نا هەمـوارو ئاڵـۆزەدا، حکـوومـەتی ئێران بە هەمـوو جۆرێـك هەوڵی ئەدا بزووتنـەوەکـەی کورد لە ناو بەرێت. بە فەرمانی راستەو خۆی شا، هێزە سەرەکییەکانی ئێـران بە سەرکـردایـەتی گشتی ئیعتمـادوئەلسـەلتـەنە بەرەو تەبـرێـز کەوتـنـەرێ. بەشێکی تری هێـزی سوپـاییش بەسـەرۆکـایـەتی حەمـزە میـرزا حیشمەت لە تارانەوە کەوتە

ڕێ. ئەفسەری ئەورووپا یی (نەمسایی) لەگەڵ ئەم هێزەدا بوو. لە ڕێگــاش دا لەگــەڵ ئەو هێـزانـەی لە هەمـەدان و قەزوینەوە هاتبوون یەکیان گرت. بەواتەی گەلێك هەواڵ و سەرچاوە، ئەو هێزانەی لە تارانەوە هاتن لە لایەن ئەفسەرە نەمســاییــەکـانـەوە مەشقیـان پێ کرابـوو. هەرچی هێـزی سێهـەمـە، ئەوە بە سەرۆکـایەتی تەیموور خان لە (خو)یەوە کەوتەڕێ و ڕێگایەکی تری گرت.[37]

لەو کاتەی ئێران خۆی بۆ هێرش بردنە سەر ڕاپەڕیوەکان ئامادە ئەکرد، هێزە چەکدارەکانی کورد گەمارۆی تەبرێزیان دابـوو، وکـەوتبـوونـە تاڵان کردنی ناوچەکانی ئازربایجان، بەوەش هێزوتوانای جەنگاوەری خۆیان لاواز کرد. گەلێك لەو کوردانەی لە تاو برسێتی هاتبوونە ریزی ڕاپەڕینەکەوە، پاش ئەوەی تاڵانــی خۆیــان کرد ریــزی هێــزەکــانــی ڕاپەڕیوەکانیان بەجێ هێشت و بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە. ئەمە کارێکی کوشنــدەی کردە سەر هێـزی کوردەکـان و لە دووا ڕۆژدا خراپ بەسەریانا شکایەوەو بە جۆرێکی سلبی کاری کردە سەر کردەوە جەنگییەکانی ڕاپەڕیوەکان دژی هێزەکانی شاه.

شای ئێــران هەر بەوەوە نەوەســتــا خۆی بۆ لێــدانــی بزووتنـەوەکـەی کورد ئامـادە بکـات، بەڵکو پەنای بردە بەر ڕووسیـاو بەریتـانیـاش، بەونیـازەی بە جووتە زۆر لە تورکیا بکـەن ڕێی و شوێنێـك بدۆزیتـەوە بزووتنەوەکەی کوردی پێ لەناو بەرێت.[38]

کاربەدەستانی چار، کە «ئەرکی دۆستایەتی سەرشانیان» بەرامبــەر حکــومـەتی شا بە پێویست دائـەنـا، هێـزێکی گەورەیان لە نەخچوان، لە نزیك سنووری ڕووسیاو ئێراندا بە سەرۆکایەتی ئەلخازۆف کۆ کردەوە.

لە ١١ تشرینی یەکەمدا، لە یەك بینینێکی ڕەسمیدا لە نێوان شاو تۆمسۆنی باڵیۆزی بەریتانیا لە تەهران، شا داوای کرد، حکومەتی بەریتانیا زۆر لە تورکیا بکات دژی کوردە ڕاپـەڕیـوەکـان بکـەوێتـە شەڕەوە. هەر لەو ڕۆژەدا تۆمسـۆن حکومەتەکەی خۆی لەو یەك بینینە ئاگادار کردوو لەوە دووا کە ئەنجامی سەرکەوتنی کوردەکان لە ئێران ئەگاتە ئەوەی ڕووسیـا ڕاستـەو خۆ دەست بخـاتـە کاروبـاری ئێـرانـەوە. «خـاوەن شکـۆ ـ واتـە شا ـ نووسـەر» لەوە ئەترسێ ڕووسیا سوود لەو کەم تەرخەمییەو خوێن ساردییەی بەریتانیا ببینی و ئەوە بەهــەل بزانێ، هەتــا بەنـاوی پاراستنی بەرژەوەنـدی هەمـوو ئەو ڕووسـە هاونیشتمـانـە زۆرانـەی لە ئازربـایجان ئەژین، بەتیـژی دەست بخــاتــە کارو باری ئێــرانـەوە، بیانووەکەشی ئەوەبێت ئێران پێی ناکرێت مافی ئەوانە بپارێزێت.»[39]

لە هەمـان کاتیشـدا تروتیـری کۆنسـوڵی ئینگلیزی، ئەو ڕایەی دەرخست، کە دوور نی یە کاربەدەستانی عوسمانی لێ قەومــانــدنـەکـەی شێـخ لە ئێـران بەهـەل دابنێن و بە تەواوەتی لە تورکیا لەناوی بەرێت.[40]

لە ئەنجامی زۆر لێ کردن و سەر کردنە سەر عوسمانی لەلایەن ڕووسیاو تورکیاوە، حکومەتی عوسمانی بۆ ئەوەی ڕێگــا لە کوردەکــان بگــرێت لە ئێــرانــەوە بەرەو تورکیـا نەگەڕێنەوە، هات چەند مەخفەرێکی (٩) بەتالیۆنی لەسەر سنوور دانا.

حکــومـەتی ئێـران ناچـار کەوتـە بەکـارهێنـانی هێـزی سوارە. ئەو هێـزەی تەنیـا لە ڕۆژانی شەڕدا بەکـاری ئەهێنا (واتە شەڕی خۆی لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا ـ وەرگێڕ)و پەنای ئەبــردە بەر. نزیکــەی (٢٠) هەزار سوارەی کاراداگتسی و شاخسیوانی بەدەنگ شاهەوە چوون.[41] ئەم هێزی سوارە نیــزامییــە یاریــدەیــەکی زۆری شاهیدا بۆ لەنــاو بردنی ڕاپـەڕینـەکەی کورد. بەدەستێکی ڕەق و دەروونێکی ڕقاوی بێ بەزەیی ئەو هێزە کەوتە گیانی هەموو ناوچەکانی ئێران ئەفسـەرە نەمسـەوییەکان، ئەوانەی لەسوپای ئێراندا ئیشیان ئەکرد پشتگیری کردەوە دڕندەییەکانی ئەو هێزەیان کرد.

تەیـمــوور خانـی سەرداری ماکــو، بە گەرمی خۆی بۆ لێدانی ڕاپەڕینەکەی کورد ئامادە کرد. بە زۆری هەموو هێزە جەنـگییــەکــانی خانێتی پڕ چەك کردبــوو. «بــەگشتی ـ مینۆرسکی لەو گەشتەیدا کە بە خانێتی ماکین دا کردی، لە

ـچریەکەیدا ئەنووسێت ـ لە منال و پیاوانی پیری بەتەمەن جوو بەولاوە کەسی تر نەماوەتەوە». [42] جگە لەمەش تیموور خان زۆری لە دانیشتووە ئەرمەنەکان کرد بەشداری پەلامردا نەکەی کورد بکەن. [43]

شێخ عوبەیدوللا کەبیستی تەیموورخان بە لە شکرێکی پێنج هەزار کەسەوە، لە سەلماسەوە بەرەو ورمێ کەوتۆتە ڕێ. سوپایەکی دوو هەزار چەکداری بە سەرۆکایەتی محەمەد سدیق ناردەسەر. بەڵام تەیموور خان توانی ڕێگەکەی خۆ بگۆڕێت و لە ڕێگایەکی ترەوە بەرەو شارەکە وتە شاری ورمێ ـ وەرگێر ـ ) بروات. ئەوسا عوبەیدوللا ناچار بوو خۆی روو بەرووی تەیموور خان بوەستێ. لە یەکەم بەیەکاچووندا لە نزیک (بیلاوی)° عوبەیدوللا تووشی نەهامەتی هات. شێخ ناچار بوو بەهێزەکەیەوە بەرەو جنیقەلا بگەڕێتە دوواوە. تەیموور خان شوێنی کەوت، ئەمریگاش کەوتە ئازار دان و تالان کردنی دانیشتووە بێ دەسەلاتەکانی کوردو ئەرمەن و ئێرانییەکانی ورمێ.

ڕاپەڕیوەکانیش، ئەوانەی بەرەو ساوجبلاق ـ تەورێز ئەرۆیشتن کەوتنە دۆخێکی ناهەموارو تەنگانەیەکی پڕ ئەندێشەوە. کاربەدەستانی ئێران بێ بەزەییانە تۆڵەیان لە کوردەکان سەندەوە. حاجی میرزا عەبدولقاسمی موتەسەریفی میانداو سوێندی خواردبوو، بەدەستی خۆی لەملی هەموو کوردێکی بەشدار بووی ڕاپەڕینەکە بدات. کاربەدەستانی تەبریز سەروەر پشتگیری ئەو دڵ ڕەقییەیان کرد. حاجی میرزا عەبدولقاسم بەرامبەر بەوخوێن ڕشتنەی لە کوردی کرد خەلاتی سەد هەزار تومەن کرا. [44]

بگرە هەتا ئەو کوردا نەش کە بە ئارەزووی خۆیان چوو بوونە ژێر سایە یەوە ئەو دەردەیان چێشت. شوولشێفسکی لەم رووەوە نووسی: «. . . بەلای کەمەوە هەموو ئەو کوردانەی لایان دابووە لایان (واتە لای ئێرانییەکان ـ نووسەر ـ ) لەسێدارە دران یان کەلەپچەکران.». [45]

خۆ فرۆشتنی سەرۆکە کوردەکان، ڕاکردن و بەجێ هێشتنی هێزی ڕاپەڕیوەکان، عەبدولقادرو هەمزاغای ناچار کرد خێرا بەرەو دووا بگەڕێنەوە. لە لای بینابەوە کوردەکان و هێزەکانی ئێران بەیەکدا چوون، لە ئەنجامدا هێزی ڕاپەڕیوەکان زیانێکی زۆریان لێ کەوت. [46]

عەبدولقادر لەو نامەیەیدا کەبۆ باوکی نارد، هۆی سەرەکی لێ قەومان و ژێرکەوتنەکەی ئەباتەوە سەر خۆ فرۆشتنی سەرۆکە کوردەکان. «. . . هێندێك لە پیاوەکانم وازیان هێناو لایان دایە لای دوژمن. هەر لەبەر ئەمەش تووشی نەهامەتی هاتین. . . پیاوەکانم ئارەزووی هەلاتنیان هەبوو، ماوەی چەند ڕۆژێك هەوڵم دا دەست بەسەر ئەو کەم و کوورییەدا بگرم. ئەگەر ترس و لەرز دای نەگرتنایە، ئەوە لەسەرخۆو بە ئاسانی دابین ئەکران». [47]

لە نامەکەیدا ناوی ئەم سەرۆکە کوردە خۆ فرۆشانە تۆمار ئەکات: جەلال خانی قەرە پەپاخ و سمایل ئاغا حاجی خۆشا.

ئەو زیانەی سالی ١٨٨٠ لە ڕاپەڕیوەکان کەوت، بە زۆری بە هۆی ئەو سەرەك عەشرەتە کوردا نەوە بوو، کە تەنیا جەردەیی و تالانی کردن هانی دابوون بێنە ریزی ڕاپەڕینەکەوە. دۆخی ڕاپەڕینەکەش هێندەی تر بەرەو نوشوستی چوو لە ئەنجامی ئەوەی چەند دەرەبەگێکی کوردی بەشدار بووی ڕاپەڕینەکە ئامانج و مەبەستیان تەماع و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوو.

هێزەکانی ئێران کە بەرهەلستییەکی ئەوتۆیان بە خۆیانەوە نەدی، بەدرێژایی ئەو ڕێگاو بانەی پیایا ئەرۆیشتن گوندەکانی کوردیان تالان ئەکردوو ئەسووتاند. هەر کوردیکیان بەر دەست بکەوتایە ئەیانکوشت، بەزەییان بە منال و ئافرەت و پیرە کاندا نە ئەهاتەوە. هێزەکانی سوپاهسالار کە لە تارانەوە نێردرابوو، گەلێك لە گوندەکانی دەورو بەری سنەیان سووتاند. بە واتەی ڕۆژنامەی «وەقت» سوپاهسالار، فەرمانی دابوو، هێزەکانی بەزەییان بە کوردا نەیەتەوەو گوندەکانیان بسووتێنن و هەرچی گەنم و جۆیەکیان هەیە لە ناوی بەرن و بەبرسێتی بە جێیان بهێلن. [48]

سەربازە ئێرانییەکان، کە تالانی کردن و رووت کردنەوە

مەست و سەرخۆشی کردبوون، کوێرانە دەستی خۆیان ئەوەشاندو گوندی وەهاشیان تاڵان ئەکرد کە دانیشتووەکانی کورد نەبوون. هەر بۆ نموونە هەموو ئەو گوندانەی دەورو بەری مەجیدخان کە بەئیجار درابوون بەنزار بەگی هاو نیشتمانی رووس تاڵان کران و سووتێنران. هێزەکانی اعتماد ئەلسەلتەنەو حیسام ئەلدەولە لەوە کەمتریان نەکرد. ئەو سەربازانەی لە لایەن سەرکردەکانیانەو لغاو نە ئەکران لە هەموان زیاتر کردەوەی دڕانـدنەو نامرۆڤایەتییان لێ ئەوە شایەوە. ئەفسەرە نەمسەوییەکان هێندەی‌تر ئاگری تاڵانی‌و ئازاردانی خەڵکیان خۆش تر ئەکرد. هەر بەهۆی ئەوە ـ شەوە کردەوە درندەییەکان تەشەنەیان ئەکرد. هەر ئەو ئەفسەرانە فەرمانیان دا بە سەربازەکانیان، گوندەکانی مەجیدخان بسووتێنن و دانیشتووەکانیان لەناو بەرن. کاتێکیش حسام ئەلدەولە، نارەزایی خۆی بەرامبەر ئەو کردەوانە دەربڕی‌و هەرەشەی لە سەرۆکی ئەفسەرە نەمسەوییەکان کرد بەوەی بێ وەستان تاران لەو کردەوە درندەییانە ئاگادار بکات، لە وەلامدا، سەرۆکی ئەفسەرە نەمسەوییەکان بۆی دەرخست کە «تاران خۆی فەرمانی داوەتێ تەڕو وشك بەیەکەوە لە کوردستان بوسوتێنێ‌و لە ناوبەرێت». (٥٠)

ئەفسەرە ئێرانییەکان خاوەیان لەبەگ و خانە کوردەکان ئەسەند بەرامبەر بەوەی دەسەڵاتیان بەسەر گوندەکانیانەوە بمێنێتەوە. جگە لەمەش کاربەدەستانی ئێران (٤٠) هەزار تومەنیان وەك غەرامەو تەعویزی تاوانی کۆن لەکوردەکان سەند. (٥١)

شولـژێفسکی لە راپۆر تەکەیدا کە لە (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٨٠دا نووسیویێتی لەوە ئەدوێ، کە لە رۆژانی راپەرینەکەدا چەند هەزار کوردێك کوژران و زیاتر لە دووسەد گوندیشیان تاڵان کران و سووتێنران. (٥٢)

لە ئەنجامی هێرش و پاڵە پەستۆی هێزەکانی ئێرانەوە، شێخ عوبەیدوڵلا هەمزاغاو سەرۆکە کوردەکانی‌تر، بەخۆیان و هێزەکانیانەوە لە ڕێی شنو و لا جانەوە چوونە هەرێمی مەرگەوەر. چوار فەوجی پیادەو (١٥٠٠) سوارە بە چوار تۆپەوە، بەسەرۆکایەتی سەرتیپ ئاغا خان و ناسر ئەلمولك، شوێنیان کەوتن. (٥٣) لە تشرینی دووهەمدا، راپەریوەکان سنووریان بڕی‌و چوونە خاکی تورکیا ئەوسا حکوومەتی شاه، داوای لە ئەستەمبوڵ کرد سەرکردە کوردەکانی تەسلیم بکات. بەریتانیاو نەمسا، (٥٤) پشتگیری ئەم داخوازییەیان کرد. بۆ نموونە هوشیونی باڵیوزی بەریتانیا لە ئەستەمبول، داوای لە کاربەدەستانی عوسمانی کرد «یان خۆیان سزای عوبەیدوڵلا بدەن، یاخود تەسلیمی ئێرانی بکەن». (٥٥)

پاش ئەوەی عوبەیدوڵلاو عەبدولقادر چوونە خاکی تورکیاوە، زوربەی سەرۆکی عەشرەتە کوردەکانی ئێران تاعەتی خۆیان پێشانی شاەدا. بەتەنیا عەشرەتی مەنگوور بەسەرۆکایەتی هەمزاغا لەمەیانا مایەوە و دەست بەرداری بەرهەڵستی کردن نەبوو، ئەو عەشرەتەی لە سەرەتای راپەرینەکەوە لەگەڵ کاربەدەستانی ئێراندا نەگەیشتە یەکالا کردنەوەیەکی مام ناوەندی. شا، هێزێکی چوار فەوجی سوارەی نیزامی بە سەرۆکایەتی عەلی خانی ئەفشار ناردە سەر ئەم عەشرەتە مل نەدەرە.

سەربازە ئێرانییەکان گوندەکانی هەمزا غایان وێران کرد. گەلێك لە کوردەکانیان کوشت و بەدیل گرت. بە واتەی هەواڵ نووسی هێزەکانی ئێران، هەزارەها وشتر بە باری گرانی تاڵانییەوە لە گوندەکانی عەشرەتی مەنگوور بە دی ئەکران. (٥٦)

هەمزاغا لەگەڵ چەند چەکدارێکی کورددا، خۆی گەیاندە ناوچە شاخاوییەکانی سەر سنووری تورکیاو ئێران و لەوێ کەوتە خەباتی پارتی زانی. (٥٧) هەمزاغا شەبەیخوونی لە هێزە پێشرەوەکانی ئێران. کردو ترس و لەرزی لە ناویانا بڵاو کردەوە.

حەسەن عەلی خانی موتە سەریفی سنە، بریاری‌دا لەڕێی فرت و فێڵەوە هەمزاغا بگرێت، سوێندی خواردو دەستی بۆ هەمزاغا دا بە قورئاندا و بەڵێنی دایە کە ئەگەر لە

...نی جەژنـدا بێتـەلای لاقەی نەکرێت. هەمزاغا بروای ...م سوێنـدو پەیمـان دانـەکـردو لەگـەڵ چەنـد سوارەیـەکی خۆیــدا ڕۆژی جەژن هات بۆ سنـە. بەڵام موتـەسـەریف سوێنـدەکـانی خۆی خستـە ژێـرپێی و هەمزاغاو سوارەکانی گرت و هەمـوویـانی کوشت و کە للەی هەمـزاغای بەدیاری ...د بۆ سەرکردەی گشتی هێزەکانی ئێران.[٥٨]

عوبەیدوڵلا پاش ئەوەی ڕاپەڕینەکەی سەری نەگرت، لە شەمدینان. خۆی لە بارەگاکەیدا قایم کرد.

ئەو درنـدەیـەتییـەی هێـزەکـانی ئێـران پیشـانی ڕاپەڕیوە کوردەکـانیـان دا، گەلێـك لە کوردەکـانی ناچار کرد سنوور ...ن و پەنـا بەرنـەبەر تورکیا. بە واتەی ئەستەمبوول نزیکە ٦٠ - ٧٠ هەزار دانیشتووانی ورمێ [ئەبێ نیازی لە ورمێو دەوروبەرەکەی بێت - وەرگێر - ] ناچار بوون ڕوو بکەنە تورکـیـا. نزیــکــەی دوو هەزار لەوانــە ڕوویــان کردە هەکاری.[٥٩] هەر پاش ئەوەش، ژمارەیەکی زۆری کورد لە ئێرانەوە کەوتنە کۆچ کردن.

کاربــەدەستــانی ئێــران بەو نیـازەی ڕێگـا لەوە بگـرن ڕاپەڕینەکەی کورد دووبارە نەبێتەوە، بڕیاریان دا کوردەکان پەرش و بڵاو بکــەنـەوە. بە تەمـای ئەوە بوون کوردەکـانی ماکـو، سنـە، کرمـانشـاو ناوچەیتر، ڕەوانەی شوێنی هەرە دووروو چۆڵی ئێران بکەن.[٦٠]

گەلێـك لەو عەشـرەتـە کوردانـەی بە چالاکی بەشداری ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلایان کردبوو، ناچار کران واز لەژیــانی کۆچــەرێتی بهێنن و دامــەزرێن. لە ئەنجـامی ئەمەشدا عەشرەتی وەك زرزا کەلە دەوروبەری شنو ئەژیا بووە ژێـر دەستـەو ئەڵقـە لەگـوێی ئەفشـارەکـان، ئەوانـەی لەلایـەن کاربـەدەستـانی ئێرانەوە بۆ سەر بەکورد شۆڕ کردن پشتگیری ئەکران.[٦١]

بەڵام ئەم جۆرە کردەوە ناهـەمـوارو پڕ لە زۆرداریـیـانـە، ڕێگایان لەوە نەبەست ڕاپەڕینی تری کورد بتەقێتەوە. هەر لەبــەر ئەمــەش حکــومــەتی شا، بێ وچــان داوای لە ئەستەمبوول و دەوڵەتە ئەورووپاییەکان ئەکرد قەناعەت بەوە بکـەن ئەبێ شێـخ بگـیـرێت و لەهـەمـوو جۆرە جمو جوڵێك بخـرێت. بۆ ئەم مەبـەستـەش، کۆلـۆنێـل میرزا ڕەزا خانی یاوەری شاو بارۆن فۆن لێتنیوری نەمسەیی نێردران بۆ وان. میـرزا ڕەزاخـان کەدی کاربـەدەسـتـانی تورك پشتی ناگـرن ناچــار بوو بگــەڕێتــەوە تاران. ئەوســا حکــوومـەتی شا بیرەوەرییەکیدا بەکاربە دەستانی تورك. لەو بیرەوەرییەدا بە «کەم تەرخەمی» تاوان باریان ئەکات، ئەو کەم تەرخەمییەی کوردەکـان بەسـەرۆکایەتی عوبەیدوڵلا کردیانە بیانوویەك بۆ ئەوەی پەلامــاری ناوچــەکــانی ئێـران بدەن و کوردەکـانی ئێــرانیش بەدەنگیــانــەوە بچن و یارمـەتییـان بدەن.[٦٢] لە (٢٨)ی نایابری ساڵی ١٨٨٠دا، ئەستەمبوول وەڵامی ئەو بیــرەوە - رییــە دایــەوە. ئەستــەمبــووڵ بۆ ئەوەی هەستی دۆســتــایــەتی خۆی پیشــانی ئێــران بدات ئەو هەنگــاو هەوڵــدانـانـەی خۆی دەست نیشـان کرد کە بوونـە مایـەی سەرنــەکـەوتنی کوردەکـان: **«سـوپـاس بۆ ئەو هەوڵ دان و هەنگاوە بەکارانە - لە نامەکەی ئەستەمبووڵدا نووسراوە - کە وایـان کرد ڕاپـەڕیـوەکـان بۆیـان نەکرێت یەکێتی ڕیزەکانی خۆیان بپارێزن و لە ئەنجامدا دوو بەرەکی لە ناویانا سەری** دەرهێنا. ئەمەش هێرش بردنی هێزەکانی ئێرانی ئاسان تر کرد.»[٦٣]

ئەستـەمبـوولیش کاربەدەستانی ئێرانیان تاوان باری ئەوە کرد کە ڕێگـایـان بەکـوردەکانی ئێران دا، بەغداو مووسڵ و وان تاڵان بکەن و گلەییشیان لەوە کرد چۆن کاربەدەستانی ئێــران لەوەختی خۆیــدا گوێیــان لە ئاست شکـاتـەکـانی تورکیادا داخست.

شای ئێران لەوە ئەترسا ڕاپەڕینێکی تری کورد بتەقێتەوە. لەبەر ئەوە وازی لە تاوان بارکردنی تورکیا هێناو داوای لە موحسین خانی باڵیــوزی ئێــران کرد لە ئەستــەمبـــووڵ، سەربکاتە سەر کاربەدەستانی تورك و وایان لێ بکات گفت بدەن ڕێیو شوێنێکی وەهـا بگـرن، ڕێگـا لە عەبـدولقـادر بـەستێت جارێکیتـر لە دووا ڕۆژدا پەلامـاری ناوچـەکانی ئێــران بداتــەوە.[٦٤] بەڵام ئەم هەویــرە ئاوی زۆر کێشـاو

گفتوگۆکە درێژەی کێشا. ئەمەش سوودێکی زۆری بۆ عوبەیدوللا هەبوو. شێخ ئەم هەلەی لەدەست نەدا. لەبەر ئەوە هەر کە گەیشتە بارەگاکەی [واتە شەمدینان لە کوردستانی تورکیا - وەرگێر] گورج کەوتە ئامادە کردنی راپەرینێکی نوێ. ئەمجارەش کەوتە نامە ناردن بۆ سەرۆکە کوردەکان و داوای لێ کردن بەشداری راپەرینە نوێیەکەی بکەن.

**پەراوێزەکان:**

---

١ - لەو رۆژانەدا عەبدولقادر لەئێران ئەو چوار گوندانەی بەرێوە ئەبرد کەشا بە دیاری دابوونی بە باوکی، دووای شەرەکەی رووسیاو تورکیا زوربەی گوندەکانی سومای، کە کوردی سونی مەزەب بوون، شێخ عوبەیدوللایان کردە گەورەی خۆیان و باج و سەرانەیان بەو ئەدا.

٢ - کامساراکان، پەلاماردانەکەی...! لاپەرە. ٣٦

٣ - «corres pondence...! no 5 :1881», p.g

٤ - کامساراکان. پەلاماردانەکە...! لاپەرە. ٣٧

٥ - خێلەکەی هەمزاغا بەشێك بوو لە عەشرەتە گەورەکەی بەلباس. ئەم عەشرەتە لە ناوچەکانی سەر سنووری عوسمانیو ئێران ئەژیا. لەبەرئەوە دۆخێکی نیمچە سەربەخۆیان بۆ دروست بوو بوو. عەشرەتی بەلباس سوودی لە شەرەکانی نێوان عوسمانیو ئێران دەبینیو زستانانی لە عوسمانیا ئەبردە سەرو هاوینانیش ئەچوو شاخەکانی ناوچەی ئوشنوو لاهیجان لە ئێران و لەوی کۆچ رەوی خۆی ئەکرد. پێش شەرەکەی رووسیاو عوسمانی، کاربەدەستانی بەغدا هەمزاغایان گرتبوو لەوێ بەدەست بە سەری ئەژیا، دووای ئەوە لە بەندیخانەکانی ئەستەمبوول توندکرا پاش شەرەکەی رووسیاو عوسمانی بە چەند سالێك رێگایدرا لە بەغدا بژی. هەلی هێنا رای کردوو خۆی گەیاندەوە ناو عەشرەتەکەی خۆی لەئێران و بووەوە سەرۆکی عەشرەتەکە («مشاك»، ١٨٨٠، ژمارە ٢٠٣٠).

٦ - ئاف پ ر، ق. «بیعسەیەك لە..»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦، ئۆب. ٥٢٨، د. ١٢٠٢، لاپەرە. ١٢ئۆب

٧ - هەمزە عەبدوللا، شۆرش...! لاپەرە. ١٢ - ١٣

٨ - کامساراکان، پەلاماردانەکەی...، لاپەرە. ٤٠

٩ - هەمان سەرچاوە. لاپەرە. ٤٠.

١٠ - «corres pendence...! No 5 (1881) .p. 47

١١ - ibid., p. 47

١٢ - ئاف پ ر، ف. «ئەرشیفی سەرەکی ١ - ٩»، ١٨٨٠ - ١٨٨٢، د. ٢٩، ئۆب.

١٣ - «correspondence ...! No 5 (1881).p. 44

١٤ - ibid

١٥ - «قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٢٨٤

١٦ - «موورچ»، ١٩٠٦، ژمارە. ٨، لاپەرە. ٦

١٨ - «وەقت»، ١٨٨٠، ژمارە. ١٨٦٨

١٨ - «correspondence ...! No 5 (1881) ,p.32

١٩ - ویلسنی موبەشیری ئەمەریکایی، بە شێوەیەکی راست و رەوان باری سەرنجی خۆی دەرئەبری و ئەلێ، دەست خستنە خوێنی شیعەکانی ئێران کارێکی راست نەبوو، «چونکە ئەو کردەوەیە ئێرانییەکانی لێ راست. کردەوەو هەموو هەستێکی دۆستایەتی، کە ئەبوو بەرامبەر کوردەکان هەبێت، بەو کردەوەیە لەناو چوو.» s.cwiLson,persian ..; p. 112

٢٠ - کامساراکان، پەلاماردانەکەی...! لاپەرە. ١٤

٢١ - هەمان سەرچاوە، لاپەرە. ٤١

٢٢ - s.G. wiLson, persia...! p. 109

٢٣ - «the times», 17. xl. 1880

٢٤ - «قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٣١٧

٢٥ - ئاف پ ر، ف. «بیعسەیەك لە..»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦، ئۆب. ٥٢٨ ئا. د. ١٢٠٢، لاپەرە. ١١٣

٢٦ - «correspondence...» No 5 (1881).p. 38

٢٧ - Ibid., p. 39

٢٨ - پلۆ ڤدێنی کونۆلی بەریتانیا لە بەغدا، هەموو ئەو دەنگ و باسانەی بیستبوونی، لە رۆژی (٨)ی تشرینی یەکەمدا بەگوێشینی بالیوزی گەیاندو ئەلێ کە ژمارەی ئەو ئاسوورییانەی بەشداری راپەرینەکەی کوردیان کردووە، ئەگاتە چەند هەزار

کەمێك.

«corres pondence...! No 5 :1881». p.43

٢٩ - (موورچ)، ١٩٠٦، ژمارە. ٨، لاپەرە. ١٣

٣٠ - سەیری رۆژنامەی: «قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٢٢٩ بکە.

٣١ - «correspondence...! No 5 (1881). p.38

٣٢ - ئەم سیمۆن ئاغایە - کوردوچکی سیمۆن چلینگاریان، لەکاتی دیدە نییەکەی کلایتۆن و عوبەیدوڵلا لەوێ بوو. بە رای ویلسون، ئامانجی سیمۆن ئاغا ئەوەبوو مافی گاورەکان لە دەست درێژی بپارێزێت. بەڵام چەند سەرچاوەیەکی باوڕ پێ کراو لەو رایەدان کە چلینگاریان (ئەوەی هاونیشتمانێکی رووس بوو)، راوێژ کەرێکی گرنگ و سەرەکی شێخ عوبەیدوڵلا بوو لە مەیانی سیاسەتدا. بگرە سەرچاوەی وەها هەن. بە وەزیری کاورباری دەرەوەی شێخ عوبەیدوڵلای دائەنێن (ئاف پ ر ،ف. «باڵیوزخانە لە ....»، ١٨٨١، د. لاپەرە. ٢).

٣٣ - «correspondence...! No 5, (1881) ,p,38»

٣٤ - Ibid

٣٥ - ئاف پ ر، ف. «ئەرشیفی سەرەکی ٥ئا ٢»، ١٨٨٠، ئۆب. ١٨١، د. ١٠٩٥، لاپەرە. ٧٩ ئۆب.

٣٦ - «دەنگ و باسی پەیام نیری میریی»، ١٨٨٠، ژمارە. ٢٦٣، «قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٣١٦

٣٧ - «the times», 29.x. 1880

٣٨ - ئاف پ ر، ف. «ئەرشیفی سەرەکی ١ - ٩»، ١٨٨٠ - ١٨٨١، ئوب، ٨ د. ٢٩، لاپەرە. ٥

٣٩ - «correspondene ...! No 5, p.11»

٤٠ - ibid ,p. 22

٤١ - ل.ك. ئەرتامۆنۆڤ، ئازربایجانی ژوو روو، تفلیس، ١٨٩٠، لاپەرە. ٧٥، ٧٨

٤٢ - ڤ.ف، مینۆرسکی، چەند سەرنجێك دەربارەی گەشتەکەی خانێتی ماکیندا - «زانیاری دەربارەی لێکۆڵینەوەی رۆژهەلات»، بەرگی ١، س پ ب، ١٩٠٩، لاپەرە. ٣٠

٤٣ - «مشاك»، ١٨٨٠، ژمارە، ١٩٩،

٤٤ - کامساراکان، پەلاماردانەکەی...! لاپەرە. ٤٣

٤٥ - ئا ڤ.پ ر، ف. «بیعسەیەك لە...»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦، ئۆب. ١٢٨ ئا، د. ١٢٠٢، لاپەرە. ١٠٤

٤٦ - «the timesM, 3.x1. 1880

٤٧ «correspndence ...! p. 77

٤٨ - «وەقت»، ٣ - ٢ - ١٨٨١

٤٩ - ئاڤ پ ر ،ف. «بیعسەیەك لە ..»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦/، ئۆب. ٥٢٨ ئا د. ١٢٠٢، لاپەرە. ٩٥ ئۆب.

٥٠ - هەمان سەرچاوە، لاپەرە. ٩٦ ئۆب.

٥١ - «correspondence ...! p. 54

٥٢ - ئاڤ پ ر ،ف. «بیعسەیەك...»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦، ئۆب، ٥٢٨ ئا د. ١٢٠٢، لاپەرە. ١٣٧

٥٣ - هەمان سەرچاوە، لاپەرە. ١١٣ ئۆب، (هەروەها سەیری: بکە «correspondence ...! p. 57

٥٢ - «corresponce ...! p. 58

٥٥ - ئاف پ ر، ف. «ئەرشیفی سەرەکی ١ - ٩»، ١٨٨٠ - ١٨٨١، ئۆب. ٨، د. ٢٩، لاپەرە. ٤٧ ئۆب.

٥٦ - «correspondence ...! p. 80

٥٧ - wiLson, persian ..., p. 120

٥٨ - ئاف پ ر، ف. «بیعسەیەك لە ..»، ١٨٧٧ - ١٨٩٦، ئۆب. ٥٢٨ ئا، د. ١٢٠٢، لاپەرە. ١٩٩ - ٢٠٠

٥٩ - «correspondenc ...! p.65

٦٠ - (قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٣٠٤

٦١ - ئا.م. کالیوباکین، کورتە باسێك دەربارەی هێزی سوپایی ئێران لە ساڵی ١٨٨٣دا، «کەرەستەی جوگرافی و توپوگرافی و احصائی دەربارەی ئاسیا»، ١٨٨٣، ژمارە. ٤، لاپەرە. ٥٨.

٦٢ - «correspondence ...! p. 63

٦٣ - ibid

٦٤ - ibid

٦٥ - ئاف پ ر ، ف. «باڵیوزخانەلە...»، ١٨٨١، د. ١٥٦٧، لاپەرە. ٣١

٦٦ - «قەفقاس»، ١٨٨٠، ژمارە. ٣٤٣؛ هەروەها سەیری «مەگوو ئایەستان»، ١٨٨٠، ژمارە، ٩٨ بکە.

ملخص البحث

# إنتفاضة الأكراد في ايران بقيادة الشيخ عبيد الله سنة ١٨٨٠

ترجمة د. كاوس قفطان

في بداية آب ١٨٨٠ طلب متصرف ورمي من عبد القادر بن الشيخ عبيد الله جمع الضرائب في منطقة(سوما). فرفض طلبه. فاستغل المتصرف ذلك لبذر الشقاق في المنطقة، ونتيجة تعسف السلطة انتفض حمزة آغا رئيس عشيرة منكور الكبيرة وانضم الى الشيخ عبيد الله، فقد جاء في تقرير القنصل الروسي في وان «إن الأكراد الذين يواجهون تعسفاً واستغلالاً فظيعين من السلطات الأيرانية، قرروا الوقوف بوجه السلطة.» ويستمر القنصل قائلاً: «إن أكراد ايران ينضمون الى الشيخ ويعتبرونه منقذاً». وفي الشهر نفسه قرر الشيخ ارسال الف مسلح لمساعدة حمزة أغا. تقرر أن تقوم القوة الرئيسة بقيادة الشيخ عبد القادر وحمزة آغا باحتلال ساوجبلاق وبعد ذلك تبريز. اوعزت الى قوات أخرى لاحتلال مناطق اخرى. كان الشيخ القائد العام لهذه الحملة. بمجرد دخول قوات الشيخ الحدود الأيرانية انضم اليه اعداد كبيرة من المسلحين الأكراد. لقد جاء في احد تقارير كامباراكان، بأن اكراد ايران يظهرون اخلاصاً نادراً للشيخ ولقضية الوحدة الكردية. لقد وجه الشيخ رسائل الى السلطات الأيرانية والى الدول الغربية عن طريق بعثاتها السياسية والدينية. في الرسالتين التي وجهها الى كوهران، المبعوث الديني الأمريكي تتوضح ابعاد الحركة وبواعثها. في رسالته الأولى يوضح حقائق ملموسة عن مدى ظلم وتعسف السلطات الأيرانية، مؤكداً بأن الطريق الوحيد لخلاص الأكراد هو الثورة. في نهاية رسالته يطلب منه ايصال المشكلة الى القنصل البريطاني مع بذل الجد لفهمها. يعترف الشيخ بوجود عشائر كردية تمارس النهب والسلب واشاعة الفوضى في المنطقة ويتعهد بالقضاء عليهم في حال تسلمه السلطة.

لقد حاول الشيخ وبذل جهده لأستمالة بعض الأسماء الكبيرة الى حركته، من بينهم عباس ميرزا المطالب بعرش ايران والذي رفض طلبه. وفي ايلول انتشرت الأنتفاضة واحتلت مناطق شاسعة. يعترف مواطن ايراني في رسالة له، بأن المنتفض ليس عشرين الف مسلح كردي، وانما كوردستان برمتها. أنضمت معظم العشائر الكردية في ايران الى الشيخ. بلغ عدد المسلحين حوالي مئة الف مسلح. وقف الشيخ ضد النعرات المذهبية ولهذا امر بأعدام احد رجال الدين السنة عند قيامه بأثارة النعرة المذهبية، ليكون عبرة لغيره.

بعد مدة قصيرة وصلت القوات الكردية الى اطراف مدينة تبريز. اعترف احد مراسلي التايمس، بأن هذا الأنتصار الكاسح دليل على ان الأكراد يعتبرون الشيخ منقذهم. لقد ترك عدد كبير من الضباط والجنود الأكراد صفوف الجيش الأيراني والتحقوا بقوات الشيخ. لقد امر الشيخ بعدم التعرض للمواطنين وممتلكاتهم وكذلك للأجانب وكان

مخالف يعاقب بشدة.

حاصر القسم الاخر من جيش المنتفضين، مدينة ورمى. بقيادة عبد القادر ابن الشيخ. إلا ان المدينة استعصت عليهم، بسبب قرار سكان المدينة ومسؤولها مقاومة المنتفضين. قرر متصرف المدينة، ربحاً للوقت، الألتجاء الى القنصل البريطانى المدعو آبوت. لكى يطلب من الشيخ تأجيل هجومه على المدينة. اشترك القنصل بسرور فى هذه المؤامرة مستغلاً ثقة الشيخ به. كتب ثابوت فى احد تقاريره: ان الشيخ يرى أن الدولة العثمانية وايران ليستا بقادرتيين على الحكم والقضاء على الفوضى المتفشية فى المناطق الكردية التابعة لهما، ولهذا فهو مصمم على تأسيس ادارة مستقلة. وإذا لم تستطيع ادارته القضاء على الفوضى وفرض احترام القانون، والحكم بعدالة على جميع الطوائف والأديان فأنه مستعد ان يمثل امام محكمة دولية.

لقد اظهر ثابوت موقفه العدائى بأن امر الآثوريين المنضمين الى صفوف قوات الشيخ بالأنسحاب وحذر الباحثين من الأنضمام الى الشيخ. مع ذلك وافق الشيخ على قيام ثابوت بسفرة فى كوردستان للتعرف عن كثب على الشعب الكردى وامانيه.

بقدر ما كانت القضية بعيدة عن الدولة العثمانية وموجهة ضد ايران، كانت مستعدة لمد الشيخ بالمساعدة. لكن بعدما ظهر أن المسألة ابعد من تقديراتها ومصالحها، بدأت تستعد عسكرياً ومالياً لمواجهة الشيخ. طلبت من البنوك المهمة الرئيسة فى وان وارضروم وطرابزون ومدن اخرى تخصيص مبالغ كافية للقضايا الحربية. وقامت باستعدادات عسكرية كاملة وارسلت عسكرية الى مدينة وان وصلت الى مئة الف مسلح وبدأت بأستخدام سياستها التقليدية، سياسة فرق تسد بين العشائر الكردية.

اما السلطات الأيرانية فقد قامت باستعدادات عسكرية هائلة واستعانت بالخبرات الأجنبية واستخدمت ضباطاً اجانب، وبخاصة من النمساويين، وفى الوقت نفسه التجأت الى روسيا وبريطانيا لتستعين بهما فى القضاء على الحركة الكردية. على الرغم من التناقضات السياسية والمصلحية بين بريطانيا و روسيا فى ايران، إلا انهما وقفتا معاً ضد الحركة الكردية. لقد اضطرت حكومة الشاه الى استخدام جيش الفرسان. هذا الجيش الذى كان يستخدمه فى الأيام العصيبة فقط. لقد لعب تيمور خان حاكم ماكو الكردي دوراً مهماً فى النضال ضد الشيخ وحسم المعركة. استخدمت القوات الأيرانية وقوات تيمور خان افظع الوسائل الهجومية لقمع الحركة الكردية. خصصت مكافأة مالية لكل من يقتل مقاتل كردى. خلقت هذه الوضعية جواً من الكراهية ضد الأكراد، حتى ضد المنضمين منهم الى السلطة. فى احدى المرات قامت السلطة بأعدام جميع الأكراد فى وحدة عسكرية تابعة لها.

هذه الظروف، واخيراً خيانة الرؤساء الأكراد وتركهم لصفوف الأنتفاضة. اجبرا عبد القادر وحمزة آغا على الانسحاب. فى منطقة (بنيابه)، اضطرت القوات الكردية بعد معركة دموية وتكبيدها خسائر فادحة، الى الانسحاب. اعترف عبد القادر فى رسالة له الى والده بأن السبب الرئيس للهزيمة هو خيانة الرؤساء الأكراد وانظمامهم الى صفوف الأعداء. وفى رسالة تالية يذكر أسماء هؤلاء الخونة.

بدأت فترة انسحاب القوات الكردية وهجوم القوات الأيرانية. وفى هجومها استباحت كل شيء. نهبوا القرى واحرقوا المزروعات واعتدوا على اعراض النساء. يعترف احد الدبلوماسيين الروس، بأن الوف الأكراد قتلوا نتيجة هذه الانتفاضة، ومحيت اكثر من مائتي قرية. اضطر الشيخ وحمزة آغا الى الأنسحاب الى الحدود العثمانية. بذلك انتهت فترة نضال لكي تبدأ مرة اخرى فى المناطق الكردية ابان الحكم العثماني.

قامت السلطات الأيرانية بأعمال تعسفية لامثيل لها فى المناطق الكردية، حتى ليكفي القول أن اكثر من ٦٠ - ٧٠٪ من سكان ورمىّ اضطروا الى ترك منازلهم والتوجه الى الحدود العثمانية.

# ئەتنۆگرافیاو لێکۆڵینەوەی هونەری میللی

دوکتور مجید حمید عارف
زانکوی بەغداد
کۆلیجی ئاداب

## پێشەکی

### لێکۆڵینەوەی هونەری میللی

، وەکو هەموو بەشەکانی تری ئەنثروبولۆژی پشت بە هەموو جۆرەکانی لێکۆڵینەوەی مەیدانی دەبەستێ، بۆ ئەم مەبەستەش گەلێ بنچینەو دەستوورو هۆی تایبەتی هەیە کە توێژەر دەگەڕێتەوە سەری و لێکۆڵینەوەی مەیدانیش دەبێ لەسەر کۆمەڵگای ناوچەی بچووك و کەم ژمارەو سنووردار بێ بۆ ئەوەی توێژەر، یا تیپێك لە توێژەران بتوانن بە تەواوی ژیانی ئەم کۆمەڵگایە بچووکە لە هەموو لایەنەکانیانیەوە هەڵبسەنگێنی لە ماوەیێکی کەمی دیاریکراودا زانیاری دەربارەی ئەم کۆمەڵگایە لە ڕێگای ئامادەکردنی بیبلوگرافیاوە دەست دەکەوێ، ئەمەش بە هۆی خوێندنەوەی هەموو زانیارییێك کە پەیوەندی بەم کۆمەڵگایەوە هەبێ وەك راپۆرت و پەخشنامەو تیبینە گشتییەکان ئەمەش لە رووی زانیاری مێژوویی و جوگرافی و ئاماری گشتییەوە.

پاشان هەڵ دەستێ بە ژیان لەناو ئەم کۆمەڵگایەدا، لەگەڵ ژیانیش خۆی لە خۆیدا بایەخ و گرنگییێکی تەواوی هەیە لە دروست کردنی بایەخ پێدان و خۆش ویستنی کەلەپورو هونەری میللی ، ئەم کۆمەڵگەیە ، یا بە شێوەییکی تر، ژیان دەبێتە هاندەرێك بۆ توێژەرەکە کە زیاتر زانیاری بابەتێ دەربارەی ئەم کۆمەڵگایە بزانێ، لە قۆناغی دوایش دا، دەبێ توێژەر بە هۆو ڕێگاو توانای تایبەتی خۆی، مامەڵە لەگەڵ ئەم کۆمەڵگایە بکات و سەرنجیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و خۆشەویستی خۆی بۆیان زیاد بکات.

ئەتنۆگرافیا بریتییە لە زانستی وەصف کردنی میللەت و نەتەوەکان، بەیەکداچوونی زاراوە زانستییەکان، واتە ئەو زاراوە ناوخۆی پیشان دەدات، لە ئەلمانیاو هۆڵەندە زاراوەی (فولکسکندە) (Volkskunda) کە بە واتای زانستی کەلەپووری میللی دێت بەکاردەهێنن. بە شێوەییکی گشتی ئەتنوگرافیاو ئەتنۆلوجیا لایەنی ڕۆشنبیری میللی بە هەردوو رووی مادی و رۆحی دەگرێتەوە. لە هەمان کات دا فۆلکلۆر گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی کەلەپووری میللی سەر زمان، یان ئەدەبی سەر



**لایەنە تازەکانی پیشاندانی کەلتوور لە هیندستان .**

زمانی میللەتەکە. ئەوەی ناسراوە وشەی (Ethnic) کە ڕەگێکی گریکی هەیەو بە واتای میللەت، یاخود نەتەوە دێت. لە هەموو زمانی میللەتەکانی سەر ڕووی زەوی گەلێك چەمکی جۆر - بە جۆری هەیە بۆ وشەی نەتەوە کە بە واتای هاونیشتمانیتی، یان جێ‌نشینی دێت وەکو گەلی عیراق، یان میسری، یان ئینگلیزی، یان نەتەوە وەکو گەلی عەرەب، فەڕەنجی، ژەرمانی. بەڵام وشەی (Folk) ڕەگێکی ژەرمانی هەیە بە واتای (گەل) دێت، بەڵام (Lore) واتای (حکمە)دێت. بەڵام وەرگێرانی وشەیی بۆ وشەی فۆلکلور واتای (حکمەی گەل) دێت، یان (پێ‌زانینی میللی)[1] دێت.

ئەثنۆلۆجیاو ئەثنۆگرافیاو فۆلکلۆر بەشداری دەکەن هەروەکو دیارە لە زانستی ئەنثروپۆلوجیای کۆمەڵایەتی لە شی‌کردنەوەی پەیوەندی بە کارلێ‌کەرەکان و کارلێ‌کردنی گۆڕاوە لە نێوان ڕۆشنبیری جیاوازەوە، ئەوجا ئەگەر ئەمە ڕۆشنبیریەکی پێشکەوتوو بێت، یان سەرەتایی بێت کە ئەمەش بە یەك گەیاندنی شارستانیتی دەناسرێ ،یان ڕۆشنبیری، هەروەها ئەنجامەکانی کارلێ‌کردنی گۆڕاوە لە نێوان ڕۆشنبیری‌یە جیاوازەکان هەروەها توانینی سوودوەرگرتن لێ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتە مرۆڤایەتی‌یەکان.

ئەمرۆ ئەم زانستانە بەشداری لە کێشانی پرۆگرامێکی ڕوون لە خاڵە سەرەکی‌یەکان و پەیامە زانستی‌و نەتەوایەتی‌یەکەی بۆ پێش خستنی بەرهەم هێنراوەکان لە سوود لە بەکارهێنەرەکان لە کێشانی سیاسەتی ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەگەیەنێت.

پێ‌ناسینی کۆمەڵە جیاوازەکان (لە نێو یەك نیشتمان‌دا) لەیەکتری خزمەتێکی بنەرەتی‌یە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی لە یەك گەیشتن لە نێوانیان دا، وە شی‌کردنەوەی باری تایبەتی هەر یەکەیان و بۆ دیاری کردنی گیروگرفتە ناوخۆیی‌یە تایبەتی‌یەکان کە ڕووبەڕووی دەبن، تیشك خستنە سەر ئەو بەربەستە گەورانەی کە لە بەردەمی ئەو پێ‌گەیشتنە دەوەستن، هەموو ئەمە ئامانجێکە دەتوانرێت لێکۆڵینەوەی زانستی مرۆڤ خزمەتی بکات.

**ڕێگاکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە:-**

ئەوانەی بایەخ بە هونەری میللی دەدەن، زۆر سوود لە کۆکردنەوەی ئەو زانیاری‌یانە وەردەگرن کە باوە لە لێکۆڵینەوەی

ئەنیثروبولۆژی وەکو تێبینی کردن و سەرنج دانی خوورەوشت و هەڵس و ـ کەوتی ڕۆژانـەی کۆمـەڵ و بەکـارهێنـانی ئامێـرە میللی یەکان و بیروباوەڕیان و نهێنی و سۆنگەی ئەم بەکارهێنانە، توێـژەر هەمـوو زانیـاری یـەکـان تۆمـاردەکـات و ڕێکی دەخات لە لیستەیێکی تایبەتی و پشت بە وێنەی فۆتۆگرافی و نموونەو لسیتەوە دەبەستێ، دوایی بە جیاوازی هەریەك لەم ڕێگایانە بە درێژی باسی دەکەین.

**١ ـ تێبینی:**

توێـژەر، یا ئەو کەسـەی کە بایـەخ بە کۆکـردنـەوەی هونەری میللی ئەدات پێـویستـە زۆر وردبینـانـەو قووڵ سەیـری هەمـوو لایەنەکان بکات و زۆر سەرنجی تەواوی ئەو بابەتانە بدات کە دەستی کەوتوون هەروەها مێشکی خۆی لەسەر ئەوە دابنێ کە پارێـزگـاری هەمـوو زانیـاری یـەکـان بکـات کە لە مێشکی دا چەکـەرەیـان کردووە، ناوبـەنـاویش بگـەڕێتـەوە سەر سەرچاوەر تێبینی یەکان بۆ یەکالاکردنەوەی بابەتەکەی، هەروەها دەبێ توێژەر تام و چێـژ لە هەمـوو لایـەنـەکـانی کەلتـوورو ڕۆشنبیری گشتی وەربگـرێ، لە ڕۆشنبیـری ماددی و هونەری و ئەدەبی و زمانەوانی و . . . هتد، ئەم لایەنانەی ڕۆشنبیری هەرچەندە دووریش بێت لە خودی بابـەتــەکــە، توێــژەر هەر پێــویستی پێ دەبێ و کەڵکی لێ وەردەگرێ. وێنـەگـرتنی فۆتـوگـرافی بە یەکێك لە گرنگترین ڕێگـاکـانی تۆمـارکـردن دەژمێـردرێ بۆ ڕوون کردنـەوەو ساغ کردنـەوەی هونـەرە سەرەتـایی یـەکـانی کۆمـەڵ زۆر جار وێنـەی فۆتـوگـرافی جێگـای نووسین و باسی دوورو درێـژ دەگـرێتـەوەو زانیـاری زیـاتـرو وردتـر بە دەست دەخـات، لە نووسین و باس لێـوەکـردن. . . . بە تایبـەتی لە بواری هەنـدێ هونـەری میللی جوانکـاری و جل وبـەرگ و خشـل و زێـر. . یا هەندێ نەخش و نیگـاری سەر دیوارو گۆڕو ئامێـرەکـانی ڕاووشکـارو شتی تـر کە ناتوانین بە هیچ جۆرێك لە دێرینخانە بیان پارێزین تەنیا بە وێنە گرتن نەبێ. . کەواتە وێنەگرتن زۆر هونەری میللی دەپارێزێ لە فەوتان و لەناوچوون.



**(دەهۆڵ کوت) نموونەیەك بۆ کەلتووری ڕۆژهەلات**

زۆر هونەری میللی هەیە کە تەنیا بە نووسین و باس کردنی ناتوانین بیان پارێزین هەرچەند نووسەر زۆر وردبین و بەهێزبێ لەبـاس کردن دا ناتـوانێ وێنـەیێکی تەواوی ئەم هونـەرە میللی یە بگـەیـەنێتـە خوێنـەر بێ ئەوەی پشت بە وێنـەی فۆتـوگـرافی یان سینـەمـایی ببـەستێ. پێـویستـە پەنجـە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە توێژەری ئەثنوگرافی لە کاتی وێنەگرتن و زانیاری وەرگرتن دەبێ ڕەچاوی خوورەوشت و داب و نەریتی کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگایە بکات کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات و بە هیچ جورێك هەستیان بریـنـدار نەکـات و لە خۆی دووریـان نەخـاتـەوە، بۆ نموونە زۆر کۆمـەڵگـا بە هیــچ جۆرێــك ڕازی نابن کە وێنــەی شوێنــە پیـرۆزەکـانیـان، یان ئافـرەتـەکانیان بگیرێ. هەندێ لە زانایانی

ئەتنوگرافی پەنا دەبەنە بەر وێنەگرتنی سینەمایی بەتایبەتی ئەگەر ویستیان هەنگاوەکانی پیشەیێك لە پیشەکان لە سەرەتاوە، تا دوا قۆناغ هەڵ بگرن، وەکو دروست کردنی گۆزەو داتاشین و خۆش کردنی بەردی مەڕمەڕ بۆ بەکارهێنانی لە ژیانی ڕۆژانەی هەندێ کۆمەڵگای سەرەتایی‌دا.

بۆیە زۆر پێویستە توێژەر بزانێ کامیرای سینەمایی بەکاربێنێ لەکاتی لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی هونەری میللی، کە دەبێتە هۆی فەرمانێکی لە کارو تا ئەوەی هەندێ جار جێی دەست خستنی بابەتی هونەری‌و تۆمارکردنی نموونەی نەخش و نیگاری سەر قاپ و قازان و هی‌تر دەگرێتەوەو بناغەیێك بۆ لێکۆڵینەوەکانی سەر بە گۆڕانگاری ڕۆشنبیری لە بواری ڕوشنبیری ماددی کۆمەڵگا سەرەتایی‌یەکان پێك دێنێ.

دەگونجێ توێژەری ئەتنوگرافی بە گوێرەی زانیاری وەسفی، دەربارەی ڕۆشنبیری کۆمەڵگایە جیاوازەکان لە بارەی پلەی پێش کەوتنی کۆمەلایەتی‌و شارستانیەکان دا، یەك دەگرێتەوە، ئەو کۆمەڵگایەش دەشی لێك براوبن، جا نازانین هەل و مەرج و ماکە شوێنەواری‌یەکان دەی‌خاتەوە سەر ئاستی تەکنەلۆژی‌و ئابووری‌و ئایینی‌و رامیاری، بەمە ڕێی بەراوردو ساغ کردنەوەی بینراوە بابەتی‌یەکانی بۆ خۆش دەکا کە گرنگی خۆی لەیەکالاکردنەوەی سروشتی ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵگایانە هەیە.

**٢ ـ چاوپێکەوتن.**

ڕێگای دووەم لە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی هونەری میللی چاو پێکەوتنە، لەمەشیان توێژەری ئەتنوگرافی دەبێ پسپۆڕو زانا بێ وا لەو کەسە بکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکات دلێ بۆی بکاتەوەو هەموو شتێکی بۆ باس بکات، دەربارەی هونەری پیشەسازی بەرەزامەندی خۆی، بێ‌گومان وردبینی‌و توانای توێژەر زۆر شتی بۆ ڕوون دەکاتەوە دەربارەی ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات لە ڕووی کەسایەتی‌و باری کۆمەلایەتی‌یەوە، ئەمەو بۆ زیاتر پشکنین و چاوگێران بۆ بەدەست هێنانی زانیاری دەبێ توێژەر ڕاستەوخۆ چاوی بە خاوەن پیشەکان بکەوێت، وەك خاوەن پیشەو جادووگەرو فالچی‌و کەسانی‌تر.



**نموونەیەك بۆ کەلتووری خوارووی ڕۆژهەلاتی ئاسیا**

ئەو زانیاری‌یانەی کە توێژەر چنگی دەکەوێت هیچ بایەخێکی نابێ ئەگەر سنووری کات و شوێن و باری کۆمەلایەتی بۆ نەکێشابێ، بۆیە پێویستە توێژەرباەخ بە کات و ساتی دەرکەوتنی پیشە، یا هونەرە پیشەسازی‌یەکە بدات و ئاگاداری هەموو گۆڕانەکان بێت لە هەموو قۆناغەکانی، تا دەگاتە باشترین ئەنجام و ڕوونترین شێوە، لەلایەنی کۆمەلایێتیش توێژەر دەبێ ڕەچاوی بەکارهێنان و دروست کردنی پیشە جۆراوجۆرەکان بکات، هەروەها دەبێت تێبینی جۆراوجۆری ئەو هونەرە پیشەسازی‌یانە بکات لە زۆر کۆمەڵگای جیاوازدا.

دەبێت توێژەری ئەتنوگرافی زۆر ئاگادار بێ لە ئاراستە کردنی

پرسیار لەو کەسەی کە دەیەوێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، نابێ هەستیان بریندار بکات چونکە ئەمە زیانی زۆر دەبەخشێتە لێکۆڵینەوەی مەیدانی، هەروەها دەبێ لە کاتی چاوپێکەوتن دا لە بابەتی گشتی یەوە دەست پێبکات وە سەرنج و تێبینی گشتی بێت دەربارەی بابەتێکی تایبەتی و ماوە بداتە لایەنی دووەم. کە بە ئازادی بیرو ڕاکانی دەربڕێ، توێژەر تۆماری بیروڕاکانی ئەو کەسە دەکات.

لکۆڵینەوەکانی ئەثنوگرافی ئەوەی سەلماندووە کە ئەم ڕێگایە زۆر سوودبەخش دەبێ لە پراکتیدا، بەمەش توێژەر باسێکی





**نموونەیەك بۆ کەلتووری هیندستان.**



**هۆڵی نەژادی مرۆڤـایـەتی - (مـۆزەخـانـەی ئەثنوگرافی لینینگراد •**

زۆری دەست دەکـەوێ‌و نزیـك دەبێتـەوە لە ڕاستی‌و دروستی کارەکـان. هەنـدێ جاری واش هەیـە توێـژەر دەتـوانێت ئەم چاوپێ‌کەوتنە بە خۆشاردنەوە لەژێر پەردەیەکی تردا ئەنجام بدا، وەکـو ئەوەی کە هاتـووچـۆی جادووگـەرو فاڵچی‌یـەکان بکات و سەردانیان بکات وەکو مامیلێکی وان لە بارو دۆخی تایبەتی‌دا، بەشداری نەریت و بۆنەو ئاهەنگە میللی‌یەکان بکات، لەمەشیان ڕادەی سوود وەرگـرتن و زانیـاری وەرگـرتن بە پێی لێ‌هـاتوویی‌و پسپۆری‌و توانای توێژەر دەبێ، لەم حاڵەتەدا نابێ توێژەر هیچ نیشـانـەیێکی لێکـۆڵینـەوەی لێ - دەربکـەوێت کەس هەستی پێ‌نەکات و لە نیازی نەگات.

پێویستە توێژەر لە کاتی لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەرخۆو نەرم بێ وهـەروا لە گفتـوگـۆدا، لەبـەر ئەوەی گەر هاتـوو ژمـارەی ئەو کەسـانـەی کە چاوی پێـان دەکـەوێ زۆر بوون، ئەوا توێـژەر وەڵامی جیـاجیـای دەست دەکـەوێت ئەمـەش دەبێتـە هۆی سەر نەکەوتنی لێکۆڵینەوەکە، خاڵی گرنگتریش ئەوەیە کە توێژەر دەبێ پرسیـار ئاراستـەی تەمـەن زۆرەکـان بکـات، بەر لە تەمـەن بچـووکـەکـان، چونکـە جیـاوازی تەمـەن و پلەی کۆمـەڵایـەتی مەرجێکی بنەڕەتی وردبینی‌و لێزانی بەکارهێنانی هونەری میللی‌یە.

توێـژەری ئەثنـوگـرافی دەبێ چاوی لەوەوە نەبێ کە لە یەك چاوپێ‌کـەوتن دا بگـاتـە ئەنجـام و لە یەکـەم جاردا هەمـوو زانیاری‌یێکی چنگ کەوێ، بەڵکو دەبێ بەرە بەرەو لە زیاتر لە یەك چاوپێ‌کـەوتن دا بێ، چونکـە پەلـەکـردن لە لێکـۆڵینـەوە ئەنجامی باش نابەخشێ.

توێـژەر دەبێ بزانێ چۆن تاکـە کەسێکی ئەو کۆمـەڵگـایـەی لێکـۆڵینـەوەی لەسـەر دەکـات، ناتـوانێ هونـەری میللی ئەو کۆمـەڵگـایـە لە مێشکی خۆی‌دا هەڵ بگـرێ‌و هەموو لایەنەکانی بزانێ، چونکـە زۆربـەی زۆری ئەنـدامـانی ئەم کۆمـەڵگـایەش جۆرو شێوەو هێماو ئەرکی هونەری پیشەسازی‌یە میللی‌یەکان یان نازانن و دەرکی پێ‌ناکەن،

زانـای ئەنثـرویـۆلـۆژی (رالف - لنتـون) ئەم لایـەنـەی لە

کتێبەکەی (لێکۆڵینەوەی مرۆڤ) روون کردۆتەوە دەڵێ: ... تاکە کەس ناتوانێ سەرجەمی کولتوورو رۆشنبیری کۆمەڵەکەی خۆی بزانێ. . . سادەترین شێوەی کەلتوور زۆر لەوە دەوڵەمەندترو فراوان ترە، کە تاکە کەسێك هەمووی بزانێ، لەبەر ئەوە پارچە کردن و دابەش کردن و تایبەتمەندیو پەیداکردن لە فرمان و پیشەکان دا، وا لەئەندامانی ئەم کۆمەڵە دەکات کە هەریەکەی کارەکەی خۆی بەرێك وپێك و سەرکەوتوانە بباتە سەر بەبێ ئەوەی سەرجەمی گشتی کۆمەڵەکەی بزانێ، تاکە کەس تەنیا لایەنێکی شارەزایی پەیدا دەکات

لایەنەکانی‌تریش بۆ ئەندامانی‌تر بەجێ دێڵێ کە جێ‌بەجێی بکەن لە هەمان کات دا، دەبینین هەموو کەسێك دەتوانێ بەشداری زۆر لایەنی ئەم کەلتوورە گشتی‌یە بکات بەڵام خۆی ناتوانێ بە کردەوە بەشداری بکات، بۆ وێنە پیاوێکی شەل زانیاری تەواوی هەیە لە شەڕو شۆڕو هەڵمەت بردن هەرچەندە خۆشی ناتوانێ بەشداری بکات، دەتوانین هەمان شت بڵێین لەسەر تاقمێکی تایبەتی لەناو ئەم کۆمەڵەدا بۆ وێنە هەموو پیاوێك ئەو شتانە دەزانێ کە بۆ ئافرەتی دووگیان «حوامل» قەدەغەیە، بەڵام زۆر ئاشکرایە کە هیچ پیاوێك داوای لێ نەکراوە کە ممارەسەی بکات][2] لەبەر ئەمە بۆ توێژەری ئەتنوگرافی باشترە کە لە چوارچێوەی گشتی هونەرە میللی‌یەکان دەست بە لێکۆڵینەوە بکات، وەکو پیشەکان، هونەرەباوەکان و ناوچەکانی رۆشنبیری‌و کەلتووری دەورویەری، دوای ئەمەش لە هەر هونەرێك لەم هونەرانە چەند نموونەیێك هەڵ دەبژێرێ‌و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات، ڕەچاوکردنی بابەتی کەلتووری گشتی دوای ئەویش بابەتە تایبەتی‌یەکانی کەلتوور لە پیشەیی‌یەکان و وەرزێرو جووتیارو ڕاوچی‌و گەورە پیاوانی ئایین و منداڵ و نیشان کردنی کەلتووری هاوبەش لە نێوان ئەم دوو تاقمەدا دەورێکی زۆر گرنگی هەیە بۆ توێژەر لە سەرکەوتنی کارەکەی، لەتەك ئەم دوو ڕێگایەش دا بۆ کۆکردنەوەی کەلتووری میللی، یا سەرەتایی، هەندێ جار توێژەر پەنا دەباتە بەر داهێنان و چارەکردنی ذاتی بۆ بە دەست خستنی یارمەتی لە



**ئاورێك لەکەلتووری میللەتانی ئەفریقیا**
**(مۆزەخانەی ئەتنوگرافی‌لینینگراد.**

زۆرترین ژمارە لەو ئارە زوو مەندانەی کە بەشداری کۆکردنەوەی هونەری میللی دەکەن، وەکو ئەو ڕێگایەی کە هەندێ ئامۆژگای‌یەکانی ئەتنوگرافی لە یەکێتی شورەوی‌و فنلەندە گرتیانە بەر ئەویش بە دروست کردنی چەند پێش برکێ‌یەکی ساڵانە کە هەر یەکێك لەم پێش برکێ‌یانە تایبەت دەبێ بە کۆکردنەوەی جۆرێکی دیاری کراو لە فۆلکلۆرو کەلتووری میللی، هەزاران کەس بەشداری ئەم پێش برکێ‌یانە دەکەن، هەندێ دەزگا، کە بایەخ بە کەلتوور دەدەن چەند خەڵاتێك تەرخان دەکەن بۆ سەرکەوتووەکان لەم بوارەدا. لە ڕێگای ئەم پێش برکێ‌یانەوە دەستەیێکی بڵاو بە هەموو ناوچەکان و بۆ کۆکردنەوەی هونەری میللی‌و کەلتوور دروست دەبێ، کۆکردنەوەو ڕێك خستنی‌و پۆل پۆل کردنی ئەم زانیاری یانەی کە ئەو ئارەزوو مەندانە

کویان کردوتەوە لە ڕیگای دروست کردنی لیستەی کوکردنەوەی زانیاریو بلاوکەرەوەو پەخش نامە ـ کان دەبێ کە بۆ ئەم مەبەستە بەکار دێ، ئەم بلاو کراوانەش لەژێر ناوی (لێکۆڵینەوەی مەیدانی بۆ توێژەرە لاوەکان) لە یەکێتی شورەوی، نووسەری ئەم بەسە بەشداری یەکێك لە نامیلکەکانی کردووە بە لیکۆڵینەوەییك لەژێر ناوی (داب و نەریتە میللی‌یەکانی خێزانی کوردەواری لە شاری سلێمانی لە عیراق)

**ـ تۆمارکردن و ڕێك خستنی زانیاری‌یەکان ـ**

پاش وەدەست هێنانی ئەو زانیاری‌یانەی کە پەیوەندی بە کولتوورو هونەری میللی کۆمەڵگایەکەوە هەیە، توێژەری ڕیگاو هۆو ئامێری تەکنەلۆژی نوێ، وەکو فیلمی فۆتۆگرافی‌و سینەمایی‌و تۆمارکەری دەنگی کاتی ئێستامان ماوەییکی باشتری بۆ توێژەری ئەثنوگرافی ڕەخساندووە، توێژەرە کۆنەکان دەبوایە تەنیا پشت بە توانـاو زیرەکی‌و مێشك و بیری خۆیان و توانای دەربڕین بە زمان و لە بیر نەچوونەوە دەبەست (وەکو جل و بەرگ و خشل و نەخش و نیگاری شتە جۆراو جۆرەکان) دەبوایە، ئەم زانیاری‌یانە بەتەواوی لە مێشکی خۆی بپارێزێ، بەڵام توێژەری ڕۆژگاری ئێستامان باشترین ئامێرو داهێنانی هۆی زانستی بەکار دێنی لە کۆکردنەوەی هونەری میللی پێش ئەوەی دابەشیان بکات و شی‌یان بکاتەوە.(٣)



**یەکەم مۆزەخانەی ئەثنوگرافی لە روسیایا (لینغراد ـ کە ئیستا لیننبغرادە).**

ئەثنوگرافی دەبێ ئەم زانیاری‌یانە لە لیستەیەکی ڕۆشنبیری‌دا، تۆماربکات بێ‌گومان کاری کۆکردنەوەی کولتووری هەر کۆمەڵێك دەبێ بەتایبەتی لایەنی ڕۆشنبیری ڕەچاوبکرێ، لەبەر ئەوەی کولتوورو ڕۆشنبیری بابەتێکی ئاڵۆزو تێکەڵاوە هەر وەك زانای ئەثنوگرافی (ئەدوارد تایلر) پەنجە بۆ ئەم ڕاستی‌یە ڕادەکێشێ، هەروەها هەموو لێکۆڵینەوەکان دەربارەی کۆکردنەوەو تۆمارکردن و توێژینەوەی کەلتوور ئەم ڕاستی‌یان دووپات کردۆتەوە.

توێژەر هەموو ئەو زانیاری‌یانەی، کە دەستی کەوتوون، لەسەر چەند کارتێکی قەبارە گەورە تۆماریان دەکات و دابەش و پۆل پۆلیان دەکات بەپێی مێژوو جێگاو بابەتەکە، ئەمەش کاری توێژەر ئاسان دەکات بۆ دەرکردنی زانیاری‌یەکی کە بیەوێ بۆ لێکۆڵینەوە.

باشتر وایە توێژەر پەنا بەرێتە بەر وێنەکێشانی دەستی‌و فۆتۆگرافی بۆ زیاد کردنی زانیاری دەربارەی نەخش و نیگاری

سەر قاپ و قاچاغ و جەرەو گۆسکەو سەبەتەو مافوورو شتی‌تر،
هەروەهــا کامێرای سینـەمـایش پێـوستیـە بۆ توێـژەر بۆ هەنگـاو هەڵ گرتنی پیشــەیێــك لە سەرەتــاوە، تا دوا قۆنــاغی هەروەهــا دەتوانرێ سوود لەو هونەرە میللیانە وەربگیرێ کە تا ئێستا چەند نموونەیەکیان ماوەو لەناو نەچوون، ئەم نموونانە کۆبکرێتەوە لە دێرینخانەیێکی میللی، بەمەش ماوەیێکی باش بۆ توێژەرەکانی پاشــەڕۆژ دەرەخسێ کە سوود لەم نمــوونـــانــە وەربگــرن لە لێکۆڵینەوەکانیان دا.

ئەو لیستــەو بەیـانــە کەلتــووریـانـەی کە توێژەری ئەتنۆگرافی دەستی دەکــەوێ بە سەرچــاوەیێکی مێــژ وویی زۆر پێــویست دەژمێـرێ لە لێکـۆڵینـەوەی ئەتنـۆلـۆژ ی لە دوا ڕۆژدا، قوتـابیانی زانست و ئەوانەی بایەخ بەم لایەنە دەدەن دەتوانن بگەڕێنەوە سەر ئەم سەرچـاوانـەو لەژێـر ڕۆشنـایی ئەم زانیـاری‌یـانـە نەخشـەی ئەتنـۆلـۆژ ی کۆمـەڵگـای مرۆڤـایـەتی دروست بکـەن، هەروەها زانیــاری‌یــەکی کەلتــووری زۆر دەربـارەی ناوچـە شارستـانیـە ئاوەدانەکان دەخاتە ڕوو.

لێکـۆڵینـەوەی هونـەری سەرەتـایی باسی لایـەنـەکـانی بیـرو بۆچـوونی مرۆڤی سەرەتـایی دەکـات لە دیـاردە سروشتیەکان وەکو زەویو ئاسمـان و ئەستێـرەکـان، چالاکترین و فراوانترین بابەتی سەرەتایی لەلایەنی ڕوحیەوە گەردوون و دەورووبەرێتی کە شتە سەرەکیەکانی درەخت و گیان لەبەرو بێ‌گیانە، پاشان دێتە سەر باسی دیـاردەکـانی کە پەیـوەنـدی ڕاستەوخۆی بە مرۆڤەوە هەیەو پێــوەی لکــاوە وەکــو نەشتــەگـەری‌و پزیشکی میللی‌و خەون و جادووگــەری، ئەم زانیــاری‌یــانــە لە ئەرشـیـفێکی تایبــەتی کۆدەکــرێتــەوەو دەپــارێزرێ، زۆر لە ئامۆژگاو دەزگا زانستی‌یەکان لەسەر ئەم ڕێگایە ڕۆیشتوون لە جیهاندا لەبەر گرنگی باسەکە لە کۆمەڵگای سەرەتایی بە پێی ولاتە ڕۆژئاوایی‌یە پێش کەوتوەکانی تا ئەتنۆلۆژ یا دەگاتە ئاستی زانستی لەسەر دەستی بازرگان و پیاوە ئایینی‌یـە موژدەهێنـەرەکـان (مبشـرین) بزووتنـەوەی کۆکردنەوەی کەلتــووری گەلانی غەیــرە ئەورووپی (لـە کۆنـەوە بە سەرەتـایی ناویان دەبردن) جموجۆل و چالاکیەکی زۆری بەخۆیەوە بینی، لە دوای ئەمەش لە ڕێگای زاناو پسپۆڕو هەڵمەتە زانستیەکان، کە بەتـایبـەتی بۆ ئەم مەبـەستـە ڕەوان دەکـران، لەلایـەن وڵاتـە ئیمپـریـالیستـە کۆلـۆنیالیستەکان زۆر پشت گیری لەمە دەکراو لە ئەرشیقی تایبەتی هەڵ دەگیرا (زۆربەی زۆری زانیاری کۆمەڵگای سەرەتایی لە وڵاتە داگیرکەرەکان، ئیمپریالیستی کۆلۆنیال پەنای دەبـردە بەر ئەم زانیــاری‌یـانـە بۆ چارەسـەرکردنی گیروگرفتی ئەم وڵاتانەی کە داگیریان کردوون).

بەڵام ئەمــرۆ لە لێکــۆڵینــەوەی هونــەری میللی لە هەمـوو وڵاتێکــەوە بایــەخی پێ دەدرێ، زۆر هەوڵێش دراوە لە لایــەن ئەوانەی کە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی هونەری میللی دەدەن بۆ دانانی ئەتلەسێکی تایبـەتی بۆی، بۆ پڕکـردنـەوەی کەلێن و کەلـەبـەری مێــژ وویی لە کەلتــووری میـللی‌دا، یاوەکــو ڕێگــایێــك بۆ دابـەش کردنی سەرنشینـەکـانی، بە جۆرێ توێـژەر بە هۆی ئەم ئەتلەســەوە بتــوانێ لێــك چوون و جیــاوازی‌و ڕێـك خستن و دابەش کردنی جێگاو شوێن لە جێگا ئاوەدانەکان بزانێ‌و زیاتر لە کەلتــوورەکــە بگــەین و توانــای دیتنی لایــەنــە ڕاستــەکـانی شارستانیەتەکەمان هەبێ.

هەروەها نەخشە بەکاردەهێنرێ بۆ دەست نیشان کردنی ناوچە شارستانیەکان کە کەلتوورە ماددیەکە کە سەر بەم شارستانیەتەیە، ئەم کەلتــوورە پەیـوەنــدی بە بارو دۆخی جوگـرافی‌و جیـولـۆژ ی‌و ئاووهــەواو گەلێ بارو دۆخی سروشتی‌یــەوە هەیـە، ئەمـەش بە ئاشکرا دەردەکەوێ لە خوو ڕەوشت و داب و نەریت کە پەیوەندی بە چالاکی ئابووری هەیە وەکو کشتوکاڵ و شوانکاری، هەروەها داب و نەریـتی چێشت دروست کردن و نان خواردن، هەروەهــا جۆری دروســت کردنـی خانــووبــەرەو ئەو شتــانـــەی کە لێ دروست دەکـرێن و بوونی ئەم شتـانـە لە ناوچـەکەو پەیوەندی بە ئاوو هەوای ناوچەکەوە، کە بە پێی ئەم ئاووهەوایە بەرزی‌و نزمی خانووەکەو گەورەو بچووکی پەنجەرەو ژ وورەکانەوە هەیە.

هەمان شت بە گوێرەی جل و بەرگی میللی‌و ڕەنگ و شێوەو ئەو شتانەی کە لێ دروست کراون و بۆنەو هۆی لەبەر کردنیان و نرخ و بەهــاو ڕازانــدنـەوەیـان و گەلێ شتی‌تـر. خۆش ویستنی هونــەری سەرەتـایی دەورێکی گەورەی هەیـە بۆ بۆچـوونـەکـانی توێـژەرو دەمـاغی سازدان دەربـارەی ژ یـانی سەرەتایی، گرنگی

کۆمەڵایەتی و ڕەوشت بەرزی هونەر لە گەشەکردنێکی بەردەوامە وەکو هۆیێك بۆ کارامەکردنی کۆمەڵ و لەلایەکی تریش بۆ گەشە - کردنی تاکە کەس.

هونەر گرنگیەکی کۆمەڵایەتی زۆر گەورەی هەیەو یەکێکە لە هەرە چەکەکانی ململانێ لە پێناوی ژیان دا، هونەر بۆ ڕۆژگاری ئەمرۆمان ماوەتەوە وەکو نرخێکی کۆمەڵایەتی ناڕاستەوخۆ زیاتر ئەوەی وەکو جوانیەکی ڕاستەوخۆ. ئەمەو خۆش ویستنی هونەری سەرەتایی و ژیانی سەرەتایی دوور لە داب ونەریتی شارستانیەتی ئەمرۆمان پاڵی بە زۆر لە گەنجەکان ناوە کە تام وچێژ لە ژیانی سەرەتایی ناخۆش وەربگرن، ئەوروپیەکان وەکو گەشتکەر سەر لە کۆمەڵە سەرەتاییەکان دەدەن و خۆشی لە ژیانیان وەردەگرن بێ ئەوەی تۆزقاڵێك کار بکاتە سەر مێشك و بیری شارستانیەتی ئەمرۆیان.

ئەمرۆ، زۆر لە ئەنثروبۆلۆژیەکان هەوڵی زیندووکردنەوەی زۆر بەهای کۆمەڵایەتی کەلەپوور دەدەن، لەڕاستیدا ئەم بەهایانە زۆر بەهای‌تری لاچاك دەبەخشن مرۆڤ هەرچەند لە ڕابووردوو نزیك بۆوە لە ڕووی مێژووی دەروونی و جوانکاری زیاتر شتەکان شاکار و ئاسان تر دەبن لەبەر ئەوەی (هەندێ جار) شەوق و ئارەزوو بایەخی زیاتر دەبێ.

زۆرکەس تیوری پێشکەوتن تووڕهەڵ دەداو دان بەوەدا دەنێ کە هونەرو ژیان لە ڕابووردوودا زۆر باشتر بوون لە ئێستا، هەر لەبەر ئەمەش داوای هونەری سەرەتایی دەکەن و لایەنە باشەکانی باس دەکەن و باسی لایەنی خراپی هونەری ئەمرۆمان دەکەن، بەڵام چاکتر وایە کە چەند هەڵەیێکی دیارکراوی ژیانی ئەم سەردەممان روون بکەینەوە کە لە ژیانی سەرەتاییدا نەبووە.

پێداویستی زانستی هونەری میللی و کەلەپوور بۆتە هۆی پێویست بوون بە دروست کردنی دێرینخانەی ئەنثروبولۆژی بۆ پاراستنی ئەم هونەرە میللیە بە تایبەتی گرنگی مۆزەخانە وەکو کارێکی زانستی پەروەردەیی لەم دواییەدا پەرەی سەندووە.

مۆزەخانە بە بیری میللەت دەژمێردرێ، هەر گەلێك ڕابووردووی لە بیر بکات ئەمرۆو داهاتووی لەرزۆك دەبێ، هەر کەسێك ڕابووردوی خۆی نەزانێ نەزان و سەرگەردان دەبێ هەروەکو نووسەری ڕۆمانی شیرون وا دەڵێن.

مۆزەخانە بە شێوەیێکی گشتی پێشان دانی کەلەپوورە بە شێوەیێکی ڕێك وپێك، هەڵ گرتن و پاراستنە لە نەمان، ڕێگایەکە بۆ پەیوەندی کردن بە جەماوەرو ڕۆشنبیرکردنیان و گەشەکردنی چەشەی هونەریان. سەدەکانی ١٧، ١٨ بە تایبەتی پاش شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا ئارەزووی کۆکردنەوەی شوێنەوارو ئەنتیکی میللی و کەلەپوری بە خۆیەوە بینی، جگە لە کۆکردنەوەی شتی بەنرخ لەناو چینی دەوڵەمەندو ئەمیرەکان، ئەم کۆکردنەوەیە لە دووایدا بووە بە سەرەتایێك و ناوکێك بۆ دروست کردنی مۆزەخانەی ئەنثروبۆلۆژی بە ناوبانگ لە جیهان دا، هۆی سەرەکی کۆکردنەوەی شتی بەنرخ لە لایەن ئەم چینانەش گەڕانە بە دوای شتی بە دەگمەن و نرخ بەها وەك ئارەزوویێك و لایەنێکی مەعنەوی هونەری و شوێنەوار، ئەمەو لەلایەکی تریش ئەم چینانە زۆر پێویستیان بە هاندەرێك هەبوو کە گیانی ڕاپەڕین و بەردەوام بوون و بەرەوپێش چوون بایەخی کۆکردنەوەی شتی بەنرخ، وەکو بەردی بەنرخ و زێرو زیو تەنیا لەلایەن دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندەکانەوە هەبوو، زۆر نموونەشمان هەیە وەکو گۆڕستانی مەلەکی ئور، یا ئەو شتە بەنرخانەی کە شوێنەوار ناسان لە میسر لە گۆڕستانی فیرعەونەکان وە - دەستیان کەوت.

**بەڵام لە سەدەی ١٧، ١٨و پاش ئەوەی لە ئەوروپا ژیان زیاتر پێش کەوت ئارەزووی کۆکردنەوەی شتی شوێنەواری زیاتر لە شتی بەنرخ سەری هەڵ دا، هەروەها هۆی ئایینی دەورێکی گەورەی لە پاراستن و ئاگادارکردنی کارە هونەرییەکانی کە پەیوەندیان بە ئاینەوە هەبوو، هەروەها بووە هۆی دروست کردنی شتی بەنرخ وەکو پەرستگاکان و کەنیسەکان، نزیکترین نموونەش لەم لایەنە، یان دروست کردنی مەزاری پیرۆزو گۆڕستان لە ئیسلام دا کە زۆر خەزنەو شتی بە نرخی تێدایە، ئەمەش پیشەو هونەری نەخش و نیگاری هونەری سەدەیەکمان پێ دەبەخشێ کە لە کاتێك دا باو بووەو شوێنەواریان، تا ئەمرۆ هەر ماوە.**

نموونەش بۆ ئەمە، پاپاکانی ڤاتیکان لە ئیتاڵیا دەستیان کرد بە

کۆکردنەوەی شتی کەلەپوور بە شێوەیێکی فراوان، کە ئەم کەلەپوورە لە دووایی‌دا لە کاتی پاپا کلیمنت ی چواردەهەم بوو بە مۆزەخانە.

**شێوەی پیشان دان:**

پێشتر دەرمان خست ئەو پەیرەوانە چین کە ئەتنۆگرافیا دەیان گرێتە بەر بۆ ئەوەی هونەری سەرەتایی یا میللی دەست کەوێ، دەگۆڕێ لە کۆمەڵێك بۆ کۆمەڵێکی تر بەڵام قۆناغی دوای ئەو بریتی‌یە لە پاراستنی کەرەسەو کەلوپەلی هونەری وە ڕێگەی پیشان دانی بە شێوەیێك کە زیانی پێ نەگەیەنێ.

بە ون بوونی ئەم کەرەسە پارێزراوانە هیچ نی‌یە جێگایان بگرێتەوە. لە نیشتمانی عەرەبی‌دا چەند مۆزەخانەیێکی ئەتنۆلۆژی کرایەوە بۆ پاراستنی ئەو پیشەسازیانەی کە مەترسی نەمانیان لێ‌دەکرا بۆ نموونە مەنامە لە بەحرێن کە لایەنێکی سادەی لە لایەنەکانی مرواریان پێش کەش کرد.

بەڵام لە عێراق دا بۆ کردنەوەی مۆزەخانەی ئەتنۆلۆژی چەند پێشنیازێك پێش کەش کرا:

١ ـ مۆزەخانەی جل وبەرگ و پاشماوە میللیەکان:ـ
لە ئاهەنگی ١٧ لە مانگی تەمووز ساڵی ١٩٧٢ هەستان بە کردنەوەی وە هەڵ دەستن بە پێشکەش کردنی کەرەسەی بەکارهێنراو لە زۆر جێگەدا لە عێراق دا لە جل وبەرگی جوان وە کەلوپەلی وردە کە دەی‌کەن بە خۆیان دا.

وە هەروەها شتی‌تریش کە بەکاردەهێنرێت لە ژیانی ڕۆژان دا وەك قاوەخانەو چۆنێتی ژیانی کۆچەری‌و دانیشتوانی زەلکاوەکان و پیشەسازی‌یە میللی‌یەکان.

٢ ـ مۆزەخانەی بەغدادی: لە ساڵی ١٩٧٠ دروست کراوەو پێش کەش کراوە، کاتێ ئەم مۆزەخانەیە هیچ جیاوازی‌یەکی وای نی‌یە لەگەڵ پێش کەش کراوەکانی مۆزەخانەی جل و بەرگی پاشماوە میللی‌یەکان کە لە بەغدا زۆر بڵاو بوو هەتا ماوەیێکی زۆر کەم لەمەوبەر.

٣ ـ مۆزەخانەی شارستانیەتی لە زانکۆی موصل تیای‌دا زۆر لە بابەتی هەستان و دانیشتنی میللی‌و پیشەسازی‌یەکانی ئەوێ لە دانیشتوانی شاری موصل دەردەخرێ وە زۆر شوێنی کۆن لەم شارەدا دەپارێزرێ کە کاتێ پارێزگاریمان کردو کردمان بە جێی سەیران کردن و ئەوانەی دێن بۆ سەیری شارەکە.

٤ ـ مۆزەخانەی ئەتنۆگرافی فۆلکلۆری لە زانکۆی سلێمانی، بەردی دروست کردنی لە ساڵەکانی حەفتادا دانرا لە سەدەی بیستەم دا لە مۆزەخانەکانی زۆر بەرەوپێشەوە لە قەڵەم دەدرا لە جیهان دا ئەم مۆزەخانەیە توانای ئەوەی هەبوو کە کەلەپووری میللی کوردی بگرێتە باوەش و بیپارێزێ بە تایبەتی لە شاری سلێمانی‌داو پێویستە لەسەر زانکۆو دامەزراوەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، بەرێوەبردن و پەرەپێدانی بگرێتە ئەستۆی کە بریتی‌یە لە پاش ماوەکانی ڕۆشنبیری‌و ماددی‌و گیانی ئەو ناو چەیە، لەگەڵ ئەو پاش ماوە ماددی‌یەی کە لە مۆزەخانەکەدا هەیە، کتێبخانەی مۆسیقی بۆ گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی هەیە، ئەمە حاڵەتی هەموو مۆزەخانەیێکی ئەتنۆلۆژی‌یە لە جیهان دا، بەرز بوونەوەی پلەی گەرماو شێ‌و تەپ و تۆزو کۆن بونی وە چەند شتێکی‌تر دەبێتە هۆی خراپ بوونی لەبەر ئەوە پێویستە کە ئەو جێگایانەی کە ئەم شتانەی لێ‌هەڵ دەگیرێ بە باشی بپارێزرێ بە ڕێگای خستنی ئەم شتانە لەناو دۆلابێکی تایبەتی‌دا کە توند کرابێ بە باشی، یان بە ڕێگای شوێنی ساردەوە هەروەك سەلاجەو مجمدە... ! هتد..

وە ئەوانەی کە پەیوەندی‌یان بە وێنەو فلیمی سینماوە هەیە پێویستە ئاگاداری‌یێکی زۆر بکرێ بە تایبەتی تیشکی تیژ بدا لە «سلایدەکان» ڕەنگیان تێك دەدا هەروەك دەزانین وە باشتر وایە کە لە ژووری وێنەگرتنی مۆزەخانەکەدا ئەم وێنانە نەشۆرێتەوەو وە بە بۆنەی «مکروفلم»وە تۆماری وێنەی بکرێ ئێمرۆ پێشکەش کردنی ئەم یارمەتی‌یەو خزمەتانە بۆتە پێویستی لە مۆزەخانەکانی ئەتنۆلۆژی بەرامبەر بە نرخێکی هەرزان. ئەمانە نوسخە ئەسلی‌یەکەی کەرەسە میللی‌یەکە دەپارێزن. ئەوەی پەیوەندی بە تۆمارکردنی دەنگەوە هەبێ، لەسەر ڕەفە یان تاق ئەم اسطوانانە دادەنرێ، وە لە نێوانیان دا بۆشایی‌یەك بەجێ دەهێلرێ بۆ پاراستنیان ئەگینا لەناو دەچن بە هێز خستنەسەری باشتر وایە (شریت و کاسیت)ی تۆمارکراو لە ناوەڕۆکی کەرەسە

نومـارکـراوە تایبـەتی بی، بە موزەخـانـەکـەو لەژیـر چاودیـری فەرمـانبـەرێکی هونـەری تایبـەتی یـەوە لەم ئیشـەداو بە چەنـد شێـوەییـك. وە تێبینی دەکرێ بۆ پاراستنی هەمـوو وێنـەکـان و شێـوەی ژیـان لە کۆمـەڵـەکـانی ئینسـانیدا هەر مۆزەخـانـەی ئەتنۆلۆژی دانراوە بە قۆناغی دووەم وە بە ڕێك وپێك ترین شوێنیشی.

لەم مۆزەخـانـانـە توخمـەکـانی کەلـەپـوور پیشان دەدرێ کە سروشتێکی ماددی هەیە وەکو (سەبەتەو قاپ و قاچاغ و ناومالْ وەکـو کەلـوپـەلی نەتـەوایـەتی)، کە مرۆڤ بەکـاری دەهێنی لە ژیـانی ڕۆژانـەی دا، یان ئەوانـەی کە بە هەنگـاوێکی گرنـگ دادەنـرێن، بۆ نمـوونـە پێشکەوتنی پیشەسازی لە بەرهەم هێنانی جۆرێکی تایبـەتی کەلـوپـەل، یان ئەوەی بەکـاردەهێنـرێ لە هەڵس وکەوتە میللی یەکان دا، یان ئەوەی پێك دێت لە ئەنجامی بیروباوەڕدا. وە نابێ لەبیرمان بچێ لەم بارەیەوە ئەو ئامێرانەی کە بەکارهێنراون لەگەڵ جۆرەکانی هەروەها ئەو کەل وپەل و خشـل و ئەو ئامێـرانـەی کە بەکـاردەهێنـرێ بۆ ئارایشت. ئەم مۆزەخـانـە ئەتنۆلۆژیانە جیاوازیان هەیە لە بابەت پیشان دان و ڕێك خستنی ناوەڕۆکەکانیانەوە وە پەنا دەباتە بەر چەند ڕێگایەکی جیاواز بەلام زۆربەی ئەو ڕێگایانە کە بەکاردەهێنرێت یەکێکە لەمانەی خوارەوە:-

١ - ژمارەی مادده
٢ - شێوەی حیازە کە لە کرین، یان گۆڕینەوە پێك هاتبێ.
٣ - نرخی کرین ئەگەر ماددەکە کرابێ.
٤ - ناو و شوێنی فرۆشیار، یان گۆڕەرەوە
٥ - مێژووی حیازە
٦ - پێناسەکردن (کورتەیێکی پیشان دران لە مادده
٧ - درێژەکانی واتە (درێژی، پانی، بەرزی، قورسی)
٨ - شوێن کە ئەمیش ڕوونی دەکـاتـەوە. ڕەسـەنی ماددەکـە پیشان دەدات بە پێی هەرێمی جوگرافی، یان دەوری شارستانێتی.

٩ - کات: لە مێـژووی دەس نیـشـان کراوی خۆیدا دەنـووسـرێ بە ساڵ، یان بە چەرخ وە ئەگـەر گومـان کرا لەو مێژووە نیشانەی پرسیار لەلای ژمارەکەوە دادەنرێ.

١٠ - ژمـارەی سجلی پێشـوو، ئەگـەر هەبـوو بۆ زیـادکردنی زانیاری سەبارەت بەم ماددەیە بروانە پەرتووکی د. تەقی الدباغ و د. فوزي رشید

**زانیاری مۆزەخانەکان:**

**١ - ڕێگای مێژوویی:-**

ئەمیش بە پیشـان دانی و ڕێـك خستنی کەرەسـەکـان بە پێی پلەی مێـژووی بەکـارهێنـانـیـان لە چاخـە مێـژوویـیـە جیـاوازییـەکـان دا دەست پێ دەکـات بەو ئامێـرانـەی کە بەکارهێنراون لە چاخەکانی پێش مێژوو (چاخە مێژوی کۆنەکان - چاخی مێژووی ناوەند - چاخی مێژووی نوێ - هاوچەرخ) وە ئەم کەلوپەلانە بەش دەکرێ لە هۆڵی جیاوازدا یەك بەدوایی یەك لە کۆنەوە دەست پێدەکات بەرەو پلەکانی پێشکەوتن، میوان لەم کاتەدا بە کاروانی پەرەسەندنی شارستانێتیدا دەڕوات لە کاتی دەرکەوتنی مرۆڤەوە هەتا ئێستا.

**٢ - ڕێگای جوگرافی:**

یان پێی دەوترێ ڕێگای ئاسۆیی واتە پیشان دانی کەرەسەکان بە پێی چەنـد نمـوونـەیێـك بو ئەو هەرێمە جیاوازە شارستانێتیو جوگـرافیـانـە وەکـو دابـەش کردن بەپێی کیشـوەرەکـان یان بەکـارهێنـانـەکـانی کۆمەڵە ئادەمیزادییەکان، یان بە پێی شێوەی گوزەرانی دانیشتـوان (بـەکـارهێنـانـەکانی دانیشتوانی ناو شاخ و دەشتـەکـان و زۆنگـاوەکـان لەبـەرئـەوە هۆڵێـك دادەنـدرێ بۆ کەلەپووری عەرەبی یان تورکی یان ئینگلیزی ... هتد.)

وە مۆزەخـانـە ئەتنـۆلۆجی یە نەتەوایەتیەکان گرنگی دەدەن بەم ڕێگـایـە بۆ شانـازی کردن بە کەلـەپـووری نەتـەوایـەتی یـەوە وە فێـرکـردنی نەوەکـانی داهـاتـوو. بیری دوا ڕۆژی یەك گرتویان و پاراستنی ڕەسەن و یەکێتی نەتەوە.

پەراوێز

١ - تەمـاشـای تیـۆری سوکـولـوف «الفلكلور قضـاياه وتاريخه» القاهره ١٩٧١ لە ئینگلزیەوە وەرگێراوە لاپەڕە ١٥ - ٥٧.

٢ - بروانـە (رالف لنتـون) - لێکـۆڵینـەوەی مرۆڤ - کۆڕینی عبـدالملك النـاسـوق بلاوکـراوەی کتێبخانەی عەسری - بیروت

١٩٦٤ - ل ٣٥٩ - ٣٦٠

٣ - بلاوكـراوەی لێکـۆڵینـەوەی زانستی ئەتنـوگـرافی لاوان (لێکۆڵینەوەی پێکهاتەی نەتەوەیی گەلانی جیهان) - ئەکادیمەی زانستی سۆڤیەتی ئامۆژگای ئەتنوگرافی مکلوخ مکلایا - مۆسکۆ ١٩٧٦ ل١٢٩ - ٤٣ بەزمانی ڕووسی.

٤ - وا دەزانرێ کە وشەی (مۆزەخانە) لە (museion) ی یونانی وەرگیراوە کە بەو جێگایە دەوترێ کە شوێنی بیرکردنەوەو ئەندێشە بێ، یا جێگایێك کە گۆشەگیریو هێمنی دەروونیو تەنیایی بێ بۆ بیـرکـردنـەوەو ئەنـدێشـە. لە بەکـارهێنـانە تایبەتیەکانی وشەی (مۆزەخانە) لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدە بەو پەرتووکانە دەگوترا کە بابێتی یەك جۆر لە بەرهەمی مرۆڤایەتی دەکات بۆیە یەکێك لە توێـژەرە ئەوروپـاییـەکـان لە ساڵی ١٧٨٤ بە دانـانی کتێـبـێك دەربارەی گۆرانیو شیعر لەژێر ناوی (poetical Museum) هەروەها لە ساڵی ١٩٠٦دا کتـێـبـێك دەرچـوو لە ژێـر ناوی (Museum oFjramtists) کە چەند دەقێکی شانۆیی تێدابوو.

وشـەی مۆزەخـانـە بە هەمـوو شتێـك دەگـوترا کە زانیـاری مرۆڤایەتی پیشان دەدا.

## سەرچاو


**١ - بە زمانی عەرەبی**

سۆکۆلۆف.ی. الفلكلور - قضاياه وتأريخه - القاهرة ١٩٧١

شاكر مصطفى سليم - قاموس الأنثروبولوجيا - الكويت ١٩٨١

محمد الجوهري - علم الفلكلور - القاهرة ١٩٧٤.

مجيد حميد عارف - العمل الحقلي وجمع الفنون الشعبية - مجلة دراسات الأجيال آب - ١٩٨٢.

مجيـد حميـد عارف - المـرأة الكـرديـة ونظـرتها القومية للحلي والمـلابس الشعبيـة حلقـة دراسيـة للأتحـاد العام لنساء العراق بالمشاركة مع جامعة السليمانية ١٩٧٧.

مجيد حميد عارف - الأثنوغرافيا والأقاليم الحضارية - بغداد ١٩٨٥.

كلوهن - كلايـد - الأنسـان في المـرآة - علاقـة الأنثـروبـولوجيا بالحياة المعاصرة - بغدا ١٩٧٤ ترجمة - د.شاكر مصطفى سليم.

**٢ - بە زمانی ڕووسی**

١ - ئەکـادیمی زانـستی سۆڤیـەت - میللەتـانی جیهـان (مـۆسکۆ ساڵی ١٩٥٤).

٢ - الکسیف ن - ب - لە ئاژەڵیەوە بۆ مرۆڤایەتی (مۆسکۆ ١٩٦٩).

٣ - باسیلوف ن - ن شامانیزم لە میللەتانی سبیریا (مۆسکۆ ١٩٧٥)

٤ - پیرشتن أ.ی - مێژووی کۆمەڵەکانی سەرەتایی (مۆسکۆ ١٩٧٤)

٥ - جبکساروفا أ.ی - چبکساروف ن - ن - میللەتان، ڕەگەز، کەلتوور (مۆسکۆ ١٩٧١)

٦ - روکینسکی م.أ - پا لیڤین ئەنثروبولوجیا (مۆسکو ١٩٧٨)

٧ - ستورخ م.ف. نەژادی مرۆڤ (مۆسکۆ ١٩٧١)

٨ - ستورخ م.ف. ڕەگەزەکانی مرۆڤایەتی (مۆسکۆ ١٩٦٦)

٩ - توکریف س.أ بناغەی ئەثنۆگرافی (مۆسکۆ ١٩٥٧)

١٠ - تایـلر أ. کەلـتـووری سەرەتـایـی (مـۆسـکـۆ ١٩٣٩). (وەرگیراوە لە زمانی ئینگلیزی)

١١ - الکسین أ - کۆمەڵە سەرەتاییەکانی ئوستراليا (مۆسکو ١٩٦٢)

١٢ - مۆرگان - کۆمەڵە سەرەتاییەکانی (مۆسکۆ ١٩٣٩

١٢ - مۆرگان - کۆمەڵە سەرەتاییەکانی (مۆسکۆ ١٩٣٩

١٣ - گۆڤاری ئەثنۆگرافی سۆڤیەت ژمارە ٤ - ٥ - ١٩٧٧ ٢ - ١٩٧٧ ٤ - ٥ - ١٩٧٩ ١ - ١٩٨٠

١٤ - گۆڤـاری زانکـۆی جوگـرافی سۆڤیـەت - لقی مۆسکـۆ - (مۆسکۆ ١٩٧٣)

١٥ - بلاوکـردەکـانی کۆنگـرەی زانستی حەوتـەمی بۆ زانستی ئەنثروبۆلوجیو ئەثنۆغرافی (مۆسکۆ ١٩٧١) - هەموو «١١» ژمارەکان

١٦ - بلاوکـراوەکـانی لێکـۆڵینـەوەی مەیـدانی بۆ لێکـۆڵـەرەوە گەنجەکان (مۆسکۆ ١٩٧٦).

## ملخص البحث

# الأثنوغرافيا ودراسة الفنون الشعبية

الدكتور: مجيد حميد عارف

لازم الفن حياة الانسان منذ نشوئه على سطح الارض. والفن يعني معنى تجميل الشيء وتزينه وانه يمكن ان يطلق على كل شيء وجمال كالرسم والنحت والموسيقى والادب والعمارة والدراسات الادبية الا ان مدلول الكلمة قد يختلف من عصر الى عصر ومن امة الى امة اخرى وذلك مرتبط بأختلاف الانظمة السياسية والاحوال الاجتماعية التي تعمل عملها في حياة الامم ومسيرتها.

يؤكد علماء الأنثروبولوجيا على الاهتمام المتزايد بالفن لا لدوره الهام في التطور الثقافي فحسب ولكن لعلاقته بتيسير فهم المعتقدات الحضارية خاصة في المجتمعات التقليدية حيث ان جمع امثلة من فنون كل الشعوب ومن ثم توضيح ومقارنة خصائصها الجمالية جملة وتفصيلاً يسهل علينا ادراك المعاني والاحاسيس الخاصة التي يقصدها الفنانون ثم ارجاعها الى مختلف انماط ومراحل التطور الثقافي.

ان وحدة الفن ظاهرة تتماثل الى اقصى حد حتى مع اختلاف الشعوب، فالاستراليون والاسكيمو مثلا مختلفون كل الاختلاف ولكن حليهم وزينتهم متشابهة في بعض نواحيها، كذلك في رسوم الصخور عند الاستراليين وعند قبائل البوشمن الافارقة رغم الفوارق الرسية.

تحاول الاثنوغرافيا (علم وصف الشعوب) احياء كثير من القيم الشعبية (التراث) وفي الواقع ان هذه القيم يمكن ان تحقق بعض القيم الايجابية فالانسان كلما اقترب من الماضي من الناحية التاريخية والسايكلوجية او الجمالية اصبحت الاشياء اكثر بساطة ولأنها كذلك فهي اكثر تشوقاً واكثر اهمية واكثر قيمة (في بعض الاحيان) فهناك من ينبذ نظرية التقدم ويسلم بأن الفن والحياة كانا في الماضي افضل منها الآن ويدعو الى الفن الشعبي ويجسم حسنات الماضي والمغالاة في سيئات الحاضر. غير أن من الصواب في كثير من الاحيان ان نبين اخطاء معينة في الحياة الحاضرة كان الانسان في الماضي خلو منها نسبياً.

ان الحاجة العلمية للفنون الشعبية التراثية نبهت الى ضرورة انشاء المتاحف الاثنوغرافية لحفظها وقد ازدهرت اهمية المتاحف هذه في العملية التربوية في الفترة الاخيرة. حيث تعتبر كأنها تقوم مقام ذاكرة الامة. والامة التي تنسى ماضيها ترتبك في حاضرها ومستقبلها ومن لايعرف ماضيه فهو جاهل ضائع كما قال السياسي والكاتب الروماني (سيشرون) فالمتحف بصورة عامة يعرض تراثنا باسلوب منسق ومتسلسل ويحفظه من الانقراض ويعتبر وسيلة من الوسائل التي يمكن من خلالها الاتصال بالجماهير وتثقيفها وتنمية الذوق الفني لديها.

يتعرض هذا البحث الى موضوع الفنون الشعبية وعلاقة الاثنوغرافيا بالموضوع من ناحية طرق البحث والجمع للفنون الشعبية في المجتمعات البشرية مبينا اهمية طريقة الملاحظة والمقابلة وكيفية تسجيل وتنظيم المعلومات في الدراسات الاثنوغرافية وفي اسلوب حفظ المواد التراثية الشعبية التي تختلف من مجتمع لآخر حسب ظروفه ثم كيفية عرض المواد والتحف بأسلوب عرض على نحو لايؤدي الى الاضرار بها. فالمواد المحفوظة لايمكن التعويض عنها اذا فقدت. فالمتاحف الاثنوغرافية مستودع منظم تحفظ فيه كل صور وانماط الحياة في المجتمعات البشرية وهناك طرق علمية في تنظيم هذه المتاحف تتمثل في الطريقة التاريخية والجغراقية والتخصيصية والاجتماعية او الطبقية والبيئية حيث تعرض عناصر التراث ذات الطبيعة المادية كالسلال والاواني المنزلية والمصنوعات الشعبية التي يستعملها الانسان في حياته اليومية. او التي تمثل خطوة لها اهميتها على سبيل تطور المصانع في انتاج نوع معين من السلع اوتلك التي تستخدم في ممارساته الشعبية. ولا ننسى هنا في هذا الصدد الاشارة بالطبع الى ادوات العمل بانواعها. والأزياء الشعبية والحلي وأدوات الزينة.

# چەند لاپەڕەیێک لە مێژوو و ژیان و فۆلکلۆری هۆزی "گل"

عبداللطیف عبدالمجید گلی

## سەرەتاینکی پێویست

مەبەستم لە نووسینی ئەم وتارە، نە ژیاندنەوەی گیانی هۆزایەتی‌یەو نە شانازی‌کردنیشە بە بن و بنەچەی خۆمەوە، تاکە مەبەستم لادانی پەردەیە لە ڕووی لایەنێکی ژیانی بەشێك لە تیرەکانی کورد کە ئەوانەن بە هۆزی (گل) ناویان دەرکردووەو لە ناوچەی (گل)دا دەژین.

ئەگەر لەناو هەموو گەلی کوردیش دا ئەم هۆزەم دەسنیشان کردبێ بۆ لەسەر نووسین، تەنیا لەبەر دوو شتە:

یەکەم ئەوەیە کە لەمیان زۆر زیاتر شارەزام تا لە هەر هۆزیکی‌تر، دووهەمیش بەجێ هێنانی ڕاسپێری‌یێکی باوکی خواڵی خۆشبووم (عبدالمجید محەمەد بەگ جان وەیس بەگ)ە کە زۆری مەبەست بوو شتێ لەسەر ئەم هۆزە

بنووسرێ‌و بە ئاواتەوە بوو خۆی بینووسێ‌و تا بەرەحمەتی خوایش چوو هەر دووپاتی دەکردوە.

خۆ ئەگەر لە لایەکی‌کەشەوە هەر کەس وتارێکی باش و ڕاست لەسەر هۆزو ناوچەکەی خۆی بلاوکاتەوە، لەپاش چەند ساڵ کەرەستەیەکی باشمان لە بارەی هۆزە کوردەکان و ناوچەکانی کوردستان دیتەبەردەست کە هیچ مێژ وونوسێك بە تەنها شتێکی وای پێ ئامادە ناکرێ.

گل: ـ هەرێمێکی زۆر کۆنە، دەکەوێتە نێوانی دوو شیوی ئاوداری بەناوبانگ؛ یەکەم «ئاوەسپی» کە لای خۆرهەڵاتی‌یەوە شۆڕ دەبێتەوە تا باشوری، ئەم چەمە ئاودارە کە زستانان ئاوێکی زۆر وبێژی هەیەو هاوینان ئاوێکی کەم، بەشێکی زۆری دێیەکانی دەوروبەری (طوزخورماتو) ئاودێری دەکات، سەرچاوەی ئەم شیوە چیاکانی سەنگاوە.

دووەم ئاوی «ڕۆخانەیە» کە لە دەورو بەری طاوغ (داقوق) پێی دەوترێ «طوغ شایی»، ئەم ئاوە دەکەوێتە لای باکوری‌یەوەو دێ بۆ خۆرئاوای‌و سەرچاوەی ئەم شێوە، چەمەکانی ناوچەی سلێمانی‌یە.

هەرێمی گل برێتی‌بوو لەم دێیانە:

(گل، کۆرمۆر جان وەیس بەگ، کۆرمۆر علی خان بەگ، کۆشك، ئاوباریك، فەرهاد بەگ، بەهرام بەگ، کانی قادر میران بەگ کەلاوە قەڵای عاشور، سوفی ڕەزا، دارتو، ئەحمەد بەگ... وچەند دێی‌تر...) کە دەکەونە دەوروبەری چیای «جەوەل ناساز»و «خۆرنەوەزان».

تیرەی (گل) تیرەیێکی کۆنی کوردە لەم دێیانەدا، دادە نیشتن و بریتی بوو لە چەند خێل و بنەماڵەیەك «جان وەیس بەگ، فەرهاد بەگ، بەهرام بەگ، میران بەگ (باخەوەنی)، کۆیخا عاشور».

مێژ وونووسان ڕۆشنیان نەکردوتەوە کە ئاخۆ لە بنەڕەت دا تیرەی «گل» لە «گیل» = (گیلان)ەوە هاتووە.. چۆنیش هاتووە؟ یاخۆ لە «گوللی»یەوە هاتووە... یان هۆزیکی سەربەخو بوونە لە بنارگل. لەبەر ئەوەی زۆربەی بنەماڵەکانی تیرەکە نەخوێندەوار بوون، شتی کۆن دەربارەیان زۆر کەم دەزانرێ.

مێژ وونووسان باسی (گل) = (گیل) = (گیلان)یان بەم شێوەیە کردوە:

گیل: ناوی نەتەوەیەکە لە گیلان نشتەجێن (لغت نامە)ی دهخدا لە پراوێزی قاموسی (برهان قاطع)ی بە ڕاست کردنەوەی دوکتور معین وەرگرتوە، هەروەها دەڵێ (معجم البلدان)ی (یاقوت الحموی) نووسیویە: ـ

کە ناوی چەند هۆزێکە لە وڵاتی گیلان، لە چیاکانی باکور، واتا: لە خلخال و تارم دا دەنشین، یونانی کۆن بە (کادوسی)یان ناو بردوون، وەك لە (جوگرافیای سیاسی) کیهان ل ٢٦٣دا ڕوون کراوتەوە.

لە (شاهنامەی فردوسی)دا بە واتای ئازاو دلیر هاتوەو، زۆر جار لە ئەدەبیاتی فارسی‌دا، لە شیعردا وشەی (گیل)و (دیلم) بە مەجاز بە واتای ئازاو دلیرو جنگاوەر بەکارهاتووە.

ئەم وشەی (گیل)ە، لە زمانی عەرەبی‌دا بووە عەرەبی، بە (جیل).

هەروەها بەم واتایانەی خوارەوەیش هاتووە:

١ ـ بە فارسی بە جۆرە گوێزێك دەڵێن کە بە عەرەبی (زعرور)ە.

٢ ـ ناوی گوندێکە لە دەوروبەری (بەغدا) نزیکی (مدائن)ە عەرەب پیی‌دەڵێن (جیل).

٣ ـ ناوی گوندێکە لە گوندەکانی (خودا بەندەلو) لە ناوچەی (زنجان).

٤ ـ ناوی (ابن گیلان شای گاوبارە) ـ گاوبرا سەر زنجیرەی شایانی گاوبارە بووە، پایتەختەکەی (گیلان) بووە، گاوبارە خۆی لە ساڵی ٧٥ی هیجری‌دا مردووە.

٥ ـ ناوی تیرەیەکە لە هۆزی (کلهور) لە کوردستان.

٦ ـ ناوی شێوێنێکە لە دەوروبەری (کرمانشاه) لە نزیکی (قەسر شیرین)ەوە.

٧ ـ بێ‌گومان مایەی شانازی‌یە بۆ هەموو یەکێك لە هۆزی گل، مێژ وونوسیکی وەك خواڵی‌خۆش بوو عباس

العـزاوی له کتێبـه به ناویـانگـهکـهیدا (تأريخ العراق بين احتـلالين ـ مێـژووی عیـراق له نێـوان دوو داگیـرکـرانیدا [داگیـرکـرانی له لایـهن عوسمـانیو داگیـرکـرانی له لایهن ئینگلیزهوه] دهگێڕێتهوهو دهڵێ:

شێخ عهبدولقادری گهیلانی پیری تهریقهتی قادری له کوردستـان و ولاّتـانیتـرا، خهڵکی ههرێمی گله. ئهمـهش دهقی تهواوی نووسراوهکهی به کوردی:

«بنـهمـاڵـهی گهیـلانی بنهماڵهیێکی کۆنن، سهرهتایان به پیـری گهورهی تهریقـهت شێـخ عهبـدولقـادری گهیـلانی دهس پێدهکات که له ساڵی ٥٦١ کۆچیدا کوچی دوایی کردووه. ئهم زاته له ناوچهی گلهوه له ههرێمی کهرکووك هاتووهته بهغدا». [1]

ههر له جێگـایـهکیتـر یاقـوت الحمـوی له (معجم البلدان)دا دهڵێ:

(جیل: ئهمانه خهڵکی جیلانن، وه جیل: گوندیکه له دهورویـهری بهغـدا نزیـکـی «مـدائـن» دوای زراریـن پێیدهڵێن: «گیل» [2] وابن الحجاج پێیگوتوه (الکال) بهم شێوهیه:

**لعن الله ليلتي بالكالِ**

**انها ليلة تعر الليالي**

(ئهبو العز ثابت کوری منصور کوری المبارك الجيلي المقري خهلکی ئهو ولاّتهیه).

ههروهها ئهمیر (شهرف خانی بهتلیسی) که له (١٠٠٥ ـ ١٥٩٦)دا کتێبـهکـهی دوا هێنـاوه کاتێ که لیستمـهی ئهو کوردانه دهداته قهڵهم له پانایی خاکی ئێران دا بلاّوبوونهوه، لهدواییدا نووسیویه:

(لـه خوراسـان دا تیـرهییێکیتـری کوردیش ههیـه پێی دهوتـرێ «گیـل» که له سهردهمی شاه «تـهـهـمـاسبی سهفـهوی»دا ٩٣٠ ـ ٩٨٤ك، ١٥٢٤ ـ ١٥٧٦زا دا، سهرداری ئهم عێله (شهمسهددین بهگ، بوو).

ههروهها له (عشائر العراق الكردية)ی عباس عزاویدا ناوی گل هاتووه. [3]

جگـه لهم سهرچـاوه مێـژوویی‌یـانـه (سـاڵنامهی دولتی عوسمانی) ساڵی ١٣١٠ هیجری ـ باسی (گیل) دهکا، که مرکـزی ناحیـه بووه سهر به سنجـاغی کهرکـوك، وه له تقسیماتی ئیداری ملحق به کهرکوك بهم شێوهی خوارهوه هاتووه:

| گوند | ناحیه | |
|---|---|---|
| ١٣٣ | ـ | نفس کرکوك |
| ٢٧ | ١ | ملحه |
| ١٢ | ١ | طوزخورماتو |
| ٣٠ | ١ | آلتون کوپری |
| ٥٠ | ١ | گیل |
| ١٠٠ | ١ | شوان |

لهبهر گرنگی ههرێمی (گل)و تێدا بوونی چهند چاڵه نهوتی، دهوڵـهتی عوسمـانی زۆر بایـهخی به تیـرهی «گل» داوه، که دهکهوته کهوانی ئهم تیرهیانهوه، کهوا ئابلوقهیان دابون:

- لای باکوری خۆرههلاّتییهوه، زهنگهنه.
- لای باکوری خۆرئاواییهوه، جهباریو شیخان.
- لای باشوری خۆرههلاّتییهوه، داودهی کوردستان.
- لای باشورهوه، داودهی خواروو.

بهلاّم له سهردهمی حوکمـومـهتی عوسمـانیدا به هۆی دهســهلاّتی ئاینیی بنــهمــالــهی شیـخ عبــدالـرحمـانی تاڵـهبـانییهوه، ههندێ له نهوهکانی تاڵهبانی لهو دهورووبهره چهند گوندێکیان پهیداکردو، کهوتنه شهڕهوه لهگهڵ بنهماڵه (برزنجی)یهکان که به شیخێتیو دهرویشییهوه کهوتبونه ناو تیـرهی (شیخـان)و له قهرهچێـوار دادهنیشتن، لهم شهڕهدا (شیـخ حوسین)ی بهرزنجی برا گهورهی (شیـخ حهسـهن قهرهچێـوار) لهلایـهن تاڵـهبـانییـهوه کوژراو، لهو ناوهدا تیـرهکـانی گل و شیخـان و داودهو جهبـاری پشتیـوانیـان له

شێخانی بەرزنجی کرد.

هەر کە ئیستعماری ئینگلیز ولاتی خواروی عیراقیان داگیرکردو گەیینە قەرەخان (جەلولاء).. شیخ حەمیدی تالەبانی و خزمەکانی چونە بە پیریانەوەو دەولەتی ئینگلیز دەسەلاتی شیخ حەمیدی تالەبانی زۆر بەهێز کردو، لە سەرەتادا کردی بە قائیم مەقامی کفری و ئنجا کورەکەی لە جێ داناو ئەوی بردەوە گل و هەرێمی گل ناونرا (ناحیە)و دائیرەکەی برایە (چەم سورخاو).. پاش ئەوەی (سەید محەمەدی جەباری).

ئەم ناحیەیەی سوتاند، جا گوێزرایەوە (قادر کرم)و (گل) کرا بە (قەزا). مەرکزی قەزای گل سەردەمێ برایە (لەیلان)و سەردەمێ برایە (طاوق)و پاشان برایە (طوزخورماتو).[٤]

لە بارەی هێرش بە سەر ناحیەی (جەم سورخاو)، عەولقادر گولشەن جەباری کە یەکێکە لە پیاوە سەربەدەرەوەکانی جەباری و خزمی سەید مەحمەدی جەباری یەو ئیستا نابینابووەو لە گوندی (عەلی مستەفا) دائەنیشێ، ئەگێڕیتەوە ئەلێ:

کە سەیید مەحمەدی جەباری هێرشی بردە سەر ئەو ناحیەیە، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو شێخ مستەفای کوری سەید عەولقادری گولەنەبری بەرزنجیش لە گەڵیا بوون.

ژمارەی هێرش بەرەکان ٤٠٠ سوار بوو، منیش یەکێك بووم لەوان. دوای گەرانەوە لە هێرش بردنەسەر ناحیەکەو سووتاندنی مەرکەزەکەی لە رێگادا لوتمان بوو بە لووتی کاروانێکی میرییەك، ئەویشمان رووت کردەوەو چەك و ئازووقەو جل و بەرگێکی زۆرمان لێ سەندن. لە ئەنجامی ئەو هێرشەدا فروکەی ئینگلیز هاتن بۆ بۆردمان کردنمان.

١٦ کەس لە دێی (پاریاوڵە) لە ناوچەی جەباری شەهید بوون.

هەر ئەم سەید مەحمەدەش بوو برایم خانی دەلۆ پەنای هاوردبوە لای و ئەویش ناردی بۆ لای شێخ مەحمودی حەفید لە (داری کەلی) پێش ئەوەی دەس بکا بەشۆرشەکەی.

هەر لە جێگایەکی تر د. موکرم تالەبانی لە کتێبی (ابراهیم خان ثائر من کردستان) دەڵێت: ـ[١]

«لەو بەری چەمی ئاوەسپی یەوە، شیخ حەمیدی تاڵەبانی لە تۆڵەی شیخ وەهابی کوڕیدا، کە لە دەشتی قەرەئۆغلان کوژرا بوو، هێزی خۆی کۆدەکردەوە بۆ یارمەتی دانی ئینگلیزەکان و ئەم شیخ حەمیدە لە ماوەیێکی کەم دا لە سەردەمی عوسمانی یەکان دا، زەوی‌وزارێکی زۆر بەپیت و بەرەکەتی لە سەرۆك خێڵەکانی گل زەوت کردبوو. بە هۆی ئەوەوە سەدان کەس لەو خاوەن موڵکانەو لە جووتیارەکانی هۆزی گل هەلاتبوون بۆ کەرکووك بەدوای کارێك دا دەگەران پێی بژین، شیخ حەمید کە توانی جێ‌پێی خۆی لەناو هۆزی گل دا جێگیر بکات، ویستی زەوی‌وزاری شێخە بەرزنجی یەکانی قەرەچێوارو زەوی‌وزاری ئاغاکانی داودەیش داگیر بکات.

لە رێگای ئەم هەوڵ و تەقەلایەیدا، شێخ سەمەدی برای بە دەستی شێخ حسێنی قەرەچێوار کوژراو ئەویش لە تۆڵەیدا، شێخ حسێنی قەرەچێواری کوشتەوەو لەو لاشەوە دێهاتی داودەی ئاگر تێ‌بەرداو گەلێ لە دانیشتوانی کوشت.

پاش کشانەوەی تورکەکان و هاتنی ئینگلیزەکان شێخ طالبی کوری شێخ حەمیدیان کرد بە مدیری ناحیەی گل و شێخ حەمیدیش دەستی هاوکاری بۆ درێژکردن و ئەوانیش جڵەویان بۆ شۆرکرد زەوی‌وزاری کێ داگیرکا بیکات».

بەم جۆرە ناوی گل مایەوە... بەلام تاڵەبانی‌یەکان بە هۆی ئەوەوە کە گلەکان یارمەتی بەرزنجی‌یەکانیان داو، لەگەڵ جەبارییەکان دۆست بوون، هەموو گوندەکانیان داگیرکردن و دەربەدەریان کردن... هەندێ ماڵیان مایەوە تا ساڵی ١٩٣٠زا کە شەری ئاوباریك لە نێوانی شێخ مەحمودی حەفیدو هێزی دەوڵەت و ئەو تیرانەی سەر بە دەوڵەت بوون، رویدا، ئەو دوای گلەکان بە تاوانی

هاوکـاری «محـەمـەد بەگی جان وەیس بەگ»[٦] گەورەی هۆزی گل و چەن سەرۆك خێڵەکـانی تریـان لەگـەڵ شێـخ مەحمـودو هێـزەکـانی لە گونـدەکـان دەرکـران و زۆر لە رۆڵەکانیان خرانە بەندو زیندان.

ئەم هۆزە لەبەر ئەوەی بەدبەختی زەمان بوو بە دۆستیان زۆرداران بە پاڵ پشـتی دەوڵـەتی عوسمـانیو لەدواییدا ئیستعمـاری ئینگلیـز تەنگیـان پێـیان هەڵ چنی، گەورەی خێڵەکانیان بە هەڵاتن دا، هێلانەی رۆڵەکانیان تێك دان، خەلەو خەرمان و دارو درەختیانیان بە سووتان دا، لەو بنارە دەریـان کردن، پرش و بڵاوەیـان پێ کـردن بەنـاو شارو دێو دێهاتی گەرمیان و داودەو جەباریو زەنگنەو شێخان و جاف دا.

بەڵام بە پەنـا بەریو کۆچـەواری ئارامیـان نەگـرت، گەورەو بچوکیان تۆڵەسەندن لە داگیرکەران و دوژمنان بوو بە پیشەیان.

**مەحمەد بەگ جان وەیس بەگ گل** (١٨٨٥ - ١٩٦٠زا) - سەرۆکی هۆزی گل - لە دەورانـی عوسمـانیدا، دوای دەرچـوونـی لە وڵات گل و پەنـابـەری لە وڵاتی داودەی گەرمیـان و دامـەزرانـدنی لە گونـدی (قـوین پەلـك - شێخ هەوازی)، لە هاوینی ساڵی ١٩٠٧زا نەوتی وڵاتی (گل)ی سووتـانـدووە لەگـەڵ قادر عاشـوررو چەنـد رۆڵـەیـەکی هۆزەکـەیـان، دەوڵـەتی عوسمـانی بەنـدیکـرد لە شاری کەرکـوك و فەرمـانـی خنکـانـدنی داوە، بەڵام بە هۆی دەسـەڵاتی «سـەیـد ئەحمـەدی خانقـاە»و «سـەیـد وەلـەد کاکەیی»یەوە رزگاری بووە لە مردن.[٧]

جارێکیتر لە ساڵی ١٩٣٠زا، لە شەڕی (ئاوباریك) لە نێـوانی شێـخ مەحمـودی حەفیـدو هێـزی دەوڵـەت و ئینگلیـزەکـان و ئەو تیـرانەی سەر بە دەوڵەت، شان بەشانی شێخ مەحمـود وەستـاوە (خۆیو چەند سەرۆك خێڵەکانی گل و رۆڵـەکـانی، ئەحمـەد خالیـد بەگ، سەعـداللە بەگ نصـراللە بەگ، قادر عاشـور، محـەی مخـە، غفور نازەو، پێش ئەو شەرە بەشـداری تەگبیـرورایـان کردوە خۆیو سەعـدواللە بگ و سەیـد مەحمـەدی جەبـاری لەگـەڵ شێخ مەحمود لە گوندی (داری کەلی)دەربارەی هەڵ گیرساندنی ئەو شۆڕشە).[٨]

لەگـەڵ تیـرەکـانی ناوچـەی گەرمیـان و سەرۆکەکانیان، سەیـد مەحمـەدی جەبـاریو بەگـزادەی داودە (عزیز عباس ئاغـا، رەزای مصطفى ئاغـا، ئیبـراهیم مەدحـەت ئاغـا، کەریم ئاغا)و شێخ مەجیدی شێخ رەزای تاڵەبانی - ئامۆزای شێخ حەمیدی تاڵەبانی لە گوندی (ئاوباریك) لە ناوچەی گل بەشـداری ئەو شۆڕشـەی کردووەو لەوێ برینـدار بووەو لەو شۆڕشـە لەشکـری کورد شکـاوە، شێخ مەحمود ئەسیر (دیـل) بووە، ئەمـانیش هەڵاتـون بۆ ناوچـەی جەبـاریو زەنگەنەو لە کاتی گەڕانەوەی شێخ مەحموددا لە ئەسیری، مەحـمـەد بەگ جان وەیس بەگ یەکێـك بووە لە سەرانی هۆزە کوردەکـان لەگـەڵ سەعـدواللە بەگ گل کە چوون بە پیریەوە لە شاری (کفری)و سێ رۆژ لەگەڵیدا میوانی ماڵی (سـەیـد موحسن ئاغـای بەرزنجـە) بوون و لەگـەڵ شێـخ مەحمود چۆوە بۆ سولیمانی.

لە بەشی دوهـەمی کتێبی (دلیـل تأریـخ مشاهیر الالویة العراقیة/ ١٩٤٧)دا[٩] دەڵێت لە باسی ژیانی (عبدالمجید محمد بگ)ی کوری: «باوکی (مەحمەد بەگی جان وەیس بەگ گل) یەکێکە لە گەورەکانی خێڵی گل و بەوە ناسراوە، کە عەزمی بە هێزەو، نیشتمان پەروەرێکی ڕاستە..».

**عزیـز بەگـی حاجی مەحمـەد گل**: - هەر لە دەورانی عوسمـانیدا، لە دوا دوای سەدەی نۆزدەهـەم، لەگـەڵ جوامێر ئاغای هەمەوەند دژی دەوڵەتی عوسمانی شۆڕشیان کردووە، وڵاتیان جێهێشتووە چوونەتە (قەسری شیرین)، فەرمـانـدەی هەرێمـەکـە دراوە بە جوامیـر ئاغای هەمەوەندو عزیـز بەگ گل کراوەتـە یارمـەتیدەری، پاش ماوەیێـك دەوڵـەتی ئێـران پیـلانێکی دژیـان دروست کردووە، لەپاشا توانویە رزگاری بیت و گەڕاوەتەوە وڵات لە جێی خۆی دامەزراوە.

**ئەحمەد بەگ خالید بەگ گل**: - پاش ئەوەی کە هێزی

کورد چوونــە شەرەوە لەگــەڵ ئینــگـلیــزەکــان لە شەڕی (شعیبە)دا لەگەڵ خێڵی نامیق علی ئاغای داودە بەشداری لەشکری شێخ مەحمودی کردوە، لەگەڵ سەعدواللە بەگی گل و لەوێ نامق علی ئاغای داودەو شێخ علی قەڵ بەزەی جەباری شەهید بوون.

**شوێنە دیاری‌یەکانی ناوچەی گل: -**

ناوچـــەی گل سەرەرای ئەوە کە ناوچــەیــێکی بەپیت و بەرەکەت و پڕ دەغڵ و دانەو باخ و باخاتێکی زۆری تێدایەو بێستانی زوری لێ‌دەکرێ، هەندێ شوێنیشی تێدایە، هەر لە کۆنەوە بە شوێنی ئایینی‌و پیرۆز ناسراون، وەك:

باوەقـەتـاڵ: زیـارەتگـایێکی ئایینی‌یـە بە سەر لوتکەی چیایەکەوە لە نزیك ئاوایی (کۆرمۆری جان وەیس بەگ)، کانیاوێکی گەراویشی لە پاڵدایە، ئاوەکەی گۆگردی‌یە.

پێـشــان خەڵـکـی ناوچـــەکـــەو دەوروبـــەری‌و زۆر لە کاکەیی‌یەکانی هەورامان هەموو ساڵێ دەهاتن بۆ سەر ئەم باوەقــەتــاڵـە بۆ زیارەت و بەرەکەت و دەواریان لێ‌هەڵ دەداو چەنــد مانـگێ لەوێ دەمـــانــەوە، خەریکی کەوچکی دار دروست کردن دەبـوون بۆ دۆ خواردنـەوەو چێشت خواردن، هەروەهـا کاسـەو تەشی‌و شتی‌تـری لەم بابـەتەیان دروست دەکردو دەیان فرۆشتن بە خەڵکی ئەو بنارە، هەروەها زۆر لە کاکەیەکانی ناوچەی کەرکوك هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ زیارەتی.

وا دیارە باوەقەتاڵ یەکێ لە پیشەواکانی کاکەیی‌یەکان بووبێ.[10]

لە بارەی بیناکردنی ئەم زیارەتگاوە پیرەپیاوو پیرەژنەکانی ئەو بنارە سەرگوزەشتەیێك دەگێرنەوە دەڵێن: وەختی خۆی جان وەیس بەگــی گەورەی سەرۆکـی خێـڵی گل تووشـی دەردێکی پیس دەبێ هەر حەکیمێـــك دەهێنـــە سەری بۆی چارناکری، ماوەییکی زۆر لەناو جێگادا دەکەوێ چاوەروانی مەرگی خوێ دەکات.

رۆژێــکـیــان کە جان وەیس بەگ لە گیـــان لادا دەبێ‌و خەڵکەکە خەریکی کفن بۆ ئامادەکردن و ئاو گەرم کردن بۆ شۆردنی دەبن، سەیـــر دەکـــەن وا جان وەیس بەگ هۆشی هاتەوە بە بەراو ساغ و سەلیم راست بووە لە جێگاو چووە ناو خێڵەکــەی پێی‌وتن لەگــەڵی بکـەونـە رێ بۆ لووتکـەی چیاکەی نزیك ئاوایی، پێ‌یان دەڵێ یەکێ لە خاسانی خوا هاتووتە خەوی پێی‌وتوە لە جێگەکەی هەڵسێ‌و بچێ بۆ سەر لوتـکــەی ئەو چیـــایـــە، لەوێ شوێـن رمێــك دەبـیـنـی تەقـانـدوویـانـەو چەقیـوە بەزەوی‌یـەکـەدا، ئەوە نیشـانـەی باوەقــەتـاڵی پیـاو خاسی کاکـەیی‌یـە، گۆزێکی بەســەرەوە بکـاتـەوە. جان وەیس بەگ لەگـەڵ خێڵەکـەی‌دا دەرۆن بۆ سەر لووتکـەی چیـاکـە، دەبینی راستەوا شوێن تیرەکە دیارە چەقیـــوە بە عەرزەکـــەدا، لەوێ ماڵێــك بە بەردو گەچ بە گۆشتـاوی گۆشت گاگیـراوە دروست دەکـات. تا ئێستـاش کەلاوەی ئەو ماڵە هەر ماوە. جان وەیس بەگ کە خۆیشی پاش ماوەیـــێــك دەمـــرێ هەر لەو ماڵـــەدا گۆری بۆ هەڵ دەکەتن و دەی‌شارنەوە.

**گەراو: -**

°کانی‌یێکی گەورەی ئاوی گۆگــردە، لە داوینی زنجیــرە چیای ناسازەوەیە، لە کۆنەوە گەرۆڵ دەچنە سەری خویانی تێدادەشۆن و پێی چاك دەبنەوە.

**سەرچاوەی نەوت: -**

ئەو بنـــارە گەلێ سەرچـاوەی نەوتی تێ‌دایـە خەڵکی ئەو ناوە هەر لە زووەوە لێ‌یـان هەڵ دەگـوست و بۆ سووتـەمەنی‌و روشن کردنـەوەی ماڵ بەکـاریـان دەهینا، چەند کەسێك لە خێڵی گل کردبوویان بە عادەت بە کۆڵی ئێسترو بە کاروان لێ‌یان دەبرد بۆ ناوچەی سولەیمانی‌و کوێستان لەوێ لەگەڵ خواردەمەنی‌و کەل وپەلی لەو ناوە ئاڵشتیان دەکرد.

«پیاوانی گل» کەواو سەڵتەیان لەبەر دەکرد، سەریان بە مشکی، قۆلیـــان بە فەقیــانـەی سپی‌و ئاوەسی دەبـەست، سواری ئەسپ و ماینی بێ ئەنازەو گۆرج بوون.

«ژنـانیـان (ئافرەتەکانیان)» کراس و کەوای زەردو سوورو

سوخمەی سورمەداریان لەبەر دەکرد، پشتێنیان بەسەردا دەبەست، لۆتەوانە لە لوت، گوارە لە گوێچك، ملیوانەی مێخەك بەندیان دەکردە مل.

«کورانی هۆز» خاوەن بەهرەیێکی گەورە بوون لە هۆنراوی فۆلکلوریو بەزم و ڕەزمی شاییو زەماوەن دا، لە کاتی جووت کردن و درەو و گێرەو گێشەدا، لە کاتی هەڵ گرتنی خەلەو خەرمان دا، لە کاری ناو مەرەزەو باخ و باخچەو بێستان دا، لە ڕۆژانی ڕاوە ئاسك و کەروێشك و سۆسك و پۆرو کەودا، لە هۆهۆ بۆ کردنی شوانی مێگەلە مەردا، لە کاتی بێرەکردنی بەهاران، لە هاتو چۆی ڕێگەی کاروان، لە قسە خۆشەکانی دانیشتنی پاش نیوەڕۆی پاڵ سێبەری مزگەوتی گوندەکان، لە گفتوگۆی پیرە پیاوەکان، لە گاڵتەو گەپی شەوانی زستان، لە دەور کوانووی ئاگرو قاوەجاخی دیوەخانەکانی پیاوە گەورەکانیان دا.

هەروا کچانیان لە زەماوندو هۆنراوەی فولکوری بێبەش نەبوون، لە ڕۆژانی خۆشیدا بە باڵای کوڕە سوارەکانی تفەنگ لەشان و نیشەك دان لە مل، لە بان ماین و ئەسپی ئاوزەنگی داریانەوە، لە غاردانی شاییو بووك گۆێزانەوەدا، لە عیشق و سەودای کوڕە ئازاکانی هەراو هوریای لەشکریان لە شەڕی دوژمنانەو لە کاری تەون و تەشی ڕستن داو لە مەڵوونان و مەردۆشین و مەشکەژەندن و پەچەماڵین و لە لایەلایەی ژنان لە کاتی بێشك ڕاژەندن و، هەویر شێلان و دەستار کردن دا، لە هاتوچۆی سەرکایو لە دەرچوونی کۆمەڵ کۆمەڵیان لەگەڵ هەرزەکارەکان بە گۆرانی لەناو دیمەنی دەشت و تەلانی دەورویشتی (باوەقەتاڵ)دا بۆ سەیران و هاوردنی تۆڵەکەو قنگرو پیشیۆك و هەپلۆك لە ڕۆژانی بەهاردا.

هەروەها هۆنراوی کەلەپووریان پربوو لە هەڵبەستی خۆشەویستیو پێداهەڵدان و شین و شیوەن و لاواندنەوەو چەمەرەبیو کۆتل بۆ ئازیزانی کۆچ کردوو.

و لە ئەم وتارە ئەوەش بەبێ موناسەبەت نازانم کە ئەم چەند وردە بابەتە بگێرمەوە کە پێوەندیان بە هۆزی گل و ئەدەبیاتی ئەم هۆزەوە هەیە:

یەکەم - شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە بەیتە شیعرێکیدا ناوی هۆزی گلی بەم جۆرە هێناوە:

**ئاخ لە دەس شۆربای سلێمان چاوەش و قاوەی خلە**
**ئەو دەڵێی ئاوی گەڕاوە، ئەم دەڵێی نەوتی گلە.**

دووەم - لە فۆلکلۆری کوردیدا ئافرەتی گل بەم جۆرە وەسفی کراوە:

**گل و داودەو زەنگنەو شیخان**
**ئەم چوار ملەتە ژنیان قێخان**[11]

سێیەم - وێسو ساووك (١٨٣١ - ١٩٠٩) شاعیرێکی کاکەیی بووە، لە گوندی (قەڵخانلوو)ی گەورە لەدایك بووەو، لە (عارەبی کۆیی)ی نزیکی (داقووق) کۆچی دوایی کردووە.

ئەم شاعیرە، ئەم پارچە شیعرەی بە عەلی ئاغای داودەدا وتووە، کە ناوی هۆزی گلیشیتێدا هێناوە:

**ڕەیس هەفتەغار، ئاغای هەردوو زەن**[12]
**توخوا عەلیاغا! گۆزەی نەفت وە چەن؟**
**یەکێ چە**[13] **بەرەی «های نەفت.. های نەفت.!» بۆ**
**چ تەور وەی تەورە حوکما زەفت بۆ؟**[14]
**سەت کە بەگزادەو خاڵوانی گلی**
**عەیبێکت هەیە نەختێ وە ملی**[15]

## چەند نموونەیێکی هەڵبەستە کەلەپوورەکانی بناری گل

لە مەیدانی شەڕو شۆڕە سواریو پێداهەڵدان

(١)

سوارێکم هاتگە لاو لاو ئەرانێ
ـغکەی فەقیانەی شەماڵ ئەیشانی

★

سوارێکم هاتگە لەکەڵ گلەوە
وەلوولەی تفەنگ ئاگری کردوە

★

جفتە سوارەکەی کەل ماردارێ
سینەوەن زیوو، لەغاو مرواری

★

سوارێکم هاتگە دیورە نایناسم
قەزای ئەو سوارە، لە دیدەی ڕاسم

★

کەی لەو دیوانە مەردێ بنمانۆ
کوڕگل ئاو لە دیەی دوژمن بسانۆ

★

هەی داد، هەی بێداد، تەقەی پاناڵ تێ
تەقەی کوڕ گلە، شەوو شەماڵ تێ

★

قەلای دوژمنە تەواو کریاوە
لە ترس کوڕ گلە سەر نەگیریاوە

★

ئەم دیم کاول بێ، ئەو دیمی پێوە
نرکەی سواری گل قەد نایە لێوە

★

دەسەی فیشەك لغ نیمەی قەوانە
بیدەنە کوڕ گل وەعدەی نیشانە

★

هەلەیراکەوە حەتاکو بەغا، لە تێل دریابێ
هەر وەسپ و سنای کوڕ گل کریابێ

★

دەن لە تەپلی باز لەشکر خورۆشیا
لە تەقەی پاناڵ زەردی خۆرپۆشیا

★

ئەوا هاتە بان وەك شنەی شەماڵ
چوار پەل ماینەکەی پڕ کردە لە ناڵ

★

دەس و دەسەسر ئاڵ و دێزەوە
شانی وە تفەنگ نوقلە ڕێزەوە

★

دایك وە قوربان هەلەو مەلەکەی
فیشەك چەپ و ڕاست دەور کەلەکەی

★

ئی بەرو ئەو بەر، دنیام لێ تاڵە
کوڕ گل ڕاو ئەکا، لە کانی ژاڵە

★

پاوەن قودرەت ها لە پاتانا
دوژمن وە بێ خۆف دایە لاتانا

★

لە گوێیشم نایە دەنگ دلێران
ڕێوی ڕاو ئەکا لە جیاتی شێران

★

**لاواندنەوەی مردوو**

---

هەی وەی شێرە
چاوم کوێرە
بۆ ئەو شێرە

★

دەمم فێرە
دیەم کوێرە
بۆ ئەو شێرە

★

هەی وەی شێرە
لەنگەر لەرزێن

میر داوەزین

★

دەس هەڵ ورڤ

پرچ بوڕن

★

هەی لاو، هەی لاو

کوڕ زەردە لاو

★

نیەیان لە جاو

بردیان وە تاو

★

نە شێرێ کوشتی‌یە، نە شێرەوانێ

یەکێ کوشتی‌یە، بزنە لەوانێ

★

نە شێری کوشتی‌یە، نە شێرەوانێ

یەکی کوشتی‌یە، زوان نازانێ

★

چی غێل ئەسمەرپیچ، تێ‌لا دالاواز

قەومێل کێ دییە؟ سێ لەیل وە بێ ناز

★

لەیلی وە قوربان قەور مەجلووم بوی

تورویش وەك مەجلووم ستارە شوویم بوی

★

کوژیا، کریا وەقەد زینەوە

خوێن هاژەی کردەو کەمەر چینەوە

★

خوشەویستی وڵات

---

(٢)

عەبلە وەخەیاڵ و ماڵ نمە بۆ

دۆست دویر وەتەن و بار نمە بۆ

★

تورو خوا محەمەد گلەیی مەکە لم

ئێش وەتەن سەختە فام نەهیشتە پم

★

مەحمەد بەگێ لە قشلە،[٣] دو ساقی بەنە

قەد کەس نازانێ، جورمەکەی چەنە

★

وینەی ئاسکەکان، پوست لە رەزەن کەن

ئەو جاکە مردم رویم لە وەتەن کەن[٤]

★

ئەی باوەقەتاڵ، نەت کرد خوڵکمان

پەنای شارەکان، بیە مۆلکمان

★

لای لای دایك بۆ مناڵ

---

لای لات بۆ ئەکەم پیر دەروێشان

لە خوام گەرەکە هیچت نە ییشان

★

لای لات بۆ ئەکەم خەو بوەیتەوە

فریشتەی چاکان خەورت کاتەوە

★

لای لات بۆ ئەکەم لە ئێوارەوە

زرەی زەنگڵەت تێ وەگافارەوە[٥]

★

دڵداری

---

دۆستێ پەی دۆستێ فرە دڵسۆز بێ

وە چیە ئێژێ چەژنت پیرۆز بێ

★

پشوێنەکەی سەرم کەفتە لای ملم

تازە وە تەمای کوڕ گەورەی گلم

★

یا باوەقەتاڵ، یا پشت وەکاشە

قیلەم نە کوڕی تازە ریش تاشە
★
هە لە یراکەوە حەتا سنجاوی
گشتی وە قوربان کوڕ صەڵتە ماوی
★
ئوەسی چەرمگ خوت بووە نیشانم
یتەوە باعیث ئیش و فرمانم
★
مشکی‌یەکەی سەری حاشیەکەی بازە
ە خۆی حەز ئەکات، باوکی بەرازە
★
یەزەڵ یەزێومەن،[٦] یە تویلەدارە[٧]
ە دەر ئەو ماڵە کوڕ خوێنەوارە
★
ئاسەکەی دەسی زەرد ئەکاتەوە
گەنمەکەی پشت باغ، گرد ئەکاتەوە
★
دەسگیرانەکەم کوڕە فەقیەیە
عابە لەسەر شان کتێبی پیە
★
بووم وە قوربان، ئەسپەکەی زێری
حوکم رانینی، ناوچەی هەولێری
★
بووم وە قوربان، ڕاستی چەم چەماڵ
نە با ئەی‌گرێ، نە نووزەی شەماڵ
★
دایك وە قوربان کان و مکانی
جیرەی قوندەرەی بەر پەنجەکانی
★
وە بەرزی باڵام وێستیام وەپاوە
هەر چاوت کوێر بێ چێ‌کم خراوە
★

بێژم وە قیبلەم عەمری نەمێنی
تەختەکەی زێری نامەرد ئەی‌سێنی
★
تف لە شەرتەکەت وە بەقاتەوە
دڵەکەم وەتوریا لەلات هاتەوە
★
قوتی‌کەت بێرە جەغارەی تێ‌کەم
نە تۆ ژن بخواز، نە من شویی‌کەم
★
لە خەڵ بیستمە تۆ ژن ئەخوازی
غەوزەکەی[٨] بەغا نەی‌دەی مرازی
★
هۆیجی کەرەکەت دوو کوڕی بمرێ
قاری لە دڵما کردەتە گرێ
★
مەلایە هاتگە لە شاری عورووس[٩]
مارە ئەورێ وە بێ چارەنووس
★
مەلایە هاتگە لەبەر ئەخوێنێ
دڵ لە دڵدارێل وە زۆر ئەسێنێ
★
مەلا مەورە مارەی نەوەدڵ
دەست و قەڵەمت بچێتە ژێرگڵ
★
مەلا بورە کاری دڵداری
دەست و قەڵەمت گوڵ پیاباری
★
یا وەماڵێ زۆر، یا و گفتەی دەم
ئەگەر ئەتوانی دەرمکە لە غەم
ئەگەر ناتوانی بەس بێژە من هەم
★
یا ئیمام محەمەد، ماڵ وە بەرزەوە

یارم نەکوژی وەدەم لەرزەوە
★
ئاوەسپی هات و بەرزی داران
ڕێگەی بریگە لە بۆرە سواران
★
ئاوەسپی هات و بەرزی ژاڵە
ڕێگەی بریگەی لەو برکە ماڵە
★
ئەو برکە ماڵە وە تیلەکۆوە
گشتم خوش ئەوێ لە بۆنەی تۆوە
★
مانگەشەو خۆشە مانگ خەیلێ بەرزە
دۆست و دەسگیران هەر ئەم شەو فەرزە
★
مانگەشەو خۆشە حیلەی ئەسپی شێ
ئەڵا چەن خۆشە دەسگیران لە دێ
★
لۆتەوانە زەرد، لۆت لەرانەوە
زام کۆنەو نوێم گشت کولانەوە
★
ئەو باڵا بەرزە، ئەو تێل وەسەرە
عالەمی کوشتووە، خوێ بێ خەوەرە
★
باڵاکەت بەرزە، وەك گوڵە بەڕۆژە
ڕۆژی نەد دینم، سزای صەد ڕۆژە
★
پشوین شل وملی هەسە بەیانە
تا بگەین وەیەك ئاخر زەمانە
★
کراسەکەت شێلە،[10] مەیدە لە دیوار
دڵ هەدڵێکە، مەیدەو وە هەزار
★

قورئانێ بێرە پیا بیەم دەس
لە تۆ زیاتر مەیل نەم وە کەس
★
جفتێ شەمامە ها وە گوڵەوە
لەنجە ها وەلای باڵە کوڵەوە
★
جفتێ شەمامە ها وە تەرزەوە[11]
لەنجە ها وەلای باڵە بەرزەوە
★
ندیم وە باڵا، شاری وە گەردەن
فەیم گوڵێکە خوا ئیجاد کەردەن
★
باڵاکەت بەرزە وەك بەیداغی ڕۆم
عالەم ئەزانێ من وەتەمای تۆم
★
ئاگرێ ئەسووتێ وە زمناکۆوە
ئەو ئاگرە من بویم وە بۆنەی تۆوە
★
هەی‌دادو بێ‌داد دەردم تاو تاوە
شەو لە ناڵەی من سیروان بێ ئاوە
★
دەرماڵەکەمان شەقامە ڕێیە
یەکی ڕەت بویە نازانم کێیە
★
وە قسەی بەدکار، وە شایەی درۆ
کەفتەتە ناومان، زوڵم و ڕەنجەڕۆ
★
هەر کە دوو قسە بکا، لەم کارە
بە دۆزەق بچێ، وە پای قەنارە
★
ئەگەر نەبوایە وە لۆمەی بسات[12]
کەپرێکم ئەکرد شەوو ڕۆژ لەلات

حەتا دیار بویت، تەمەنات کەردەم
کەفتی وە پێوار[13] گران بویی دەردم
★
ژنەکە رۆیی، بەچە وە پەچە
مچێکمان بەپێ، دەوڵەمەن بەچە
★
هەورێ هاوردی، بارانی نی‌یە
قیبلەم گفتوگۆی جارانی نی‌یە
★
هەورێ هاوردی، دنیا تاڵی کرد
ماڵی قیبلەکەم لە من باری کرد
★
دوعام وە دوعای رسوڵ ئەڵلا بێ
خاوەن کچ بمرێ، کچ بەرەڵا بێ
★
وەگولەی دوژمن نەورێ حەیاتم
دایك حەوت کور بی هەر وە تەماتم
★
کانی‌و سەرکانی، سۆنە سڵ ئەکا
کافر ئەو کەسە، مەعنی[14] دڵ ئەکا
★

## پراوێزەکان

(١) بروانـە: عبـاس العـزاوي، تأريـخ العـراق بين احتلالين، الجزء الرابع، بغداد، ١٩٤٩، ص ـذ—٤ و ١٢٦.

(٢) وا دیارە مەبەستی بنار گلە، چونکە گوندی‌وا لە دەوروبەری بەغداو مدائن نەبوەو نی‌یە.

(٣) لاپەرە ١٦٤ و ١٧٥.

(٤) محمـد جميـل الـروژبیانی، داقوق (دقوقاء) في التأريخ، بغداد، ١٩٨٢.

(٥) د. مكـرم الطـالبـاني، ابـراهيم خان ثائـر من كردستـان، بغداد، ١٩٧١، ص ٨٦ ٨٧.

(٦) باپیری نووسەرە.

(٧) محمـد جميـل الـروبيـاني، داقـوق (دقوقاء) في التأريخ، بغداد، ١٩٨٢.

(٨) شێـخ مەحمـودی حەفیـد کە لە وڵاتی زەنگنـە بوو لەگـەڵ هێـزەکـەی، سەییـد مەحمـەدی جەباری‌و مەحمەدی جان وەیس بەگی گل چوون بۆ زیـارەتی‌و هەمـوو پێکـەوە هاتن بۆ گونـدی (ئـاویـاریـك) لە بنـار گل و لەوێ لە ماڵی شێـخ مەجیدی شێخ رەزای تاڵەبانی قوناغیان گرت تا شەڕەکە کرا. لەو شەڕەدا شێخ عەلی قەرەداغی شەهید کراو لە بەرامبەر (قەرەچێوار) ناشتیان. مەچەکی چەپی مەحمەد بەگیش بریندار بوو، پاش شکانیان و گەرانـەوەیـان بۆ ناوچـەی زەنگنـە لەوێ مەچـەکیـان تیمـار کردو زامـەکـەی چاك بووەوە، بەڵام شوێنی کۆنـە برینەکەی مەچەکی هەر مابوو.

(٩) عبـدالمجيـد فهمي حسن، دليـل تأريـخ مشـاهيـر الالوية العراقية/ ج٢، بغداد، ١٩٤٧، ص ٢٤٢ ـ ٢٤٤٣.

(١٠) هەردەوێـڵ کاکـەیی لە کتێبی (هـەڵبژاردەیەك لە هونراوی فولـکـلوری ناوچـەی گەرمیـان) باسی کردوەو دەڵێ ئەم زاتـە زانایەکی ئایینی کاکەیی‌یە بە تیرەیش (باوە)یە.

(١١) ملەت: کۆمەڵە خەڵك. قێخا: کۆیخا.

(١٢) رەیس: رەئیس. هەردۆ زەن.

(١٣) چە: جە، لە.

(١٤) زەفت بۆ: زەبت بووە.

(١٥) وەملی: خاوەن فیزو تکبری.

## فەرهەنگوکی وشەکانی دەقەکانی فۆلکلۆرەکان

١ ـ هاتگـە: ئەم گافـە وەکـو (د)ی (ئـەحمـەد) لە زاری

سلیمانی‌دا دەخوێنرێتەوە.

٢ ـ عەبلە: پیاوی گەوج.

٣ ـ قشلە: پۆلیس خانەی عوسمانی.

٤ ـ ئەو دێرە هۆنراویە وتەی محەمەد بەگ جان وەیس بەگی گلە.

٥ ـ گافارە: لانك.

٦ ـ یەزەل یە زێومەن: چاو برکێمە.

٧ ـ یە تویلەدارە: لەگەڵ پەرچەم دارێك.

٨ ـ غەوز: شێخ عبدالقادر گیلانی.

٩ ـ عوروس: رووس.

١٠ ـ شێلە: جۆرە قوماشێکی تەنکە.

١١ ـ تەرزە: ساقەت و ریشە.

١٢ ـ بسات: خەڵك.

١٣ ـ پێوار: غەریبی، دوور وڵات.

١٤ ـ مەعن: مەنع، قەدەغەکردن.

**سەرچاوەکان:**


١ ـ معجم البلدان، یاقوت الحموي الجزء الثاني ـ مطبعة دار صادر بیروت ـ

٢ ـ تأریخ العراق بین احتلالین/ الجزء الرابع، عباس العزاوی، بغداد، ١٩٤٦.

٣ ـ عشائر العراق الکردیة/ عباس العزاوی ـ الجزء الثاني، بغداد.

٤ ـ دلیل تأریخ مشاهیر الألویة العراقیة/ الجزء الثاني، عبدالمجید فهمي حسن.

٥ ـ داقوق (دقوقاء) في التأریخ، محمد جمیل الروژبیانی. مستل من مجلة المجمع العلمي العراقي/ الهیئة الکردیة ـ العدد السابع.

٦ ـ ابراهیم خان ثائر من کردستان، مکرم الطالباني، بغداد، ١٩٧١.

٧ ـ شرفنامە، شەرف خانی بدلیسی الترجمة العربیة للاستاذ محمد جمیل الروژبیانی طبعة بغداد، ١٩٥٣ ص ٣٧٥.

٨ ـ دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی/ علي الطالبانی، بغداد، ١٩٤٦ چاپی دووەم.

, ـ هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فولکلوری ناوچەی گەرمیان، هەردەویل کاکەیی، بغداد، ١٩٨٥.

:١ ـ شاهنامە، فردوسی.

١١ ـ جوگرافیای سیاسی، کیهان.

١٢ ـ قاموسی برهان قاطع، بە تصحیح د. محمد معین.

١٣ ـ ساڵنامەی دوڵتی غوسمانی، قرق سکزنجی سنة، ١٣١٠هـ مطبعة عامرة.

ملخص البحث

# صفحات من تاريخ عشيرة گل ونمط حياتها وفولكلورها الشعبي

عبد اللطيف عبد المجيد گلي

يشير الكاتب فى بداية البحث الى ان تخصيصه هذه العشيرة بالبحث ليس عن هوى فى نفسه لاحياء القبيلة، ولا اشادة باصله المنحدر من «گل» وانما لكونها جزءاً من شعبة الكردي ولأنه يعرف عنها ما لايعرفه عن غيرها ويتمنى لو ان كل منتمٍ الى جزء من هذا الشعب دون ما يعرفه عن هذا الجزء، اذاً لتوفرت لدينا مادة قيمة اذا جمعت القت الضوء على اتسام واسعة من الشعب الكردى.

يتحدث البحث عن الرقعة الجغرافية التى تقطنها هذه العشيرة تلك هي الواقعة بين (آوه سپى) و(روخان) فى منطقة طوزخوماتو. ويذكر اسماء القرى التى تقطنها، ويورد معلومات معينة عن الجذر التاريخي لكلمة (گل)، كما يورد احصائيات تتعلق بالعشيرة فى العصر العثمانى المتاخر. ثم يتطرق الى بعض الاحداث التاريخية التى جرت ابان الاحتلال الانكليزى ومواطوء بعض الاقطاعيين مع الانكليز لاحتلال قرى هذه العشيرة. وتعرض رؤسائها وافرادها للاضطهاد سواء فى العهد العثمانى او فى عهد الاحتلال.

ويتطرق الكاتب الى الآثار التاريخية والدينية فى المنطقة والى الحياة العامة لاهاليها وجوانب اتوگرافية فيها، كما يخصص عشرة صفحات لنماذج من الشعر الفولكلورى عن الغزوات والحروب والرثاء والحب وتنوعت الاطفال، مما يتردد على السنة سكان المنطقة من ابناء العشيرة وغيرهم كذلك.

**ئەم وتارە سەرەتای**
**کتێبێکی ڕێزمانی بەراوردکراوی زمانی**
**کوردی لەگەڵ زمانە ئاری‌یەکانی هاونەژادو زمان.**

# زانیاری زمان و زمانی کوردی


ا. د. پاکزە رفیق حلمی
پروفیسۆری زانیاری زمان


دەتوانم بڵێم هەر لەو ڕۆژەوە زمان پەیدابووە، لێکۆڵینەوەی زمانیش هەبووە. بەڵام بە شێوەیێکی ساکارو بێ ڕێ‌رەو و دەستوور. بێ گومان هەموو نەتەوەیێك زمانی خۆی خۆش ویستووەو هەوڵی داوە بی‌پارێزی لە فەوتان پەروەردەی بکات، چونکە گرنکترین هۆی یەکیەتی نەتەوەکەو مانەوەی‌و ژیانی بەردەوامی، مانەوەی زمانەکەیەتی‌و ژیانی بەردەوامی، ئەگەر زمانەکە لە فەوتان رزگاری بوو ئەوا نەتەوەکەش دەژی‌و فەوتان زەفەری پێ نابا، بەڵام ئەگەر زمانەکە مۆرانەی فەوتانی تێ کەوت، ئەوا نەتەوەکەش خوای لەگەڵ. لەبەر ئەوە ژیرو زانای هەموو نەتەوەیێك مێشکی خۆی دەتوێنێتەوە بۆ پاراستنی زمانەکەو دڵی [illegible] لە [illegible]ێشەدا دەبێ لە ترسی فەوتانی‌و خۆشەویستی زمانەکەی لێ دەبێ بە خولیاو ئارامی لێ هەڵ دەگ[illegible]راستی خۆشەویستی زمان کە گۆشەیەکە لە [illegible]ت بەڵکو گەورەترین گۆشە، دەگاتە [illegible]

[illegible] ئەوی جێ [illegible]ردبوونەوەیە، کە ئەم خۆشەویستی‌و [illegible] پەرستنە تەنها بەرامبەر شێوەی نووسینی زمانەکە بووە، بەدرێژایی مێژو ئەوەش وابزانم بە هۆی حالەتێکی نەفسی‌یە، نەك واقعی، چونکە شێوەی نووسین لە یەك قاڵبی پتەودا دەمێنێ‌و زمان پەروەر، لەبەر ئەوەی دەیەوی زمانەکە هەر وەك خۆی بمێنێ‌و نەگۆڕێ، ئەو شێوەیەی لاخۆشەویست دەبێ کە پتەوەو ناگۆڕێ لە کاتێك دا کە زمانی گفتوگۆی سەر دەم دەگۆڕێ‌و ئەمەش نیشانەی تێك چونەو بەڵکو فەوتانە، کەوابو زمانی گفتوگۆ، دەبێ شێوەیێکی شکست و بێ‌پیت بی‌و دەس نەدا بۆ پاراستنی نەتەوەکە دەبێ هەوڵ بدری بۆ توانەوەی لە شێوەی نووسینی پارێزراودا کە ئەمەش بیرو باوەڕێکی نارەوایەو لە جێی خۆی نی‌یە، چونکە کانگای ژیانی شێوەی نووسینە کە خۆی شێوەکانی گفتوگۆیە کە خوێنی ژیانی تازەو موخی پەروەردەکردنی ئەو شێوە نووسینەیە کە بووە بە نمونەیێکی پیرۆزی زمانەکەو بەڵگەی تەمەن و نرخی.

ئەگەر زمانی گفتوگۆیی ڕۆژانە هەمیشە ئەو خوێنە تازەیە نەکات بە بەر ئەو شێوە پیرۆزەدا، ئەو شێوە پیرۆزە وەك (مومیا) رەق دەبێتەوە لە پێستی خۆی‌داو لەگەڵ تیشکی ڕۆژی بەرکەوت یا هەوایێکی لێ‌دا هەڵ دەوەرێ‌و دەپوکێتەوە. بەڵام چی بڵێین لەگەڵ بیرو باوەری تەسك دا. ئەوە نەبێ کە هەوڵی روون کردنەوەی ئەو هۆیانە بدەین کە ئەم بیروو باوەڕەیان خستوتە ئاراوەو ئاگری دەکەن بەڵکو زمان پەروەریی پێ بەزاتای زمان و لەژێر تیشکی عقل و ڕۆشنایی مەنطق دا بیربکاتەوە، نەك بە گڕی

دەرون و سۆزی دڵ. چونکە گەلێ نەتەوە تا ئێستەش لەو باوەڕەدان کە زمانی نووسین زمانێکی پیرۆزەو شێوەکانی تری زمان واتە شێوەی گفتوگۆی سەر زمان نارەسەن و لە ئەنجامی دواکەوتنی زمان داو تێکەڵ بونی بە بێ گانە دروست بوون و دەبێ بفەوتێن و لە کار بکەون و هەموو ئەندامانی نەتەوە دەبێ بەو زمانە پیرۆزە بەسندە گفتوگۆ بکەن و، ئەو شێوە سوکە نارەسەنانە دەس لێ هەڵ گرن ئەمەش بێ گومان ئاشکرایە کە ڕەوا نی یەو ناش چێتە سەر بە تەوریش چونکە، ڕێ بازێکی سروشتی نی یەو ناگونجێ لەگەڵ تەبیعەتی ژیان دا، ئەگەر وابوایە، دەمان توانی هەموو ئەندامی نەتەوەکەش بەپێی ئارەزو بکەین بە یەك ڕەنگ و یەك شێوەو یەك بەژن و بالا. ئەمەش خلافی تەبیعەتی ژیانە. بەڵام ئەوی سودی لەو بیرو باوەڕە تەسکە وەرگرتووە بەدرێژایی مێژو و ئەو چینە پیاوە زانایانە یا ئایینیانەبوون کە کاروباری ئاین و زانیاری و نووسینیان بەدەست بووە، چونکە خۆیان ئەو شێوە زمانە نوسراوەیان داهێناوەو ناویان لێ ناوەو هەر خۆشیان بەکاریان هیناوە، چینەکانی تری نەتەوە لە کۆن دا کە نووسین بەهرەیێکی بەرزو هونەرێکی بەخشندەی خوا بووە وەك ئێستە عام نەبووەو تەنها ئەو چینە باس کراوە شارەزای بووەو کاسبی پێوەکردووە، لەبەر ئەوە نەك هەر بە پیرۆز دانراوە بەڵکو دەستوورو ئاڵو وگۆڕەکەشی نهێن بووە نەیان هێشتووە کەس فێری بێ یا بەکاری بهێنێ تا ماوەیێکی دوری مێژ و و ڕاپەرینێکی فکری. کە بووە بە هۆی ئەوە، ئەو شێوە نوسراوەی زمان ببێ بە شێوەییکی گشت و، ئەندامانی چینەکانی تری نەتەوە فێری ببن و پێی بنووسن.

ئنجا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم باوەڕەی من با چاوێك بگێڕین بە مێژ وودا.

ئاشوری یەکان کە بە خەتی مێخی نووسیویانە، لەو باوەڕەدابون کە نووسین خودای ئاسمان نیبو ـ Nebo پێی بەخشیون.

ئەلف وبێی سانسکریتی ناوی(١) دێڤانا گاری ـ D evana gari یە کە مانای (کردەوەی خدا)یە. هەروەها، هایروگلینر Hieroglyphy ئەو نەخشە وێنەییانەی فیرعەونەکانی میسر لەسەر بەرد هەڵیان کەندووە مانای نووسینی بەردە پیرۆزەکانە، چونکە لەو باوەڕدابون کە (بتاح) خدای حکمەت نەخشی کردووە. هەر وشەی نووسین خۆی بە مسری کۆن ناوی ndw. ntr بوو کە مانای کەلامی خودایە.

لە ڕاستیدا شێوەی زمانی نووسراو، لە کۆن دا شێوەییکی تایبەتی دەست کرد بووە. پیاوە ئاینیە باوەڕ پێ کراوەکان، ئایینامەکانیان پێ نووسیوەتەوە، کە خوداکانیان پێیان سپاردون، لەبەر ئەوە نەك هەر پیرۆز بووە، زۆر بە نهێنیش بەکار هاتووەو دەستووری شارراوەتەوە لە چینەکانی تری نەتەوەکە، هەروەها نووسراوەکان بەتوندی پارێزراون لە پەرستگاکان داو بۆ پاراستنی ئەو نووسراوانە دەستوو سازکردنی نووسیەو خوێندەوەی چینێك پیاوی زاناو ئاینی پەیدابوون کە لە پەرستگاکان دا ژیاون و خۆیان بەخت کردووە بۆ ئەو ئەرکە، **ئەمانەش زۆر بەرێزو پیرۆزو هەڵ بژاردە دانراون لەناو نەتەوەکەدا.**

ئەمەش بووە بە هۆی پەیدابوونی دوو بابەت زمان، زمانی نووسراوی پیرۆز کە دەست کردەی پیاوە ئاینیەکان بووە و، بە زمانێکی بەرزو ڕەسەن دانراوە، کە لە دەستوورێکی پتەوی سازکراودا قاڵبی بەستووەو بە گوێرەی زەمان تێك نەچووە یا زۆر زۆر کەم دەست کاری کراوەتەوە، بە بریاری گشتی ئەو چینە پارێزەرەی. بابەتی دووەمی زمانەکەش شێوەکانی تری زمانی گفتوگۆی گشت نەتەوەکەیەکە بە زمانی (عەوام ـ ڕەشۆکی) دانراوە. بەرامبەر شێوەی پێشوی پەسندو هەڵ بژاردە، زمانی یەکەم. کە شێوەی نووسینەکەیە چونکە نووسراوە بەدرێژایی زەمانی و گۆڕانی چەرخاوچەرخی مێژ وی نەتەوەکە وەك خۆی دەمێنیتەوەو بەرەبەرە بە گوێرەی تەتەوری سروشتی (زمانەکانی ـ شێوەکانی ی)تری گفتوگۆ، کۆن دەبێ و دەچێتە قاڵبێکی کلاسیکی کە وای دێ ئیتر بە ئاسانی هەتا چینی پارێزەرکە خۆی هەڵەی تێدا دەکات و بۆی ناخوێنرێتەوە

ناچار بریار دەردرێ لە سەرەوە بنووسرێتەووو لێك بدرێتەوە. ئەم کارەساتە بەسەر زمانی سانسکریتی، هیروغلیفی، ئاڤێستایی، عیراقیدا هات [2] هەر وەها گەلێ زمانیتر، ئەمەش بوو بە هۆی بوژانەوەی زمانەکان و گیانی تازە پێداکردنیان، وەك زمانە هندییەکان، ئارییەکان، سامییەکان، لە رۆژهەلات دا، هەروەها زمانی یۆنانیو لاتینی لە رۆژئاوادا. بەم گوێرەیە ئەو زمانانە لە فەوتان پارێزران و لە کۆنەوە تا ئێستە لەگەڵ چەرخی مێژوو دەژین و دەگەرێن. زمانی کوردی کە زۆر، نەك هەر، بێگانەو نە شارەزا بەڵکو کورد خۆی سەریان لەسەر رەقی بەرامبەر جەوری زەمان سوڕماوە نازانن چون ماوە تا ئێستەو نەفەوتاوە. چونکە زمان لە سایەی دوو هۆی گرنگ دا دەژیو دەمێنێ، یا ئاینێکی قوڵ و پتەو، یا حوکمێکی چەسپ و بەزەبر، لە باوەری ئەوان دداو، هەروایشە، بەڵام وا دەزانن کە کورد ئەم دوو پەهرەیەی نەبووە، کەوا بونە ئەبویمایە، کەچی وا نییەو لە هەر دوو هۆ پایە بەرزو بەخشندە بووە . چونکە وەکو بۆم روون بۆتەوە، نەتەوەی کورد یەکێکە لەو نەتەوە دێرین و خاوەند مێژوانەی کە لە یەکەم پلەی شارستانیدا بەشدار بووەو زمانەکەی یەکێکە لەو زمانانەی خاوەند شێوەی نووسراوی پیرۆزن. وەك باسیان دەکەم بۆتان لەمەودوا.

وەك لە پێشەوە وتم خۆشەویستی زمان زانایان هان داوە بۆ لێکۆڵینەوەی زمان بە شێوەیێکی ساکار، ئەفلاتونی حەکیم یەکێك بووە لەو زانایانە کە خۆشەویسێ زمانی یۆنانی خستویەتە سەر کەڵکەڵەی لێك دانەوەی زمان و ئەو زانستەی ناو ناوە فیلولوجی phiLoLogy کە لە دوو وشەی لێك دراوی یۆنانی پەیدا دەبێ phiLos ـ خۆشەویستیو Logos وشەوپێکەوە دەبن بە خۆشەویستی زمان، بەڵام ئەفلاتون کە لە دەوری ٤٢٧ ـ ٣٤٧ پ ز ژیاوە ئەوەی بە بیردا نەهاتووە لە بنج و بناوانی زمانەکە بپشکنی یا پەیوەندی بە زمانانی ترەوە بدۆزێتەوە، وەك phiLoLogy دەگرێتەوە ئێستە، هەروەها زانایانی زمان پێش یونانەکان یا دوای ئەوان زیاتر لە دوو هەزار ساڵ، چونکە زانایانی زمانی هەر نەتەوەیێك لەژێر سایەی ئەو باوەردا کە شێوەی نووسینی زمانەکەیان بەخشندەی خودایە، هەر هەولێ لێك دانەوەو دەستوورسازی زمانەکەی خۆیان داوە بە هیچ جۆرێك بیریان لە زمانێکیتر نەکردۆتەوە ئایا پەیوەندیەکی هەیە بە زمانەکەیانەوە یا نە هەروەهاش مێژوی زمانەکەی خۆشیان ئەوەندە جێی نەزەر نەبووە، بەڵکو هەتا شێوەکانی گفتوگۆی زمانەکەیان خۆی بە بەشێکی سوك و نارەسەن داناوەو وایان زانیوە دەستووری نییە چونکە دەستورە بەدی نەکراوەو نە نووسراوەتەوە.

زانیاری زمان هەتا سەدەی هەڤدەو هەژدە هەر بەم شێوەیە بووە. هەتا هەندێ لە (گەریدە ـ رحالە) ئەوروپاییەکان بە هۆی خولیای رۆژهەلات ناسیەوە روویان کردە رۆژهەلات و بە تایبەتی بۆ هندستان بە دوای ئاثاری شارستانی هندستان و ولاتەکانی تری خاوەند شارستانی کۆن، یەکێك لەوانە sir willian jones بوو کە لە دەوری ١٧٤٧ ـ ١٧٩٤ ب ز. ژیاوە، ئەم زانایە لە هندستان دا هەندێ شارەزایی پەیداکرد زمانی سانسکریتیو چەند زمانێکیتری رۆژهەلاتی، و ئەمە خستیە سەر سەددای لێك دانەوەی دەستووری ئەم زمانانەو ئەنجام دا بۆی دەرکەوت هەندێ نزیکی هەیە لە بەینی رێزمانی سانسکریتیو زمانی لاتینیو هەروەها یونانی، ئەمە بۆ یەکەم هەنگاو، لە دامەزراندنی لێکۆڵینەوەی زمان و پەیدابوونی زانیاری زمان کە لەپێشدا ئەو ناوەیان لێ نا کە ئەفلاتون دای نابوو واتە philology دوای ئەوەو لە ئەنجامی بەراوردکردنی هەندێ لە زمانەکانی ئەوروپا لەگەڵ زمانی لاتینیو یۆنانی کۆن لە لایێکەوەو لەلایێکیترەوە لەگەڵ زمانی سانسکریتیو دۆزینەوەی خزمایەتی زمانیان بەشێکی گرنگی ئەم زانیارە پەیدابوو کە ناوی نرا زانیاری بەراوردکردنی زمان comparative philr ئەمە رێی خۆش کرد بۆ زانایانی زمان کە بە دوای رەسەن زمانە کان دا بگەرێن و دابەشیان کەن بە گوێرەی خزمایەتیو نزیکیان لەیەکەوە

بەسەر چەند خێزانێك دا (ق)و گەیشتنە ئەو باوەڕە کە زمانە هنــدی ـ ئێــرانیــەکــان لەگــەڵ زمــانــە یونــانی ـ لاتینیــە ئەوروپایەکان بە یەکەم خێزان دابنێن و ناوی بنێن خێزانی زمانە هندوئەوروپا ییەکان .IndoE uropian Long کە بریتی یە لە زمانەکانی هندستانی ژوورو و ئیرانی ژوورو لەگەڵ زمانەکانی ئەوروپا بێجگە لە چەند زمانێکی کە لەم خێزانە دەردەکرێن چونکە سەر بەخێزانێکی‌ترن وەك مەجەری‌و فنلندی.

یەکەم لێکۆڵینەوە دوای jones فرانز بوپ Fronz Bopp بوو کە لە ساڵی ١٨١٦دا، دەربارەی وشەسازی movphoLogy بوو لە زمانــە هندوئەوروپاییــەکــان دا، کە بوو بە هۆی پێك هاتنی بەشی (وشەسازی) لە زانیاری زمان دا. دوای ئەو راسموس کریستیان رەسك R.K. R ask لە ساڵی ١٨٨٣ پ ز دا کە سەرتای دەنگ سازی داهێنا بە بەراوردکردنی دەنگەکان لە زمانــە هنــدوئە,روپاییداو بوو بە هۆی پەیدا بوونی (زانیــاری دەنــگ ـ- phonenties) ئنجــا ئوگــەست فردریش پوت ١٨٠٢ ـ ١٨٨٧ پ ز، کە (زانیاری مێژ وی وشــەی Etymology) داهێنــا بە لێکـۆڵینــەوەیێکی دوورودرێژ لە مێژ وی وشەی زمانە هندوئەوروپاییە کان دا.

هەروەهــا یەك بەدوای یەك دا زانــایــان بەرهــەمــی لێکــۆڵینــەوەی خۆیــان دەرهێنــاو خستــە بەردەستا زمــان پەروەران بێ‌وچــان تاوەکــو هەمــوو بەشــەکــانی زانیــاری روون بووەوەو خێزانی زمانەکان ناونیشان کران. بەم جۆرە کەوا ئێستە دەیزانین و، ئاشکرا بوو کە زمان دەبێ لە دوو رۆڵ دا بنــاسـرێتــەوە لە رۆڵی رۆالەتی کانی لێکۆڵینەوە کە پێی دەڵێن (زانیــاری وەسفی زمــان Descriptive) کە ئوتــو بۆ تلینج ـ otto botlingh دای‌هێناو، دوو هەم لە رۆڵی مێژودا کە پێی دەڵێن (زانیــاری مێــژ وی زمــان .Historical ling) ئینجــا (فردناند دی سوسور)ی بە ناوبانگ لە ١٨٥٧ ـ ١٩١٣دا چەند محازەرەیێکی دا بوو قوتابیەکانی دوای خۆی بلاویان کردەوە لە ساڵی ١٩١٥ کە باسی هەمــوو گۆشــەیــێکی زانیــاری تێــدابــوو. لە ساڵی ٩٣٣/دا لیــونــارد بلومفیلر کتێبێکی بەنــرخی دانــا ناوی نا (زمــان) ئەم کتێبــە بوو بە سەرچاوەیێکی زۆر بەنرخ بە دەست زمانەوانەکانەوە تا ئەمرو کەتیــا گەیشتــە ئەو یادەرە کە زمــان وەك ئینســـان دەژی‌و دەمرێ‌و لە ماوەی ژیانی‌دا دەگۆڕڕێ‌و هەموو زمانانی دنیا بە یەك شێوەو لەسەر یەك قانون وەرەك یەك دەگۆڕڕین، یەعنی عالــەمێکی تایبــەتیــان هەیــە کە هەمــوو روداوێکی تیــدا بە قانــون دەبێ‌و دەگــۆڕڕێ‌و ئەم قانــونــەش یەکــە بەرامبــەر هەمــوو زمــانــێك. هیچ زمانێك بەرز نی‌یەو ئەوی‌تر نەوێ. هیــچ زمــانێــك پیرۆز نی‌یەو ئەوی‌تر سوك. دوای بلومفیلر، ئوتو یسپرسن لە ساڵی ١٩٣٤دا کتێبێکی دەرهێنا بە ناوی

The Phihosophyof gramm

کە ئەمیش سەرچــاوەیــێکی زۆر بەنــرخــەو بوو بە هۆی روون کردنــەوەی گەلێ بیــرو باوەر کە زۆر روون نەبون و راست کردنــەوەی گەلێکی‌تــریش کە هەڵــە بوون، ئەوی شایــانی باســە لێرەدا کە زانــایــانی زمــان بریــاریــان دا کە پێ‌ویست نی‌یە خۆیان بە نەژادو رەسەنی زمانەوە خەریك بکــەن یا لە سەرەتــای هەڵ کەوت و جۆری هەڵ کەوتــی بگــەرێن، چونکــە ئەم گۆشــەی زمانە کە لە کۆن دا زۆری وەقت بۆ تەرخــان دەکــراو هیــچ نەدەگــەیشتــە ئەنجام. لەوە گرنگتــر بە لای زمــان زانــەوە ئەوەیــە دەستــووری زمــانە کە لێك بداتەوەو ژیانی لە ماوەی مێژودا روون بکاتەوە.

ئینجا ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەم دوو سەد تا سێ سەد ساڵەی رابوردو، زانیاری زمان کرا بەم بەشانەی خوارەوە:

١ ـ دەنگ و زانیاری دەنگ phoheticsc phonology
٢ ـ تیپی نووسین orthography
٣ ـ وشەو مێژ وی وشە Ety mology
٤ ـ وشەسازکردن morphology
٥ ـ رستە سازی syntax
٦ ـ فەرهەنگ سازی Lexicology
٧ ـ واتا سازی semomtics
٨ ـ شێوە (لهجە) سازی dialeetology
٩ ـ هەڵبەست (عروض) prosody

هەروەهــا دەرکــەوت کە گەلێ زانیــاری‌تــر هەیــە زۆر

پەیوەندییان هەیە بە پەیدا بوون و گۆڕین و پەرەسەندن و فەوتانی زمانەوە، پێویستە زانای زمان ئاگاداریان بێ وەك زانیاری مێژو، نەژاد، ئینسان تەشریح و، فەلسەفە و زانیاری نەفس.

ئنجا بێینەوە سەر خێزانی زمانەکان، کە خێزانی هندوئەروپین لێرەدا مەبەس ئیمەیەو هەر باسی ئەو دەکەین کە زمانی کوردی یەکێکە لە دێرین ترین زمانی ئەم خێزانە.

بەلام، ئەوی شایانی باسە پێش ئەوەی دەس بکەین بە باسی خێزانی زمانە هندو ئەورپاییەکان، ئەوەیە کە زانیاری لێکۆڵینەوەی زمان لە راستیدا گەلێك پێش ولیم جونس دەستی پێکردبوو، هەر بە شێوەیێکی زۆر نزیك لەو شێوەیەی کە ولیم جونس دایهێنا واتا بەراوردکردنی زمان، ئەویش لە هندستان و ئیران دا بوو کە لە دەوری ٥٠٠ تا ٦٠٠ سال پ ز بوو. وەك بە زمانی سانسکریتیو ئاڤێستا، دەس پێکرد لەو کاتەدا (٥٠٠ ـ ٦٠٠)پ ز، هەروەها زمانی سانسکریتیو ئاڤێستا بوو، زانایانی بەرەوهندستان رەوانەکرد بە دوای لێکۆڵینەوەی زمان دا لە سەدەی ١٧دەدا. لێرەدا دەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە زمانی ئاڤێستا بوو پێش سانسکریتی کە سەرنجی زانایانی راکێشا ئەویش لە سالی ١٧٥٤ واتە چل سال پێش. jones گەنجێکی بیست سالێ فرنسز کە ناوی ئەنکتین دوپرۆن Anquetil Durom [4] بوو و لە معهدی دراساتی شرقی لە پارس دەیخوێند چوار پەڕەی لە بەشێکی ئاڤێستا دەس کەوت کە ناوی Vendidad ە و بڕیاری بەخۆیدا وەریگێڕێتە سەر زمانی فرنسزیو پێش کەشی بە زانایانی زمانی بکات. لە سالی ١٧٥٥ دا چوبوهندستان وپاش سێ سال هەول وتە قەلا وتێکۆشین گەیشتە Surat و لەوێش سێ سالیتری رابوارد لەگەل باوەرپێ کەرانی زەردەشت و لە ئەنجامی هیلاکیو ماندوبونێکی زۆر گەیشت بە ئاوات و لە سالی ١٧٦٤دا گەرایەوە پاریس لەگەل نوسخەیەکی تەواو لە زەند ئاڤێستا و دە سالیتریش رابوارد بە لێکۆڵینەوەو لێك دانەوە وەرگێڕانی بۆ فرنسزی. هەتا گەیاندی بە چاپ کردن لە سالی ١٩٧٧١ دا لەدوایدا کریستیان پارثلومی. Cristian Bartolomae تەواوی عمری خۆی تەرخان کرد بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی زمانی ئاڤێستا بە هەموو بەشەکانی، دەنگ، وشە، ڕستەو فەرهەنگ و هیچ گۆشەیێکی نەهێشت لێی نەکولێتەوە. [5]

تۆزێك لەمەوپێش وتمان کە زانیاری زمانی بەراوردکراو گەلێك لەپێش ولیم جونز و ڕۆژهەلات ناس و زمانەوانەکانی ئەوروپای سەدەی هەژدە دەسی پێ کردبوو، ئەویش لە هندستان و ئیران دا نزیکە ٥٠٠ ـ ٦٠٠ ب.ز. واتا لە ولاتی ئاریان دا. بۆ لێك دانەوەی ڕێزمانی ئەو شێوە پیرۆزە نووسراوو ئاینیایانەی هندی براهمانی کە بریتی لە چوار بەرك سرودی هۆنراو بە زمانە هندیيە کۆنەکان کە نزیك هەزار تا هەزارو دوو سال پ.ز. کۆ بووبوونەوە و لەبەر کۆنی ڕێنووس و خوێندنەوەیان ئاسان نەبوو دوای ٥٠٠ ـ ٦٠٠ سالێك. لەبەر ئەوە ئەنجومەنی زانایانی ئاینی براهمانی بڕیاریان دا هەموو وێنەکانیان کۆبکرێتەوە [6] و لە سەرەوە بنوسرێنەوە. ئنجا هەموو سرودو هۆنراوەکانی هندی براهمانی کۆکرانەوەو لە چوار بەرگ دا نووسراوەو ناو نران vedas - ڤێداکان. بە شێوەیێکی پەسندی دەست کرد و ئەم زمانە ناونرا سانسکریتی، Sanskrita کە مانای ڕاست و دروست و هەل بژاردەیە یا نووسینی بەرزو پیرۆز. بەرامبەر بە شێوەکانی تری زمانەدە کە بە ناوی Prakrati واتا زمانی عەوام - ڕەشۆکی (7) یا زمانی گفتوگۆ. یەکەم هۆی ئەو زاناو ئاین پەروەرانی ئاینی براهمانی ئەوە بوو، سرودە ئاینیەکۆنەکان کە زۆریان هەر بەسەر دەمەوە، بپارێزن لە فەوتان و گۆڕران و تێك چوون. چونکە کەمترین و بچوکترین لە ڕێزمان و بەتایبەتی دەنگەکان دا دەبێ بە هۆی گۆڕینی ماناو، ئەمەش تاوان و خەتاییکی زۆرە لە چاو لێك دانەوەی سرودەکان داو هەروەها ئاینەکە. لەبەر ئەوە، چینێك زانایان، دانانی دەستوورێکی وردو پتەویان پێسپێررا بۆ ئەوەی ئەو شێوە زمانە کە سرودەکانیان پێنووسیەوە واتا san skrit ـە فەوتان و تێك چوون و دەست لێدان بپارێزێ پنین ـ pamini گرنگترین و

وزاناترینی هەموویان بوو، و توانی بە ورد بوونەوەییکی بێ ئەندازە ئەم ئەرکە بەرێتە سەرو بەشێوەییکی وا ئەو دەستوورە دانێ کە نەك هەر زمانی سانسکریتی پێبپارێزێ بەڵکو ببێ بە یەکەم زانای زمان لە دنیادا کە تا ئێستەش کتێبەکەی یەکەم سەرچاوەی زانیاری زمانە بە گشتی بووەوئەو رێبازەی دایناوە بۆ لێکۆڵینەوەی زمان بە گشت بووە بە قانون هەموزانایێکی زمان دەتوانێ هەرچی زمانێکی بیەوی پێی نێك بداتەوە(٥) بە تایبەتی لە دەنگ سازیدا. هەروەها، یەکەم کەسە، کە باسی وشەو مانای وشەی بە نووسراو داهێناوە کە فەرهەنگ سازییە ـ Lexicology هەروا دابەش کردنی وشەو ناونانی جۆرەکانی، وەك ناو ـ na mam راناو ـ sarvan aman کار ـ فرمان akhyata، و ئامرازی ئیزافە ـ حەرفی جەر upasarga و ئامرازی پەیوەندی گشتی nipata هەتا باسی ناوی لێك دراوی بە دورو درێژی کردووەو جۆری لێك دانی کە بە هۆی کەرت ـ کە ناوەکەی هەر وەك کوردییە krt یا بە هۆی پاشگرو پێشگرەوە Tadhita - affixes پێك دێ. کتێبەکەی پاتین کە لە دەوری چوار سەد ساڵ پێش زاین دانراوەو ناوی astadhyayi یە(٦) بریتییە لە چوار هەزار پەند ـ حکمەت ـ aphorisms کە زۆر بە کورتی دایناون، بە نزامێکی کە لەسەر معادلاتی جەبرەوە وەرگیراوە بەڵام هەموو گۆشەییکی زمان دەگرێتەوە، شێوەییکی وا کە ئینسان سەری لە ژیریو بلیمەتی سوردەمێنی و باوەر ناکات ئەمە تێکۆشین و رەنجی تەنها یەك مرۆڤ بێو دەبێ ئەنجامی رەنجی گەڵ کەس پێشوتر بوویێ بەڵام پانینی توانیویەتی بە بیری تیژی خۆی و ژیریو دانایی رێکیخا بەو نزامەو بینووسێتەوە لەو کتێبەدا کە ئێستە یەکەم سەرچاوەی زانیاری زمانە لە سەدەی چوارەی پ.ز تا ئەمرۆ. لێرەدا بۆ ماوەییکی کەم باسی زمانی سانسکریتی بەجێدێڵیەو، لەدواییدا دەگەرێنەوە سەری بۆ بەراورد ـ کردنی لەگەڵ کوردیو زمانە ئارییایەکانیتردا.

لە راستیدا بەدی کردنی پەیوەندیو لەیەك چوونی زمانی سانسکریتی لەگەڵ لاتینیو یونانیدا، بوو بە هۆی گۆرینێکی زۆرو بێ ئەندازە لە زانیاریو لێکۆڵینەوەی زمان دا. ئەم زانستە کە هەتا سەدەی حەڤدەو هەژدە لە چوار چێوەییکی تەسکی خەیاڵی چەند کەسێك دا دەخولایەوە، وادەزانرا کە لە ئاسمان زمان دروست دەبێو خودا دەیبەخشی، نەتەوە خۆشەویستەکانی یا، رێزمان تەلیسمێکی نهێنییە بەجادوگەر نەبێ لێك نادرێتەوە، هاتە سەر رووی ئەرزی واقع و زانایانی خستە کۆری وردبوونەوەو لێك دانەوە و بەراوردکردن، زمان تا ئەو رۆژە وەك تابو ـ Tabo وابوو کەسێ ئەو تەلیسمەی بە دەس نەبوایە نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە یا دەس لە رێبازو دەستوریەوە بدا. هەرچی زانای زمان خەیاڵی خۆی دای‌نا بێ ئەوەی بزانی زمان چییە چۆن پەیدادەبێو چ کارەساتێکی بەسەر دێو چۆن دەژی چۆن دەفەوتێو چۆن لق و پۆپی لێدەبێتەوە و ئینسان و کۆمەڵ چ دەورێکیان هەیە لەو کارەساتانەی بەسەر زمان دا دێو، پەیوەندی زمان چییە بە مێژو و یا شارستانییەوە. واتا زمان زان زمانی لەو دەستوورو قاڵبەدا دەبەستەوە کە بە خەیاڵی خۆی بە رێبازی زمانی دادەناو شاکردەکانی دەبوو وەك توی لەبەری بکەن بێ ئەوەی بزانن بە کەڵکن بهێنن، زمانی نووسیە بەم شێوەیە تەنها شێوەییك بوو دەستووری لەبەر دەکراو خەلقیتر هەر وەك خۆیان زمانی گفتوگۆیان بەکاردەهێنا.

زانیاری زمان ئێستە لە هەموو گۆشەییکی زمان دەکۆڵێتەوەو بە تایبەتی شێوەکانی گفتوگۆ چونکە زمان لەو شێوانەدا بە راستی دەژیو پەروەردە دەبێو رەنگ وبۆی تێدا دەردەکەوێ. هەروەها لێك دانەوەی زمان بووە بە زانیارییێکی خاوەند قانون و دەستوورو بە پێی ئەو قانونە گشتیانە هەموو زمانێك لێك دەرێتەوە کە یەکە بەرامبەر هەموو زمانێك لێرەدا دەبێ ئەوەش بزانرێ (هەڵ سەندنی) چینایەتی لە زمان دا نییە واتە زمانێك سوك بێو زمانێك بەرز، بەڵام بەپێی پێویست چەند شێوە زمانێك پەیدادەبێ وەك زمانی چینی ئەندازیار یا پزیشك. یا چینی بازرگان و

کەسەبەی ناو بازار... زمانیش لەپێش هەموو شتێك دا دەس کەوتێکی تێکۆشینی ئینسانە کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا پێویستەو بەرهەمی توانای مێشك و هۆشیەتی کە بەکاریهێناوە بۆ سازکردنی.

دۆزینەوەی خزمایەتی زمانەکان دوای دامەزراندی زانیاری زمان بەو جۆرەی باسمان کرد، پێی خۆش کرد بۆ بەرنامەو دەستورێکی رێك خراو بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کە یەکەم هەنگاوی ئەوە بوو، پاش بەراوردکردنی دەستوری زمانەکانی خزمایەتیان بەدیکرا بۆ دابەش کردنیان بە چەند بەشێکەوە کە ئەو خزمایەتی‌یە ئاشکرا بکاو رێی لێکۆڵینەوەو بەرا وردکردنی رێزمانیان و پەیوەندی‌یان بەیەکەوەو دوورو نزیکی خزمایەتیان و هەروەها مێژو و بەسەرهات و گورین و فەوتانیان ساغ بکاتەوە پێکەوە لە ئەنجام دا زاراوەی هندوئەوروپی gndo Europiaw هەڵ بژێررا بۆ ناوی کۆمەڵێك زمان، کە سەر بە زمانی سانسکریتی‌و ئاڤێستایین و رۆژهەلاتیە لە لایەکەوەو لەلایەکی‌ترەوە سەر بە یونانی‌و لاتینیە کە رۆژئاوایی ـ ئەوروپایین. نەك هەر لە وێنەی تازەی ئەمرومان دا بەڵکو لە وێنەی مێژویی کۆنەوە تا ئێستە.

خێزانی زمانە هندوئەوروپاییەکان. ئەم خێزانە زمانە کۆمەڵێك زمانی دانیشتوانی ئاسیاو ئەوروپا دەگرێتەوە چەند زمانێك نەبێ کە سەر بە خێزانی ترن لە کاتی خۆی دا باسیان دەکەین.

ئەم خێزانە گەورەیەش لە دوو شابەش پەیدا دەبێ یەکەمیان زمانە هندوئێرانیەکان کە زمانی هندی سانسکریتی‌و ئاڤێستایی کونترین نمونەیانن و فارس و کوردی‌و، ئەفغانی‌و هەندێ زمانی‌تر نمونەی تازەیانن. دوهەمیان زمانە ئەوروپاییەکان کە یونانی‌و لاتینی نمونەی کۆنیانن و، زمانەکانی رۆژئاوای ئەوروپا وەك ئینگلیزی، ئەلمانی، فرنسزی، ئیتالی، روسی نمونەی ئێستەیانن.

بەتێك رایی ئەم خێزانە بە گوێرەی دوورو نزیکی زمان، دەکریت بە دە بەشەوە:

١ ـ زمانە ئاری‌یەکان یا هندوئێرانیەکان.

٢ ـ زمانە بەیەلتیکەکان Baltie وەك لیثوانی. لاتیڤی.

٣ ـ سلاڤی کۆن. کە لە روسی‌و بولغاری‌و پولەندی، چیکی‌و سربی وکرواتیی پەیدا دەبن زمانە بەلیتیکی‌و سلاڤیەکان ئەوەندە لە یەك نزیکی کە هەندێ جار بە یەك بەش دادەنرێن[10] کۆنترین نمونەی ئەم بەشە، بولغاری کۆنە کە لە سەدەی نۆیەمی زاینەوە.

٣ ـ زمانی ئەرمەنی Armenan زمانی ئەو نەتەوەیەیە کە هاوسنورە لەگەڵ وڵاتی کورددا، کۆنترین نمونەی نووسراوی لە سەدەی پێنجەمی زاینەوە دەس پێ‌دەکات

٤ ـ زمانی ئەلبانی، کە تەنها لەم چەند ساڵەی دوایی‌دا ناسراوە ئەم چوار بەشەی زمانە هندوئەوروپاییەکان پێکەوە بە زمانی Satem ناونراون چونکە لە کاتی بەراوردکردنی زمانە هندوئەوروپاییەکان دا دەر کەوت کە کۆمەڵێك لەم زمانانە لە ناوی ژمارە (سەد)ی کوردی دەنگی (س ـ S) دەبێ بە (ك ـ K) ئینجا ئەمە بۆ مەبەس بە راورد کردنی ئەم زمانانەو ئاشکراکردنی پلەی خزمایەتیان بووە بەڵگەی بەش کردنیان بە دوو بەشەوە بەشی یەکەم کۆمەڵی [کەنتوم ـ centum ]ی پێ دەڵێن کە زمانی لاتینی لەم کۆمەڵەیە، بەشی دووم کۆمەڵی [سەتەم ـ Satem ی پێ دەڵێن، ئەمەش زمانە هندوئەوروپاییەکان دەکات بە دوو بەشەوە، کۆمەڵی زمانی cemtum و کۆمەڵی زمانی satem کە (کوردی) لەم بەشەیە ئەمەش دوای بە وردی باس دەکەین.

٥ ـ زمانی greek ـ یونانی کە شێوەی کونێ لە (ئەلیازەو ئۆدیسە)ی هۆمیروسەوە دەس پێ‌دەکات نزیك ٨٠٠ پ.ز.و ئێستە گەلێ شێوەی گفتوگۆیی‌و بچوکی لێ‌کەوتوتەوە.

٦ ـ زمانی لاتینی ـ Latin کە ئێستە چەند زمانێکی سەربەخۆی لێ‌کەوتوتەوە بە تێك رایی پێیان دەڵێن زمانە [رومانس ـ Romamu ]ە کان، وەك فەرەنسزی، ئیتالی، هسپانی ـ ئیسپان، د پورتغالی ،رومانی.. کۆنترین نمونەی ئەم زمانانە هی ٢٠٠ب.ز.

١ ـ زمـانـــه كەڵتيـەكـان Cettie كە لەم شێـوانـە پەيـدادەبێ ئێرـەنـدی، بریتـانی، وێلش، و گەلێکی تـر، کۆنتـرین نمونەیان هی دەوری ٨٠٠م.[11]

٨ ـ زمـانـە جەرمـانيـەكـان[12] germanic كە دەكـرێن بە دوو بەشـەوە بەش رۆژهــەلات و بریتــی یــە لەم زمـانــانــە[ gothie ـ غوثی] كۆن كە فەوتــاوە، زمـانی ئيسكـەنـدنیـاڤیـەكان بەش رۆژئاوا كە بریتیە لە ئینگلیزی ئێستـەو ئەڵمـانی كۆنتـرین نمـونـەی ئەم كۆمەڵە دەگەڕێتەوە ٤٠٠م كە بە غوثی كۆنە.

دوو بەشی‌تـری ئەم خێـزانی زمـانـە گەورەیـە كە ئێستـە فەوتـاون و لەم دواییـەدا نمـونـەیـان دۆزراوەتـەوەو نرخێکی تایبـەتیـان هەیەلەلایـەن زانیـاری بەراوردكـردنی زمـان Com. philology یەكـەمیـان زمـانی (تـۆخـاری)یـە كە لە تركستانی چینـی دۆزراوەتـــەوەو هەنــدێ ئاین نامــەی بوذیــەكــانی پێ‌نووسراوەتەوە لە دەوری سەدەی دەیەم (م)دا ئەویتریان زمانی (حثی)یەكان Hittite كە بە خەتی مێخی نووسراوەو لە بوغـازی كۆی لە تركیـا ـ انـادوڵ دۆزراوەتـەوە. (بـوغـازی كۆی) پایتــەختی هثیـەكـان بووە مێـژووی ئەم نووسـراوانـە دەگـەڕێتـەوە نزیـك ٢٠٠٠ ساڵ زیـاتـر لە پێش عیسا. كە ئەمەش شێوەی یەكێك لە كۆنترین زمانە ئێرانیەكانە و پێش سانسكریتی‌و ئاڤێستاییەو دوو. هەزار ساڵ زیاتر پ.ز. بووە.

بێجگە لەو زمانانەی ناومان بردن، لە چەرخێکی كۆنترا چەند زمانێكی (هندوئەوروپی) هەبوون لەو ناوچانەی زمانە ناوبــراوەكــان، بەڵام فەوتـاون، وەك ژاكی thraeian كە لە مەكدونیاوە هەتا جەنوبی رۆسیا مەڵبەندیان بووە. فریجی phrygian كە لە ئەنادولدا ژیاون و گەلێکی‌تر كە شایانی باس نیـە ئێستـە. بەڵام ئەوی شایـانی باسـە كە چەند زمانێكی كۆن لە نووسـراوە مێخیـە (هیثی)یـەكـان دا ناوبراون كە لە (ئـەنـادوڵ)دا ژیـاون لە دەوری ئەوان دا واتـە لە ٢٠٠٠ ـ ١٠٠٠ پ.ز وەك زمـانی لوەكـان ـ cLuwiam لەگـەڵ چەنـد نووسراوێك بەم زمانە بە مێخی هەروەها چەند نووسراوێك بە زمانی (هیثی) كە بە خەتی (هیروغلین) واتە وێنەیی كە كۆنترە لە مێخی[13] و بەمەدا ئاشكرایە كە گەلێك پێش دوو هەزار ساڵ پ.ز. ژیـاون لەو ناوچـەیـەدا و خاوەنـد شارستـانیـەكی وەك شارستـانی میسـری‌یـەكـان بوون كە دەگـەڕێتـەوە چوار هەزار ساڵ پ.ز. هەروەهـا چەنـد زمانێکی‌تری سەر بە هندوئەوروپی ـ بەشی هندو ئێرانی لە چوار هەزار ساڵەوە پ.ز. ناسراون لە ناوچەی مێزوپوتامیا Mesopotamia دا كە عراقی ئێستە بەشێكیەتی [14]وەك زمانی سومـەری دەوری ٤٠٠٠٠ پ.ز. زمـانی كاشیـەكـان لە دەوری ٢٠٠٠پ. زمـانی میتـانی لە دەوری ١٦٠٠پ.ز زمـانی ناوچـەی (وان) لە ١٠٠ پ.ز بەمـە كوتـایی باسی خێزانی هندوئەوروپی بەگشت دێنین.

لە وتاری ئایندەدا باسی زمانە هندوئیرانی و ئاری‌یەكان دەكەین بەدرێژی كە زمانی كوردیی یەكێكە لە دێرینترین و گرنگترین نمونەیانە.

1 - the story of Language - Mano Pei .P.87

2 - Hebrew grammar. gesenius .P.8

3 - Language - Leonard BLoofield .P.12 - 13

4- کاتها، سرودهای زرتشت. پور داود. ص. ١٠،

5- کاتها، سرودهای زرتشت. پور داود. ص. ١٣،

6 - the Sanskrit Languge .T. Burrow P.3

7 - the Sanskrit language - T - Burrow P.1.

8 - the Sanskrit language - T - Burrow P.48 - 49

رەنگـە وەستـا مۆستـە لەووەهـاتبێ‌و مانـاكـەی مام مەستای‌ـو ئێستە بێ‌و ناوی كتێبە كەش ماناكەی (مام وەستایی) بێ

10 - the sanskrit lang .T. BurrowP.7

11 - the Snnskrit Lang .T. Burrow .P. 8 - 9

12 - the sanskritLany.7. Burraw p.8.

13 - Language .L. BLoofieldP.58

14 - Language . BLoomfield .P.65

# علم اللغة واللغة الكردية

د. ياكزه رفيق حلمي

استطيع القول بان البحث في اللغة بدا منذ نشأة اللغة الانسانية ولكنه كان يتم بصورة بسيطة وغير منتظمة ويدافع عن حب اللغة، ولاشك بان جميع الشعوب تحب لغاتها، لان اللغة تكاد تكون من احدى دعائم بقاء الامة، فاذا دامت الامة واذا انهارت اللغة وضعفت الامة ـ لذلك نجد بان جميع افراد المجتمع يرغبون في بقاء اللغة ويحملون على انمائها ـ حتى ان حب اللغة في قلوب المفكرين والعلماء يصل حد العبادة والتقديس، ولكن الظاهر ان هذا الحب يقتصر على الصورة الكتابية للغة التي تعتبر الصورة الباقية الخالدة المقدسة للغة ورمز بقاء الامة.

ولذلك فان التفكير في اللغة يصب في هذه الصورة وينحصر فيها. اما لقاح الكلام والتي تسعى ضمن عادة بالعامية فانها تعتبر صورا متدنيه غير ذات قواعد ويجب ان تهمل وتنبذ وتبذل الجهود لتعم اللغة الكتابية التي تعتبر هي وحدها الفصحى والجديرة بالاهتمام وهذا

التفكير يعتبر في نظر علم اللغة الحديث خطأ فاللغة الحقيقية هي لغات الكلام اما اللغة التاريخية المدونه فما هي الا صورة كلاسيكية مصطنعة ـ وقد نشأ بين العلماء منذ قرون عديدة صراع بين المفكرين حول هذا الامر مازال قائما لم يصل الى قرار.

والحقيقة ان الحضارات القديمة جميعا كانت تعتبر لغة الكتابية هبة من الله فقد كان الاشوريون يعتقدون بان الاله نيبو وهبهم الخط المسماري الذي كتبوا به وسمى الهنود خطهم الذي كتبوا به الكتب المقدسة ب (ديفانا گاري) اي صنعه الالهة. اما المصريون فقد اعتقدوا بان الاله يتاح هو الذي نقش الخط الهيروغليفي على الصخور والاحجار بل ان الكتابه نفسها كانت تسمى (ندونتر) اي كلام الالهة.

وكانت الكتابات القديمة تخترع لتكتب بها الكتب المقدسة ولايطلع على اسرارها الا الكهنة ورجال المعابد الذين يحرسون المعابد والكتب المقدسة المحفوظة فيها، بحرص تام. وعما كانت اللغة ظاهرة حياتية، تعيش وتنمو وتتغير في الكلام فان الزمن كان يحول اللغة المكتوبة الى لغة غامضة غير مفهومة يضطر معها رجال الدين والعلماء الى اعادة النظر فيها وتجديد كتابتها وتفسيرها ووضع القواعد لضبطها وهكذا نشأت طبقة من العلماء، تعمل على وضع الاسس والقواعد تحفظ الكتب المقدسة صيانة قواعد قراءتها وتلفظها الى جانب تفسير معانيها ووضع القواعد لضبط موازينها ومقاييس صياغة مفرداتها وتركيب جملها. وهكذا نشأ علماء اللغة الاوائل. وكان لكل شعب من الشعوب علماء عرفوا باتقانهم اللغة ومعرفتهم باسرارها.

ولعل اول من عرف في التاريخ من هؤلاء العلماء هو (باتيني) الهندي ٤٠٠ ق. م. الذي وضع كتابا في قواعد اللغة السانسكريتيه ثم ظهرت كتب الفلاسفة اليونان حيث سمى افلاطون ٤٠٠ ق. م المستحب في اللغة بPhilology ومعناه حب اللغة. ثم ظهرت دراسة قواعد اللغة الافستائية لمتنسرفي العهد الساساني ٢٦٠ م ثم كتب النحو العربي منذ ظهور الاسلام في منتصف القرن السادس الميلادي للخليل وسيبويه وغيرهم.

ولكن الدراسة اللغوية ظلت تقتصر على اللغة الكتابية واللغة الواحدة ولم يكن احد من العلماء يفكر في لغة اخرى غير لغته القومية. او يرى ان صله بين لغته واية لغه اخرى. حتى نهاية القرن السابع عشر الميلادي حيث اكتشف بعض العلماء من الغرب، الكتب الهندية والبهلوميه القديمه وعرفت اللغات القديمه والكتب التي وضعت في قواعدها وعرفت العلاقات اللغوية بين مجموعات من اللغات دعت الىٰ التفكير في وجود قرابه لغوية بينها وهكذا ظهر علم اللغة الحديث الذي اتخذ مناهج علمية تجريبيه دقيقة، ادت الى تقسيم العلم الىٰ فروع مختلفة ففرع في علم اللغة المقارن وأخرىٰ علم اللغة التاريخي وثالث في علم اللغة الوصفي. وعرفت الاسر اللغوية فكانت اسره اللغات الهندية الاوروبية والتي تعتبر اللغة الكردية احدى اقدم لغاتها واعرفها.

ثم الاسرة الساميه وتعتبر اللغة العربية اهمها واقدمها.. وهكذا.. بدا العلماء بالنظر الى اللغة نظرة شمولية واسعة تظم كل جوانبها الصوتية والتصريفيه والتركيبيه، كما ان تجمع بين دراسة لغة الكتابة ولغات الكلام. فاللغة الكلامية هي القاعدة التي ترتكز عليها اللغة الكتابية او الفصحى وبدون هذه القاعدة لاتقوم القمه ابدا.

وسيكون بحثنا القادم مقتصر على الفرع الشرقي من اسرة اللغات الهندية الاوربية وهو الفرع الذي تكون اللغة الكردية احد اهم فرعية فيها هما، السانسكريتيه وهي اللغة الهندية القديمه وفروعها الحديثه، والميديه وهي اللغة الكردية القديمة وفروعها الحديثة.

## پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشەو دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا

# لیکسیکولۆگیا : Lexicologie

دوکتۆر نەسرین فەخری
کۆلێجی پەروەردە زانکۆی بەغدا

کەرەسەی زمان وشەیە، بۆیە بۆ لە زمان گەیشتن پێویستە لە وشە بگەین، ئاگاداری مێژووی بین لە سەرەتای لەدایك بوونی هەر وشەیەکەوەو ئەو پلانەی بریویەتی‌و ئەو واتایانەی لێی‌بوونەتەوەو ئەو لق وپۆپانەی هاویشتویەتی‌و ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر ناوەرۆك و رووالەتی‌دا دێت، لێرەو لەوێ‌و لەتەك وشەی‌تردا و لە رستەی هەمە چەشنەدا.

---

١ ـ ووشەی «پشت: PISHT
پشت وشەو ناوێکی سادەیە.

لە رووی واتاوە:

١ ـ پشت: ئەو بەشەیە کە لە مل بەرەوخواری گیاندارە، تا سەر سمتی = کۆڵ = دژی‌پێش و بەر.

٢ ـ پشت: باوو باپیر، پشتاو پشت. بۆ نموونە:
فلان کەس پشتاوپشت دەچێتەوە سەر فلان تیرە، یا بنەماڵە. یان: لە باوو باپیرەوە...

٣ ـ پشت: یارمەتیدەر، پشتیوان. بۆ نموونە:
تۆ (پشت) بە کێ، یان پشتت بە کێ قایمە، یان: کێ پشتیوانتە لەم کارەدا.

٤ ـ پشت: دوا، دیوی ئەو دیو.
«دیوی ئەو دیوی گوێژە ـ شارباژێرە»[١]
وان لە (دوا)ی ماڵی ئێمەوە، وان لەو دیو ماڵی ئێمەوە، ماڵیان کەوتۆتە پشت ماڵی ئێمە.

٥ ـ پشت: «دیوی قوقزی میخ»

٦ ـ پشت: بە واتای (خت)و (ختە)و (ختتە) وتەیەکە بۆ دەرکردنی پشیلە (کتك) بەکاردێت، هەر وەك: (پش)و (پش پش) بۆ بانگ کردنیەتی. هتد..

---

«پشت» لە وشەی ناسادەدا:
أ ـ دارێژراو لە ناوو چاوك
ب ـ لێکدراو لە ناوو چاوك

١ ـ پشتدار پشت + پاشگری (دار) کە بە واتای (خاوەن) دێت و ناوو ئاوەڵناو دروست دەکات و باوو ئاشکرایە لە زمانی کوردی‌دا، بۆ نموونە: دڵدار، باڵدار، بریندار، نازدار هتد...

واتا: یەك: شتی دارێژراوو قایم و پتەو.

دوو: خاوەن پشت و پشتیوان.

٣ - پشتێن پشت + پاشگری (ێن) کە ناوی تازە دروست دەکات بە تایبەتی ناوی (یاری) لە کوردیدا، بۆ نموونە: هەڵمات - هەڵماتێن، هەلووکێن، بازبازێن. هتد...

٤ - پشتێنە ١ - «دارێکە بە ناو (بەرزەگەوە)دا ڕەت دەکرێ بۆ ئەوەی نەجو وڵێ».

٢ - «شتێکە بەر بەستی فیچقەی ئاوی نێی ئاسنی پێ دەکرێ».

٣ - «پشتێنێکە بە سترابێتە ناو قەدی هێندێ شت بۆ قایمی».

لە: پشت + پاشگری (ێن)[٢] + ە =پشتێنە، پێك هاتووە.

٤ - پشتی لە: پشت + (ی) پێك هاتووە کە بۆ ناوی تازەو (نیسبەت) بەکاردێت، وەك: کونجی (کونج + ی)، باڵەك - باڵەکی، بەرزی، نزمی، ساردی، خێلی، خواری هتد...

لە رووی واتاوە:

یەك - پشتی: جۆرە سەرینێکە درێژکۆڵەو تەنکە، پشتی پێوە دەدرێت.

دوو - پشتی «پاشەوانەی هەنگە»[٣]

سێ - پشتی: شتێکە کە بە کۆڵ هەڵ بگیرێ (ز)[٤]

٥ - پشتە پشت + پاشگری (ە - e) کە ناوی تازە دروست دەکات، هەروەك: دەست - دەستە، ڕاست + ڕاستە، درك - درکە هتد...

لە رووی واتاوە:

یەك - «پشتی میچی قاپین»[٥]

دوو - پشتە، پشت = ختە - ختە، وتەیەکە بۆ دەرکردنی پشیلە بەکاردێت.

٦ - پشتەك پشت + پاشگری (e - k) کە پاشگرێکی (ناوی)یە، ناوی تازە دروست دەکات وەك: گەڕەك، کۆمەك، هێلەك هتد...

واتا: -

یەك - «خوریو موویەکە کە لە کاتی برینەوەدا بەسەر - پشتی مەڕو بزنەوە دەهێڵرێتەوە».[٦]

دوو - «پشتیوانێکە بدرێتە پاڵ شتێك».[٧]

٧ - پشتیوان: پشت + پاشگری (وان) بە واتای خاوەن وەك (پاشگری - دار)، یان سەر بەو شتە، ناوو ئاوەڵناوی تازە دروست دەکات، بۆ نموونە: باغەوان، مەلەوان، زمانەوان، پاسەوان، گاوان، هتد..

واتا: یەك: پاڵ پشت و یارمەتیدەر

دوو: «دارێکە لە پشت دەرگاوە دادەچەقێنرێ بۆ ئەوەی بخرێتە بەر (پشکۆڵ) بۆ قایمی».[٨]

سێ: «دارێکە لە باری پانی بە پشتی تای دەرگاو دەرابەدا دادەکوترێ».[٩]

٨ - پشتەوانە: پشت + پاشگری (وان)[١٠] + ە، وەك: لووتەوانە... «ناوە بۆ دێیەك لە بەری سیروان».[١١]

٩ - پشتگین: (پشت + گین) وەك: غەمگین - غەم + گین...

پشتگین = «د. دواهەمین، دواکەس».[١٢]

١٠ - پشتیر: «هۆدەی ئاژەڵ، گەنجینەی پشت کەڵەگێ».[١٣]

---

پشت لە وشە «ناوو چاوگ»ی لێکدراودا

١ - پشتگیر: پشت + گیر (گیرناوو ڕەگی چاوگی - گیران - یشە).

٢ - پشتگیریکردن: چاوگ و فرمانی لێکدراوە، بە واتای یارمەتیدان لەگەڵ دا وەستان، بۆ نموونە: هەمیشە پشتگیریی مرۆڤی خاوەن ماف و ڕاست گۆ دەکەم.

بۆ نموونە: دەنگی گیراوە، ئاوگیران، گیرم خواردووە بە دەستییەوە. هتد، بە واتای خاوڵیو پەشتەماڵ.

٣ - پشت دانەوە[١٤] چاوگی لێکدراوە = پشت + چاوگیدان + ە + پاشگری (وە).

واتا = هەڵ دانەوەی ئاگری ناو تەنوور پاش دامرنی، تا گەرم بێنەوە.

ب - پاڵ دانەوە، دەش گوترێت: پشت لێدانەوە

٤ ـ پشتمێر پشتیوان و یارمەتیدەر هاومەبەستی (پشتگیر)ە لێرەدا.

٥ ـ پشترێژ یان ـ پشتەرێژ. (رێژ ـ رەگی فرمانی ـ رشتن ـ ە).

پشترێژ ـ ناوێکی لێکدراوە بە واتای برینداربوونی پشتی وڵاخ بە هۆی باری قورس و زۆرەوە.

٦ ـ پشتەوەشکێن: پشت + ە + وە + شکین (رەگی فرمانی تێپەری ـ شکاندن ـ ە)

بروانە: شەکرشکێن، چاو شکێن.

بە دیوارێك دەگوترێت، کە بەپشت دا شکابێتەوە، خوار ـ بوو بێتەوە بۆ پشتەوە.

٧ ـ پشتەسەر: پشت + ە ـ سەر: ناوێکی لێکدراوە.

ـ جۆرە خشڵێکی پلپلەدارە لە زیو یان زێر دەکرێت و ئافرەت دەیدا لە پشتی سەری یان لە پشتی سەروپێچی، هەروەك لە ناوەکەیەوە دیارە، هەروەك (لاسەرەش) هەیە کە ئەمیان دەدرێت لە لایەکی سەر.

٨ ـ پشتەمەلە: مەلەکردن لەسەر پشت، ئەمەش جۆرە مەلەیەکە.

٩ ـ پشتەپا: پشتەپێ: شەق، (پاشقول گرتن)یش هەیە کە بە پێیە.

١٠ ـ پەشتەماڵ: جۆرە (خاولی) یەکە پان و گەورەیەو تایبەتییە ـ پەشتەماڵی ـ حەمام، واتا: پشتگیر ـ لە پشت دەئاڵێنرێ و بەپشتەوە دەبەسترێت، (دەسماڵ ـ دەست ماڵ ـ)یش هەیە کە ئەم دەدرێت (بەکۆڵ و شان و مل)دا.

١١ ـ پشت ماڵە: بەو دراوسێیە دەگوترێت کە ماڵی کەوتبێتە پشت ماڵی یەکێکی ترەوە، نەك بەرامبەر بە ماڵەکەی یان تەنیشت و ئەملاوئەو لای. واتا: ئەو دیوی ماڵێکی تر.. کە پشتیان دەکەوێتە یەکتری...

١٢ ـ پشت هەیوان: پشتەیوان ـ ئەو ژوورەیە کە دەکەوێتە پشتی (هەیوان)ەوە.

١٣ ـ پاڵ پشت: پشتیوان، یارمەتیدەر، پشتمێر، پشتگر.

١٤ ـ پشتیوانی کردن: یارمەتی دان و خاوەنداری کردن و پشت گرتن.

بروانە ـ پشتیوان ـ بە تەنیا.

١٥ ـ پشت گرتن: پشتیوانی کردن.

١٦ ـ پشت گوێ کردن: پشت + گوێ + کردن (چاوگی تێپەر).

واتا: هەڵ پاچینی وردە قژ و تووکی بن پرچی ئافرەت.

١٧ ـ پشتکۆڵ = پشکۆڵ: دارێکی درێژە لە ناوەوە دەدرێتە پشت دەرگا بۆ قایم کردن.

**(پشت) لە جووتە وشەدا:**

**پشتاوپشت ١ ـ پشتاوپشت دەگەڕێتەوە سەر فلان بنەماڵە، یان خێزان.**

**٢ ـ پشتاوپشت بەربۆوە، بە پشتا کەوتە خوارەوە.**

**نموونەش لەم جۆرە زۆرە. وەك دوولاودوڵ، کوناوکون..**

**(پشت) لە ئیدیۆم و زاراوەدا**

---

**١ ـ پشت گوێ خستن = گوێ نەدان بە قسە، یان کاروکردەوەیەك یان کەسێك، فەرامۆش کردنی، بەتەنگەوە نەهاتن، هەروەك گوێی لە هیچ نەبووبێت وایە.**

**٢ ـ پشت ساردبوونەوە = وازهێنان لە کارێك، یان هەر نیازێك بێت، لەبەر هەر هۆیەك بێت، وەك لەبەرچاوکەوتن، یان زۆر پێوە ماندووبوون هتد...**

**٣ ـ پشت ساردکردنەوە = یەکێك ببێتە هۆی ئەوەی ئەویتر واز لەو کارە بێنێت و بتوانێت لەبەر چاوی بخات.**

**٤ ـ پشتی شکا = بۆ کەسێکە کە کۆستی بکەوێت، خۆشەویستێك یان گەورەو پشتیوانێکی لێ بڕوات، کە پشتیوان نەما، پشت دەشکێت.**

٥ - پشتی‌شکـانـد: ئەمـەش بۆ کەسێکـە کە ببێتـە هۆی سەرلێ‌شێوانـدن و زیان گەیاندنێکی گەورە بە کەسێك، کە هەروەك پشت شکاو لە پەلوپۆ دەکەوێت و بە دەست ئازار و - ئەشکەنجەوە دەتلێتەوە وای بەسەر دێنێت، یان داوێکی گەورەی پشت شکێنی بۆ دەنێتەوە وەك دوژمن بۆ دوژمن.

٦ - پشتی بۆکەس نادا بەعەرزا = بۆ مرۆڤێکی بەجەرگ و سەربەرزو پاکە، تا ناعیلاجیش سەری پێ‌شۆڕ ناکات و پشتی نادات بە عەرزداو کۆڵ نادات و نابەزێت.

٧ - پشتـی‌دا بەعـەرزا: ئەمـە بە تەواوی بە پێچـەوانـەی نمـوونـەی ژ (٦)ی سەرەوەیـە. لێرەدا بۆ کەسێکـە کە دەبەزێت و دەکشێتە دواوەو وازدێنێت، کە بەرامبەرەکەی لە خۆی زاڵ ترو بەهێـزتـر بوو، تا توانـیی پشتی‌بـدا بەعەرزداو کۆڵی پێ‌بدات.

٨ - پشتی لێ‌داوە بەعەرزا رقی‌گرتووە، تووڕە ئەمە وەك (پێی لێداوە بە (عەرزا) وایە.

٩ - دەرگاکەی خستە سەرپشت: بەکراوەیی بەجێی‌هێشت.

١٠ - وەك پەشتـەمـاڵی حەمـام وایـە هەر ساتـە وا بە بەرگێکـەوە: بۆ کەسێکی بێ‌بـارو هەڵ پەرستـە، کەجێی متمانە نی‌یە.

١١ - حەوت پشتی لە قەبر دێنێتە دەرەوە -

واتا: وا لێی‌ڕو تووڕەیە:

١٢ - حەوت بەردی داوە بە پشتی.. واتا: فلان هیچ نی‌یە، لەچاو ئەم دا.

١٣ - پشتی‌لێ‌هەڵ کردووین - زویرو عاجزە لێمان.

١٤ - پشت لێ‌کردووین بەولادا - بڕوانە ژمارە (١٥) کە (هاوەمەبەست) تێتی.

بۆ هەمان مەبەست دەش گوترێت: لووتی لێ هەڵ کردووین.

١٥ - پشت ئەستوورە = پشتی قایمە، پشت ئەستووری.

١٦ - پشت قایم بڕوانە ژمارە (١٧) هاومەبەستەکەی.

هەردووکیـان بۆ کەسێـك بەکـاردێت کە کەسێکی بەتواناو بەدەسەڵات لەدوایەوە بێت.

١٧ - پشت بەخوا - کەسێك دەیلێت کە بە تەمای کارێك، یان کەسێـك بێت کە ئومێـدێکی پێی هەبێت و بۆ ئەم هیـوایـەش (پشت بەخودا) دەبەستێت و بە ڕەنج و تەقەلای خۆی...

١٨ - «بە پشتە ملە». واتا بە زۆرە ملە - یان - ملێ). ئەمەش بۆ کەسێکە کە بە زۆر کار بە یەکێك بکات، یان بە زۆرە ملێ خۆی ئەو کارە بکـات، لەبـەر بە دەسـەڵاتـی ئەو کەسـەو بێ‌دەسەڵاتی و ناچاربوونی خۆی.

١٩ - پشت پێ بەستن: پشت پێ قایم کردن - پشتی پێ قایم دەکـرێت، واتـا پشتی پێ‌دەبـەسـترێت، جا یان لەبەر ئەوەی بە توانایە یان جێگەی متمانەیە، یان هەردووکیان.

٢٠ - پشتی پێ نابەسترێت، پشت پێ‌نەبەستن = پشت پێ‌قایم نەکـردن، دژی نمـوونـەی ژمـارە (٢١)، یان لەبـەر ئەوەی بێ‌توانایەو ئەو کارە لە وزەی ئەودا نی‌یە، یان جێگەی بڕوانی‌یەو تەنیا قسەی لە باردایەو بەس..

٢١ - پشت (کۆڵی) پشت دەرگامە = واتا: پشتیوانمە

٢٢ - وەك نیسك وایە بەرو پشتی بۆ نی‌یە، واتا: دوو ڕووە، جێگەی متمانە نی‌یە، بۆ هەمان مەبەست کورد دەڵێت:

**ڕوو بەڕوو دەم چەور، پاشەملە دەم تەور**

**(پشت) لە (پەندی پێشینان)دا**

**١ - برا لە پشت برا بێ مەگەر قەزا لە لای خودا بێ**

**٢ - پشتم سەفین بێت تف لە ئاسنیش دەکەم.**

**پشت لە (یاری)دا**

١ - پشت لێدان:

———— ناوی جۆرە (یاری)یەکە کە چەند کەسێك، یەك لە دوای یەك بە کووری دادەنیشن و بەرودوا بە سەریەك دا بازدەدەن، لێ‌دانی پشتیان لە پشتی ئەوی‌تر.

٢ ـ سابوونی ڕەقی پشتم تەقی

سابوونی بەزی پشتم تەزی

ئەمیش (یـاری)یـەکـە کە دوو دوو پشت دەنین بە پشتی یەکـەوەو دەسـت لە دەسـتی یەك دەئـاڵێنن لە دواوەو بە نۆبەت و بە پشت یەکتری بەرز دەکەنەوە. . .

---

٢ ـ ووشەی ـ کۆڵ ـ COL

کۆڵ: ووشەو ناوێکی سادەیە

---

لە ڕووی واتاوە

---

کۆڵ ١ ـ = پشت: بە کۆڵ هەڵم گرت = بە پشت لە پەلوپۆ کەوتووەو بە کۆڵ هەڵی دەگرن و دای‌دەگرن.

٢ ـ بار، قورسایی، ئەو شتـە، یان هەر شتێـك بخـرێتە سەر پشت بۆ هەڵ گرتن و گواستنـەوەی لە شوێنێکـەوە بۆ شوێنێکی‌تر، دەگوترێت ئەو کۆڵە بدە بە کۆڵی‌دا.

٣ ـ = زۆر: کۆڵێـك ئیشم هەیـە، کۆڵێـك (کـۆشێـك منداڵی بەسەردا کەوتووە، یان ـ لە پاشی بەجێ ماوە.

٤ ـ ناوی ئەو دارە بۆشەیە کە دۆشاوی لێ‌دروست ـ دەکرێت.

---

کۆڵ ـ لە وشەی ناسادەدا:

أ ـ لە ووشەی دارێژ ڕاودا ـ

١ ـ کۆڵەوانە کۆڵ + ە + پاشگری (وان) + ە.

سەرنجی ئەم نمـوونـانـەش بدەن کە بە هەمـان شێـوە دروست بوون = لووتـەوانـە، پاوانـە، بەپێچـەوانـە، حەوتەوانە هتد. . .

واتا ـ جۆرە بەرگێکی کوردی‌یە، وەك (دەسماڵ) دەدرێت بە (کـۆڵ)دا، بۆ جوانی‌و بۆ خۆپـاراستن لە سەرمـاوبـا.

پێشی دەگـوتـرێت ـ چارۆکـە ـ ئەگەر چوارچێوە یان چوار گۆشـە بوو، ژنـانـەیـە، لە سەرشـانەوە دێتە خواری بەرەو پشت و لەپێشـەوەو لەسـەر سنگ هەردوو لکـەکـەی گرێ دەدرێت تا نەکەوێت.

٢ ـ کۆڵەکە کۆڵ + ە ـ کە

(کە) پاشگرێکی (ناوی)یە، ناوی تازە دروست دەکات، هەروەها، بۆ بچووك کردنەوەش بەکاردێت.

بۆ نموونە: پوولەکە، چارۆکە، جاڵجاڵۆکە، خولخولۆکە، درکە. هتد. . .

واتـاکـەی دیـارو ئاشکـرایە. دەگوترێت. . ئەم ژوورە بە کۆڵـەکـە بەنـدە. . کۆڵـەکـەی ماڵـمە: بۆ سەردارو خاوەن ماڵ. . واتا (ئەستوون ـ ئاسمان ئەستوونی ناوێ).

٣ ـ کۆڵەوار کۆڵ + ە ـ وار

(وار) پاشگرێکی (ناوی)یە، ناوی تازە دروست دەکات.

خوێندەوار، شوێنەوار، پاشەوار، هتد. .

واتا: ئەرکی گرانە، باری سەرشانی قورسە، گیرۆدەیە، (کۆڵەوارە بە دەستیانەوە)، لە ژیانی‌دا نارەحەت و بێزارە.

٤ ـ کۆڵ دانەوە = چاوگێکی لێکدراوە ـ بە واتای ـ حەسانەوە، پشت دانەوە، دانیشتنێکی کەم و کورت بۆ پشوودان بە خۆ.

٥ ـ پشت کۆڵ = ناوی دارێکی درێژە، دەدرێتە پاڵ دەرگا لە دیوی ناوەوە بۆ داخستن و قایم کردنی.

٦ ـ کۆڵ نەدەر[١٧] نەبەز، ئازا، سەربەرز.

بۆ کەسێك بەکاردێت کە بۆ هیچ کارو کارەساتێك پشت نە ـ دات بە عەرزدا.

دژی (کۆڵدەر) ە = دەگوترێت زوو کۆڵی دا = بەزی. نەی‌بردە سەر، کشایە دواوە. هتد. . .

٧ ـ لەکۆڵ کەوتووە ـ کەڵکی پێوە نەماوە، بۆ شت و بۆ مرۆڤی بێ کـەڵکیش بەکـاردێت، یان بۆ ئەو کەسـەی توانـای نەمـابێت جا لەبـەر ئەشکـەنجەو ئەرکی زەمانە بێت، یان گیرۆدەی داوی نەخۆشی‌و بە ساڵ دا چوون بێت.

کۆڵ ـ لە ئیدیۆم و زاراوەدا ـ

١ ـ کۆڵ دانـەوە[١٨]: پشت دانـەوە، کۆڵی دایـەوە = پشتی دایەوە = پاڵی ـ دایەوە. واتا: بۆی دانیشت بەبێ باکی.

٢ ـ كۆڵی‌دا = كۆڵ دان ـ دژی ـ كۆڵ نەدان ـ ە ـ كۆڵی‌دا =ء بەزی، بۆ نموونە دەڵێن: زۆری هەوڵ داو سوودی نەبوو تا كۆڵی‌دا... یەعنی ـ كشایە دواوەو ئومێدی بڕی.

٣ ـ لەكۆڵم نابێتەوە = وازم لێ ناهێنێت، بەرۆكم بەر نادات، پێمەوە ـ نووساوە.. دەگوترێت: بە هیچ كلۆجێك لە كۆڵم ـ نابێتەوە، دەڵێی مێردە زمەیە سواری سەرم بووەو لە كۆڵم نابێتەوە.

٤ ـ لەكۆڵ كەوتووە = لە پەلوپۆ كەوتووە.

٥ ـ بەكۆڵمەوە بووە بەسەرم دا، بووە بە بار بە سەرمەوە، تووشم بووە بە تووشی‌یەوە، ناچاریو ناعیلاجی دەردەخات سەرەڕای (ئەرك)ی خۆی.

٦ ـ كەركۆڵ = بارسووك = (سەڵت و قوڵت)ە، یان (سەڵت وقووتە) = تەنیاو بارو ئەرك سووكە.

٧ ـ پشت كۆڵی (٧) پشت دەرگامە = پشتیوان و یارمەتیدەرو سەرداری ماڵمە.

(كۆڵ) لە پەندی پێشینان دا:

«هەقی بزنی كۆڵ بەسەر شاخدارەوە نامێنێ».

(كۆڵ) لە (یاری)دا

كۆڵ كۆڵێن: ناوی (یاری) یەكە، كە هەر لە ناوەكەیەوە دیارە كە دوو دوو یەكتری بە نۆرەو بە پشت هەڵ دەگرن لە شوێنێكی نیشانەكراوەوە بۆ شوێنێكی تری دیار.

ب ـ هەروەها وەك گرەو بەكاردێت لە (یاری) دیكەدا، ئەگەر هاتوو ئەو یاری‌یە گرەوی تێ‌دا هەبوو، جا ئەو كەسەی یاری دەدۆڕێنێت ئەو كەسەی یاری‌یەكەی بردوتەوە بە كۆڵ هەڵ دەگرێت لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیاری‌كراو جارێك یان جارێك زیاتر بە پێی ئەو گرەوە.

هەروەها بڕوانە ئەم نموونانە.

١ ـ درێژ كۆڵە: ئاوەڵناوێكە بۆ كەسێكی مەیلەو درێژ و باریكەلە بێت.

٢ ـ مستەكۆڵە مست + كۆڵ، هەر دوو وشەكە دیارە. مستەكۆڵە بەو جۆرە لێ‌دانە دەگوترێت كە مستی دەستی تێ‌دا كۆدەكرێتەوە، واتا دەست دادەخرێت و دەنووقێنرێت و ئەوجا بۆ لێ‌دان دەدرێت بە پشت و كۆڵ دا.

٣ ـ «كاكۆڵ زێڕین و دان مرواری».

ناوی حەكایەتێكی كوردی‌یە، كە تایبەتی‌یە، بە منداڵان.

---

ئەنجام

ـــــــــــ: لە ئەنجام دا نامانەوێت دیسانەوە هەندێك نموونە دووبارە بكەینەوە بۆ دەرخستنی ئەو تایبەتیانەی لەم ووشانەدا هەن و ئەوەی زیاتر روون دەبێتەوە لە پاڵ وشەی‌ترو رستەو نموونەی جیاوازدا، خوێنەر خۆی بە وردبوونەوەو سەرنج دان دەتوانێت دەست نیشانیان بكات و بەڵكو خاسیەت و نموونەی دی بێتەوە بیر كە دەی‌زانێت و لێرەدا باسی نەهاتووە، هەروەها بەراوردی نێوانی دوو وشەی (پشت)و (كۆڵ) بكات وەك دوو وشەی (هاو مەبەست) لە لایەكەوە، لە لایەكی ترەوە وەك دوو وشەی جیاوازو سەربەخۆ لە رووالەت و ناوەرۆك دا لەگەڵ گەیشتن بە هۆكانی، بۆ نموونە: «كۆڵ» ـ كە ناوە ئەو (بار)و شتەی كە كۆدەكرێتەوە لە شتێك دا، یان دەبەسترێت، پاشان دەخرێتە سەر پشت بۆ هەڵ گرتنی لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی‌كە ناوی ئەو (بار)ە كە (كۆڵ)ە، بووە بە ناویش بۆ (پشت) بە ـ هۆی ئەو پێوەندی‌یەی كە لە نێوانیان دا هەیە وەك دەرمان خست و هەر بەمەش بوون بە هاومەبەستی یەكتری، وەك: ئەو (بارە) بدە بە پشتی‌دا، ئەو (كۆڵە) بخەسەری پشتی، ئەو (كۆڵە) بدە بە (كۆڵ)ی‌دا، (كۆڵ)ەكەی قورسە، بارەكەی گرانە هتد...

## پەراوێزەكان

(١) بڕوانە (فەرهەنگی خاڵ) جـ ١، ١٩٦٠، هەروەها لە ژ (٣)وە تا (١٣)ەش.

(٢) (ێـن) پاشـگـرێکی (نـاوی)یـەو بە گشتی ناوی یاری لە کوردیدا دروست دەکـات، بۆ نمـوونـە: هەلـوکێن، هەڵماتێن، جغزێن، بازبازێن، پەت پەتێن هتد... لە پاڵ وشەیتردا وەك بۆمان دەرکەوت لێرەدا، بەرامبەریشی پاشـگـری (یـن)یش هەیـە کە تەنـیـا لە رووالـەت دا جیاوازییان لە دەنگی (ی)دایە کە لە یەکەم دا (سووك)و لە دووەم دا (تیـژ)ە.. ئەمیـان، ناوو ـ ئاوەڵنـاو دروست دەکات، هەریەکە بە رێبازی خۆی، بۆ نموونە:
سەر ـ سەرین، شەرم ـ شەرمین، نەرم ـ نەرمین هتد؛..

(١٤) و (١٥ ئەم دوو نمـوونـەیـە کە (پشت دانـەوە)و (پشت گرتن)ە بە پێی شوێنی بەکارهێنانیان، جار هەیە ڕاستەوخۆ ـ مەبـەست خۆیـەتیو جاریش هەیـە (کـنـایـە) ئـیـدیـۆم و زاراوەن و لەبـەر پێـوەنـدییێـك لە نێـوانی ئەم وشـەیـەو واتـاکـەیو ئەو مەبـەستـەدا هەیـە بۆی بەکـاردەهێـنـرێت، سەرنجیان بدەوە، لەگەڵ نموونەی هەمە چەشنەدا کە لەم باسەدا هەیە...

(١٦) ـ بڕوانەو سەرنجی دووبارە بوونەوەی وشەی (پشت) بدە لە هەمـان نمـوونـەدا، لەگەڵ هاتنی هاوەبەستەکەشیدا (کـوڵ)، هەروەك ئەگـەڵ (دژمـەبەست)ەکەشیدا هاتووە لەم نمرونەیەدا بەپێچەوانەی نموونەی باسکراو لە ژ (٤)ی سەرەوەدا.

(١٧) ـ ئەمـە دیـارە کە پاشمـاوەی ڕەوشتێکی کۆنـە کە (زۆران بازی) مەرجێك بوو جاران، جا کام لا پشتی ئەویتری بدایە بە عەرزدا ئەو سەردەکەوت و مەرجەکەی دەبردەوە، پاشـان ئەمـە بوو بە یاریـی (زۆران بازی) لە (زۆرخانە)کان داو ئەمرۆ بەرانبەری وەرزشی (زۆران بازی ـ المصارعە) هەیەو ئەم ئیدیۆمی (کۆڵ نەدەر) لەوەوە هاتووە...

(١٨) بۆ ئەمە بگەڕێرەوە بۆ باسی پشت.

## سەرچاوەکان


١ ـ فەرهەنگی خاڵ ـ شێخ محمدی خاڵ، سلێمانی، ١٩٦٠. ج١.

٢ ـ فەرهەنگی خاڵ ـ شێخ محمدی خاڵ، سلێمانی، ١٩٦٤. ج٢.

٣ ـ پەندی پێشینان، شێخ محمدی خاڵ، بەغدا، ١٩٥٧.

٤ ـ پەندی کوردی، عومەر شێخەڵلا دەشتەکی، هەولێر، ١٩٧٢.

٥ ـ پەنـدی پێشینـان ـ لە شیعـری کوردیدا، کەریم شارەزا، بەغدا، چاپی کۆڕی زانیاریی کورد، ١٩٧٦.

٦ ـ ئەوەی خۆم دەیزانـم و لە بیـرمـە، یان بیستـوومـەو کۆم کردۆتەوەو نووسیومەتەوە.

٧ ـ سەرچاوەیتر لە کوردیو عەرەبی کە ئەمانە، یان بەشێك لە مانەیان هێناوەتەوە یادم.. بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە وشەو کەلەپوورەوە هەبێت (نووسەر).

ملخص البحث

# تطور تاريخ معنى الكلمة ودوره في اغناء اللغة

الدكتورة: نسرين فخري
كلية التربية ـ جامعة بغداد

يتناول هذا البحث اللغة بان مادتها هي الكلمة او اللفظة، لذلك لابد من استيعاب اللفظ لنستوعب اللغة، ونقف على تاريخ الكلمة بدأ من ميلادها وانتهاء بالمراحل التي تمر بها والتغيرات التي طرأت عليها من حيث مظهرها وجوهرها في سياق وجودها ضمن مفردات اخرى وفي جمل متنوعة. بعد هذه المقدمة تقف الباحثة على كلمتين اثنتين (پشت ـ ظهر) و(كۆل ـ ظهر) وتتناول تلك الكلمتين من حيث معناهما، في الكلمة غير البسيطة (والمصطلح والمشتق) تأتي بامثلة وتوضح التغيرات التي تحدث في كل كلمة من حيث الاضافات واللواحق التي ترتبط بها وتعطي معاني جديدة في سياق استخداماتها المتعددة ضمن الجمل والتراكيب. حيث ان تلك الكلمتين كانتا في الاساس كلمتين مترادفتين في المعنى لكنهما خرجتا عن اطارهما الحقيقي واخذتا ابعاداً اخرى من حيث الجوهر والمظهر فاغنتنا اللغة الكردية بمعاني ومفردات جديدة، من هنا فان الوقوف على تاريخ معاني الكلمات والامعان في تطورها لمعرفة دورها في اغناء اللغة الكردية مسألة ضرورية لابد من الاهتمام بها.

ويبدو ان الباحثة قد اعتمدت عدة مصادر اضافة الى معلوماتها الشخصية. فعدت (قسەی پێشینان ـ الامثال والحكم) الكردية خير منهل لارتشاف المفردات التي تغني لغتنا الكردية وتطورها وتحفزنا للمزيد من سبر اغوار تراثنا الفولكلوري السابغ علينا نعمة العطاء المستمر.

# ڕستەی شوێن کەوتووی کات لە ڕستەی تێکەڵ دا

د. کوردستان موکریانی

ڕستەی شوێن کەوتووی سەر بە ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی تێکەڵ دا، تا ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا بایەخی پێنەدراوەو لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی زانستانە سەبارەت بە جۆرەکانی نەکراوە، تەنیا زانستانە سەبارەت بە جۆرەکانی نەکراوە، تەنیا ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری نەبێت، کە بۆتە بابەتی نامەی دکتۆریو لێی کۆڵدراوەتەوە.

ڕستەی شوێن کەوتووی کات لەلایەن هێندێك لە ڕێزمان ناسانی کوردەوە بەشێوەیەکی زۆر کورت لە چەند دێڕیك دا باس کراوە، بۆ وێنە مامۆستا توفیق وهبی لە (قواعد اللغة الكردية)[1] دا لە بەشی (الجملة المختلطة) باسی (الفقرة الظرفية) دەکات و ڕستەیەکی بەوێنە هێناوەتەوە: (یاریەکەمان کە مانگ هەڵات دەسی پێکرد) جا ڕستەکە بەم جۆرە شیدەکاتەوە: [إن الفقرة «یاریەکەمان دەسی پێکرد» هيالفقرة الرئيسية في هذه الجملة المختلطة، واما الفقرة «كە مانگ هەڵ هات»، فهي الفقرة التابعة، وهي فقرة ظرفية لأنها تعمل عمل الظرف للفعل «دەسی پێکرد» الذي هو في الفقرة الرئيسية].

مامۆستا نوری علي أمين لە (قەواعیدی زمانی کوردی)[12] لەژێر نێوی (پارچەی زەرفی)دا بەم جۆرە ئەم ڕستە شوێن کەوتووی کاتە بە ناسین دەدات:

پارچەی زەرفی ئەو ڕستەیەیە، کە ئەرکی زەرفی پێئەبینرێ لە شا پارچەدا، وەك کە تەرزەکە باری، لافاوێکی باش هەستا.

لەم ڕستەیەدا (لافاوێکی باش) شا پارچەیە، بەڵام (تەرزەکە باری) پارچەیەکی تابیعە، لەبەر ئەوەی وەسفی فرمانی (هەستا) ئەکا پێی ئەڵرێ: پارچەی زەرفی. هەروەها:

أ ـ پرشنگ کە باوکی هاتەوە، ئەچیٚ بۆ شەقلاوا.

ب ـ کە تۆم دی، تازە گەیشتبوومە جیٚ.

حـ ـ کە پیٚلاوەکەم لە پیٚ‌کرد، بزماریٚ چوو بە قاچما.

مامۆستا نوری علي وەستایانە رستەکانی هەڵبژاردووە، بەڵام روونی نەکردۆتەوە چ جۆرە پارچەیەکی زەرفی‌یە، هەروا ئەو ئامرازانەی هاوبەشی دارشتنی دەکەن ناوی نەبردوون.

دکتۆر زەری عارف یوسوپۆڤا لەدوا بەرهەمی‌دا، کە دەربارەی دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی‌یە[٣] لەو بەشەی، کە بۆ سینتاکسی تەرخان کردووە، باسی رستەی شوێن کەوتووی کات دەکات. لە سەرەتادا ئەو ئامرازانەی دەست نیشان کردووە، کە بۆ ئەم بارە بەکاردین، وەکو ئامرازی [کە، هەر (کە)، کاتێك (کە)، هەتا، لەدوائەوەی کە، لەپاش ئەوەی کە، لەپێش ئەوەی‌کە، هەرچەند]

جا زەری خان یەکسەر هاتۆتە سەرپێشان دانی شوێنی رستەی شوێن کەوتووی کات لە بەرامبەر بە رستەی سەرەکی‌داو دابەشی کردۆتە سەر سێ جۆر:

أ ـ رستەی شوێن کەوتووی کاتی پێش رستەی سەرەکی.

ب ـ رستەی شوێن کەوتووی کاتی ناو رستەی سەرەکی.

پ ـ رستەی شوێن کەوتووی کاتی پاش وەیا دوای رستەی سەرەکی.

زەری خان بۆ هەر یەکێك لەو خاڵانەی سەرەوە چەند رستەیەکی هێناوەتەوە.

ئەمەو هیچ بابەتێکی دی رێزمانی بەشێکی سەربەخۆی بۆ تۆژینەوە لەم بارە سینتاکسیە گرنگە تەرخان نەکردووە، بەڵکو، هەر نێوی جۆرەکەی بردووەو یەك دوو رستەی بە وێنە بۆ هێناوەتەوە.

لەبەر گرنگی ئەم دۆخە سینتاکسی‌یەو لەبەر نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ سەبارەت بەم باسە، وام بەباش زانی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی بۆ ئامادەبکەم و چەند لایەنێکی باس نەکراوی رستەی تێکەڵی کوردی بخەمە بەر تیشکی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە. رستەی شوێن کەوتووی کات

رستەی شوێن کەوتووی کات کاتی روودانی رووداوی رستەی سەرەکی پێشان دەدات، کە زۆر جار لەنێو رستە سەرەکێکەدا هێمای بۆ نەکراوە.

ئەم جۆرە رستە شوێن کەوتووە بۆی هەیە دەوری بەشی ئەندامانی رستەی سەرەکی بگرێت، بەڵام لەو رستەیەدا، کە ئاوەڵگوزارەی کاری تێدا بەکار نەهاتبێت. بۆ وێنە:ـ

[کە من هاتمەماڵەوە، مینەواس نوستبوو

(مینەواس نوستبوو) رستەی سەرەکی‌یەو لە نیهاد (مینەواس)و گوزارە (نوستبوو) پێك هاتووەو هیچ ئاوەڵگوزارەیەکی کاتی تێدا بەدیٚ‌ناکرێت، بۆ ئەوەی کاتەکەی دەست نیشان بکات، بۆیە رستەی شوێن کەوتووی کات (کە من هاتمە ماڵەوە) کاتی نوستنی مینەواس روون دەکاتەوەو دەتوانین بڵێین ئەرکی ئاوەڵگوزارەی کاتی رستەی سەرەکی گیراوە.

لە زمانی کوردی‌دا ئامرازو هێندیك ناوی کات هاوبەشی دارشتنی رستەی شوێن کەوتووی

کات دەکەن. لەوانە ئامرازی گەیەنەری (کە)، بە شێوەیەکی سەرەکی لە پێك هاتنی ئەم چەشنە رستە شوێن کەوتووەدا بەشداری دەکات، هەروا ئامرازی گەیەنەری (هەرکە، هەرچەند، هەتا) بەڵام بەکارهاتنیان لەچاو ئامرازی (کە)دا لەم دۆخەدا کەمترە.

وەنەبێت ئامرازی گەیەنەری (کە) هەر بە تەنیا خۆی هەمیشە ئەم دەورە بگێرێت، بەڵکو زۆر ناوی کات هەن وەك (شەو، بەیانی، ئێوارە..) لەپاڵ (کە)دا بەکاردێن، بۆ وێنە:ـ

**شەو، کە تۆ هاتی، کار لەکـار ترازابـوو. بەیـانی کە خۆر هەڵات، هەمـوو بەرەو کارەکە بەرێ‌کەوتن.**

**ئێوارە کە باران دایدا، ژوورەکە دڵۆپەی کرد.**

هەروا هێنـدیـك وشـەی وەك (پێش، پاش دوا) بەهـاوکـاری ئامـرازی پێـوەنـدی لە شێـوەی (لـەپـاش، لەپێش، لەدوا)دا دەچنە پێش ئامـرازی (کـە)و تێکـرا هاوبـەشی دارشتنی رستـەی شوێن کەوتووی کات دەکەن. بۆ وێنە:ـ

**لە پێش ئەوەی کە دەست بە خوێندنەوەی کتێبە بکەیت، چاویك بەم وتارەدا بخشێنە.**

**لەپاش ئەوەی کە باوکی نەما، خۆی کاروبارەکەی بەرێوەبرد.**

**لەدوای ئەوەی کە تاریکایی داهات، باڵندەکان هەڵ نیشتن.**

وشـەی (کـات) لە شێـوەی (کـاتێ لەو کاتـەی، کاتێـك)دا بەپێش ئامـرازی گەیەنەری (کە) دەکەوێت، وەك:ـ

**کاتێ، کە چاوم کردەوە، باوکمم بەرامبەر خۆم**

**بینی، کاروان، ژمارە، ٢٤، لاپەرە ٧٣**

**لەو کاتەی، کە بەلایماڵیان دا تێپەریم، دایکی لەبەر دەرگە وەستابوو.**

لەم رستانەدا، کە وشەی کاتی وەك (شەو، بەیانی، ئێوارە، لەپێش، لەپاش، لەدوا، کاتێ، لەوکـاتـەی، کاتێـك) لەگـەڵ ئامـرازی گەیـەنـەری (کـە) دا بەشـداری پێـك هێنـانی رستـەی شوێن کەوتووی کات دەکەن، وشەیەکی سەرەکی‌نین و لە هەبوون و نەبوونیان دا هەر ئامرازی (کـە) دەوری بنجی دەگێـرێت، بۆیـە ئەگـەر ئەم وشـانـە لەرستـەدا لابـردران، هیـچ دۆخێکی سینتاکسی نێو رستەکان تێك ناچێت، بۆ وێنە وا ئەم رستانەی لەمەوبەر ئەم وشانەیان تێدا بوو، لایان بەرین، رستەکان هەمان بار دەگێرن:ـ

**کە باران دایدا، ژوورەکە دڵۆپەی کرد.**

**کە باوکی نەما، خۆی کاروبارەکەی بەرێوەبرد.**

**کە تاریکایی داهات، باڵندەکان هەڵ نیشتن.**

**کە چاوم کردەوە، باوکم بەرامبەر خۆم بینی.**

**کە بەلای ماڵیان دا تێپەریم، دایکی لەبەر دەرگە وەستابوو.**

وە نەبێت ئامــرازی گەیــەنــەری (کــە) ئامــرازێـك بێت، هەر تەنیـا بۆ دارشتنی رستــەی شوێن کەوتــووی کات بەکــاربێت، بەڵکــو ئەم ئامــرازە بە چالاکتــرین ئامــرازی گەیــەنــەر دەژمێردرێت، چونکە هاوبەشی بەشی هەرە زۆری پێك هاتنی رستەی شوێن کەوتوو لە زمانی کوریدا دەکـات، لەوانــە رستــەی شوێن کەوتــووی سەرکاری (نیهادی)، گوزارەیی بەکاری، دیارخەرە. لەم رستانەش دا هەمووی دەکەوێتە سەرەتای رستە شوێن کەوتووەکانەوە.[1] بۆ وێنە:-

١) ئامرازی (کە) لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی سەرکاری (نیهادی):-

دیارە، کە ئەو خۆشی دەوێت.

(کە ئەو خۆشی دەوێت) رستەی شوێن کەوتووی سەرکارییە.

٢) ئامرازی (کە) لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی گوزارەیی:-

مرۆڤی باش ئەو کەسەیە، کە بە هاسانی دەتوانم هەناسەی لەلا بدەم.

(کە بەهاسانی دەتوانم هەناسەی لە لا بدەم) رستەی شوێن کەوتووی گوزارەییە.

٣) رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری:-

گومانی لەوە پەیداکرد، کە تفەنگەکەی فیشەکی تێدا نییە (خۆشەویستی ژیان، ل - ١٩)

(کە تفەنگەکەی فیشەکی تێدا نییە) رستەی شوێن کەوتووی بەرکارییە.

٤) - ئامرازی (کە) لەگەڵ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەریدا:-

پشیلە خۆشەویستەکەی، کە لەنێو جێگەدا بەخێوی کردبوو، چاوی لەبەر رووناکی زەردو شین دەچۆوە لەباوەش کرد (ئەفسانەی چیای ئاگری، ١١٢)

(کــە لەنێــو جێگــەدا بەخێــوی کردبــوو، چاوی لەبەر رووناکی زەردو شین دەچۆوە) رستەی شوێن کەوتووی دیارخەرییە.

لەم رستانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کەوا ئامرازی (کە) چالاکترین ئامرازی گەیەنەرە و لە هەر شوێنەدا دەوری سینتاکسی خۆی دەگێڕێت و هەمیشەش دەکەوێتە سەرەتای رستەی شوێن کەوتووەوە.

## جۆرەکانی کاتی روودان لە رستەی شوێن کەوتووی کات و رستەی سەرەکیدا

ئەگەر سەرنج لە کاتی رووداني رووداوی هەردوو رستە، سەرەکیو شوێن کەوتووی کات لە رستەی تێکەڵ دا بدەین، دوو جۆرە کاتمان بۆ روون دەبێتەوە ئەو رستە شوێن کەوتووانەی کات، کە بەشــوێن رستــەی سەرەکیدا دەکــەون و کاتی رووداني رووداوی بەدیـاردەخـەن، ئەگەرچی خویان لە رووی بنچینەکانی رستەدا ناتەواون، بەڵام خاوەن رووداون، جا لەرووی رووداني کاتی رووداوی رستەی سەرەکیو رستەی شوێن کەوتوودا لە زمانی کوردیدا دوو جۆرە کات بەرچاو دەکەوێت:-

أ ـ رستەی تێکەڵ و ڕووداوی یەك کاتی.

ب ـ رستەی تێکەڵ و ڕووداوی دوو کاتی.

أ ـ رستەی تێکەڵ و ڕووداوی یەك کاتی:

لە دارشتنی رستەی شوێن کەوتووی ڕووداوی یەك کاتی‌دا، ئامرازی گەیەنەر (کە، هەرکە، هەتا) بەشداری دارشتنی ئەم جۆرە رستەیە دەکەن، ڕووداوی نێو هەردوو رستە، سەرەکی‌و شوێن کەوترو لەیەك کات دا ڕوودراوە، بۆوێنە:ـ

هەرکە دەگەیشتیە گۆرەپانی یاری، گۆڵیان بۆ چۆل دەکردی، دەبوویتە گۆڵچی، کاروان، ژمارە، ـ ٢٤، لاپەرە ـ ٦٧)

خوشکـە دە ساڵی‌یـەکـەت لەبـەر هەیـوان بوو، هەرکـە تۆ بریاری چوونە لای باپیرەت دا، کاروان، ٢٤،ر ٦٦

لەم ساتەدا هەموو دنیام لە نووکی خامەیەکی رەسەن دا ئەبینی، کە درەختی گەڵاَ زەردەکانی ئەژیاندەوە، شوان، ٤٢

لەم رستە تێکەڵانەی سەرەوەدا:

گۆڵیان بۆ چۆل دەکردی.

خوشکە دە ساڵی‌یەکەت لەبەر هەیوان بوو

لەم ساتەدا هەموو دنیام لە نووکی خامەیەکی

رەسەن دا ئەبین.

رستەی سەرەکین.

هەرکە دەگەیشتیە گۆرەپانی یاری.

هەرکە تۆ بریاری چوونە لای باپیرەت دا

کە درەختی گەڵاَزەردەکانی ئەژیاندەوە

رستـەی شوێن کەوتـووی کاتن و ئامـرازی سینتـاکسی (هـەرکـە)و (کە) هاوبەشی دارشتنی کردوون ئەو کارانـەی هاوبـەشی دارشتنی گوزارەیـان کردووە سەردەمی ڕوودانی کارەکـان لە کاتی رابردوودا بووەو وا لەخوارەوە چەند وێنەیەکی دی سەبارەت بەم دۆخە ڕوون دەکەمەوە:ـ

کە بەرێـوە دەرۆیشت خوێن بەئـاسـانی‌و ئاسـایی بەنـاو دەمـارەکـانی لەشی‌دا ئەگـەرا، خۆشەویستی ژیان، ٤٦

کە بەرێو دەرۆیشت

رستەی شوێن کەوتووی
کات

خوێن بە ئاسانیو ئاسایی بەناو
دەمارەکانی لەشیدا ئەگەڕا.

ڕستەی سەرەکی

کە ئاوڕیدایەوە، ڕوویەکی گەوجی ئیجگار بەخۆ
نازی بەدیکرد، پێنج تابلۆی شێواو

کە ئاوڕی دایەوە

ڕستەی شوێن کەوتووی
کات

ڕوویەکی گەوجی ئیجگار بەخۆ نازی بەدیکرد.

ڕستەی سەرەکی

کە گوێی لە دەنگم بوو، وەك گەڵای درەخت
لەرزی، کاروان، ژمارە ٢٤، لاپەرە - ٢٤

کە گوێی لە دەنگم بوو

ڕستەی شوێن کەوتووی کات

وەك گەلآی درەخت لەرزی

رستەی سەرەکی

کە لە گەراجەکەی هاتە دەرێ، لەلای چەپییەوە
گایەك و بلدۆزەرێك وەستابوون، پێنج تابلۆی شێواو، ١٨

کە لە گەراجەکەی هاتەدەری

رستەی شوێن کەوتووی کات

لەلای چەپییەوە گایەك و بلدۆزەرێك
وەستابوون

رستەی سەرەکی

ب ـ رستەی تێکەڵ و رووداوی دووکاتی بە شێوەیەکی سەرەکی ئامرازی گەیەنەری (کە) هاوبەشی دارشتنی ئەم جۆرە رستەیە دەکات، لەم بەشەدا کاتی رووداني رووداوی رستەی سەرەکیو رستەی شوێن کەوتووی کات لە کاتێکی جیاوازدا روودراوەو وا رێك دەکەوێت هێندیك جار کاتی رووداني رووداوی رستەی شوێن کەوتوو پێش کاتی رووداني رووداوی رستەی سەرەکییە، وەك ئەم رستانەی خوارەوە:ـ

کە دەرگام کردەوە، بینیم بەدرە، کاروان، ٢٤،٦١

کە لەمە بووەوە، بە قەمچییەکەی سەگەکانی

هێمن کردەوە، خۆشەویستی ژیان، ٦٨
توانی ماناى هونەر، کە لە سەدەکانی پێش
چەرخی خۆیدا باوبوون بگۆڕێ، نیرگز، ٣٢

لەم رستانەدا کاتی رووداني رووداوی رستەی شوێن کەوتووی کات (کە دەرگام کردەوە)، (کە لەمە بووەوە)، (کە لە سەدەکانی پێش چەرخی خۆیدا باوبوون) بە پێش کاتی رووداني رووداوی رستە سەرەکێکان؛ (بینیم بەدرە) (بە قەمچییەکەی سەگەکانی هێمن کردەوە)، (توانی ماناى هونەر بگۆڕێ) کەوتووە.

هەروا کاتی رووداني رووداوی رستەی سەرەکیش بەپێش کاتی رووداني رووداوی رستەی شوێن کەوتوو لە زمانی کوردیدا بەدی دەکرێت، وەك:ـ

کە گەیشتە ماڵەوە، وای زانی گەشتێکی سەرکەوتووی تەواوکردووە، پێنج تابلۆی شێواو دایکم فێری‌کردم، کە رێم کەوتە ناو بەفرەوە دەست لەسەر ئەژنۆ دۆش دانەمێنم، شوان، ١٠

کاتی رووداني رووداوی رستەی سەرەکی (وای زانی گەشتێکی سەرکەوتووی تەواوکردووە)و (دایکم فێری کردم) بە پێش کاتی رووداني رووداوی رستەی شوێن کەوتووی (کە گەیشتە ماڵەوە)و(کە رێم کەوتە ناو بەفرەوە دەست لەسەر ئەژنۆ دۆش دانەمێنم) کەوتووە.

ئەوەی لەم رستانەدا سەرنج راکێشە کاتی رووداني رووداوەکان هەموو لەکاتی رابردوو دایە بەدەگمەن لە رابردوو و رانەبردووا دەبێت، وەك ئەم وێنەی خوارەوە:ـ
بریاری وابوو،
هەرکە گەرایەوە ئوتومبیلەکە بفرۆشێ، پێنج تابلۆ ـ ٢٨ (بریاروابوو، ئوتومبیلەکە بفرۆشێ) رستەیەکی لێکدراوە کاری گوزارەی یەکەمیان لە کاتی رابردوو دایەو کاری گوزارەی رستەی دووەم لە کاتی داهاتوو دایەو (کە مەبەست ئەمەی دووەمیانە) کاتی رووداني رووداوی رستەی شوێن کەوتوو لە کاتی رابردوو دایە، بەڵام ئەم جۆرە دارشتنانە کەم بەرچاوەدەکەون.

## شوێنی رستەی شوێن کەوتووی کات لە رستەی تێکەڵ دا

رستەی شوین کەوتووی کات لە رووی شوێنەوە تاکە جێگەیەکی دیاری‌کراوی لە رستەی تێکەڵ دا نییە، بەڵکو دەکەوێتە پێش، پاش رستەی سەرەکی نێو رستەی تێکەڵەوە وەیا دەکەوێتە نێوان بەشەکانی رستەی سەرەکیەوە.

١ ـ رستەی شوێن کەوتوو لە سەرەتای رستەی تێکەڵ دا، وەك:ـ
هەرکە دەگەیشتیە گۆرەپانی یاری، گوڵیان بۆ چوڵ دەکردی.

هەرکە دەگەیشتیە گۆرەپانی یاری

ڕستەی شوێن کەوتووی کات

گوڵیان بۆ چۆل دەکردی

ڕستەی سەرەکی

کە ڕاست بۆوە، هەستی هیلاکییەکی کت وپڕ تەواو سستیکرد.

کە ڕاست بۆوە

ڕستەی شوێن کەوتووی
کات

هەستی هیلاکییەکی کت وپڕ تەواو سستیکرد

ڕستەی سەرەکی

٢ ـ رستەی شوێن کەوتووی کات لە کۆتایی رستەی تێکەڵ دا، وەك :ـ

مانگی جۆزەردان تازە بەنیـوەببـوو، کە جووتـە مینـارەکـەی مزگـەوتی گەورە بوونە ئامێرەی لێکدانەوەکەت، کاروان، ژمارە ٢٤، ٦٣.

مانگی جۆزەردان تازە بەنیوە بوو

رستەی سەرەکی

کە جووتە منارەکەی مزگەوتی گەورە، بوونە

ئامێرەنی لێکدانەوەکەت

رستەی شوێن کەوتووی کات

٣ ـ رستەی شوێن کەوتووی کات لەنێو رستەی سەرەکیدا :ـ

قوتابی، کە دەگەیشتە پۆلی پێنج و شەش بە چاوێکی تایبەتی سەیر دەکرا، روشنبیری‌نوێ، ژمارە، ١٠٩، لاپەرە ٢٩٦.

قوتابی بەچاوێکی تایبەتی سەیر دەکرا

رستەی سەرەکی

کە دەگەیشتە پۆلی پێنج وشەش

رستەی شوێن کەوتووی کات

توانی مانای هونەر، کە لە سەدەکانی پێش
چەرخی خۆیدا باوبوون بگۆڕێ، نیرگز، ٣٢
توانی مانای هونەر بگۆڕێ
ڕستەی سەرەکی

کە لە سەدەکانی پێش چەرخی خۆیدا
باوبوون

ڕستەی شوێن کەوتووی کات

## ئەنجام

ڕستەی شوێن کەوتووی کات، جۆرە ڕستەیەکی شوێن کەوتووی ڕستەی سەرەکی‌یە، کە چەند ئامرازێکی سینتاکسی وەك (کە، هەرکە، هەرچەند، هەتا) وەیا هاوبەشی پێك هاتنی دەکەن وەیا بە هاوکاری چەند نێوێکی کات وەك (شەو، بەیانی، ئێوارە) وەیا بەیارمەتی (لەپێش، لەپاش، لەدوا)، کە بەپێش ئامرازی گەیەنەری (کە) دەکەون دادەڕێژرێت، بەڵام لەنێو ئەم ئامرازانەدا تەنیا ئامرازی (کە) بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە ڕستە شوێن کەوتووە لە هەمووان چالاکترەو هەمیشەش بەپێش ڕستە شوێن کەوتووەکەی کات دەکەوێت.

له زمـانی کوردی‌دا کاتی روودانی رووداو له‌و رستـه تێکـه‌ڵـه‌ی رستـه‌ی شوێن که‌وتووی کاتی تیٚدا هه‌یه، دوو جۆره؛ یه‌که‌میان ئه‌و جۆره‌یه، که روودانی رووداوی رستـــه‌ی سه‌ره‌کی‌و رستـــه‌ی شوێن که‌وتـــووی له‌یـــه‌ك کات دا ده‌بێت. دووه‌میـــان کاتی روودانی رووداوی نێـو رستـه‌ی سه‌ره‌کی به‌پێش وه‌یا به‌پاش کاتی روودانی رووداوی رسته‌ی شوێن که‌وتوو ده‌که‌وێت.

شوێنی رستـه‌ی شوێن که‌وتـووی کات له‌نێـو رستـه‌ی تێکـه‌ڵ دا چه‌سپیو نی‌یه، به‌پێش رسته‌ی سه‌ره‌کی وه‌یا به پاشی ده‌که‌وێت وه‌یا ده‌که‌وێته نێوان به‌شه‌کانی رسته‌ی سه‌ره‌کییه‌وه.

**په‌راوێزو سه‌رچاوه**

---


١ ـ توفيق وهبي، قواعد اللغة الكردية، الجزء الأول، الباب الثاني، ١٩٥٦، ص ٨٧و٨٩

٢ ـ بروانه: نوری علی أمین، قه‌واعدی زمانی کوردی له «صرف و نه‌حو»دا، به‌رگی دووه‌م، به‌غدا، ١٩٥٨، لاپه‌ره ـ ٢٦

٣ ـ بروانـــه: زه‌ری عارف یوسـوپـوڤـا، دیـالێکتی سلێمـانی زمـانی کوردی، مۆسکـۆ، ١٩٨٥، لاپه‌ره، ١٢٥ و٢٦/.

٤ ـ بروانـه: د.کـوردستـانی موکـریـانی، جۆره‌کانی رسته له زمانی کوردی‌دا، گۆڤاری زانکۆ، ژماره ـ ١، به‌رگی ٦، سلێمانی، ئه‌یلولی ١٩٨٠

٥ ـ رێـزمـانی زمـانی روسی، مۆسکـۆ، ١٩٥٣، به‌رگی دووه‌م، ئامۆژگه‌ی زانستی‌زمان سه‌ر به کۆڕی زانیاری یه‌کێتی سوڤێت دایناوه.

٦ ـ ن.س. ڤالگنیا، سینتاکسی زمانی روسی هاوچه‌رخ، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ٣١٧ ـ ٣٢٢

# الجُملة التابعَة الزمَنيّة

د. كردستان مكرياني

**تعتبر الجمل المعقدة ذات جمل رئيسية وثانوية تابعة لها، غير مستقلة ومتعلقة ببعضها بواسطة أداة نحوية، وتوضح الجملة الثانوية عادةً معنى اجزاء الجملة الرئيسية أو الجملة ككل.**

توجد في اللغة الكردية مجموعة أو اصناف من الجمل الثانوية التابعة للجملة الرئيسية منها؛ الجملة التابعة الفاعلية، الجملة التابعة المفعولية، الجملة التابعة الوصفية، الجملة التابعة الزمنية، الجملة التابعة السببية، الجملة التابعة الشرطية وغيرها. . والجدير بالذكر إن الكتب اللغوية الكردية لم تتناول دراسة مستقلة وعلمية للجملة التابعة الزمنية.

الجملة التابعة الزمنية جملة تابعة للجملة الرئيسة، توضح وتتمم زمن حدوث الفعل في الجملة الرئيسة، وترتبط بها بواسطة اداة الوصل النحوية، (كه، هەركه، هەرچەند، هەتا) والكلمات الظرفية (شەو، بەيانى، ئيواره، لەپيش، لەپاش، لەدوا) وتقع هذه الادوات النحوية والكلمات الظرفية في مقدمة أو بداية الجملة التابعة الزمنية، والملاحظ إن اداة (كه) هي أنشطهم من حيث عملها النحوي.

ينقسم زمن حدوث الحدث في الجملة التابعة الزمنية في اللغة الكردية الى قسمين: ـ

أ ـ للدلالة على تطابق حدثين أوظاهرتين في الزمن في آنٍ واحد، نحو:ـ

خوشكـه ده سالَى يـەكەت لەبەر هەيوان بوو، هەركه تۆبريارى چوونه لاى باپيرت دا

كانت اختك ذات العشر سنوات واقفةً امام الايوان، عندما قررت انت الذهاب الى جدك.

ب ـ للدلالة على تتابع حدثين أو ظاهرتين، نحو:

كه دەرگام كردەوه، بينيم بەدر، عندما فتحت الباب، رأيت بدراً

يُلاحظ إن موقع الجملة التابعة الزمنية ضمن الجملة المعقدة غير ثابت، نجدها أحياناً تتخلل الجملة الرئيسية، تقع في بدايتها أو نهايتها.

# جێناوی خۆیی لە زمانی کوردیدا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

وێنەی جێناوی خۆیی لە ئاوێستادا لە شێوەی (هڤە، خوە، خوەتۆ)دا دەبینرێو[1] لە فارسیی ناوەڕاست دا لە شێوەی (خوەت)دا بەرچاودەکەوێو[2] لە فارسیی نوێدا بووە بە (خود)...[3]

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا ئەگەرچی (خۆ) شێوەی سەرەکیی جێناوی خۆیی‌یە، بەڵام لە هەندێ حاڵەت و لە هەندێ بەشە دیالێکت دا شێوەی (خود)[4] ...یش هەیە.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژوورووودا لەگەڵ ئەوەش دا، کە (خوە) شێوەی سەرەکی‌یە، بەڵام شێوەی (خۆ)و[5] (خوو)و[6] (خۆن)و[7] (خوا)[8] ... یش دەبینرێن.

ئەگەر ئاورێك لەو کتێبانە بدەینەوە کە لە ڕێزمانی کوردی دەدوێن و سەرنج لەو شوێنانەیان ڕابگرین کە دەربارەی (جێناوی خۆیی) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودان،

وێڕای بینینی هەڵەو ناتەواویو بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون و سادەیی ئەوە بەدی دەکەین کە نووسەران لەم باسەدا دەبنە دوو کۆمەڵ:

کۆمەڵی یەکەم وا ڕادەگەیەنن کە مۆرفێمی (خۆ) جێناوی

خۆیی‌یەو دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان (م، ت، ی، مان، تان، یان) وەردەگرێ‌و دەبێتە (خۆم، خۆت، خۆی، خۆمان، خۆتان، خۆیان)...[9]

کۆمەڵی دووەم وایان داناوە، کە (خۆم، خۆت، خۆی، خۆمان، خۆتان، خۆیان) جێناوی خۆیین.[10]

ئەگەرچی کۆمەڵی یەکەم ڕاست بۆ دیاریکردنی شێوەی ئەو جێناوە چووە، بەڵام ناتەواوییان ئەوەیە، کە تەنیا حاڵەتی پێوەلکاندنی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمیان باس کردووەو بە هیچ چەشنێك ئەوەیان یادداشت نەکردووە کە جێناوی (خوە) جێناوێکی لکاوی دەستەی دووەم، یان دوو جێناوی لکاوی دەستەی یەکەم پێکەوە، یان جێناوێکی لکاوی دەستەی یەکەم و دوایدا جێناوێکی دەستەی دووەم، یان (ش/یش)ی پێوەندی‌و بەدوایدا جێناوێکی دەستەی یەکەم... یش وەردەگرێ... یاخود دەبێتە پارچەیێکی وشەی دارێژراو، یان لێکدراو...

کۆمەڵی دووەم لەگەڵ ئەوەش دا کە هیچ شتێکی ئەوتۆیان لە بارەی ئەو جێناوەوە تۆمارنەکردووە، هەروەها لە دیاریکردنی شێوەشی‌دا بەهەڵەچوون. ئەگەر جێناوی خۆیی (خۆم، خۆت، خۆی، خۆمان، خۆتان، خۆیان) بوایە، ئەوە لە شێوەی (خۆ)دا دەرنەدەکەوت یاخود (ش/یش)ی پێوەندی نەدەکەوتە نێوان (خۆ)و جێناوە لکاوەکانەوە، یاخود نەدەبوو (خۆ) ببێتە پارچەیێکی وشەی ناسادە، بەڵکو دەبوو (خۆم، خۆت، خۆی، خۆمان، خۆتان، خۆیان) ببن...

جێناوی (خۆ)،[11] کە واتای خۆیەتی‌و خاوەنێتی دەگەیەنێ، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووی بەم جۆرانەی خوارەوە دەردەکەوێ:

١ - بێ ئەوەی هیچ زیادییێکی لەگەڵ بێ، وەك:

خۆ لە خۆ[12] ئەکوژێ، بێگانە لە کولۆری دارا.

(پەندی پێشینان، ل ١٩٦)

هەروا دەروا خۆ دەشلێنی
پەنجەو پانیان لۆ یەك دینی
قەسدێ دەکا بمووتێنێ

(فۆلکلۆر، ل ٧١)

٢ - یەك جێناوی دەستەی یەکەم وەردەگرێ، وەك:

خۆ + م ← خۆم

لە ژینی خۆم ئومێدم قەطعە «نالی»!
کە سووتاوە هەموو جەرگ و هەناوم

(نالی، ل ٢٩٤)

خۆ + ت ← خۆت

خۆت سووك مەکە بە غائیلەی سەد مەرامەوە تا ماوی
ڕابوێرە بە نامووس و نامەوە

(زێوەر، ل ٢٠)

خۆ + ی ← خۆی

خۆی خستۆتە ساجی عەلی.

(پەندی پێشینان، ل ١٩٨)

خۆ + مان ← خۆمان

ئەی بلبل، هەزار خۆمان
بێ‌دەستەڵات، پڕ گومان،

(گۆران، ل ١٠٨)

خۆ + تان ← خۆتان[13]

دوژمن بە خۆتان خۆش مەکەن
هەموو بە جارێ لە چەپڵە دەن

(بێکەس، ل ٨١)

خۆ + یان ← خۆیان[١٤]

پۆل پۆل ئەهاتنە سەر ڕێگەمان و قەدرێك شەرەتفەنگ ئەکراو زەفەریان نەئەبرد، خۆیان ون ئەکرد.

(لە خەوما، ل ٤٠)

٣ ـ جێناوێکی دەستەی دووەمی دەچێتە سەر، وەك:

خۆ + م ← خۆم

من خۆم، نەناسیاو نیم.

خۆ + ی (یت) ← خۆی (یت).

تۆ خۆی(یت)، نەناسیاو نیت.

خۆ + ە ← خۆیە

ئەو خۆیە،[١٥] نەناسیاو نی‌یە.

خۆ + ین ← خۆین

ئیمە خۆین نەناسیاو نین.

خۆ + ن ← خۆن

ئیوە خۆن، نەناسیاو نین.

خۆ + ن ← خۆن

ئەوان خۆن، نەناسیاو نین.

٤ ـ دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە دەلکێ، وەك:

خۆ + م + م ← خۆمم

. . . کە چاوم بەوانە کەوت و ئەو ئەحواڵەم دی بە جارێك خۆمم لەبیرچووەوە.

(لە خەوما، ل ٣٩)

خەڵك هەموو مەسروورو شادن دەستە دەستە دێنە خوار

من خەریکی دەردی خۆمم، تەرکی ناو باران ئەکەم

(بێکەس، ل ١٧٥)

خۆ + ت + ت ← خۆتت

یاخود بە قەولی گاڵتەی درۆزن

کەرەکەی خۆتت لێبووە ڕم و زن

(پیرەمێرد، ل ٣٠٢)

خۆ + ت + ی ← خۆتی

خۆتی[١٦] فیداکەی هەر کەمە

خەڵاتی ئەو دەردو غەمە

(بێکەس، ل ١٦٢)

خۆ + م + تان ← خۆمتان

خۆمتان لێناگۆڕم

خۆ + تام + مان ← خۆتانمان

خۆتانمان لێمەشارنەوە

. . . . هتد[١٧]

٥ ـ جێناوێکی دەستەی یەکەم و دوای‌دا هی دەستەی دووەم، وەك:

خۆ + م + ن ← خۆمن

ئەوان وەك کوری خۆمن

خۆ + ت + ن ← خۆتن

ئەوان لە خۆتن

خۆ + ت + ین ← خۆتین

ئیمە لە خۆتین

خۆ + مان + ین ← خۆمانین

ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا؟ خانم بێکەرەوە خۆمانین

خۆ + تان + ین ← خۆتانین

ئیمە لە خۆتانین

٦ ـ کاتێ (خۆ) جێناوی لکاوی دەچێتە سەر چ لە پێش و چ لە پاش جێناوەکەوە مۆرفیمی (ش/یش) دەتوانێ وەربگرێ. وەك:

أ) لە پێش جێناوەکەوە:

خۆشم، خۆشت، خۆشی، خۆشمان، خۆشتان، خۆشیان.

لەبەر تۆ زەربەم داوە لە خۆشم

وا تێگەیشتم کە چەند بێهۆشم

(بێکەس، ل ٧٧)

پیرەمێردێك بوو، چوار پێنج ولاخی پێبوو، خۆشی تەنها بوو. .

(لە خەوما، ل ٣٠)

ب) له پاش جێناوەکەوە:
خۆمیش، خۆتیش... خۆمانیش، خۆتانیش...
خۆتانمانیش، خۆمتانیش...[18]
٧ ـ جێناوی (خۆ) لەگەڵ کرداردا بەو جۆرەی خوارەوە خۆی دەنوێنێ:
أ) کاتێ جێناوێکی دەستەی یەکەمی پێوە لکابێ لەگەڵ کرداری تێپەڕو تێنەپەڕیش دا دێ. وەك:
خۆمان ـ فرۆشتمان، کوشتمان..
خۆمان ـ چووین، کەوتین..
ب) ئەگەر دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە لکابێ، تەنیا لەگەڵ کرداری تێپەڕدا دێو لەگەڵ تێنەپەڕدا نایەت.
وەك:
خۆمانمان ـ فرۆشت، کوشت...
خۆمانمان ـ ×، ×

حـ) بێتــو جێنـاوێکی دەستــەی دووەم، یان جێنـاوێکی دەستـەی یەکـەم و بە دوای‌دا جێناوێکی دەستـەی دووەمی چووبێتە سەر، ئەوە لەگەڵ هیچ جۆرە کردارێك دا نایەت.
٨ ـ جێنـاوی (خـۆ) دەتـوانێ ببێتـە بەشێکی گرنگی وشەی ناسادە. وەك:
أ) لە وشەی دارێژ راودا:
یەك ـ لەگەڵ پێشگر
بەخۆ...
دوو ـ لەگەڵ پاشگر
خۆیەتی، خۆیی...
ب) لە وشەی لێکدراودا:
یەك ـ لە سەرەتاوە
خۆکــرد، خۆمــاڵــی، خۆپــەرســت، خۆنــاســیــن، خۆبەخت کردن، خۆپەسەندی...
کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردی‌یە خۆکردی‌یە هەر کەسێ
نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا
(نالی، ل ١٠٧)

خۆپەسەندی مایەی ڕیسوایی‌یە
(پەندی پێشینان، ل ١٩٣)
دوو ـ لە کۆتایی‌یەوە
سەربەخۆیی، لەسەرخۆ.
داری ئازادی بە خوێــن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگــرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ
(بێ‌کەس، ل ٨٢)
٩ ـ جێناوی (خۆ) چ لە زووداو چ ئەمڕۆ؛ چ سەربەخۆو چ لە پێــك هێنــانی وشـەی ناسـادەدا ناوە ناوە لە شێـوەی (خود)دا دەبینرێ. وەك:
کە هاتی تیغی بێزاریت لەسەر دام
سەری خۆم خود بە خود هەڵ گرت و ڕۆییم
(نالی، ل ٣١٤)
هەر کەسێ ئیظهاری دانایی بکات و مەقصەدی
خودپەسەندی بێ، یەقین ئیظهاری نادانی دەکا
(نالی، ل ١٠١)

جێنــاوی خۆیی لە دیــالێکتی کرمـانجیی خواروودا لە ڕووی جنس و[19] ژمـارەو دۆخـەوە بێ‌لایـەنـەو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروش دا هەر بەو چەشنەیە:
چەند نموونەیێك
* بۆ نێر:
هەما مەم ڕابوو لنگی خوە ئاڤێتە جۆتێ سۆلانە.
(مەمێ ئالان، ل ٤٣)
عەلی مەمەد... ڕۆنیشت و خۆ دا بەر تەعفە..
(کوردۆ، ل ٣٤)
* بۆ مێ:
خوشکەك مە هەبوو ڕەنگێ سۆر گول
هەل گرتی‌یە وێ ژ بوە خوە بلبل
(خانی، ل ٢٨٨)
* بۆ تاك:
عەلی مەمەد... دلێ خۆدا گۆت..

(کوردۆ، ل ٣٥)

شەفقێ ب دیدارێ خوە کت
قەستا برینداریێ خوە کت

(جزیری، ل ٤٥٥)

* بۆ کۆ

ڕۆژەکی دەرکەتن، چوون سەر کانییا گولانە،
ژ خوە دانین پۆستێن کەوانە،

(مەمێ ئالان، ل ٤٥)

* بۆ دۆخی ڕاستەوخۆ:

ل سینان باڤێ سلێمان دەرباز بوو، خۆ بەردا کورانا بشیرێ..

(ئۆردیخان، ل ٨٠)

* بۆ دۆخی تیان:

هەم ئەهلێ ئەزەر نەبێن کو: کورمانج
ئیشقێ نەکرن ژ بۆ خوە ئامانج

(خانی، ل ٦٠)

★ ★ ★

## پەراوێزەکان:

(١) بروانە: س. ن. سۆکۆلۆڤ، زمانی ئاوێستا، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل ٦٤.

(٢) بروانە: ف. س. ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل ٦٨.

(٣) بروانە:

أ) ذو النور، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی، تهران، ١٣٤٣، ل ٢٨ - ٢٩.

ب) علی برناك، دستور زبان فارسی، ١٣٤٧، ل ٢٨.

(٤) دواتر لێی دەدوێین.

(٥) بە وێنە بروانە:

أ) چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ١٦٣.

ب) ق. کوردۆیێڤ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو)، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ل ١١٤.

ح) م. خەمۆ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق، کتێبی «وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك و ناوەڕاست»، ب ٧، یەریڤان، ١٩٧٥، ل ٣٣٤.

(٦) بەوێنە بروانە:

أ) سەرچاوەی ناوبراو، چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، ل ١٦٣.

ب) سەرچاوەی ناوبراو، م. خەمۆ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق، ل ٣٣٤.

(٢) بروانە: ف. س. ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل ٦٨.

(٣) بروانە:

أ) ذو النور، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی، تهران، ١٣٤٣، ل ٢٨ - ٢٩.

ب) علی برناك، دستور زبان فارسی، ١٣٤٧، ل ٢٨.

(٤) دواتر لێی دەدوێین.

(٥) بە وێنە بروانە:

أ) چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ١٦٣.

ب) ق. کوردۆیێڤ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو)، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ل ١١٤.

ح) م. خەمۆ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق، کتێبی «وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك و ناوەڕاست»، ب ٧، یەریڤان، ١٩٧٥، ل ٣٣٤.

(٦) بەوێنە بروانە:

أ) سەرچاوەی ناوبراو، چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، ل ١٦٣.

ب) سەرچاوەی ناوبراو، م. خەمۆ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق، ل ٣٣٤.

(٧) بروانــە: سەرچـاوەی ناوبـراو، چ. خ. باکـایێف، زمـانی کوردەکانی سۆڤێت، ل ١٦٣.
(٨) بروانـە: سەرچـاوەی ناوبـراو، ق. کوردۆییف، دەستووری زمانی کوردی...، ل ١١٤.،
(٩) بە نموونە، وەك:
أ) ك. ر. ئەیــوویی‌و ئی. ئا. سمیـر نۆڤـا، دیـالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨، ل ٥٢.
ب) سەرچاوەی ناوبراو، چ. خ. باکایێف، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، ل ١٦٣.
ج) ق. کوردۆییف، دەستووری زمانی کوردی.. ل ١١٤.
د) ر. ل. تسـابـۆلـۆڤ، لەبـارەی مێـژ ووی مۆرفـۆلۆژ یی زمانی کوردی‌یەوە، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ل ٢٨.
هـ) سەرچاوەی ناوبراو، م. خەمۆ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق، ل ٣٣٤.
...و هەندێکی‌تر.
(١٠) بە نموونە، وەك:
أ) تۆفیق وەهبی، دەستــووری زمـانی کوردی، جزمی یەکـەم، بەغدا، ١٩٢٩، ل ١١٢ ـ ١١٣.
ب) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی ١٩٦٠، ل ٩٥ ـ ٩٦.
حـ) عەبدوڵڵا شالی، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، د. ئەمین عەلـی، نووری عەلـی ئەمـین، فەرەیــدوون عەلـی ئەمــین، عەلائەددین سەجـادی، کەمـال مەحمــوود فەرەج، ئەبـووزەیـد مستــەفــا سەنــدی، زمـان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجـەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٢١ ـ ٢٢.
د) د. کوردستـان موکـریـانی، جۆرەکـانی جێنـاوو دەوریـان لە ڕستـەی کوردی‌دا لە دیـالێکتی کرمـانجیی خواروو و کرمـانجیی ژووروودا، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد»، ب ٧، بەغدا ١٩٨٠، ل ٢٤٩ ـ ٢٥٠.
.... و هەندێکی‌تر.
(١١) (خۆ)ی جێناو کە لە ڕووی واتاوە بەرانبەر (نفس، عین ـ Self) دەوەستێ‌و هەنـدێ جاریش جێگـای تەئکیـد دەگـرێتـەوە، لەگــەڵ ئامــرازی (خــۆ) کە بە واتــای (إذا، لو) دێ‌و لەگـەڵ مۆرفیمی (خۆ) کە ڕەگی کرداری ڕانەبوردووی (خواردن)ە... نابێ تێکەڵ بکرێ.
ئامرازی (خۆ). وەك:
خۆ مریشك نیم بە دەندووك شەڕ بکەم
(پەندی پێشینان، ل ١٩٧)
(خۆ)ی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو:
شەربەتی خەوف و ڕەجای ئەغیارو یار
ترش و شیرین هەم دەچێژم، هەم دەخۆم
(نالی، ل ٢٩٧)
..... هتد.
(١٢) ئەو (خۆ)یە بە واتای (خزم) دێت.
(١٣) لە هەندێ شێوەی کوردی‌دا لە جێگای (خۆمان) شێوەی (خۆن)و لەبریتی (خۆتان) شێوەی (خۆو) بەکاردێ.
(بـروانـە: مەسعـوود محـەمـەد، سوورێکی خامە بە دەوری ڕانـاودا، «گـۆڤـاری کۆڕی زانیاری کورد»، ب٢، ژ١، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٧٨).
(١٤) هەنـدێ لە نووسـەرانی ڕێـزمـانی کوردی ئەو حاڵـەتانەی جێناوی (خۆ) کە جێناوی لکاو وەردەگرن، بە (جێناوی خۆیی کەسی) ناودەبەن. بەوێنە، بروانە: (ر. ل. تسابۆلۆڤ، لەبارەی مێـژ ووی مۆرفـۆلۆژ یی زمانی کوردی‌یەوە، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ل ٢٨؛ ك. ر. ئەیوویی‌و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨، ل ٥٢...و هەندێکی‌تر).
ئەگەرچی ڕاستە جێناوی خۆیی بەبێ جێناوی لکاو، کەسی قسەکەر یان قسەبۆکراو یان قسەلێ‌کراوی تێ‌دا نی‌یە، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێ کە جێناوی لکاو وەربگرێ ببێتە جێناوێکی تر.... چونکــە ئەگــەر بەو پێ‌یـە بێ، ئەوە دەبێ کاتێ جێنـاوی لکـاو دەچێتە سەر ناو (وەك: کوڕم... کوڕمان..) ناوەکە ببێتە ناوی کەسـی، یان کە بە پریبـۆزیشـنـەوە دەلـکێ (وەك: لەم.. لەمان....)، ئەوە پریپۆزیشنەکە ببێتە پریپۆزیشنی کەسی...
(١٥) دەرکــەوتنی (ە) وەك جێنــاوی لکـاوی کەسی سێ‌یـەمی دەستـەی دووەم لەگـەڵ جێنـاوی خۆیی (خـۆ)دا بەڵگـەیێکی‌ترە بخرێتە سەر ئەو بەڵگانەی لە وتاری «جێناوی کەسی لکاو لە دیــالێکتی کرمـانجیی خوارووداِ»دا بۆ ئیسپـات کردنی بە جێنـاو

دانانی (٥) هێناومانەتەوە.

(١٦) واتە: (خۆت فیدای ئەو کەی).

(١٧) کاتێ دوو جێناوی دەستەی یەکەم دەچنە سەر جێناوی خۆیی (خۆ)، هەمیشە ئەوەی یەکەم بەرکارەو ئەوی دووەم کارایە. بەوێنە:

خۆتم نیشان بدە ـ تۆ (بەرکار) خۆ بە من
(کارا) نیشان بدە

خۆیتان لێ ون دەکا ـ ئەو (بەرکار) خۆی لە ئێوە
(کارا) ون دەکا.

خۆیانمان لێ دەشارنەوە ـ ئەوان (بەرکار) خۆیان لە
ئێمە ((کارا) دەشارنەوە.

(١٨) ئەگەر دوو جێناوی لکاو بە دوا (خۆ)دا هات، حاڵەتی (ش/یش) کەوتنە نێوان دوو جێناوەکەشەوە هەیە، وەك:
خۆتانیشمان، خۆمیشتان...

(١٩) بەوێنە، ئەوەتە بۆ کەسی سێیەمی تاك چ مێ بێ و چ نێر هەر (خۆی) بەکاردێنرێ.

أ) بۆ مێ:

ئەزانی یار خۆی، کام هەژار، ڕۆژی سەدجار،
ئەکا هاوار: خۆزگەم بە پار، خۆزگەم بە پار!
(گۆران، ل ٢٣)

ب) بۆ نێر:

ئەوانیش وتیان.. هاتووە لێرە کاسبیێك بکا بۆ خۆی...
(لە خەوما، ل ٣٣)

★ ★ ★

## نیشانەی نموونەکان:

١ ـ (بێکەس)

دیوانی بێکەس، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوەو سەرپەرشتیی لە چاپ دانی کردووە، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٠.

٢ ـ (پەندی پێشینان).

پەندی پێشینان، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ، چاپی **دووەم، ١٩٧١.**

**٣ ـ (پیرەمێرد).**

**پیرەمێردی نەمر، محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بەغدا، ١٩٧٠.**

**٤ ـ (جزیری)**

**دیوانا مەلایێ جزیری، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی، بەغدا، ١٩٧٧.**

**٥ ـ (خانی)**

**ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئەستەمووڵ، م. بۆز ئەرسەلان لە چاپی داوە.**

**٦ ـ (زێوەر)**

**دیوانی زێوەر، بەغدا، ١٩٥٨.**

**٧ ـ (فۆلکلۆر)**

**فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف، کەرکوك، ١٩٧٤.**

**٨ ـ (کوردۆ)**

**کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆماری کردووە. شوکور مستەفاو ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.**

**٩ ـ (گۆران)**

**سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، دیوانی گۆران، محەمەدی مەلا کەریم کۆی کردوەتەوەو ئامادەی کردووەو پێشەکیو پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٨٠.**

**١٠ ـ (لە خەوما)**

**جەمیل صائب، لە خەوما، پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی جەمال بابان، بەغدا، ١٩٧٥.**

**١١ ـ (مەمێ ئالان)**

**مەمێ ئالان، چیرۆك نفیس کۆی کردووەتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە، صالح عەلی گوللیو ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینیەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، بەغدا، ١٩٧٧.**

**١٢ ـ (نالی)**

**دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، بەغدا، ١٩٧٦.**

# ملخص البحث

# الضمائر التوكيدية في اللغة الكردية

د. عبد الرحمن الحاج معروف

مع ان (خۆ) يعتبر الصيغة الرئيسية للضمير التوكيدي فى الكرمانجية الجنوبية، الا ان هناك ايضا (خود) فى بعض الحالات وفى بعض اللهجات الفرعية.

اما فى الكرمانجية الشمالية فمع ان (خوه) يعتبر الصيغة الرئيسية للضمير التوكيدى الا انه يلاحظ كذلك صيغ (خۆ) و (خوو) و (خۆن) و (خوا). . .

واذا القينا نظرة على الكتب التى الفت فى قواعد اللغة الكردية وانعمنا النظر فى فصولها المخصصه للضمير التوكيدى فى اللهجة الكرمانجية الجنوبية وجدنا فضلا عن البساطة والاخطاء والنواقص العديدة واهمال التطرق الى جوانب عديدة من الموضوع، ان الباحثين انقسموا فى هذا المبحث الى فريقين.

فريق يرى ان مورفيم (خۆ) ضمير توكيدى ويقبل الضمائر المتصلة من الصنف الاول (م، ت، ى، مان، تان، يان) ليصبح (خۆم، خۆت، خۆى، خۆمان، خۆتان، خۆيان).

وفريق آخر يرى ان (خۆم، خۆت، خۆى، خۆمان، خۆتان، خۆيان) برمقها ضمائر توكيدية.

ومع ان الفريق الاول اصاب كبد الحقيقة، الا ان ما يؤخذ عليه انه حصر بحثه فى الحاق الضمائر المتصلة من الصنف الاول بالضمائر التوكيدية ولم يتطرق الى حالات الحاق الضمائر المتصلة من الصنف الثاني او الحاق ضمائر متصلة من الصنف الاول واخرى من الصنف الثاني كما لم يتطرق الى الحالات التى تغدو فيها الضمائر التوكيدية جزءا من كلمة مركبة او مشتقة.

اما الفريق الثانى ففضلا عن انه لم يسجل شيئا ذا اهمية حول الضمائر التوكيدية، وقع فى الخطأ كذلك فى تحديدها. فلوكان (خۆم، خۆت، خۆى، خۆمان، خۆتان، خۆيان) برمتها ضمائر توكيدية، لما ظهرت هذه الضمائر فى صيغة (خۆ)، ولما غدت جزءا من كلمة مركبة، ولكان من الضروري ان تكون الضمائر التوكيدية (خۆم، خۆت، خۆى، خۆتان، خۆيان). . .

ان ضمير (خۆ) الذى يدل على الذاتية والملكية يلاحظ فى اللهجة الكرمانجية الجنوبية فى الصور التالية:

١ ـ دونما اى زيادة.

٢ ـ ملحق به ضمير متصل واحد من الصنف الاول.

٣ ـ ملحق به ضمير متصل من الصنف الثانى.

٤ ـ ملحق به ضميران متصلان من الصنف الاول.

٥ ـ ملحق به ضمير متصل من الصنف الاول وثان من الصنف الثانى.

٦ ـ عندما يتصل به ضمير متصل يمكن قبول مورفيم (ش / يش) ايضا مع الضمير قبله او بعده.

٧ ـ يلاحظ ضمير (خۆ) مع الفعل فى الصيغ التالية:

أ) عندما يتصل به ضمير من الصنف الاول يمكن ان يكون مع الفعل اللازم او المتعدي.

ب) عندما يتصل به ضميران من الصنف الاول يجب ان يكون مع الفعل المتعدي ولا يأتى مع الفعل اللازم.

ح) اذا اتصل به ضمير من الصنف الثانى اوضمير من الصنف الاول وآخر بعده من الصنف الثاني، لاياتى معه اي فعل متعديا كان او لازما.

٨ ـ يمكن لضمير (خۆ) ان يكون جزءا مهما من الكلمة المركبة.

٩ ـ يشاهد ضمير (خۆ) فى النصوص القديمة والحديثة كما يشاهد مستقلا او جزءا من كلمة مركبة فى صيغة (خود).

الضمير التوكيدي فى اللهجة الكرمانجية الجنوبية والشمالية محايد من حيث الجنس والعدد والوضع.

اتى الباحث بنماذج عديدة من الفولكلور والادب الكردي المدون من مناطق مختلفة من كردستان لاثبات وجهة نظره.

# دەوری پیتە بزوێنی «ە» لە زمانی کوردی دا

● نوری عەلی ئەمین ●

ئەم پیتـە ـ وەك لەمـەولا دەبینین ـ دەورێکی گرنگ و بەسوود لە زمانی کوردیدا دەبینێو دەتوانرێ بە یاریدەی ئەم پیتەوە زۆر وشەی نوێو زاراوەی نوێ دروست بکرێتو بخریتە سەر گەنجینەی زمانی کوردی.

ئەوا یەکـەیەکەش لەم دەورانـە دەدوێم، کە ئەم پیتـە بزوێنە لە زمانی کوردیدا دەیبینێ:

## ١ ـ دەوری بزوێن:

بزوێنەکانی (ۆ، و، وو، ا، ی، ێ، وێ. .) چ دەورێ دەبینن لە دارشتنی وشـەدا ئەمیش هەمـان دەور دەبینێ لە دارشتنی وشەو برگەدا، بۆ وینە:

**بە پێکەنینی زاڵم باوەڕ مەکە.**

لەم گوتنەدا، پێنج جار چاومان بە بزوێنی (ە) دەکەوێت:

ـ لە وشەی (بە)دا، لەم وشەیەدا پیتە نەبزوێنی (ب) بە یاریدەی بزوێنی (ە) توانیویەتی وشەی (بە) کە لەیەك برگە پێك هاتووە، دابرێژێ.

ـ لە وشـەی (پێکـەنین)دا، پیتی (کـ)ی نەبـزوێن توانیـویـەتی بە یاریـدەی بزوێنی (ە) برگـەی (کـە) لە وشەکەدا، دابرێژێ.

ـ لە وشەی (باوەڕ)دا، پیتە نەبزوێنی (و) توانیویەتی بە یاریدەی پیتە بزوێنی (ە) برگەی (وەڕ) لە وشەکەدا، دابرێژێ.

ـ لە وشەی (مەکە)دا:

أ ـ پیتـە نەبـزوێنی (م) توانیـویـەتی بە یاریدەی بزوێنی (ە) برگەی (مە) لە وشەی (مەکە)دا، دابرێژێ.

ب ـ پیتە نەبزوێنی (کـ) توانیویەتی بە یاریدەی بزوێنی (ە) برگەی (کە) لە وشەی (مەکە)دا، دابرێژێ.

## ٢ ـ دەوری پاشگر:

ئەم بزوێنـە (ە) وەك پاشگـر بەکـار دەهێـنرێ، دەخرێتە تەك وشەیێکیتر، بە هەردووکیان وشـەیێکی نوێ بۆ واتاو، مەبەستێکی نوێ پێك دەهێنن (دادەرێژن).

١ ـ لەگەڵ ناوی سادەدا، ناوی درێژ و پێك دەهێنێ، وەك:

ئاگر + ە ← ئاگرە
خشت + ە ← خشتە
گورز + ە ← گورزە
مشت + ە ← مشتە
رست + ە ← رستە
دەست + ە ← دەستە
خەڵوز + ە ← خەڵوزە
پشتێن + ە ← پشتێنە
خەرمان + ە ← خەرمانە

٢ ـ لەتەك ئاوەڵناوی سادەدا، ناوی دارێژاو پێك دەهێنێ، وەك:

ڕاست + ە ← ڕاستە
سەوز + ە ← سەوزە
چەوت + ە ← چەوتە
خراپ + ە ← خراپە
چاك + ە ← چاكە
حەوت + ە ← حەوتە
تەڕ + ە ← تەڕە
چل + ە ← چلە (چلەی زستان)

٣ ـ لەگەڵ ئاوەڵفرمانی سادەدا، ناوی دارێژاو دروست دەكات، وەك:

هاوین + ە ← هاوینە
زستان + ە ← زستانە
بەهار + ە ← بەهارە
شەو + ە ← شەوە
پشت + ە ← پشتە
سەر + ە ← سەرە (ئافرەتی سەرە).

٤ ـ لەبەل ڕەگی فرمانی سادەدا، ناوی دارێژاو دروست دەكات، وەك:

| چاوگ | ڕەگ | ناوی دارێژاو |
|---|---|---|
| پژمین | پژم | پژم + ە ← پژمە |
| پرسین | پرس | پرس + ە ← پرسە |
| كۆكین | كۆك | كۆك + ە ← كۆكە |
| ڕژان | (ڕژ - ڕێژ) | ڕێژ + ە ← ڕێژە |
| تەقین | تەق | تەق + ە ← تەقە |
| لەرزین | لەرز | لەرز + ە ← لەرزە |
| لەرین | لەر | لەر + ە ← لەرە |
| جووڵان | جووڵ | جووڵ + ە ← جووڵە |
| دزین | دز | دز + ە ← دزە |
| گوتن | گوت | گوت + ە ← گوتە |
| گیران | گیر | گیر + ە ← گیرە |

٥ ـ لەگەڵ قەدی فرمانی سادە، یان ناسادە ئاوەڵناوی بەركاری دارێژاو، پێك دەهێنێ:

| چاووگ | قەد | ئاوەڵناوی بەركاری دارێژاو |
|---|---|---|
| كوشتن | كوشت | كوشت + ە ← كوشتە |
| بەستن | بەست | بەست + ە ← بەستە |
| گەستن | گەست | گەست + ە ← گەستە |
| سپاردن | سپارد | سپارد + ە ← سپاردە |
| بژاردن | بژارد | بژارد + ە ← بژاردە |
| بواردن | بوارد | بوارد + ە ← بواردە |
| پەستاوتن | پەستاوت | پەستاوت + ە ← پەستاوتە |
| قەڵاشتن | قەڵاشت | قەڵاشت + ە ← قەڵاشتە |
| دابەستن | دابەست | دابەست + ە ← دابەستە |

٦ ـ لەتەك قەدی فرمانی سادەدا، ئاوەڵناوی كارای دارێژاو، پێك دەهێنێ، وەك:

| چاوگ | قەد | ئاوەڵناوی کارای دارِژاو |
| --- | --- | --- |
| خواردن | خوارد | خوارد + ە ← خواردە |
| دیتن | دیت | دیت + ە ← دیتە |
| بوون | بوو | بوو + ە ← بووە |

١ ـ رەگـەڵ رەگ، یان قەدی فرمـانـی ناسـادە (لێکدراو)دا، ناوی ناسادەی لێکدراو دادەرِێژێ، وەك:

× کلك هەڵ سەنگاندن (چاوگی ناسادە).

کلك هەڵ سەنگێن (قەدی فرمانی ناسادە)

کلك هەڵ سەنگێن + ە ← کلك هەڵ سەنگێنە

× (گۆرِهەڵ کەندن)(چاوگی ناسادە)

گۆرِ هەڵ کەند (قەدی فرمانی ناسادە)

گۆرِ هەڵ کەند + ە ← گۆرِهەڵ کەندە[1]

× مەشکە درِان (چاوگی ناسادە)

مەشکەدرِ (رەگی فرمانی ناسادە)

مەشکەدرِ + ە ← مەشکەدرِە

× کەرخنکاندن (چاوگی ناسادە).

کەرخنکان (رەگی فرمانی ناسادە).

کەرخنکێن (رەگی فرمانی ناسادە).

کەرخنکێن + ە ← کەرخنکێنە

× دۆشاومژین (چاوگی ناسادە).

دۆشاومژ (رەگی فرمانی ناسادە).

دۆشاومژ + ە ← دۆشاومژە

٣ ـ دەوری گونجاندن:

ئەم بزوێنە (ە) دەوری بەستن و گونجاندن و یەك خستن دەبینێ لە نێوان وشەیێك و پاشگرێك دا، وەك:

وشەی (پەستەك). ئەم وشەیە:

ـ لە قەدی فرمانی (پەست)

ـ لە پاشگری (ك)

ـ پیتەبزوێنی (ە) خراوەتە نێوانیان پێکیەوە گونجاندوون و بە هەرسێکیـان وشـەی (پـەسـتـەك)یـان، دارِشتـوەوە. لەو پاشگرانەی کە بە یاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە وشەی دارِژاو پێك دەهێنن، ئەمانەن:

١ ـ پاشگری (ك):

ئەم پاشکرە، ئەگەر:

أ ـ خرایـە تەك ناوێکی سادە بەیـاریـدەی پیتـەبـزوێنی (ە)وە، وشەیێکی دارِژاوی نوێ پێك دەهێنێت، وەك:

دەست + ە + ك ← دەستەك

کەشك + ە + ك ← کەشکەك

چەم + ە + ك ← چەمەك[2]

خشت + ە + ك ← خشتەك

هێڵ + ە + ك ← هێڵەك

کۆم + ە + ك ← کۆمەك

ب ـ خرایـە تەك رەگی فرمـان بەیـاریـدەی پیتـەبزوێنی (ە)وە، وشەیێکی دارِژاوی نوێ سازدەدات، وەك:

| چاوگ | رەگ | ناوی دارِژاو |
| --- | --- | --- |
| رِووان | رِوو | روو + ە + ك ← رِووەك |
| پەستان | پەست | پەست + ە + ك ← پەستەك |
| نووسان | نووس | نووس + ە + ك ← نووسەك |
| گەستن | گەز | گەز + ە + ك ← گەزەك |
| گیران | گیر | گیر + ە + ك ← گیرەك |
| کوتان | کوت | کوت + ە + ك ← کوتەك |

جـ ـ خرایە تەك ئاوەڵناوی سادە بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە وشەیێکی دارِژاوی نوێ سازدەدات، وەك:

بەرز    بەرز + ە + ك ← بەرزەك

چەپ    چەپ + ە + ك ← چەپەك

چەوت    چەوت + ە + ك ← چەوتەك

٢ ـ پاشگری (وان):

ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە تەك ناوێ بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە وشەیەكی دارژاو بۆ واتاو مەبەستێكی نوێ پێك دەهێنێ، وەك:

**باخ + ە + وان ← باخەوان**

**شاخ + ە + وان ← شاخەوان**

**دار + ە + وان ← دارەوان**

**پاس + ە + وان ← پاسەوان**

**نێچیر + ە + وان ← نێچیرەوان**

**دەسك + ە + وان ← دەسكەوان**

**ئاش + ە + وان ← ئاشەوان**

٣ ـ پاشگری (وا):

ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە تەك ناوێ، دەتوانێت بە یاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیەكی نوێی دارژاو بۆ واتاو مەبەستێكی نوێ سازبدات. دەشێت وشە نوێیەكە:

أ ـ ناوی كارا ببەخشێت، وەك:

**نان + ە + وا ← نانەوا**

**پێش + ە + وا ← پێشەوا**

ب ـ ناوی ئاسایی ببەخشێت، وەك:

**ئارد + ە + وا ← ئاردەوا**

**شیر + ە + وا ← شیرەوا**

٤ ـ پاشگری (ڵان):

ئەم پاشگرە دیسان بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، دەتوانێت لەتەك ناوێ، یان ئاوەڵناوێك دا، وشەیەكی نوێ بۆ واتاو مەبەستێكی نوێ پێك بهێنێت، وەك:

**نەرم + ە + ڵان ← نەرمەڵان**

**سەوز + ە + ڵان ← سەوزەڵان**

**بەرد + ە + ڵان ← بەردەڵان**

**قامیش + ە + ڵان ← قامیشەڵان**

**تێبینی:**

ئەگەر وشەكە كۆتایی بە پیتەبزوێنی (ە) هاتبوو، پێویستی بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە) نییەو خۆی دەتوانێت كارەكە ئەنجام بدات، وەك:

**كوندە + ڵان ← كوندەڵان**

٥ ـ پاشگری (ن):

ئەم پاشگرە بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، دەتوانێت لەتەك وشەیەكی سادەدا، وشەیەكی دارژاو پێك بهێنێ بۆ مەبەست و واتایێكی‌تر، وەك:

**رێژ + ە + ن ← رێژەن**

**رەق + ە + ن ← رەقەن**

**رووت + ە + ن ← رووتەن**

**گێژ + ە + ن ← گێژەن**

٦ ـ پاشگری (م ـ مین):

ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە تەك ئاوەڵناوی ژمارەیی و كۆتایی ئاوەڵناوەكە بە پیتەنەبزوێن هاتبوو، بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، ئاوەڵناوە ژمارەیی‌یەكە دەكات بە ئاوەڵناوی ریزێن، واتە (تەرتیبی)، وەك:

× **حەوت + ە + م ← حەوتەم**

**حەوت + ە + مین ← حەوتەمین**

× **چوار + ە + م ← چوارەم**

**چوار + ە + مین ← چوارەمین**

× **شەش + ە + م ← شەشەم**

**شەش + ە + مین ← شەشەمین**

بەڵام ئەگەر ئاوەڵناوە ژمارەییەكە كۆتایی بە پیتەبزوێن هاتبوو، لەم بارەدا دەبێت پیتە گونجاندنی (ی) بە دوای ئاوەڵناوە ژمارەیی‌یەكەدا بهێنرێت، ئەوجا پیتەبزوێنی (ە)

لەدوای ئەمیشەوە، پاشگری (م - مین)، وەك:

× سێ + ی + ە + م ← سێیەم

سێ + ی + ە + مین ← سێیەمین

× دە + ی + ە + م ← دەیەم

دە + ی + ە + مین ← دەیەمین

× نۆ + ی + ە + م ← نۆیەم

نۆ + ی + ە + مین ← نۆیەمین

**٧ - پاشگری (ڵ):**

ئەم پاشگرە دەخرێتە تەك وشەیێكی‌تر، بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێكی تازە كوورە (دارِژاو) بۆ واتاو مەبەستێكی نوێ ئەنجام دەدات، وەك:

**خشت + ە + ڵ ← خشتەڵ**

**فش + ە + ڵ ← فشەڵ**

**كۆم + ە + ڵ ← كۆمەڵ**

**پاش + ە + ڵ ← پاشەڵ**

**پێش + ە + ڵ ← پێشەڵ**

**٨ - پاشگری (ڵە):**

ئەم پاشگرە كە لە پاشگری (ڵ)و پاشگری (ە) پێك هاتووە، ئەگەر خرایە تەك ناوێ، یان ئاوەڵناوێ بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێكی نوێی دارِژاو بۆ واتاو مەبەستێكی تازە پێك دەهێنێ، وەك:

**أ - لەگەڵ ناودا:**

**كۆم + ە + ڵە ← كۆمەڵە**

**خشت + ە + ڵە ← خشتەڵە**

**تووت + ە + ڵە ← تووتەڵە**

**ب - لەتەك ئاوەڵناودا:**

**قنج + ە + ڵە ← قنجەڵە**

**نەرم + ە + ڵە ← نەرمەڵە**

**رِووت + ە + ڵە ← رِووتەڵە**

**سەوز + ە + ڵە ← سەوزەڵە**

**٩ - پاشگری (وەر):**

ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە تەك وشەیێكی‌تر بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێكی نوێ بۆ واتاو مەبەستێكی نوێ پێك دێ، وەك:

**بەخت + ە + وەر ← بەختەوەر**

**دەم + ە + وەر ← دەمەوەر**

**بیر + ە + وەر ← بیرەوەر**

**كوێر + ە + وەر ← كوێرەوەر**

**١٠ - پاشگری (وەری):**

ئەم پاشگرە ناسادەیە، واتە لە پاشگری (وەر)و پاشگری (ی) پێك هاتووە، ئەگەر خرایە تەك وشەیێكی‌دی، بە هەموویان وشەیێكی دارِژاوی نوێ لە واتاو رِووخساردا پێك دەهێنن، وەك:

**بەخت + ە + وەری ← بەختەوەری**

**دەم + ە + وەری ← دەمەوەری**

**بیر + ە + وەری ← بیرەوەری**

**كوێر + ە + وەری ← كوێرەوەری**

**١١ - پاشگری (وار):**

ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە دوای وشەیێك، بەیارمەتی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێكی نوێی دارِژاو [illegible] واتاو مەبەستێكی جوێ لە وشە بنەرەتیەكە، وەك:

**شوێن + ە + وار ← شوێنەوار**

**دێرین + ە + وار ← دێرینەوار**

**خوێند + ە + وار ← خوێندەوار**

**كۆڵ + ە + وار ← كۆڵەوار**

**١٢ - پاشگری (واری):**

ئەم پاشگرە ناسادەیە، واتە لە پاشگری (وار)و پاشگری (ی) پێك هاتووە، ئەگەر هاتوو خرایە تەك وشەیێكی‌تر بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێكی نوێ [illegible]

مەبەستێکی دی سازدەدات، وەك:
**کورد + ە + واری ← کوردەواری**
**خوێند + ە + واری ← خوێندەواری**
**کۆڵ + ە + واری ← کۆڵەواری**

**١٣ - پاشگری (کی):**
ئەم پاشگـرەش ناسـادەیـە، واتـە لە پاشگـری (ك)و پاشگری (ی) پێك هاتووە، ئەگەر خرایە تەك وشەیێکیدی بەیـاریـدەی پیتـەبـزوێنی (ە)وە، وشـەیێکی دارِژاوی نوێ پێـك دێت بۆ واتـاو مەبـەستێکی جوێ لە واتـاو مەبـەستـە بنجییەکەی، وەك:
**خێڵ + ە + کی ← خێڵەکی**
**دەشت + ە + کی ← دەشتەکی**
**پێش + ە + کی ← پێشەکی**
**سەر + ە + کی ← سەرەکی**
**شەو + ە + کی ← شەوەکی**

**١٤ - پاشگری (تی):**
ئەم پاشگـرە ئەگـەر خرایـە تەك وشـەیێکیتر بە یاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، وشەیێکی دارِژاوی تازە پێك دەهێنێت، وەك:
**پیاو + ە + تی ← پیاوەتی**
**خۆشناو + ە + تی ← خۆشناوەتی**

بەڵام ئەگـەر وشـەکـە کۆتـایی بە پیتەبزوێن هاتبوو، لەو بارەدا دەشێت پیتی (ی) گونجـانـدن بەدوای وشـەکـەدا بهێنرێ، ئەوجـا پیتـەبـزوێنی (ە)، دوای ئەویش پاشگری (ەتی)، وەك:
**برا + ی + ە + تی ← برایەتی**
**درِندە + ی + ە + تی ← درِەندەیەتی**
**ئاغا + ی + ە + تی ← ئاغایەتی**
**ئازا + ی + ە + تی ← ئازایەتی**

**١٥ - پاشگری (مەنی):**
ئەم پاشگرە ئەگەر خرایە تەك وشەیێك، بەیاریدەی پیتە بزوێنی (ە)وە، وشەیێکی نوێ بۆ واتاییکی نوێ پێك دێت، وەك:
**سارد + ە + مەنی ← ساردەمەنی**
**خواست + ە + مەنی ← خواستەمەنی**
**خوارد + ە + مەنی ← خواردەمەنی**
**سووت + ە + مەنی ← سووتەمەنی**
**مزر + ە + مەنی ← مزرەمەنی**
**چاپ + ە + مەنی ← چاپەمەنی**

بەڵام ئەگـەر وشـەکـە، خۆی کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ە) هاتبوو، پێویستی بە یاریدەی پیتەبزوێنی (ە) نییە، وەك:
**تەقە + مەنی ← تەقەمەنی**

**١٦ - پاشگری (ر):**
ئەم پاشگـرە ئەگـەر خرایـە تەك رەگی فرمـانی سادەی تێپەر، بە یاریدەی پیتەبزوێنی (ە)وە، ناوی کارای دارِژاو پێك دەهێنێ، وەك:

| چاوگ | رەگ | کارای دارِژاو |
| --- | --- | --- |
| نووسین | نووس | نووس + ە + ر ← **نووسەر** |
| **فرۆشتن** | **فرۆش** | **فرۆش + ە + ر ← فرۆشەر** |
| **چاندن** | **چێن** | **چێن + ە + ر ← چێنەر** |
| **ناردن** | **نێر** | **نێر + ە + ر ← نێرەر** |
| **بەخشین** | **بەخش** | **بەخش + ە + ر ← بەخشەر** |
| **پێوان** | **پێو** | **پێو + ە + ر ← پێوەر** |

**١٧ - پاشگری (وە):**
**ئەم پاشگرە:**
**أ - ئەگەر خرایە تەك ناوێ، یان چاوگێ، کە کۆتاییيان**

به پیتـهٔ نەبـزوێن هاتبـوو، ئەوا دەبێت پیتـە بزوێنی (ە) بخرێتە دوای ناوەکە، یان چاوگەکە، واتە بەیاریدەی پیتە بزوێنی (ە)ەوە دەتوانن کارەکەی خۆیان ئەنجام بدەن، وەك:

ـ وێنە بۆ چاوگە:

هاتن + ە + وە ← هاتنەوە

شاردن + ە + وە ← شاردنەوە

کردن + ە + وە ← کردنەوە

کولان + ە + وە ← کولانەوە

خواردن + ە + وە ← خواردنەوە

پلیشان + ە + وە ← پلیشانەوە

ڕشان + ە + وە ← ڕشانەوە

گەشان + ە + وە ← گەشانەوە

ـ وێنە بۆ ناو:

لە شارەوە (لە ـ شار + ە + وە)

لە خوارەوە (لە ـ خوار ـ ە + وە)

بە بەرگەوە (بە ـ بەرگ + ە + وە)

بە ڕەگەوە (بە ـ ڕەگ + ە + وە)

ب ـ ئەگـەر خرایـە تەك فرمـانێـك و فرمـانـەکـە کۆتایی بە پیتـەنـەبـزوێن هاتبوو، ئەم کارە بەیاریدەی پیتەبزوێنی (ە) پێك دێت، وەك:

هات    هات + ە + وە ← هاتەوە

نیشت   نیشت + ە + وە ← نیشتەوە

خوارد   خوارد + ە + وە ← خواردەوە

کرد    کرد + ە + وە ← کردەوە

هێشت   هێشت + ە + وە ← هێشتەوە

بەڵام ئەگەر:

ـ فرمانەکە کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ا) یان (ی) هاتبوو، لە پێشـا پیتـە گونجـانـدنی (ی) دەخـەینـە دوای فرمانەکە، ئەوجـا پیتـەبـزوێنی (ە)ی بەدوادا دەهێنین، پاش ئەوانیش پاشگری (وە)، وەك:

× وێنە بۆ پیتەبزوێنی (ا):

کێڵا (کێڵا + ی + ە + وە ← کێڵایەوە)

گریا (گریا + ی +ە + وە ← گریایەوە)

شێلرا (شێلرا + ی + ە + وە ← شێلرایەوە)

سووتا (سووتا + ی + ە + وە ← سووتایەوە)

× وێنەی بۆ پیتەبزوێنی (ی)، وەك:

نووسی (نووسی + ی + ە + وە ← نووسی‌یەوە)

چاندی (چاندی + ی + ە + وە ← چاندی‌یەوە)

فری (فری + ی + ە + وە ← فری‌یەوە)

کری (کری + ی + ە + وە ← کری‌یەوە)

ـ ئەگەر فرمانەکە، ڕابوردووی تەواوبوو، لەم بارەدا:

× پیتە بزوێنی (وو)ی نیشانەی پارتیسب دەگۆڕین بە (ۆ)

× پیتە گونجاندنی (ن) دەخەینە دوای پارتیسپی (ۆ)وە

× ئەنـجـا پیتـەبـزوێنی (ە)ی یاریـدەدەر بە دوای پیتـە گونجاندنی (ت)دا، دەهێنین.

× لەپاشا پاشگری (وە) دەخەینە سەری، وەك:

گرتوو (گرتۆ + ت + ە + وە ← گرتۆتەوە)

خواردوو (خواردۆ + ت + ە + وە ← خواردۆتەوە)

چاندوو (چاندۆ + ت + ە + وە ← چاندۆتەوە)

نووستوو (نووستۆ + ت + ە + وە ← نورستۆتەوە)

جـ ـ ئەگـەر پاشگـری (وە) خرایـە تەك ئامـرازی پەیوەندی ناسـادەوە، بەیـاریـدەی پیتـەبزوێنی (ە)وە، کارەکە ئەنجام دەدرێ، وەك:

× پێك (پێك + ە + وە ← پێکەوە)

× لێك (لێك + ە + وە ← لێکەوە)

× تێك (تێك + ە + وە ← تێکەوە)

بەڵام ئەگەر ئامرازە پەیوەندی‌یەکە سادە بوو، وەك (پێ، تێ، لێ...) بەبێ‌یـاریـدەی پیتـەبـزوێنی (ە) پاشگـری

(وه)ی دەخرێتە سەر، وەك:
**بێ (بێ + وە ← بێوە)**
**تێ (تێ + وە ← تێوە)**
**لێ (لێ + وە ← لێوە)**

**١٧ ـ ئامرازی (کە):**

ئەگەر بمانەوێ ناوێکی نەناسیاو، بکەین بە ناسیاو:

١ ـ ئەگەر ناوە نەناسیاوەکە (نەناسراوەکە) کۆتایی بە پیتە نەبزوێن هاتبوو، ئەوا پیتەبزوێنی (ە) دەخرێتە دوای ناوە نەناسیاوەکەوە، ئەنجا ئامرازەکە، دەخەینە دوای پیتەبزوێنەکەوە، وەك:

**بەروو (بەروو + ە + کە ← بەرووەکە)**
**باخ (باخ + ە + کە ← باخەکە)**
**بەفر (بەفر + ە + کە ← بەفرەکە)**
**هەویر (هەویر + ە + کە ← هەویرەکە)**
**باڵباز (باڵباز + ە + کە ← باڵبازەکە)**
**گەرێن (گەرێن + ە + کە ← گەرێنەکە)**
**دەمەداس (دەمەداس + ە + کە ← دەمەداسەکە)**
**دارسێو (دارسێو + ە + کە ← دارسێوەکە)**

ب ـ ئەگەر ناوە نەناسیاوەکە کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ێ) یان (ی) هاتبوو، لەم بارەدا پیتەگونجاندنی (ی) دەخرێتە دوای ناوەکە ئەوجا پیتەبزوێنی (ە)و لەپاشا ئامرازی (کە) پێ‌ناسین. . .

**ـ وێنە بۆ (ێ):**
**رێ (رێ + ی + ە + کە ← رێیەکە)**
**لادێ (لادێ + ی + ە + کە ← لادێیەکە)**
**تەشوێ (تەشوێ + ی + ە + کە ← تەشوێیەکە)**
**هەرمێ (هەرمێ + ی + ە + کە ← هەرمێیەکە)**
**ـ وێنە بۆ (ی):**
**رێوی + ی + ە + کە ← رێوییەکە)**
**مراوی (مراوی + ی + ە + کە ← مراوییەکە)**
**ماسی (ماسی + ی + ە + کە ← ماسییەکە)**
**کانی (کانی + ی + ە + کە ← کانییەکە)**

حـ ـ ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ا، ۆ، ە) هاتبوو، وە ویسترا بکرێت بە ناسیاو، لەم بارەدا پێویستی بە پیتەبزوێنی (ە) نییە، وەك:

**کەوا (کەوا + کە ← کەواکە)**
**چەقۆ (چەقۆ + کە ← چەقۆکە)**
**پەنجەرە (پەنجەرە + کە ← پەنجەرەکە)**

**٤ ـ دەوری ئامرازی پەیوەندی:**

ئەم پیتە بزوێنە (ە) لە زمانی کوردیدا، دەوری ئامرازی پەیوەندی دەبینێ‌و دەکەوێتە دوای فرمانەوەو لەتەك ناوەکەی دوای خۆیدا دەستەواژەی بەرکاری ناراستەوخۆ پێك دەهێنێ، وەك:

**ـ دەچمە هەولێرێ (دەچم ـ ە ـ هەولێرێ)**
**ـ رێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ (دەگەیشت + ە + ترێ)**
**دەی گوت: ترشە. .**
**ـ کتێبەکەم خستە سەرمێزەکە (خست + ەسەر + مێزەکە)**
**ـ فڕۆکەکە کەوتە خوارێ (کەوت + ە + خوارێ)**
**ـ لە باخەکە هاتە دەرێ (هات + ە + دەرێ)**

**٥ ـ دەوری نیدا:**

پیتەبزوێنی (ە) لە ئاخاوتن دا دەوری ئامرازی دەنگ دان (نیدا) دەبینێ‌و دەکەوێتە دوای دەنگ دراوەکەوە، وەك:

**کورە. . وریا بە نەکەوێتە خوارەوە (کور ـ ە)**
**گیانە. . وەرە لام دڵ بۆت سووتاوە (گیان ـ ە)**
**کوردینە. . بخوێنن (کورد ـ ین ـ ە)**
**سوارە. . وەرە لەم بوارەوە بپەڕێنەوە. (سوار ـ ە)**

٦ ـ دەوری لێکدان لە وشەی نادەدا دەبینێ:

ئەم بزوێنە (ە) دەخرێتە نێوان دوو وشەی سادەوە، هەر دوو وشـەکـە لێـك دەدا، واتـە بە یەکیانـەوە دەبـەستێ و وشەیێکی نوێ پێك دەهێنێت کە لە ڕووخسارو ناوەرۆك دا، لە دوو وشە سادەکە جیاوازە، بۆ وێنە:

گەرد + ە + مل ← گەردەمل

گوڵ + ە + باخ ← گوڵەباخ

بەرد + ە + نوێژ ← بەردەنوێژ

دەم + ە + داس ← دەمەداس

پیر + ە + مێرد ← پیرەمێرد

کوڕ + ە + پان ← کوڕەپان

هەور + ە + تریشقە ← هەورەتریشقە

گیسك + ە + نێر ← گیسکەنێر

وشك + ە + جوو ← وشکەجوو

دەڵ + ە + ورچ ← دەڵەورچ

هەروەها دەخرێتە نێوان دوو ڕەگی فرمانەوە، وشەیێکی نادە پێك دێت، وەك:

تەق + ە + تەق ← تەقەتەق

لەرز + ە + لەرز ← لەرزەلەرز

جووڵ + ە + جووڵ ← جووڵەجووڵ

لوور + ە + لوور ← لوورەلوور

گرم + ە + گرم ← گرمەگرم

هەندێ جار ئەم پیتە (ە) لەتەك ئامرازی (و)ی عەتف دا یەك دەگـرن و پێکـەوە دەکـەونـە نێـوان دوو وشـەی سادەی هاوچـەشنـەوە، بۆ پێـك هێنانی وشەیێکی نادە، کە واتاو مەبەستێکی نوێ پێك دەهێنن، وەك:

شاخ + ەو + شاخ ← شاخەوشاخ

بان + ەو + بان ← بانەوبان

شار + ەو + شار ← شارەوشار

خەرمان + ەو + خەرمان ← خەرمانەوخەرمان

هەروەها دەکەونە نێوان دوو وشەی سادەی ناجۆرەوە، وەك:

دەست + ەو + یەخە ← دەستەویەخە

دەم + ەو + ڕوو ← دەمەوڕوو

بەر ± ەو + ژوور ← بەرەوژوور

دەم + ەو + ئێوارێ ← دەمەوئێوارێ

گۆڕ + ەو + شار ← گۆڕەوشار

سەر + ەو + ژوور ← سەرەوژوو

٧ ـ دەوری پاشبەند لە ئاوەڵناوی نیشانەدا، دەبینێ:

ئەم بزوێنـە (ە) دەبێتـە پاشکـۆی (پاشبەند)ی ئاوەڵناوی نیشانە، وەك:

ئەم ـ هەویر ـ ە ئاو زۆر دەکێشێ.

لەم پەندەدا وەك دەبینین:

ئاوەڵنـاوی (ئـەم)و پاشبـەنـد (ە) واتـە (ئـەم ـــ ە) بە هەردووکیـان ناوی (هـەویـر)یان گرتۆتە نێو خۆیان بۆ ئەوەی دەست نیشـان و دیـاریبکـەن، وەك دەشبینین ئاوەڵنـاوی نیشـانـە (ئـەم) کەوتۆتە سەرەتاوە، ئەنجا ناوە دەست نیشان کراوەکەی بەدوادا هاتووەو لەپاشا بزوێنی (ە)ی پاشبەند.

هەروەها ئاوەڵناوی (ئەو ـــ ە)یش، وەك:

× ئەو ـ چاو ـ ە کوێر بێت، کە خەنیمی خۆی ناناسێت.

× ئەم نانە، بەو ـ ڕۆن ـ ە. ئەنجا.

أ ـ ئەگـەر وشـە دەست نیشـان کراوەکـە کۆتـایی بە پیتـەبـزوێن نەهـاتبـوو، سادەبێت، یان نـادە (دارژاو ـ لێکدراو) پاشبەندی (ە) دەخرێتە کۆتایی وشەکەوە (واتە وشە دەست نیشان کراوەکەوە)، وەك:

ئەم گورگ + ە ← ئەم گورگە (ناوی سادە)

ئەو بەرخ + ە ← ئەو بەرخە (ناوی سادە)

ئەم کوردستان + ← ئەم کوردستانە (ناوی دارژاو)

**ئەو رووەك + ە ← ئەو رووەکە (ناوی دارژاو)**
**ئەم دەمەداس + ە ← ئەم دەمەداسە (لێکدراو)**
**ئەو گوڵەگەنم + ە ← ئەو گوڵەگەنمە (لێکدراو)**

ب ـ ئەگەر ئەو وشە سادە، یان ناسادەیەی کە دەویستری بە یەکێ لە ئاوەڵناوی (ئەم ـــ ە)یان (ئەو ـــ ە) دەست نیشان بکرێت و لە شێوەی (کۆ)دا بوو، وە کۆتایی بە پیتەبزوێن نەهاتبوو، دەبێت پاشبەندی (ە) بخرێتە دوای ئامرازی (کۆ)وە نەك وشە سادەکە یان ناسادەکە، وەك:

**ئەم گوڵ + ان + ە ← ئەم گوڵانە**
**ئەو رووەك + ان + ە ← ئەو رووەکانە**
**ئەم چیرۆك نوس + ان + ە ← ئەم چیرۆك نووسانە**
**ئەو تفەنگ بەدەست + ان + ە ← ئەو تفەنگە بەدەستانە**

حـ ـ ئەگەر ئەو وشەیەی کە دەویستری بە ئاوەڵناوی (ئەم ـ ە) یان (ئەو ـــ ە) دەست نیشان بکرێت، وە وشەکە ـ سادە بێت، یان ناسادە) کۆتایی بە پیتە بزوێنی (ە، ا، ۆ، ی، ێ، وێ) هاتبوو، دەبێت.

ـ پیتە نەبزوێنی (ی) گونجاندن بخرێتە دوای پیتەبزوێنی وشەکە.

ـ پاشبەندی (ە) بخرێتە دوای پیتە نەبزوێنی (ی)، وەك:

**ئەم + پەنجەرە + ی + ە ← ئەم پەنجەرەیە**
**ئەو + رێ + ی + ە ← ئەو رێیە**
**ئەم + خوێ + ی + ە ← ئەم خوێیە**
**ئەو + دەرگا + ی + ە ← ئەو دەرگایە**
**ئەم + کانی + ی + ە ← ئەم کانییە**
**ئەو + چەقۆ + ی + ە ← ئەو چەقۆیە**

هەروەها ئەگەر وشە نیشانەکراوەکانیش ناسادە بوون، وەك:

**ئەم + دەسکەچەقۆ + ی + ە ← ئەم دەسکەچەقۆیە**
**ئەو + بەرەکەوا + ی + ە ← ئەو بەرەکەوایە**
**ئەم + سەبەتەترێ + ی + ە ← ئەم سەبەتەترێیە**
**ئەو + سەرکانی + ی + ە ← ئەو سەرکانییە**
**ئەم + گۆشتەتوێتوێ + ی + ە ← ئەم گۆشتە توێتوێیە**

د ـ ئەگەر وشە دەست نیشان کراوەکە یەکێ لەم وشانە بوو (رۆ، شەو، سەر، لا، بەر، پەر) پاشگری (ە)ی نەگەرەکە، وەك:

× ئەمساڵ ساڵی مەیموونە،
ئەمە هەوڵمانە،
ئاخۆ دواییمان چۆنە. (ئەم ـ ساڵ...)

× ئەمسەر ئەکاو ئەو سەر ئەکا
(ئەم ـ سەر...)
(ئەو ـ سەر...)

× ئەمرۆ هاتم (ئەم ـ رۆ....)
× ئەمشەو باران باری (ئەم ـ شەو...)
× ئەملاو ئەولا دەکات. (ئەم ـ لا ـ ...)
(ئەو ـ لا ـ ...)
× ئەمبەرو ئەو بەر مەکە (ئەم ـ بەر ـ ...)
(ئەو ـ بەر ـ ...)
× یان ئەمپەڕ دەگرێ، یان ئەو پەڕ.
(ئەم ـ پەڕ ـ ...)
(ئەو ـ پەڕ ـ ...)

هـ ـ ئەگەر وشەیێك بە وشەیێکی‌دی تەواوکرا، وەك:

**کۆتری چیا**

لێرەدا ئەگەر ویسترا ناوە تەواوکراوەکە، واتە (کۆتر)ە کە دەست نیشان بکرێت، وشەی کۆتر دەخرێتە نێوان (ئەم... ە) یان (ئەو... ە) لەم بارەدا پاشبەندی (ە) بەدوای وشەی کۆتردا دەهێنرێت و دەڵێین:

**ئەم ـ کۆتر ـ ەی چیا**
**ئەو ـ کۆتر ـ ەی چیا**

بەڵام ئەگەر ویستمان ناوە تەواوکەرەکە، واتە وشەی

**چیا) نیشانە بکەین، لەم بارەدا پاشبەندی (ە) بەدوای وشەی (چیا)دا دەهێنین، وەك:**

**کۆتری (ئەم - چیا - ی + ە) ← چیایە**

**کۆتری (ئەو - چیا + ی + ە) ← چیایە**

**هەروەها:**

ڕێواسی کوێستان

ئەم ڕێواسەی کوێستان

ڕێواسی ئەم کوێستانە

**تێبینی:**

ناوی تەواوکەر، یان تەواوکراو، ئەگەر ناسراوی دیار، یان نادیار بوو، ناتوانرێ بە ئاوەڵناوی (ئەم . . . ە) یان (ئەو. . . ە) نیشانە بکرێت، واتە ناتوانرێت بوترێت:

ئەم کۆترەکەی چیا

کۆتری ئەم چیاکانە

ئەو کۆترێکی چیا

کۆتری - ئەو - چیایێك - ە.

بە واتایێکی ڕوونتر ئاوەڵناوی نیشانەی (ئەم. . . ە)و (ئەو. . ە) تەنیا دەچێتە سەر وشەی نەناسراو (نكرة).

و - ئاوەڵناوی نیشانەی (ئەم)و (ئەو)، وەك:

**ئەم - سوار - ە لەلادێوە هاتووە**

**ئەو - کەو - ە دەقاسپێنێ**

ئەگەر ویستمان لە ڕستەی یەکەم دا ناوە دەست نیشان کراوەکە، کە وشەی (سوار)ە ناونەهێنین، لەم بارەدا پاشبەندی (ە) دەلکێنرێت بە ئاوەڵناوی (ئەم)ەوەو ڕستەکە وەهای لێدێ:

**ئەمە لەلادێوە هاتووە**

هەروەها لە ڕستەی دووەمیش دا، ناوی (کەو) دەست نیشان کراوە، ئەگەر بمانەوێ ناوە دەست نیشان کراوەکە لابەرین، واتە ناوی نەهێنین لەبەر هەر مەبەستێ بێت، ئەو دەمە پاشبەندی (ە) یەکسەر دەلکێنین بە ئاوەڵناوی (ئەو)ەوەو ڕستەکە وەهای لێدێت:

**ئەوە دەقاسپێنێ.**

لەم بارانەدا بە وشەی (ئەمە)و (ئەوە) بە تاك و کۆیانەوە (ئەمانە)و (ئەوانە) دەگوترێت (ڕاناوی نیشانە) چونکە لەبری وشە نیشانە کراوەکە بەکارهاتووە.

ز - تەرکیبی وەسفی ئەگەر ویسترا بە ئاوەڵناوی (ئەم . . ە) یان (ئەو. . . ە) دەست نیشان بکرێت، دەبێت لەپێش دا، تەرکیبەکە بخرێتە شێوەی ناوێکی ناسادە (لێکدراو)ەوە، ئەوجا دەست نیشان بکرێت، بۆ وێنە:

گوڵی سوور

چاوی کاڵ

کەوی گەردن بە خاڵ

سێوی مزر

× لە هەنگاوی یەکەم دا، ئەو تەرکیبانە هەموویان دەخەینە شێوەی وشەیێکی ناسادەوە (لێکدراوەوە):

گوڵەسوور

چاوکاڵ (چاوەکاڵ)

کەوە گەردن بەخاڵ

مزرەسێو

× لە هەنگاوی دووەم دا، ئاوەڵناوی (ئەم) یان (ئەو) دەخەینە بەرایی وشە لێکدراوەکانەوە:

ئەم گوڵە سوور

ئەم چاوکاڵ (چاوەکاڵ)

ئەو کەوەگەردن بەخاڵ

ئەو مزرە سێو

× لە هەنگاوی سێیەم دا، پاشبەندی (ئەم)و (ئەو) کە پیتەبزوێنی (ە)بە دەخەینە کۆتایی وشە لێکدراوەکەوە:

ئەم گوڵە سوورە

ئەم چاوکاڵە (ئەم چاوەکاڵە)

ئەو کەوە گەردن بەخاڵە

ئەو مزرە سێوە

ز - ئەگەر دوو وشەی سادە، یان ناسادە (داڕژاو،

لێکدراو، ئاوێته) یان پتر واوی عەتف لە نێوانیان دا بوو، وە ویستـرا بە ئاوەڵنـاوی (ئـەم. . .ە) یان (ئـەو. . .ە) دەست نیشان بکرێت:

- ئاوەڵناوی (ئەم) یان (ئەو) دەخرێتە بەرایی وشەکە، یان وشەکان، بەڵام پاشبەندی (ە) دەخرێتە دوای ئەو وشەیە، یان وشانەی کە بەدوای واوی عەتفەکەدا دێت، وەك:

گەل و سوپا - ئەم گەل و سوپایە

هێلکەو رۆن - ئەم هێلکەو رۆنە

هەنارو هەرمێو سێو - ئەو هەنارو هەرمێو سێوە

چیاو گردو نەهاڵ - ئەو چیاو گردو نەهاڵە

بەڵام ئەگەر ویسترا هەردوو وشەکەی پێش و پاش واوە عەتفـەکـە دەست نیشـان بکـرێت، لەم بارەدا دەتـوانین پاشبـەنـدی (ە) بەدوای مەعتـوف و مەعتـوف ئیلەیهی‌دا بهێنین، وەك:

ئەم مەڕەو ئەو بزنە

ئەو سوارەو ئەم پیادە

ئەم شارەو ئەو گوندانە

ئەو پیاوەو ئەم ژنە

## ٨ - دەوری ڕاناوی کەسی دووەم:

ئەم بزوێنە (ە) لە فرمانی داخوازی‌دا، دەوری کەسی دووەمی تاك دەبینی، وەك:

**بنووسە (بـ - نووس - ە)**

**بکرە (بـ - کڕ - ە)**

**بفرە (بـ - فڕ - ە)**

**دانیشە (دانیش - ە)**

## ٩ - دەوری فرمانی (بوون):

ئەم بزوێنـە دەوری فرمـانی (بـوون) دەبینی لە ڕستـەی ئیسنـادی‌دا بۆ کەسی سێیـەمی تاك لە دەمی ئەخبـاری حازردا، وەك:

بارام مەردە (مەرد - ە)

ترۆزی‌یەکە تاڵە. (تاڵ - ە)

هەنارەکە ترشە. (ترش - ە)

سەربازەکە ئازایە. (ئازا - ی - ە)

**ئەم فرمانە (ە) لە ڕستەدا:**

- وەك فرمـانێکی ناتـەواو (بێ‌هێـز) بەکـاردەهێنـرێت و ناتـوانێت ببێتـە گوزارە (مسنـد) هەتـا بەیاریدەی وشەیێك. یان چەند وشەیێکی‌ترەوە نەبێت، وەك:

**سێوەکە مزرە.**

**لەم ڕستەیەدا:**

**سێوەکە: کارایە**

**مزرە: گوزارەیە**

**مزر: ئاوەڵناوە**

**ە: فرمـانی بوونی ناتـەواوە. ئەگـەر بەیـاریـدەی ئاوەڵنـاوی (مزر)ەوە نەبوایە نەی‌دەتوانی ببێتە گوزارە.**

کەواتە وشەی (مزر) لێرەدا:

١ - فرمانی (ە) تەواوکردووە

٢ - سیفەتی (مزرێتی) داوەتەپاڵ سێوەکە

**هەروەها:**

باوکم لە شارە (ە)

مەریوان مەردە (ە)

مەهاباد شاری ئازادی‌یە (ە)

بەهار خۆشە (ە)

- دەبـێتـە یاریـدەدەری ڕێـژەی دوولایی (پـارتیسپ PARTICIP) بۆ ئەوەی ببێتـە فرمـانی رابـوردووی تەواو لە شێوەی کەسی سێیەمی تاك دا، وەك:

**نووستن - نووست + وو ← نووستوو + ە**

**بارام نووستووە:**

**چاندن - چاند + وو ← چاندوو + ە**

**تۆوەکەم چاندووە.**

نووسین ـ نووسی + و ← نووسیو + ە
وتارەکەم نووسیوە.

**تێبینی:**

هەنـدێ، پیتـەبـزوێنی (ە) لەم شێوانـەدا بە رانـاوی تێدەگەن، وەك لە گۆڤاری رۆشنبیری ژمارە.(١٠٩) ساڵی ١٩٨٦ لاپەرە (٢٥٥)دا وتوومە باسێکم بە دەستەوەیە لەسەر فرمانی (ە)و پێشگری (هە) لە فرمانی (هەبوون)دا، ئەگەر بتوانم بگەمە ئەنجامێکی باش بڵاوی دەکەمەوە.

**پەراوێزەکان:**

١ ـ گۆرهەڵ کەندە، یان (گۆرهەڵ کەنە) ناوی زیندەوەرێکە لەناو گۆرستانەکان دا دەژی‌و گۆری مردووەکان هەڵ دەکەنێ.

٢ ـ (چەمەك) ناوی گوندێکە لە کوردستان.

٣ ـ هەنـدێ لە پاشگـری (ر)یـان (ەر) دوو دڵن و بە کوردی دانـانێن و دەڵێن لە (ەر)ی ئینگلیـزی‌یـەوە هێنـراوەتـە ناو زمانی کوردی‌یەوە، دەڵێن لەبـری (ەر) پاشگـری (یار) بەکاربهێنرێ، وەك:

| | |
|---|---|
| نووسین | نووس نووس + یار ← نووسیار |
| فرۆشتن | فرۆش فرۆش + یار ← فرۆشیار |
| کرین | کر کر + یار ← کریار |
| جووت | جووت + یار ← جووتیار |
| کشت | کشت + یار ← کشتیار |

★ ★ ★

**سەرچاوەکان:**


١ ـ مختصری صرف و نحوی کوردی ـ سعید صدقی ـ بەغـ ـ ١٩٢٨ ـ

٢ ـ دەستووری زمانی کوردی ـ توفیق وەهبی ـ جزمی یەکەم ـ ١٩٢٩ بەغداد ـ ١٩٥٨.

٣ ـ گرتنی کەلێنێکی‌تـر لە رێـزمـانی کوردی ـ نوری عەلی ـ ئەمین ـ ١٩٥٨.

٤ ـ رێزمانی ئاخاوتنی کوردی لە چاپ کراوەکانی کۆری زانیاری کورد ـ ١٩٧٦.

٥ ـ پەندی پێشینان شێخ محمدی خاڵ ـ چاپخانەی مەعاریف ـ بەغداد ـ ١٩٥٧م.

٦ ـ رێـزمـانی کوردی ـ د. نسـرین فخـری و د. کوردستـان موکریانی ـ زانکۆی سەلاحەددین ١٩٨٢.

# دور حرف العلة (ە) في اللغة الكردية

نوري علي أمين

**يتناول البحث اهمية وفائدة هذا الحرف في اللغة الكردية، حيث يمكن بوساطته تكوين واستحداث عدد كبير من المفردات والمصطلحات الجديدة واضافتها الى دخيرة اللغة الكردية.**

يلقي الباحث الضوء على الادوار التي يؤديها الحرف المذكور في اللغة الكردية، وبقدر ماتلعب حروف العلة
ۆ، و، وو، ا، ی، ێ، وێ»
دوراً هاماً في صياغة اللغة، فان هذا الحرف ايضاً يلعب ذات الدور ويضرب مثالاً واضحاً على مايذهب اليه ويوضحه بشكل معضل، ثم ينتقل الباحث الى الدور يؤويه كاللاحقة حيث عن طريق وصفه الى جانب مفردة اخرى تتكون مفردة جديدة تستخدم لمعنى وغرض جديدين، اي ان تلك المفردة الجديدة تأخذ بعداً اخر من حيث معناها وغرضها.

وان هذا الحرف يستخدم كاللاحقة مع الاسم البسيط والى جانب الصفة البسيطة، ومع الظرف البسيط يكون اسماً مشتقاً وبالاضافة الى ذلك يستخدم مع جذر الفعل البسيط ومع جذع الفعل البسيط وغير البسيط الى جانب جذع الفعل وفي تلك الاحوال يكون مع المفردات التي يلتصق بها مفردات جديدة. وبعد ذلك ينتقل الباحث الى دور في الرابطة والتوحيد بين مفردة ولاحقة حيث تتكون كلمات مشتقة ويأتي بامثلة عديدة ويتحدث باسهاب عن دور، في لاحقة (ك) و(وان) و (وا) و(لان) و(ن) و (م - مين) و (ڵ) و (ڵه) و(وەن) و (ر) و (وه) والاداة (كه) حيث يشفع مايذهب اليه بامثلة متعددة ويوضح كل الجوانب التي يتناولها. وفيما يتعلق بالاداة (كه) يقسمها الى أ، ب، ج ثم يقف على دور هذا الحرف في اداة الربط ودوره في (نيدا) ودوره في التركيب في المفردة غير البسيطة، ويقوم ايضاً بدور ملحق صفة لاشارة، ثم يشرح دوره في المخاطب بنوعية في فعل الطلب، كما انه يلعب دور فعل الكينونة في الجملة الاسنادية.

واخيراً فان الباحث يولي اهتماماً كبيراً بدور الحرف المذكور، ويبدي في سياق بحثه جملة من الملاحظات حوله في دوره البارز في اللغة الكردية وما تطرأ عليها من تطورات في استحداث مفردات ومصطلحات عديدة تغني اللغة الكردية بثروة لغوية هائلة.

# بیناغەی سادەترین رستەی کوردی



د. وریا عمر امین
کولێجی پەروەردە - زانکۆی بەغدا

ڕستە گەورەترین دانەی (ڕێزمانی)ی زمانە. ئامانجی هەرە سەرەکیی ڕێزمان پێناسینی رستەیە ڕستەش پێ ناناسرێت بێ پێناسین و دەست نیشان کردنی سروشت و چۆنیەتیی هەموو ئەو کەرەسانەی دروستی دەکەن و جۆری پەیوەندیی نێوانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا.

سادەترین کەرەسەکانی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. گەورەترین و ئاڵۆزترین دانەی (ڕێزمانی)ش ڕستەیە. پەیوەندیی نێوان دەنگ و ڕستە لەسەر پەیڕەوێکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.




واتا ـ بە هۆی ئەو نرخانەی تاکە دەنگەکانی زمان لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتی‌دا پێشانی دەدەن فۆنیمەکانی زمانەکە دەست نیشان دەکرێن.

لەناو قاڵبی برگەکان دا بە فۆنیمێ یا زیاتر مۆرفیم پێك دێت.

بەمۆرفیمێ یا زیاتر وشە پێك دێت.

بە وشەیێ یا زیاتر فرێز پێك دێت.

چەن فرێزێکیش ڕستەپێك دەهێنن.[1]

دەست نیشان کردنی سروشت و چۆنیەتی پێك هاتنی ئەم کەرەسانە (دەنگ ـ فۆنیم ـ برگە ـ مۆرفیم ـ وشە ـ فرێز)و چۆنیەتی‌لەیەك دانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا ڕێزمانی زمانەکەیە.

ئەم باسە سینتاکسی‌یە. دانەی سەرەکیی (سینتاکسی)یش وشەیە. بۆیە توخون دەنگ و فۆنیم و برگەو مۆرفیم ناکەوین.[2]

ڕستە لە هەر زمانێك دا لە چەند بەشێکی بنجی (ڕیشە) پێك دێت. هەر دانەیێکی ڕێزمانی بتوانێ دەوری بەشێکی بنجی‌ی ڕستە بگێڕێ (فرێز)ێك پێك دەهێنێ.

سادەترین ڕستە لە دوو فرێز پێك دێت:

١ ـ فرێزی ناوی Noun phrase (ف. ن بۆکورت کردنەوە)

٢ ـ فرێزی فرمانی verb phrase (ف. ف)

ریزبوونیان لە ڕستەی زمانی کوردی‌دا بەم جۆرەیە:



سادەترین فرێزی ناوی لە ناوێك (یا ڕاناوێك) پێك دێت.

سادەترین فرێزی فرمانی لە زمانی کوردیدا لە ڕەگی فرمان و ڕاناوێکی لکاو پێك دێت، ئەرکی ڕاناوی لکاو دەربڕینی ڕێکەوتنە لە نێوان بکەرو فرمان دا.[3]

ئەم وێنەیە بیناغەی سادەترین ڕستەی زمانی کوردی ڕوون دەکاتەوە.




بە دەست نیشان کردنی یاساکانی دارشتنی (فرێزی ناوی)و (فرێزی فرمانی) ڕێزمانی سادەترین ڕستەی کوردی دەست نیشان دەکرێ.

**١ - فرێزی ناوی**

فرێزی ناوی لە ناوێ یا زیاتر پێك دێت. (کە دەڵێین زیاتر واتا ژمارەیێکی بێ کۆتایی)

**ف.ن ← ناو + ناو ...... ∞**

**یاساژ (1)**

ئەم ناوانە بە (و) یا (ی) لەیەك دەدرێن. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە لە یەك دانە لەوەدایە، ئەو ناوانەی بە (و) لەیەك دەدرێن هەموو بەشداری لە ڕووداوی فرمانەکە دەکەن بە پێی ئەوئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێیان سپێراوە. وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

**أ - ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... هاتن**

**ب - من ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... دەبینم**

**جـ - من نامە بۆ ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ دەنێرم.**

ئەم چوار ناوە (**ئازاد - ڕزگار - ئاواز - ئاهەنگ**) بە ئامرازی (و) لەیەك دراون. لە (أ)دا دەوری بکەریی ڕستەکە دەبینن، هەر چواریان لە (هاتن)دا بەشدارن.

لە (ب)دا دەوری بەکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەبینن. هەر چواریان بەشدارن لەوەی کە دەبینرێن.

لە (حـ)دا دەوری بەکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن، هەر چواریان بەشدارن لەوەی نامەیان بۆ دەنێررێ.

لەلایەکی ترەوە ئەو ناوانەی بە (ی) لەیەك دەدرێن پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا لەسەر بیناغەی (هەیی) Possessive دایە. تەنیا ناوی یەکەم ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێراوە بەجێ دەهێنێ. ئەم ناوەش سەر بە ناوی دووەم دەبێ و ناوی دووەم سەر بە هی سێیەم دەبێ و سێیەم سەر بەچوارەم و بەم جۆرە. وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ

**د - برای دەزگیرانی کچی پوورم هات.**

**هـ - من برای دەزگیرانی کچی پوورم دەناسم.**

**و - من نامە بۆ برای دەزگیرانی کچی پوورم دەنێرم.**

لەم ڕستانەدا (**برا - دەزگیران - کچ - پوور**) هەموو ناون بە ئامرازی بەستن (ی) لەیەك دراون لە (ء)دا دەوری بکەری و لە (هـ)دا دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ و لە (و)دا دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن. لە هەر سێ حاڵەت دا تەنیا (برا)یە ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لە ناو چوارچێوەی ڕستەکان دا پێی سپێراوە، بەجێ

دەهێنێ تەنیا (برا)یە لە (ء)دا هاتووەو لە (هـ)دا ناسراوەو لە (و)دا نامـەی بۆ دەنێـررێ. ئەم (بـرا)یـە هی (دەزگیران)ەو دەزگیران هی (کچ)ەو کچ هی (پوورم)ە.

لە ڕووی نەزەرییەوە هیچ هێزی نییە بڵێ ژمارەی ئەو ناوانەی لە بکەر و بەرکار.. هتد دەردەکەون نابێ لەوەندە ڕەت بـێ ژمـارەی ناوەکـان هەر چەنـدێ بێ دەشـێ ناوێکیتری بخرێتە سەر.

لە ڕووی عەمـەلی یشـەوە.. ژیـانی ڕۆژانـە هەرگیـز پێویستی بەم جۆرە ڕستانە نییە ژمارەی ناوەکانی یەکجار زۆربێ

ناو دەشێ ئەم ئامرازانەی لەگەڵ دا دەرکەوێ:

(ان)ی کۆ

(ەکە)ی پێناسین

(ێك)ی نەناسین (یا تاکێتی singularity)

(ان) و (ێك) هەرگیز پێکەوە دەرناکەوەن

گەر (ان)و (ەکە) پێکەوە دەرکەوتن ڕیزبوونیان بەم جۆرە دەبێ ەکە ـ ان ← ەکان

کور ـ ەکە ـ ان ← کوڕەکان

یاسـای لێکـدانی ناوەکـان بۆ پێـك هێنـانی فرێـز لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.




یاساژ (٢)

هەر ناوەی دەشێ ئاوەڵنـاوێ یا زیـاتـری لەگـەڵ دا دەرکەوێ. (دیسان ژمارەی ئاوەڵناوەکان بێ سنوورە)

گەر هات ناوەکـە ئامـرازی پێنـاسین (ەکـە)ی لەگەڵ دا بوو. ئەوە ناوەکـە بە ئاوەڵنـاوی یەکـەمـەوەو ئاوەڵنـاوەکـان بەیـەکـەوە بە هۆی ئامـرازی بەستن (ـە) لێـك دەدرێن و (ەکە) دەچێتە سەر دوا ئاوەڵناوەوە.




یاساژ (٣)




هەر ئاوەڵنـاوش دەشێ (ڕادە)یێکی intensifire لەگـەڵ دا دەرکەوێ.. (مەبەست لە ڕادە ئەم جۆرە وشانەن زۆر ـ کەمێ ـ هەندێ ـ یەکجار ... هتد) ڕادە پێش ئاوڵناو دەکەوێ.

جوان ـ زۆر جوان

بەرز ـ یەکجار بەرز




یاساژ (٤)




گەر ناو (ەکـە)ی لەگـەڵ دا نەبـوو ناو و ئاوەڵنـاوەکـان بە هۆی ئامرازی بەستن (ی) لێك دەدرێن، (ێك)ی لەگەڵ دا بێ یا نا.

کوڕی زیرەکی ئازا ـ کوڕێکی زیرەکی ئازا

پیاوی ژیری دڵسۆز ـ پیاوێکی ژیری دڵسۆز




یاسا ژ ٥

Ø نیشانەیە بۆ (هیچ) واتا ناو بەبێ (ەکە) و (ێك) یاسا ژ (٤) و (٥) لەیەك یاسا کۆ دەکرێنەوە.




یاسا ژ (٦)

هەر ناوەی دەشێ ناوێکی ژمـارەی لەگـەڵ دا دەرکـەوێ ناوی ژمارە هەمیشە پێش ناو دەکەوێ.

پێنج پیاو. .

دووسەدو بیست قوتابی. .

بەشێـوەیێکی گشتی (نـاوی ژمـارە)و ئامرازی کۆ پێکەوە لەگەڵ هەمان ناودا دەرناکەون (×) نیشانەی لەگەڵ یەك دەرنەکەوتنە....




یاساژ (٧).

دەمناڵی یەکجار ساوا (بێ ئامراز)

دەپیاوێکی زۆر ئازا لەگەڵ (ێك)

حەوت کتێبە زۆر کۆنەکە. لەگەڵ (ەکە).

هەر ناوەی دەشـێ. . ناوێـکی ئیشـارەی لەگـەڵ دا دەرکەوێ. ناوەکانی ئیشارە ئەمانەن:

| | نزیك | دوور |
|---|---|---|
| تاك | ئەمە | ئەوە |
| کۆ | ئەمانە | ئەوانە |

که لەگەڵ ناوا دەردەکەون بەم جۆرە دەبن بە دوو لەتەوە.

ئەم ـــ ـە　　　ئەم ـــ انە

ئەو ـــ ـە　　　ئەو ـــ انە

(نـاو)و هەمـوو ئەوانـەی لەگـەڵیدا دەردەکـەون دەکەونە نێـوان ئەم دوو بەشـانـەوە. (نـاوی‌ئیشارە) و (ەکە)و (ێك) هەرگیز لەگەڵ یەکتر دەرناکەون.

فرێز لە کوردی‌دا یەك جار ئامرازی کۆی دەچێتە سەر.

لەگەڵ ناوی ئیشارەدا ناو و ئاوەڵناوەکان بە هۆی ئامرازی بەستن (ـە) لێك دەدرێن (وەك لەگەڵ (ەکە)دا.. چونکە ناوی ئیشارەش چەمکی پیناسین دەگەیەنێ)

یاسا ژ (٧) بەم جۆرە فراوان دەکرێ.




یاساز (٨)

ناو خراوەتـە ناو دوو کەوانـەی []. واتـا ناو (نـەووکی) فرێزی ناوی‌یەو دەبێ لە ڕستەی بیناغەدا دەرکەوێ. ناوی ئیشارەو ژمارەو ئاوەڵناو و ڕادە خراونەتە ناو دوو کەوانەی () واتـا دەشێ دەرکـەون. دەرکـەوتن و دەرنـەکـەوتنیـان کار لە ڕێزمانی‌یەتی ڕستەکە ناکات.

**فرێزی فرمانی**

ناوکـی فرێـزی فرمـانی لە زمـانی کوردی‌دا لە ڕەگی فرمان و ڕاناوێکی لکاو پێك دێت.

ڕێـزمـانی کوردی دوو ڕەگی جیـاوازی بۆ فرمـان دەست نیشان کردووە. ئەوانەن کە پێیان دەوترێ (ڕەگی ڕابردوو)و (ڕەگی داهاتوو).. هەموو کاتە ڕێزمانی‌یەکان بەم دوو ڕەگە دادەڕێژرێن.

چاووگ کراوە بە سەرچـاوە لێـیـەوە ڕەگ وەردەگیـرێ.

ڕەگی ڕابردوو بە لابردنی (ن)ی چاووگ دەست دەکەوێ.

بۆ وەرگـرتنی ڕەگی داهـاتـوو چەنـد یاسایێك دەست نیشان کراوە پەیـوەنـدی‌ی مۆرفـۆلـۆجی‌ی نێـوان ڕەگی ڕابـردوو و داهاتوو ڕوون دەکاتەوە[٣] نیشانەی کاتی داهاتوو (دە) دەبێ لەگەڵ ڕەگی داهاتوودا دەرکەوێ.

لەزمانی کوردی‌دا بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێك دەکەون. واتا ڕەگی فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بە هەمان کەس و ژمارەی بکەر وەردەگرێ.

ڕانـاوە جوداو لکـاوەکـان بەپێی کەس و ژمـارەیـان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو ١ | ٢ | ٣ |
|---|---|---|---|---|---|
| تاك | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

جۆر و کاتی فرمـانـەکـە دەور دەگێـرن لە هەڵ بژاردنی ڕاناوی لکاو (مەبەست لە جۆر، تێپەڕ و تێنەپەڕە ـ لەکاتیش ـ ڕابردوو و داهاتووە.)

دەرکـەوتنی ڕانـاوە لکـاوەکـان لەگـەڵ ڕەگی فرمان دا بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن بەم جۆرەیە.

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ڕابردوو | ١ | ٢ |
| داهاتوو | ٣ | ٣ |

یاسـاکـانی داڕشتنی بینـاغەی سادەترین ڕستەی کوردی دەشێ لێك بدرێن و لەم وێنەیەدا ڕوون بکرێنەوە.




پەراویزەکان

١ - (چەن ڕستەیەکیش ڕستەی لێکدراو پێك دەهێنی). ئەم باسە تەنیا دەربارەی سادەترین شێوەی ڕستەی سادەیە.

٢ - بۆ ئەمانە سەیری ئەم وتارانە بکەن.

أ- و.ع. ئەمین (١٩٨٢) وشــە - گۆڤــاری نووســەری کورد. ژ ٩ خولی دووەم

ب - و.ع. ئەمین (١٩٨٤) مۆرفیم - ڕۆژنامەی عیراق ژ ٢٤٩٣.

جـ - و.ع. ئەمین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی - کاروان ژ ٢٠.

٣ - بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەم دیاردەیەی زمان سەیری ئەم وتارە بکەن

و.ع. ئەمـین (١٩٨٢) ڕێکــەوتن لەزمــانــدا. گۆڤــاری ڕۆشنبیری نوێ ژ٩١

٤ - بۆ زیاتر زانیاری سەیری ئەم وتارە بکەن و.ع. ئەمین (١٩٨٤) کات و ڕەگی فرمان گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٥.

## سەرچاوەکان


١ - و.ع. ئەمین (١٩٨٣) زمــان و ماتمــاتیــك - گۆڤــاری ڕۆشنبیری نوێ ژ ٩٧ (ل ٣٤ - ٣٧)

٢ - و.ع. ئەمین (١٨٩٤) ئامرازەکانی بەستن - گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٧ (ل٢٨ - ٣١)

٣ - و.ع. ئەمین (١٩٨٥) ڕێــزمــان چی‌یـە - گۆڤــاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٩ - ل ٢٥ .

٤ - ڕێزماتی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاری کورد.

5 - Radford. A, (1981) Transformahona syntax Cambricdye.

6 - Huddleston. R, (1976) An introduchon to English transformahnal syntax Lodgerman.

# قواعد ابسط جملة كردية

د. وريا عمر امين
كلية التربية ـ جامعة بغداد

اصغر وحدة لغوية هي الاصوات المفرده التي يولدها الانسان عن طريق الجهاز الصوتي. واعقد وحدة لغويه هي الجملة. إن العلاقة بين هذه الوحدات الصوتية والجملة مبنيه على اساس هرمي. فالقوانين الفونولوجية تحدد النظام الفونيمي للغة من تلك الاصوات، ضمن المقاطع الفونولوجية بفونيم واحد او اكثر يتكون المورفيم (اصغر وحدة ذات دلالة) وبمورفيم واحد او اكثر تتكون الكلمة وبكلمه واحدة او اكثر يتكون العزيز (العبارة) ومن مجموعه من الفريزات تتكون الجملة. فتحديد وتغيير ماهية هذه الوحدات (الصوت ـ الفونيم ـ المقطع ـ المورفيم ـ الكلمة ـ الفريز) وكيفية ربطها معاً لتكوين وحدات اكبر فاكبر ضمن السلم الهرمي ضمن لغه معينة هي قواعد تلك اللغة. .

يحاول الباحث ايجاد العلاقة الهرمية الموجوده بين الكلمة والجملة ضمن ابسط جملة في اللغة الكردية وعلىٰ اساس بنيوي.

ابسط جملة كردية تتكون من عبارة اسمية وعباره فعلية.

ابسط عبارة اسمية تتكون من اسم واحد او ضمير. يمكن ان يظهر مع الاسم صفة او اكثر ويمكن ان يظهر مع كل صفة محددات الكمية.

فاذا كان الاسم في حالة نكرة فيكون علامه ربط الاسم بالصفة، والصفات ببعضها هي (ى). اما اذا كان الاسم في حالة معرفة فتكون علامة الربط هي (ه)، في هذه الحالة تتحول علامه المعرفه (ه كه) الىٰ نهاية اخر صفة.

كما يمكن ان يظهر مع الاسم اسم عدد او اسم اشارة. .

اما ابسط عباره فعلية فتتكون من جذر الفعل مع الضمير المتصل. الضمير المتصل يعبر عن التوافق بين الفعل والفاعل في العدد والشخص حيث يأخذ الفعل ضميرا متصلاً له نفس عدد وشخص الفاعل.

يحدد الباحث القوانين الفرعية اولاً ثم يجمعهم بالتدريج في قانون موحد ويقدمه علىٰ شكل صورة توضيحية تفسر جميع العلاقات الموجودة بين وحدات ابسط جملة في قواعد اللغة الكردية.

# فەرهەنگی

# «ئێریەن ڤاچ»

محەمەد ئەمین هەورامانی

**پێشەکی:**

دەربارەی کۆچ کردنی هۆزوتیرە ئاریایەکان. بۆ نیشتمانی ئەمرۆیان، مێژوو هەواڵی ناجۆر بە دەستەوە دەدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، زۆربەی مێژوونووسان و جوگرافیاناسان و پشکێنەرە دێرینەکان، بە تایبەتی ئەوانەی گریك و ئەوانەیش، کە دوابەدوای ئەوانەوە هاتوون، لەوەدا یەك کەوتوون، کە پتر لە هەزاران هەزار ساڵێك،[1] پێش زاینی، هۆزوتیرە ئاریایە جۆربەجۆرەکان، بە هۆی ساردو سڕبوونەوەی ئاوو هەوای نیشتمانی بنەرەتییانەوە، یەخبەندان بوون و بەستەڵەك کردنی بەروبوومی ئەو نیشتمانەو بەرەو نەزۆکی[2] چوونی، لە رووی ڕواندن و هێنانەبەری بەروبوومەوە، بە شێوەی پۆلە هۆزو تیرە هەندێ لەوانە بەرودوا، لە ڕێبازی ئەفغانستانی ئەمرۆوە، بەرەو چەم و دۆڵەکانی (پەنجاب) ـ هیندستان ـ ی ئەمرۆ کۆچیان کردووەو ئەوجا، کۆچی پۆلەهۆزو تیرەی‌دیکەش بەرەو بان و چەم و دۆڵەکانی ئێرانی ئەمرۆ هاتوون.[3]

هەر شەپۆلە پۆلەی لەو هۆزو تیرە کۆچ کردوانە، بریتی بووە لە کۆمەڵە هۆزوتیرەی خزم و خوێش بە یەکتریی، کە بە تەنیا شێوەیێ گفتوگۆیان کردووە (بە پیێ پان و پۆری نیشتمانی بنەرەتی‌یان ـ کەبەئاسیای ناوەڕاست دادەنرێت لەوانەیە، هەر شەپۆلەی لەو کۆچ کردوانە، خاوەن شێوەزارێکی تایبەتی بوویێ)و لە چەم و دۆڵێکی ئاوو هەوا تایبەتی‌دا، کە لەکاتی ڕێگە بڕینی کۆچ کردن دا ڕێیان تیێ کەوتووەو بە شایستەی ئەوەیان زانیوە بی‌کەن بە مەڵبەندی ژیانیان و تیای‌دا نیشتەجیێ بوون.[4]

ئەوەی، کە لێرەدا، جێگای مەبەستی ئێمە بیێ ئەوەیە، کە شەپۆلە پۆلێك، یان پتر، لەو هۆزو تیرانە بەرەو چەم و دۆڵەکانی کوردستانی ئەمرۆ هاتوون و تیێ‌دا نیشتەجیێ بوون.

بروا بۆ ئەوە دەچیێ، کە ئەو شەپۆلە هۆزو تیرە ئاریایانەی بەرەو کوردستانی ئەمرۆ هاتوون لە شەش هۆزی سەرەکی پێك هاتبن و بە ناوی (ئێریان ڤەچ)[5] ەوە نیشتمانیان ناوبانگی دەرکردووە، هەروەك زمانەکەشیان بەو ناوەوە ناوبراوە.

**زاراوی «ئێریان ڤەچ»:**

پێش ئەوەی دەم لە دەمەتەقیێ زاراوی (ئێریان ڤەچ)ەوە بدەین بەپێویستی دەزانم، کە لە (ڕوواڵەت)و (ناوەرۆك)و (واتا)ی «گۆرانی بێژ» ورد بینەوەو بی‌دەینە بەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوە.

زاراوی (گۆرانی‌بێژ)و (ستران بێژ)و (گۆرانی‌واچ) یەك واتاو یەك جۆرە ڕوواڵەتیان هەیە.

زاراوی (گۆرانی‌بێژ)، لە دوو وشەی یەك گرتوو پێك هاتووە: وشەی (گۆرانی)، کە (ناو)ەو لەگەڵ قەدی ڕانەبوردووی (بێژ)دا یەکی گرتووەو وشەی ناسادەی

(گۆرانی‌بێژ)یان، دروست کردووەو دەوری ناوی (پیشەی هونەریی)و هی (ناو)و هی (ئاوەڵناو)یش دەبینێ.

زاراوی (ستران بێژ)یش، لە (ستران)و (بێژ) پێك هاتووە، ئەگەرچی (ستران) خۆی، لێك دراوی (س + تەرنیم)ە.

زاراوی (گۆرانی واچ)یش، هەر هەمان دەستوور لە وشەی (گۆرانی)و وشەی (واچ) پێك هاتووە.

هەر بەو پێیەی کە یەك واتا دەبەخشن «واتە: هەر سێ زاراوەکە، (گۆرانی‌بێژ)و (ستران بێژ)و (گۆرانی‌واچ)، کەوابوو وشەی (بێژ)و هی (واچ) یەك واتا دەدەن، لەبەر ئەم هۆیە، پێویستە لە بنەڕەتی ئاڵوگۆڕبوونی هەردووکیان ورد ببینەوەو شوێنەواریان هەڵ بکەین (هەڵ بگرین).

هەروەك، لای زمانناسان ئاشکرایە، هەر (کار = فرمان)ێ لە زمانی کوردی‌دا، دوو جۆرە (قەد = رەگ)ی هەیە؛ هی (رابوردوو)و هی (رانەبوردوو)ش.

**ئەوجا، بەو پێیە، (وات)، قەدی (رابوردوو)ەو (واچ)یش هی رانەبوردوو.**

**وشەی (واچ)، یان (ڤاچ) بە هۆی وەرگرتنی پاشبەندی (ـ ە)ەوە، بووە بە (ناو)و (بوو)شە بە چاووگی (کار = فرمان).**

وشەی (ڤاچ)، یان (واچ) بە واتای (بێژ) هاتووە. (بیر)و هۆشی زمانناسیش، وەها وردی دەکاتەوە، کە (ڤاچ)، یان (ڤەچ) لەبنەڕەت دا هەبووەو بەرەبەرە، پاش بەسەرچوونی زەمان بووە بە (ڤاژ)، یان (ڤەژ)و ئەوجا بەرەو (واژ)یان بەرەو (وەژ) چووەو ئەوجا لە هەندێ ناوچەدا، بووە بە (وێژ)و لە هەندێ ناوچەی‌دیکەدا، بووە بە (بێژ، کە هەنووکە لە شارەزووردا، بەپانی‌و درێژای‌دا، هەردووکیان بەکار دەهێنرێن.

وشەی (واچ)، یان (ڤاچ)یش، وەك (قەد = رەگ)ی رانەبوردووی (کار = فرمان)، لەگەڵ راناوی کەسی (لکاو)دا هەڵ دەسووڕێ‌و بەم جۆرە:

- **بۆ کەسی سێیەمی تاك: مواچۆ (ماچۆ)، کە**
**واتای؛ (دێژێ) = (یەژێ) = (دێژێت) = (یەژێت) دێ**
- **بۆ کەسی یەکەمی تاك: مواچوو (ماچوو). کە**
**بەواتای؛ (دێژم = یەژم)دێ.**
- **بۆ فەرمان: (بواچە) = (واچە)، کە بە واتای؛ (بێژە**
**= یەژە) دێ.**

لە ڕووی ئاڵوگۆڕی دەنگسازی‌یەوە، سازگەی دەنگی [چ]و دەنگی [ژ]، زۆر نزیکی یەکترین و وەك خێز کەرەسەی زمان، ئەم دەنگە دەبێ بەوو ئەویش بەم دە

لە لایێکی‌دیکەشەوە، سازگەی دەنگی [ت]. سازگەی دەنگی [ژ]ێوە زۆر نزیکە. بە شێوەیێکی ڕوونتر لە سێ پلەدا، کە (موو)یەك، نێوان پلەیێك و یەکێکی دیکە جیادەکاتەوە، دەنگەکانی [چ]و [ژ]و [ت] ساز دەدرێن

کەوابوو زۆر نزیکەو زۆر رەواشە، کە دەنگی [چ] دەنگی [ژ] بگۆڕدرێ‌و ئەمیش بەرەو دەنگی [ت]، بە رێڕەوی بەرەو ئاسان چوون و جۆری کارتێ کردنی دەنگی‌دراوسێ، سەردەنگە دراوسێ‌یەکەی.

بەم پێیە، بۆمان هەیە، بڵێین:-

- (واچە = ڤاچە ← (ڤاژە = واژە) ← (وێژە) = (بێژە). هەروەها:
- (واچە = ڤاچە) ← (واتە)و لەمیشەوە، چاوگی (گوتن)و (وتن)، وەرگیراوە.

ئەگەر، ئەم جۆرە ئاڵوگۆڕە بەو جۆرە رێڕەوەد نەڕۆیشتبایێ هەرگیز، نە زاراوی (گۆرانی‌بێژ)و نە هی (ستران بێژ) دەبوو!

یاخود، ئەگەر ئەوان هەبوونایێ، دەبوایێ زاراوێکی هە بەو جۆرەی وەك (گۆرانی بڵێ)، هەبوایێ!!

بەشێوەیێکی ڕۆشنتر؛ (واچ = ڤاچ)و (بێژ) تەمەنێکی زمانی کوردی‌دا بەسەر بردووەو وشەی (بڵێ)و(گوتن)یش. وەچەی نوێی ناو زمانی کوردین.

**شێوەزاری ماچۆ.**

بەر لەوەی، بەرەو دوای دواوەو بەرەو دێـریـن دەمـی باووبـرەوی وشـەی (مـاچـۆ) بڕۆینـەوە، یا بگـەڕینەوە، بە پێـویـسـتـی دەزانـیـن، کە فرەیــزێکی سەرزاری خەڵکی کوردەواری ناو شارەزوور هەیە، بە یادی بهێنینەوەو ئەویش ئەوەیـە، کە ناوبـەنـاو بۆ پێنـاسەی کەسێ، یان یەکێ، کە لەبەرخۆیەوە دەئاخەفێ، یان لەگەڵ خۆیدا وات ویتیەتی (یەژێ)، دەوترێ: (کابرا لەبەر خۆیەوە، واچە واچیەتی!).

ئەم فرەیزی (واچەواچ)ە، بە واتایەك دێ، کە مەبەستی بەدەستـەوەدانی ناوی شێـوە زارێکـە، کە (ڕەگی) یاخـود، قەدی (واچە)ی[٦] زۆری تێدایە، ئەویش، شێوەزاری (ماچۆ)یە.

کاکەیی‌یەکان، یاخود، با بێژین ئەهلی هەق، بە زمانی نووسـراوی دەفتـەرە دینی‌یە نووسراوەکانیان، یەژن، زمانی کوردی، یان شێـوەزاری (مـاچـۆ)و بەشێوەی (سۆرانی) یان شارەزووری، شێوەزاری (جافی) یەژن.

بەم پێیەو بە تایبەتی پاش ڕوون بوونەوەی ئەوەی، کە (قـەد)ی، یاخـود (ڕیشـە)ی وشـەی (ڤـاچ = واچ)و هی (مـاچـۆ)، هەر یەکێ بوو، ئەمـە لە لایـەکـەوە، هەروەهـا بوونی ڕیشەی زۆری وەك (واچ = ڤاچ)و (وەچ = ڤەچ)و (وێـژ)و (بێـژ)و بوونی پەیـوەندی زۆر بەتینی دیکەی زمانی (لـەلایـەکی دیکـەوە، لەبـەشی وشـەو موفـرەدات و ڕیشەو قەددا، بە درێژی باسی ئەم خاڵە دەکەین پەیوەندی‌یەکان ڕۆشـن دەکەینەوە) لە نێوان زمانی (ئێریەن ڤەچ = Aryana Vaejah) و هی (مـاچـۆ)دا، وامـان بە دەسـتـەوە دەدەن، کە هەردووکیان وەك ڕیشەو قەدی دارێ بن، وەهایە!

وشــەی (ڤـاچ = واچ)، زۆر کۆنـەو لە ئاوێستـادا، بەو جۆرە واتـایــەی، کە لێکمـان دایـەوە، بۆ چەنـدان جارێ هاتـووەو بە زمـانی ئاوێستـاش زمـانی (ئێریەن ڤەچ) وتراوە (تەماشای، ل ـ ١٩٩، تأریخ زبان پارسی، د. خانلری، هەروەهــا بروانـە، تأریـخ مشـرق قدیم ـ حسن پیـرنیـا «مشیرالدولە» بەشی، ایران باستان، ل ـ ١٥٦).

**شایـانی باسـە، هەروەك بە زمـانی ئاوێستـا، زمـانی (ئێریەن ڤەچ) وتراوە، بە نیشتمانی ئەو خەڵکەش، کە بەو زمانە گفتو گۆیان کردوە، وتراوە نیشتمانی (ئێریەن ڤەچ)و گەل و هۆزو تیـرەی (ئێـریـەن ڤەچ)یش یەکێ بووە، لەو شانـزدە شەپـۆلـە کۆچـەی ئاریایی کە لە نیشتمانی بنەڕەتی خۆیان، بەرەو بانەکانی ئێران کوردستانی ئەمڕۆ کۆچیان کردووە.**

پێش ئەوەی، ئەم کورتە پێشەکی‌یە بەجێ بهێڵین و بەرەو لێکـدانـەوەی ناوەڕۆکی فەرهـەنگـەکە بڕۆین، بە پێویستی دەزانین، خاڵێك هەیە ڕۆشنی بکەینەوەو ئەویش بە کورتی:

یەکەم؛ چونکە، تا ئێستە خاوەنی هیچ شتێ نەبووین، ئەگەر هات و گەیشتینە ڕاستی‌یەکیش، هەرگیز، لە دەست هەڵ بەستی بێگـانـە سەر لەبەرتر نابێ، لەگەڵ ئەوەش دا، دەبێ خوێنــەری بەڕێـز ئاگـادار بکـەین، بەوەی، کە پاش بەراوردکــردنـێـکـی سەرپـێـی نـێـوان ئاوێـسـتــاو شێــوە زارەکــوردی‌یــەکـانی ئێسـتـا، لە ڕووی (قـەد)و (ڕیشـە)و موفــرەداتی دیکـەوە، هەروەهـا هی نێـوان پارسی باسـتـان زمــانی ئاوێستــا، وای بۆ دەچم، کە زمــانی کوردی (بـە سەرپـاکی ناوەڕۆکی ڕەسـەنی شێـوەزارەکانی‌یەوە) لە نەوەی نوێ زمـانی ئاوێستـاوە، زۆتـر نزیکە، تاوەکو هەر زمانێکی دیکەی ئێرانی، کە وەك پارسی باستان، **یان پەهلەوی بێ!**

بوونی ئەو وشەو موفرەداتە هاوبەشانەش، کە بەشداری نێـوان زمـانی پارسی کۆن و زمـانی ئاوێستـا دەکـەن، دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی، کە پارسەکان (حازرخۆربوون، نەك بێستـان ڕن) نیشتنـە سەر کەلـەپـووری ڕۆشنبیـریی دینی‌و دنیایی بنەڕەت بەستراوو بە تینی میدیەکان.[٧]

**بە شێوەییکی ئاشکراتر، پارسەکان، هەروەك چۆن بە زۆر کوردستانیان کردووە بە وڵاتی خۆیان، بەو جۆرەش سەرووەت و سامانی کەلەپووری‌و ڕۆشنبیری میدیەکانیان بە**

ناوونیشانی خۆیانەوە تۆمار کردووە.

دووەم، ئەوەی کە پتـر پاڵپشتی ئەم راستی‌یـەمـانـە، ئەوەیـە، کە ئەوەی دەربـارەی دینی خەڵکی (پـاسـارگـادا)و وڵاتی (ئانزان) ـ نیشتمانی دایگزادی پارسە ـ دەگێرێتەوە، لە بت پەرستی بەولاوە، هیچ جۆرە خوایەکیان نەناسیوە.

ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی‌دیکەوە، جگە لەوەی، کە ماوەیێکی زۆر دوورو درێـژ لە نێـوان سەرچـاوەی دینی خاوەن ئاوێستـاداو مەڵبـەنـدی پارس دا هەیـە، دینی‌خاوەن ئاوێستـا لەکـاتێـك دا پەیـدابـووەو پەرەی سەنـدووە، کە پارسـەکـان لە (پـاسـارگـاد)و (ئانزان)دا، هێشتا بەروپشتی خۆیان نەناسیوە!!

سێ‌یـەم؛ سەرچاوەی، پەیـدابـوونی ئاوێستـاو زمـانی ئاوێستـاو دینی ناو ئاوێستـا، هەر تەنیـا بۆ لای سەروو و سەرووی رۆژئاوای ئێران (کوردستانی ئەمرۆ) دەبرێتەوەو لە هیـچ سەرچـاوەییکی بروایی‌کـراوداو ئا لەو رووەوە، باسی شیـراز، یان دانیشتـوانی (پـاسـارگـاد)و (ئـانـزان) بە هیچ جۆرێ نەکراوە!!

## پەراوێز.

---

١ ـ لە دێـرین زەمـانـەوەو لە ماوەیێکی دوورو درێـژدا (2000000 ـ پ.ز، تا، 2000 ـ پ.ز)، گەل و هۆزە ئاریـایی‌یـەکـان، کە لە ناوچـەکـانی ئاسیـای ناوەراست دا دەژیـان، بە هۆی بەرەو ناسـازچـوونـی ئاووهـەوای نیشتمانیان، بە شێوەی پۆلە هۆزو تیرەی خزم بە یەکتریی، بەرەو چەم و دۆڵە ئاودارەکانی ئێران و ئەفغان و کوردستان و پەنجاب کۆچیان کردووە.

هۆزوتیـرە هینـدی‌یـەکـان، (هەروەك مێژووی نووسینی «ڤیدا» کتێبی ئاینی پیرۆزی هیندی‌یە دێرینەکان، بۆ نێوان «١٤٠٠ ـ ٨٠٠ ـ پ.ز» دەگـەرێتـەوە) پێشـرەوی هۆزە ئاریایەکان بوون لە کۆچ کردن داو لە رێبازی ئەفغانستانەوە بەرەو وڵاتی (پـەنجـاب)ی ئێستـا چوون و بە ناوی «هـەپتە هیندو»وە ناویان ناوە، کە واتای (نیشتمانی) هیند دەدات و حاڵی حازر بووە بە (هیندستان) (تەماشای: ل ـ ١٥٦ ـ ١٥٩ ـ ی حسن پیرنیا ـ مشیرالدولة ـ تأریخ مشرق قدیم. بکە).

٢ ـ هەنـدێ لەو پشکێنـەرو زانـایـانـە، کە بە تەنگەوەی زانینی هۆی کۆچ کردنی ئەو هۆزو خێڵە ئاریایەوەن، بۆ ئەو ناوچـانـەی ئەمـرۆیـان، وای بۆ دەچن، کە هۆی سەرەکی کۆچ کردنیان، بۆ هۆی ساردبوونەوەی ناو زگی زەوی‌وزاری نیشتمـانی بنـەرەتی‌و بنچینەیی‌یان، دەگەرێتەوە (تەماشای. ل ـ ١٤٣، هەمان سەرچاوە، بکە).

لەم رووەوە ئەفسانەیێك دەگێرێتەوە، ئەویش، ئەوەیە کە بەهـۆی ناراستی وتنـەوەو (بـەد) گوتنـەوە، زەوی‌و بوومی نیشتمـانی دایکـزادی گەل و هۆزەئـاریـایـەکـان ساردوسـر بووەتـەوەو بەستـەڵـەکی بەستـووە، ئەوانیش لەوێ‌دا خۆیان پێ‌نەگیراوەو بێ پەروا بەرودوا کۆچیان کردووە.

٣ـ زۆربـەی پشکێنـەرەکـان (ئـەوانـەی بە تەنـگە هۆی زانینی کوچ کردنی گەل و هۆزە ئاریایەکان بەرەو نیشتمانی ئەمـرۆیـان و ناسینیـان هاتوون)، وا، بۆی چوون، کە ئەو شەپـۆلـە هۆزو خێڵە ئاریـایـانـە، بەرودوا لە ماوەیێکی درێژخایەن دا، بە سێ رێگای جۆربەجۆردا کۆچیان کردبێ

هەندێ لەو شەپۆلانە (هەر شەپۆلەی بریتی بووە لەچەند هۆزو تیرەی نزیك بەیەکتری) لە ئەفغانستانی ئەمرۆوە بەرەو چەم و دۆڵەکانی (پەنجاب) روویان ناوەو تیادی‌دا نیشتەجێ بوون. هەندێکی‌دیکەش بەرەو کوردستانی ئەمرۆ هاتوون و تیـای‌دا نیشتـەجێ بوون، هەنـدێ شەپـۆلی‌دیکـەش لە ئەفغـانـەوە بەرەو بانـەکانی ئێران هاتوون و لەجێگاو شوێنی گونجـاودا بۆ بەردەوامی ژین و ژیـانیـان تیـای‌دا نیشتـەجێ بوون. (بـروانـە، ل ١١ ـ ١٢ ـ ی زمـانی ئاوێستـا، بە زمانی ئینگلیزی وەرگیرانی نەورۆزۆف).

٤ ـ پشکێنەرە زاناکان، وای بۆ چوون، کە ئەو هۆزو

تیرەو ئێلە ئاریایانە، بە بەرودواوە، لە ماوەی درێژی کۆچ کردنیان دا، تاوەکو نیشتەجێ بوونیان، نزیکەی شانزە شەپۆلی بەرەو هۆزو تیرە بوون و لە شانزە ناوچەی جۆربەجۆری کۆچ بۆکراودا، نیشتەجێ بوون و بە پێی ئەو ناوانەی، کە لە ئاوێستادا هاتووە، ئەمانە ناوەکانیان:ـ

١ ـ هۆزوتیرەی (ئەیریەن ڤاچ)، لە چەم و دۆڵێك دا، لە نیشتمانێك دا ژیاون، پێی وتراوە ولاتی (ئەیریەن ڤاچ).

ئەم ولاتە، هەروەك پشکێنەرە گریکەکان وا بۆی چوون، کوردستانی ئەمرۆی ئێرانە.

ئەوەش، کە پاڵپشتی ئەم راستی‌یە بێ، ئەوەیە، کە لە ناو زمانی ئاوێستادا، وشەی (ڤاچ) زۆر دووبارە بووەتەوەو پات کراوەتەوەو بە واتای (وتن)و (بێژە) هاتووە، ئەمە لەلایەکەوەو لە لایێکی دیکەشەوە، لە ئاوێستادا بە زمانی ناو ئاوێستا، دەوترێ؛ زمانی (ئەیریەن ڤاچ)و ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە زمانی کتێبی ئاوێستا پێش ئەوەی ناوی ئاوێستای پێوە بنووسرێ بە ناوی زمانی (ئێریەن واچ)ەوە ناوبراوە.

٢ ـ سوغدەیی، یاخود هۆزوخێڵی (سەغدی)، کە لە ناوچەی (سەغد)، کە ناوچەی (سمرقند)ی ئەمرۆیە گلیان خواردووەتەوەو تیای‌دا ژیاون.

٣ ـ هۆزوتیرەی (موری)، کە لە ناوچەی مەرۆ(مرو)ی ئەمرۆ نیشتەجێ بوون.

٤ ـ هۆزوتیرەی (باخزی)، کە لە ناوچەی (باختەرە)، یان (باکتەرە)یەو کەوتووەتە لای‌سەرووی رۆژهەلاتی ئەمرۆی ئێرانەوەو بە «بەلخ»ەوە، ناوبانگی دەرکردووە.

٥ ـ هەندێ هۆزو تیرە، لە ناوچەی «نیسایە» نیشتەجێ بوون و لەپاشان دا، ئەم ناوچەیە، بە (نیشابور)، یان (نیسابور) ناوبانگی دەر کردووەو ئەم ناوچەیەش کەوتووتە ناوچەی (خراسان)ی ئەمرۆوە.

٦ ـ شەپۆلێ لەوانە، لە ناوچەی (هیرای)، کە حاڵی حازر (هیرات)ی پێ دەوترێو ناوچەرگەی ئەفغانستانی ئەمرۆیە نیشتەجێ بوون.

٧ ـ شەپۆلە هۆزو تیرەی‌دیکە، لە ناوچەیێك دا نیشتەجێ بوون، کە پێی وتراوە (ڤەئای‌کژیتە)و ئێستەش ئەم ناوچەیە کەوتووەتە ناوچەی (کابل)ی ئەمرۆوە، لە ولاتی ئەفغانستان.

٨ ـ شەپۆلە هۆزو تیرەی ئاریانی دیکە، خۆیان و کۆچیان لە ناوچەیێ گرتووەتەوە، کە پێی وتراوە (ئورو) ئەو ناوچەیەش، ئێستە بە (طوس)، یان (غەزنە) ناو دەبرێ.

٩ ـ شەپۆلە هۆزو تیرەی دیکە، لە ناوچەی (ڤەهرگا) گلیان خواردووەتەوە، کە ئێستا بە ناوی (گورگان)ەوە ناو دەبرێو کەوتووەتە رۆژهەلاتی خوارووی قەزوێنەوە.

١٠ ـ شەپۆلێ لە هۆزو تیرەی ئاریانی‌دیکە، لە ناوچەی (هەرەهەوراتی) گلیان خواردووەتەوەو حاڵی حازر بەو ناوچەیە (رەوخاج) = (رەوخاگ) دەوترێو کەوتووتە لای خوارووی (ئەفغانستان)ەوە، یاخود ناوچەی (بلوجستان)ی ئەمرۆیە.

١١ ـ شەپۆلێکی دیکەی ئەو هۆزوتیرە ئاریانە بەرەو چەم و دۆڵی (ئای تەوم نت)دا کۆچیان کردووەو تیای‌دا نیشتەجێ بوون و ئەو ناوچەیەش، حاڵی حازر، بە چەم و دۆڵی (هێلمەند) ناسراوە.

١٢ ـ هەندێ لەو هۆزانە، لە شەپۆلێك دا، بەرەو ناوچەی (رەگە) کۆچیان کردووەو تیای‌دا نیشتەجێ بوون و ئێستاش ئەو ناوچەیە، بە ناوی (رەی)یەوە، دەناسرێ.

١٣ ـ شەپۆلێکی دیکەی لەو هۆزو تیرانە، بەرەو ناوچەی (سەخرە) یان (جەحرە) کۆچیان کردووەو تیای‌دا گلیان خواردووەتەوەو ئەو ناوچەیەش ـ ئێستا ـ بە (شاهرود) کە کەوتووەتە ناوچەی (دامغان)ی ئێستاوە، ناو دەبرێ.

١٤ ـ هەندێکی‌دیکە لەو هۆزو تیرانە، لە ناوچەی (ڤەرینە) گلیان خواردووەتەوەو تیای‌دا نیشتەجێ بوون و ئێستاش بەو ناوچەیە (ئەلبورز) دەوترێ.

١٥ ـ شەپۆلێکی زۆر سەرەکی‌و گەورە، لەو هۆزو تیرە ئاریایانە، لە رێبازی ئەفغانستانی ئەمرۆوە، بەرەو چەم و دۆڵی (پەنجاب) کۆچیان کردووەو تیای‌دا نیشتەجێ بوون.

شایــانی باسیشــە، ئەو ناوچـانــەی، کەتیـای‌دا نیشتــەجیٚ بوون، بە ناوی، (هــەیتــە هینــدو) ناویــان بردووە، ئەمــەش واتـــای (نیشتمــانی هینــدی) دەدات و حالّی حازریش پیٚی دەوتریٚ (هیندستان).

ئەم شەپــۆلــە، هەروەك گەورەتــریــن شەپــۆل بووە، هەروەهـاش شەپۆلی کۆچکــەری پیٚشــرەو بووە، یان پیٚشی هەموو شەپۆلیکەوە کۆچی کردووە.

پشکیٚنــەرەکــان، وای بۆ دەچن، کە ئەم شەپــۆلــە پتر لە میلیــون ساڵ پیٚش زایین، یان پتــر لەوە، بەرەو ئەو چەم و دۆڵـەو ئەو ناوچـانــەی هینــدستــان کۆچیان کردووە، چونکە میٚژووی نووسینی، یاخود میٚژووی تۆمارکردنی (رەگ ڤیٚدا) کتیٚبی پیــرۆزی دینیــان بۆ نیٚــوان (هــەزار) تا (هەشت سەد) پیٚش زایین دەگەریٚتەوە.

١٦ ـ شەپۆلیٚکی دیکە لەو هۆزو تیرانە، لە ناوچەیەك دا نیشتــەجیٚ بوون، کە پیٚی وتــراوە (رەنگــائــەست وسەر)و تا ئیٚستەش ئەم ناوچەیە نەزانراوە کویٚیە!

٥ ـ لە ئاویٚستـــادا ناوی (ئـــەیــریـا) هاتـووەو لەلایـەن (بــارتــۆلـومی)یـەوە (airya) نووسراوە، لە پارسی باستانیش دا هەر هەمــان وشــە بە هەمــان ئاوازەوە بەکار هاتووە. بەلاّم، لەســانسکـریتی‌دا بووە بە (ئــاریــا = arya) (ئەیریەن ڤەچ)، زاراویٚکی لیٚکدراوە، لە وشەی (ئەیریەن) لە قەدی (ڤەچ) پیٚك هاتووە .

وشەی (ئیریا)، یان (ئاریا)، ناوی گەلە ئاریایەکانە، کە هەزاران هەزار ساڵیٚ پیٚش زایینی ناوچــەکــانی (ئــاسیـای ناوەراست)یان بەجیٚ‌هیٚشتووەو ئیٚستە پیٚیان دەوتریٚ هیندوئەوروپایی.

وشەی (ڤەچ = vac̆) بۆ چەند جاریٚ لە ئاویٚستادا هاتووەو قەدی وشەی (ڤەچەت = vaocat) ە، کە بە واتای (ئاخافتن) دیٚ.

هەر هەمان (قەد) (ڤەچە = vaca) ی لیٚ وەرگیراوە، کە بە واتای (ئاواز)و (گۆرانی) دیٚ. وشەی (ڤەز) یان (ڤاز = vaz) بە واتــای (دوعــا)و (ســروود) دیٚ. جگە لەو واتایانەی وشــەی ڤەچ)، کە باسمــان کردن، بە واتــای (وشــە)، یان (پەیمان) یان (وتار) دیٚ.

وا دەردەکــەویٚ، کە وشـــەی (ڤــاچــار = vac̆ar) یش کە حالّــی حازر بووە بە (بـــازار) هەر لەوەوەو بە هۆیـــەوە درست کراوە (ل ـ ٢٢٤٤ ـ برهان قاطع).

ئەوجــا، لیٚکــدراوی (ئیٚــریــەن ڤەچ) بە واتــای (ئاریانی ئاخــافتن) هاتــووەو ئەم گەلــەش (گــەلی ئیٚــریــەن ڤەچ) لە ولاّتیٚك دا ژیاون، کە هەر بەو ناوەوە، ناو نراوە.

٦ ـ لە بەرهەمی کاکەیی‌دا، دەربارەی وشەی (واچ = ڤاچ)ەوە، ئەوەندە وتراوە، کە بتوانیٚ واتای رۆشن بکاتەوەو سەرچـاوەی پەیـدابـوونی ، دیـاری بکات (تەماشای، ل ـ ٨٤ ـ ٩٠، بکە).

٧ ـ دەربـــارەی زانـــایـی لیٚ‌هـــاتـــویـی و رۆشــنبیـــریی میدیەکانەوە، لە سەرچاوەی بروا پیٚ‌کراوی زۆردا، باسیان پیٚشرەوی باسانی زانایانی دیکەی گرتووە.

بۆ ویٚنە، لە کتیٚبی ئیستەر (THE BOOK OF ESTHER) دا، شای شوش؛ (ئــەهــشــەروش)، تەگــبیـــرو راویـــژی چارەســەرکــردنـی سەرپیٚچی شاژن (ڤــەشتی) = (vas̆hti) خیٚــزانی، دەخــاتــە بەردەم حەوت ئەمیرەکانی میدیاو پارس (تەماشای، ل ـ ٤٨٩ی هۆڵی بایبلّ،بە زمانی ئینگلیزیی، بکە)

ئەوەی، کە دەبیٚ جیٚگــای سەرنــج بیٚ ئەوەیـە، کە ناوی میـــدیـــا (Me̅di - a) بەم جۆرە نووســراوەو ناوی میــرەکـانیش (میــرەکـــانی‌میـــدیـا) بە - me) دەست پیٚ‌دەکـەن، واتـە، (میٚریٚش = meres) ، (مارشیٚنە = mar - sena) و (میٚموچەن = me - mu can) ، کەچـی ناوی میـــرەکـــانی پارس بەو جۆرە برگەیە، دەستیان پیٚ‌نەکردووە!! ئەمەش ئەوە دەسەلمیٚنیٚ، کە ناوی میـــدی باو، بەو برگـــەیـــە دەســت پیٚ‌دەکـــات و لەوانـــەشـــە، زۆربـــەی زۆری ناوی جیٚـگـــاو شویٚـنـــە گەورەکانیان، هەر بەو برگەیە دەستی پیٚ کردبیٚ، یان ئەو برگەیەی تیادا بیٚ.

هە لەبەر ناوداری ناوبانگی‌میدیا، لە کتیٚبی (دانیالّ)دا،

داریـوّش به شای (میـدیـا) ناو دەبـریّ، نەك ناوی پارس، (تـەمـاشـای: کتێبی دانیـال، چاپتەر ٥، خالّی (٣٠) ل ـ ٧٩٧ بە زمانی ئینگلیزی، هوّلّی بایبلّ، بکە).

یان، لەکـاتێـك دا، کە بابـل کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی (کوّرش)ەوە فەرمانی دا، کە پشکێنەرەکان بە ناو خەزینەو گەوهـەرو نووسـراوەکـانی گەنجینـەو ئەنتیکـەخـانـەکـەیدا بگەڕین، بوّ ئەوەی چ نووسراوێکی میدی ئەگەر هەبوو، بوّ کتێبخانەی کوّشکی (ئەهمێتا = Ashmetha) لە (ئەکباتان = هەمەدان) بی‌نێرنەوە.

(بـڕوانـە، ل ـ ٤٦٨، چاپتـەر ـ ٦، خالّی دووەم، هوّلّی‌بایبلّ، بە زمانی ئینگلیزی.).

٨ ـ زوّربەی زوّری ئاوێستا ناسان، وای بوّ دەچن، کە زمانی ئاوێستا زمانی دینی، یان شێوەزاری دینی میدیەکان بووبیّ (تـەمـاشـای: ل ـ چهـار ـ مقـدمـه ـ پووداود ـ فەرهەنگی برهان قاطع، جلد ١ ـ ث).

## سەرچاوەکان:


- S.N. Sokolov, The Arestan Language.
Translated from the Russian, by L. Narrzor
«NAUKA» PubLishing House
Central Department of oriental Literature, Moscow 1967.
- The Holy BinbLe Containing the old and New Testaments set forth in 1611
And commonly known as the king james version
American BibLe society, New york MacdoneLL, M.A. Ph.D
william Heinemann, London
- Ahistory of sanskrit Literature ,by ArtherA.
- An Avestan Grammar, in Comparison with Sanskraby, A.v. williams Jackson
of columbia collegf. New yourk City 1892


## سەرچاوەی بێگانەی دیکە.


ـ تأریـخ، مشـرق قدیم، حسن پیـرنیـا (مشیـرالـدولـة)، مرکزپخش انتشارات عطار

ـ برهـان قاطـع، تالیف، محمـد حسین بن خلف تبریزی متخلص ببرهان.

ـ تأریخ زبان فارس، به قلم دکتر پرویز ناتل خانلری.

ـ فەرهەنگی فارسی به پهلوی، تالیف، دکتر بهرام فرەوشی.

ـ دستـورنـامـه در حرف ونحـو زبـان پارسی، تألیف، دکتر محمد جواد مشکور

ـ تأریخ کردوکـردستـان و (تـوابـع). تالیف شێخ محمد، مردوخ کردستانی.

ـ اوستا، نامه مینوی آیین زرتشت، تالیف، ابراهیم پورداود


## سەرچاوەی عارەبی.


ـ خلاصـة تأریـخ الکـرد وکردستان ـ من أقدم العصور التأریخیـه حتى الآن وضعـه باللغـة الکـردیـة، العـلامـة المفضال معالی محمد أمین زکی‌بگ الوزیر العراقی سنة ١٩٣١.

ونقله الى العربیة وعلق علیه الاستاذ محمد علی عونی ١٩٣٦. (مطبعة السعادة بجوار محافظة مصر سنه ١٩٣٩)

ـ ایران فی عهد الساسانیین تالیف کریستنسن، ترجمه یحی‌الخشـاب مراجعـة عبـدالـوهـاب عزام، مطبعـة لجنة التالیف والترجمة والنشر، القاهره ١٩٥٨

ـ تراث فارس، کتب فصوله أساتذه من المستشرقین، اشترك فی کتابتەو اشرف على نشره ا.ج. أربری.

نقله الى العـربیـة من اسـاتـذه کلیـة الاداب، جامعـة القـاهـرة محمـد کفـافی، السیـد یعقـوب بکـر، احمـد

السادا‌تي، محمد صقر خفاجه، احمد عيسى اشترك فى كتابته وراجع ترجمته يحى الخشاب. دار أحياء الكتب العربية عيسى البابى الحلبي وشركاه، ١٩٥٩.

- مروج الذهب ومعادن الجوهر، ج،١،٢،٣،٤، المسعودى.

**سەرچاوەی کوردیی.**

- قامووسی زمانی کوردیی، بەرگی یەکەم، ودووەم عبدالرحمن محمد امین زەبیحی، چاپخانەی کوری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧

- فەرهەنگی مردوخ، شێخ محمد مردوخ

- فەرهەنگی خاڵ. شێخ محەمەدیخاڵ، چاپخانەی کامەران.

- کاکەیی. محمد أمین هەورامانی، چاپخانەی الحوداث

- بەغدا ١٩٨٤.

- فەرهەنگی لەك ولور. حەمیدی ئیزەد پەناهـ - مەحمود زامدار چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨.

- میدیا. ئی.م. دیاکۆنۆف، برهان قانع، لەفارسییەوە کردوویەتی بە کوردیی، چاپخانە دارالحریة للطباعة بغداد، ١٩٧٨

**بەشی «ئـ»**

**(ئاپ** = ap) :

(ئاپ = ap) لە ئاوێستادا بۆ چەند جارێ پات کراوەتەوە، بە واتای (ئاف)و (ئاو)، (ئاوی) هاتووە.

لە سانسکریتیدا، لەبری وشەی (ئاپ) وشەی (ئاپە = apa) یە.

لە پارسی باستان دا، بووە بە (ئاپی = api) لە ئاوێستادا، وشەی (ئاو = ئاپ)، کۆ کراوەتەوەو بەم جۆرەو وتراوە (ئەپام = ap - am) ، کە بە واتای (ئاو + ان) = (ئاوان) هاتووە.

**(ئەسبارەی** = asbaray) :

ئەم وشەیە، لە دوو پارچە پێك هاتووە وشەی (ئەسپە = āspa) و وشەی (بارەی = bāray).

ئەم دووانە. یەکیان گرتووەو بە هۆی کارتێکردنی دەنگی دراوسێوە سەر یەکتری ئاڵوگۆڕێ بە دی هاتووەو دەنگی [ب]ی ئاوازەدار، بەسەر دەنگی [پ]ی کپ دا، سەرکەوتووە.

ئەم وشە لێکدراوە ناسادەیە، لە زمانی کوردیدا بە واتای (ئەسپ بردن)، (ئەسپ بەردە)، (ئەسپ بەر) هاتووە.

**(ئەش** = ash) :

وشەی (ئەش)، لە ئاوێستادا، بە واتای (فراوان) بە واتای (وە)، (زۆر)، بێشمار) هاتووە.

**(ئاسمان** = asman) :

وشەی (ئاسمان = āsmān) ، لە ئاوێستادا، بە واتای وشەی (ئاسمان)، یان (سەما) لە زمانی کوردیدا هاتووە.

**(ئەڤەی** = avai) :

ئەڤەی راناوی ئاماژە (ئیشارەت)بە، بۆ (دوور)و بۆ (تاك) بەکار دێو بە واتا؛ (ئەوە)، یان (ئەو هاتووە.

بۆ وێنە، لە ئاوێستادا، وتراوە: (ئەڤەی ئەورە = avai awra) ، ئەمەش، ئەگەر وشە بەوشەو بەریز لێك بدرێتەوە، بەم جۆرە دەبێ: (ئەو هەورە).

**(ئەسپە** = aspa) :

لە ئاوێستادا، وشەی (ئەسپە)، بۆ جینسی (نێر)، واتە (ئەسپ) هاتووە، بۆ وشەی (ماین)، دەنگی کۆتایی وشەی (ئەسپە = aspa) ، کە دەنگی (a -) ی کۆتاییە درێژ بووەو بووە بە (ئا = ā) ، کە ئەمە لە هەندێ (ناو)دا، نیشانەی مێینەیە.

بە شێوەیێکی زۆر رۆشن و فرە ئاشکرا. وشەی (ئەسپە)، بە واتای (ئەسپ) بۆ (نێر) هاتووە. وشەی

(ئەسپا)ش، بە واتای (ماین) بۆ (مێ) هاتووە.

بە پێی ئەو لێک دانەوەیە، وشەی (ئاڤێستا)، بە واتای (زانین)، یان (ناوەڕۆک و بنەڕەت زانراو) دێ.

من، بەش بە حاڵی خۆم، بە پێی لێک دانەوەی پارچەکانی، وای بۆ دەچم، کە بە واتای (زەوی بەردار) یان (نیشتمانی بە پیت و بەبەر).

لە زمانی عارەبی و فارسی دا، بەچەند شێوەیێ ناوی (ئاڤێستا) هاتووە، بۆ وێنە، وەک:

اوستا، ابستا، استا، وستا، است، اویستا، بستاق، ابستاق، ابستاغ، ابستاه، بستاه، أبستا، افستا ابستا، ستا.

**ئاتەر = ātar** :

وشەی (ئاتەر)، لە (ئاوێستا)دا پات بووەتەوەو بە واتای (ئاگر، ئایر، ئاویر، ئادر) هاتووە.

لە پالەوی‌دا، ئەم وشەیە بووە بە (ئاتەرش = ātarsh) و بووە بە (ئاتۆر)یش.

**ئاتەرپاتە = āterepāte** :

ئەم وشە ناسادەیە، بە واتای (ئاگر ئاگاداری کەر) یان (ئاگرەوان) - ئەگەر ڕەوابێ - دێ. جگە لەمەش (ئاترەڤەن = athravan) یش، بە هەمان واتاو هاو واتای هاتووە ئەم وشەیە، حاڵی‌حازر بووە بە (ئاگرەوان).

**(ئارەم = āram)** :

وشەی (ئارەم)، لە پێشبەندی ( ā - = ئا - ) و چاوگی (ڕەم = ram) ، کە بە واتای (ئارام گرتن)، یان (ئارام بوون) هاتووەو لە کوردی‌دا، وشەی (ئارام) بە هەمان واتا بەکاردێ.

**(ئارمەیتی = armaiti)** :

ئەم وشەیە، لە ئاوێستادا، بە واتای خۆشەویستی و دۆستایەتی و هاریکاری‌کردن دێ. لە کوردی‌دا، ئەم وشەیە بووە بە (یارمەتی).

**(ئەستا = astā)** :

وەک ناوێ، (ئەستا) بە کتێبی (زەند) دەوترێ، کە لێکدراوەی کتێبی (ئاوێستا)یە. جگە لەمەش (لەم ناوەش) (ئەبێستا)شی پێ دەوترێ. لای هەندێکیش وەهایە، کە ئەم ناوە، ناونیشانی کتێبی (ئیبراهیم ی زەردەشتی)یە.

وشەی (ئەستا) وەک ڕەگ، وشەی ئاوێستایی‌یە وشەی ئابستەی لێوە دروست بووە. ئەم وشەیە. (ئابستە) بە واتای (منداڵدان) یان (ڕەحم) هاتووە، بە واتای زەوی بەروبوومدار هاتووە. کەوابوو زەوی‌و زارێکی خەیروبەردار (زەوی کشتوکاڵ) دەگرێتەوە.

وشەی (ئابستە)، لە بنەڕەت دا، ڕیشەیەکە، لە وشەی لێکدراوی (ئاپوثرە - تەنو = āputhra tanu) وەوە هاتووە.

وشەی (ئاڤێستا)ش، لێکدراوە، یان دوو پارچەیە. بەشی (ئاڤێ = ave) ، یان (ئاڤ)، بە واتای (ئاو)یان (ئاپ)ەوە هاتووە.

ئاڵوگۆڕی دەنگی [پ]و دەنگی[ڤ]، بێ‌گومان بە هۆی کارتی‌کردنی یەکێکیان لەسەر ئەوی دیکەی دراوسێی لەسەر ڕێبازو ڕێرەوی ئاسان بوون یان بەرەو ئاسان چوونی زمان، ڕووی داوە.

بە هەرحاڵ، ناوی (ئاڤێستا)، لە پالەوی‌دا بووە بە (ئەڤەستاک = avastāk) ، یان (ئەپەستاک = apāstak) .

وشەی (ئاڤێستا)، هەروەک، لە لایەن (ئەندریاز)ەوە لێک دراوەتەوە، لەبنەڕەت دا (ئوپەستە = upasta) یە، کە بە واتای (بنەڕەت) یان (بنچینە)، یان (ڕەسەن) دێ.

لە لایەن، (ئاڤێستا) ناسی وەک بارتۆلۆمی، بەشی کۆتایی ئەم وشەیە، بە واتای (پەنا)و (کۆمەک کردن) دێ.

**(ئەسرەڤ = asrav)** :

لە ئاوێستادا، وشەی (ئەسرەڤ) بە واتای (ئەسرین)، (فرمێسک) هاتووە. حاڵی حازر لەکوردی‌دا، بۆ بەدەستەوەدانی ئەو وشەیە (ئەسرەڤ؛و (ئەسرین)و (ئەسرو) بەکار دەهێنرێ.

لەپارسی‌دا، ئەم وشەیە بووە بە (ئەشک). شایانی باسە، بۆ بە دەستەوەدانی هەمان وشە، لە ئاوێستادا، وەک هاو واتایێک وشەی (ئەسروو = asru) هاتووە.

**(ئەستی** = asti) :

ئەم وشەیە، لە ئاوێستادا، بە واتای (ئێسقان) هاتووە، لە کوردیدا، بۆ بەدەستەوەدانی هەمان واتا، وشەی (ئەستۆ) بە واتای باڵەکەی شان، (ئەستی) بە واتای (ئێسك) یان (ئێسقان) هاتووە.

فرەیزی (ئەستی - بیز = asti bis) بە واتای؛ (بە ئێسقان) دێ.

**(ئەش** = ash) :

لە ئاوێستادا، وشەی (ئەش)، بە واتای (فراوان) یان (فرە)، (زۆر)، (بێ‌شمار) هاتووە.

**ئەشیەهـ = ئەچیەهـ** = acyah - asyah) :

ئەم وشەیە لە (ئەش) + (یەهـ) پێك هاتوە دیارە واتای بەشی یەکەمی، چونکە لەسەرەوە لێك دراوەتەوە، ئەوەی دووەمیان بۆ پلەی بەراوردییە لە ئاوەڵناودا، ئا لێرەدا، ئەم پارچە پاشبەندە (یەهـ = yah) پلەی باڵا پیشان دەدات و بە واتای (زۆرترین)، (فرەترین) هاتووە.

**ئەرتە** = arta) :

وشەی (ئەرتە)، یان (ئەرێتە = areta) ، لە ئاوێستادا، بە واتای (راست)و (دروست)و (پاك) هاتووە وشەی، (ئەرتەوان)یش، کە دوو پارچەیەو بریتییە لە، (ئەرتە)و (وان)یان (ئەرێتە)و (ڤان)، واتە:

- ئەرتە + وان = ئەرتەوان.
- ئەرتە + ڤان = ئەرتەڤان.
- ئەرێتە + ڤان = ئەرێتەڤان.

ئەم وشە ناساکارە (لێکداوە) بە واتای (پارێزگاری کەری راستی) یان بۆمان هەیە، بڵێین (راستیەوان)، لەسەر کێشەی (پاسەوان)و (دادەوان)و (زیرگەوان).... هتد هاتووە.

وشەی لێکدراوی (ئەرتەڤان)و (ئەردەڤان)، هەریەکێکن و یەك واتا دەبەخشن و بە زۆری لەزمانی کوردییدا بەکار دەهێنرێ.

**ئەرەجە** = araja) :

وشەی (ئەرەجە)، لە ئاوێستادا، بە واتای نرخ هاتووە، جگە لەمەش بە واتای (کرێ) هاتووە.

**(ئەرەتنە** = aratna) :

وشەی (ئەرەتنە)، لە ئاوێستادا بە واتای (ئانیشك) یان (یەرەژنە = ئەرەژنە) هاتووە.

**(ئەرشتات** = arshtat) :

(ئەرشتات)، لە ئاوێستادا، بە واتای (راستی)و (دروستی) هاتووە، جگە لەوەش ناوی (فریشتەی راستی)یەو ئەم ناوەش بۆ مێینەیە.

**ئازی** = āzi) :

ئازی، بە واتای (حەزلێکردنی) زۆر دێ. بە وێنەیێکی ئەفسووناوی بۆ ناوی (دێو)ی تەماع (حەز) بەکار هاتووە. حاڵی حازر، لە کوردیدا، وشەی (حەز) لەبری بەکار دێ.

**ئازهی = ئاژهی** = āzhi) :

لە ئاوێستادا، (ئازهی) یان (ئاژهی)، بۆ واتای (مار) هاتووە، جگە لەمەش بە واتای (مارستان) هاتووە کە مەبەستی (مارەدۆزەخ)ەو واتە، (دوزەخێ) یان جێگایێ پر بێ لە (مار) بۆ سزادان لە بریی (دۆزەخ) بەکار هاتووە. ئاریانیەکان، (دۆزەخەمار) یان هەبوە. بۆ وێنە، وشەی (ئاژهی) بە واتای (ئەهریمەن) یان (مارستان) بەکار هاتووەو وشەی (ئازهی)یش بە (ئەهریمەن)یان دۆزەخی (باوبۆران و هەورەتریشقەو لافاو) وتراوە.

**(ئازیاهـ** = àsyah) :

لە ئاوێستادا، ئەم وشەیە، بە واتای (ئازاترین) هاتووە لەبنەڕەت دا، قەدەکە (asu) یە، کە لە ئاوێستادا، بە واتای (گورج)، (تیژڕەو)، (ئازا) هاتووە.

کەوابوو، پاشبەندی (yah -) بۆ پلەی بەراوردی نێوان ئاوەڵناو بەکار دەهێنرێ، کە لێرەدا پلەی (باڵا) پیشان دەدات.

هەر لە هەمان ریشەوە، وشەی (ئازوش = azus) و هی (ئەزامی = azami) دروست بوون.

**(ئەزهی دەهاکە = azhi dahaka) :**

ئەم وشــەیــە، بە لای کەمی‌یــەوە، لەسی پارچــە پیــك هاتووە. پارچەکانیش دەبێ لەمانە بەدەر نەبن.

١ - (ئەزهی = azhi) ، کە بە واتای (مار) هاتووە

٢ - (دەهـ = dah) ، یان (زەهـ)، بە واتای (گەزندە)، یان (زەهردارو زیاندەر) دێ.

٣ - (ئاکە = āka) ، بە واتای (خراپ) دێ.

ئەمرۆ، ئەم وشەیە لە کوردی‌دا بووە بە (ئەژدی‌هاك) یان (ئەژدەهاك) یان (هەژدەهاك).

**(ئەکە = aka) :**

وشــەی (ئــەکــە) یان (ئــەخــە) لە ئاوێستــادا، بە واتــای خراپ (بــەدگــۆ)، (شــەڕڕانی)، (زیــانــەخــرۆ) هاتووە ئەم وشەیە ئاوەڵناوەو بۆ نێرینە (ئەکە = aka) یەو بەڵام بۆ مێینە دەبێ بە (ئەکا = aka) .

لە زمــانی کوردی‌دا، (ئــەخــە)و (کخــە) لەگــەڵ منداڵ و بچووك دا بۆ دوور خستنەوەی لە کردەوەی شەڕ بەکار دەهێنرێ.

وشــەی (ئــەکــەتــەرە)، کە لە وشــەی (ئەکە)وە وەرگیراوە پاشبەندی پلەی بەراوردی وەرگرتووەو بە واتای (خراپتەر) هاتووە.

**ئاڤەنت = avant :**

لە ئاوێستــادا، ئەم وشــەیــە، بە واتــای (ئــاودار)، یان (ئاوەدان) هاتووە. ئەم وشەیە بە شوێن و جێگایێ دەوترێ کە ئاوی زۆربێ‌و جێگــای ئاوداریش خاوەنی ئاوەدا نی‌یــە (ئاو و ئاوەدانی - کورد واتەنی): یان جێگا بە ئاوەوە (ئاوا)یە:

لە سانسکــریتی‌دا، ئەم وشــەیــە بووە بە (ئــاپــوڤەنت = apovant) .

**ئەڤۆخڤەرێنە = avo - xvorena :**

ئەم وشــە لێکــدراوە، بەچــەنــد واتایێ هاتووە؛ بە واتای (نــاوچــاو)، (ئــاوەخــۆر)، یان (ئاویێ‌خۆرە)، یان جامی‌ئاو خواردنــەوە. یان قەمــی ئاوەخــۆرەی مەڕوماڵات، کە بریــتــی‌یــە، لە هەڵ کۆڵانــدنــی ناوزگــی قەدی دارێــکی ئەستوورو بە درێژایی بۆ ئەوەی ئاوی تێبکرێ و بە ریزو بە درێــژایی، مەڕو ماڵات ئاوی بەســەرەوە بخــواتــەوە، لە کوردەواری‌دا بەم جۆرە جێــگــای ئاو خواردنــەوەی مەڕ ماڵاتە، (ئاوەخۆرە) یان (ئاڤەڤەرە) دەگوترێ.

**(ئەمسە = amsa ) :**

وشــەی (ئــەمســە) لە ئاوێستــادا، بە واتای، (نزدیك)، (دراوسێ)، (هاوسێ)، (هامسا) هاتووە.

جگــە لەوەش، لە کوردی‌دا، (ئــەمــەســە)، کە واتــای (ئەمەتە)یەو زۆر نزدیك، یان دراوسێ پیشان دەدات.

دوور نی‌یە، کە وشەی (ئامسان)ی کوردی کە بە واتای (ئاوسان) یان هاو واتایەتی، هەر لە هەمان وشەوە وەر نەگیرابێ.

**(ئە - مرتە = a - mrta) :**

**ئەم وشــەیــە لە پێشبــەنــدو قەدێــك پێــك هاتــووە،** لە ئاوێستــادا، بە واتــای (نــەمر)، (زیندوو) هاتووە. بەڵامەوە وایە، کە ئەم پێشبەندی (a -) یە، لێرەدا، پێشبەندی (نەرێ = نەفی)یە.

بە شێوەیێکی ئاشکراتر (مرتە = mrta) واتای (مەرد)، یان (مردوو) دەدات و بەهەردووکیان پێکەوە (ئە - مرتە)، بووە بە (نامردوو) یان (نەمر) یان (زیندوو).

**(ئەناهیتە = anāhita) :**

ئەم وشەیە لێکدراوە، لە نیشانەی (نەرێ = نەفی)، کە (ئــەنــە = an) ەو لە قەدی (ئــاهیتــە = āhita) ، کە بە واتــای (ئالوودەو (پاك)و (رۆشن)و بێ (گەرد) هاتووە.

بە پێشبــەنــدو بە قەدەوە، بە هەردووکیــانــەوە، واتــای نارۆشن، ناپاك دەدات.

جگــە لەو واتــایــانــەش، بۆ ناوی فریشتــەی (سەرکاری ئاو)، یان (چاودێری‌کەری ئاو) هاتووە.

بۆ بە دەستــەوەدانی ناوی ئەستێرەی جوانی ئەستێرەی

زوهـــره، که رەمـــزی جوانی‌یـه، یان بە رەمـزی جوانی لە قەڵەم دراوە، بەکار هاتووە.

هەر بەو بۆنـەشـەوە، رۆمـانیـەکـانی ئەوسا (لاتینیەکان) ناوی (ڤینۆس)یان لێ ناوە.

**(ئەورە = awra)** :

وشەی (ئەورە)، لە ئاوێستادا، بە واتای (هەور) هاتوە. لە پالـەوی‌دا بووە بە (ئـەبـر = abr) و لەپـارسی ئێستـەش دا (ئەبر)ی پێ دەوترێ.

**(ئورڤەرا = urvarā - aurvarā)** :

ئەم وشەیە ساکار نی‌یە، واتە لێك دراوە، لە ئاوێستادا بە واتای (سەوزبوون)، (رووان)، (چەکەرەکردن) هاتووە.

لە پارسی نوێ‌دا، وشەی (رستن)، لەبری بەکار دێ لە کوردی‌دا، وشەی (هۆرورا) یان (هۆرڤرا)، یان (هۆرخزا)و (رووان) کە رەگ (قەد)ی وشەکەی تیادا دیاری دەدات، بە هەمان واتا هاتووە.

**(ئۆشترە = ushtra - aushtra)** :

ئەم وشــەیــە، لە ئاوێستـادا پات کراوەتـەوەو بە واتـای (وشتر)، (حوشتر) هاتووە، ئەم وشەیە بۆ (نێر)ە ، بۆ مێینە دەبێ بە (ushtrā - aushtā) = (ئوشترا).

**(ئەیریا = airya)** :

لە ئاوێستادا، وشەی (ئەیریا) لە بری وشەی (ئاریان)ی ئەمرۆیە. ئەم وشەیە، لەپارسی باستان دا، بووە بە (ئاریا = arya) یە. ئەمەش وەك ناوێ، بۆ ناوی گەلە ئاریایەکانە.

**(ئایزما = aizma)** :

ئەم وشـەیـە لێـك دراوە، یان دوو پارچـەیـە، پێشبەندی (ئـەیــزی = ئایــزی = aizi) و لەگــەڵ قەدی (مـا = ma) و پێکەوە، هەردووکیان بە واتای (تاقیکردنەوە) دێن،

لەنـاو مەنگـوری‌دا، لەبـری وشـەی (زمـان)، (ئەزمـ دەوترێ، هەروەها وشەی (ئەزموون)و وشەی (ئەزموٚن)یش لە کوردەواری‌دا، بۆ بەدەستەوەدانی واتای تاقیکردنەوە بەکـ دێت.

وشــەی (ئـەزمــوو) بە واتـای (تـاقـیـکــراو)، یـ (تەجروبەکراو) دێ «بۆ وێنە، دەوترێ:

(دۆ)ی ئەزموو لەماستی نائەزموو چاترە»

«تەماشای، بەشی «٤»ی ل ـ ١٣٣ی زەبیحی، بکە»

**(ئەیڤە = ai - va)** :

لە ئاوێستادا، ئەم وشەیە، بۆ ژماردن هاتووەو بە واتای (یەك).

لە کوردیی‌دا، بۆ بە دەستەوەدانی واتای ئەم وشەیە ئەم وشانەمان هەن: (یوە)، (یوڤە)، (یەك).

**(ئەن ـ یە = an ya)** :

فرەیــزی (ئـــەن ـ یە = an - ya) ، بە واتـــای (یــەکێکی‌دیکـە)، (یـەکی‌دیی)، (یـەکێکی‌دیی)، یان بە واتای (یەکێك)، (یەکێ)، (یووێ)، (یوڤێ) دێ.

**(ئەیشام = aisām)** :

ئەم وشــەیــە، رانـاوی ئامـاژەیـە، بە واتـای (ئـەوان) (ئادیشا)، کە لە کوردی‌دا هاتوون، دێت.

**(ئەیەر = ayar)** :

وشەی (ئەیەر)، بە واتای (رۆژ)، کە واتای وشەی (day) ی ئینگلیــزیی بدات، هاتـووە. بەلامـەوە وایـە، کە ناوی مانگی (ئــایــار)یش، لەبنــەرەت دا، لەوەوە وەرگیـرابێ، بەوەی‌دا، کە مانگی یەکەمی بەهارەو بەهاریش بە رۆژەوە بەهارە، چونکە ژیان بەهۆیەوە بەهاری دێتە پێشەوە.

# قاموس «الأيريَنْ ڤَجْ»

محمد أمين الهورامانى

من المعروف جداً، ان الاقوام الهندوايرانية ـ وبسبب تغيير مناخ موطنها الاصلي ـ هاجرت وعلى شكل موجات متعاقبة الى مناطق عديدة ومختلفة كالهند وايران وكردستان

وكان، من بين تلك الموجات، موجة، يعتقد بانها تتكون من ست قبائل رئيسة، هاجرت الى كردستان الحالي وسكنت في وديانها المختلفة وبنت لنفسها، من هنا وهناك، مدن وقرى كثيرة واهتمت اهتماماً كبيراً بالزراعة وتربية الدواجن.

وكانت تلك القبائل تعرف بالقبائل (الأيريَنْ ڤجِتَه) نسبةً الى لغتهم المعروفة بلغة (أيرْنيْ ڤجْ)، وبلادهم المسماة ببلاد (أيرْيَن ڤَجْ).

ان مصطلح (ڤاج)، او (ڤه‌ج = ڤَجْ) مشتق من مصدر فعل (ڤاجه)، (ڤه‌جه) والذي يقابله بالعربية (قول). ومن الجدير بالذكر، أن هناك لهجة كردية قديمة جداً تعرف بلهجة (ماچوّ) وبعض الأحيان بلغة (هاچو) الدينية، حيث لاتزال تحتفظ بقوتها الديني عند بعض القبائل الكردية التي تدين بدين (اهل الحق) وذلك عن طريق استعمالها) كلياً في التعاليم وفنون الكتب الدينية، عندهم.

إن ظهور اسم ميديا، بعد تأسيس الدولة الميدية وازدهارها، ادىٰ الىٰ اختفاء اسم اللغة (الايرين ڤجيه) وحل محلها اسم اللغة الميدية وسميت بلاد (أيريَن ڤَجْ) ببلاد ميديا.

إزدهرت هذه اللغة (الايرين ڤجيه) قديماً والميدية حديثاً بعد أن اصبحت لغة الدين ولغة الدولة معاً وذلك في عهد الدولة الميدية، ودُوِّنت بواسطتها فنون الكتاب الديني المقدس (أڤستا)

وبعد انقراض الدولة الميدية، اصبحت اللغة تنحصر فى القضايا الدينية فقط والتى عرفت فيما بعد باللغة الأڤستيه.

استمرت هذه اللغة بمسيرتها الدينية الا انها كانت تنحصر فقط في متون الكتاب الدينى المقدس والتعاليم الدينية الأخرىٰ وعند رجال الدين، ومن ثم اخذت تختفى باختفاء الكتاب الدينى ورجال الدين انحصرت نفسها في صدور رجال الدين الذين اختفوا فى مناطف جبلية وعرة فى كردستان، والتى تعرف تلك المناطق بـ (هورامان، واللغة بلغة (ماچوّ. التى هى الان لاتزال وكما قلنا احدى اللهجات الكردية الدينية.

ان هذه الكلمات التى عرضناها هنا تحت مجموعه (ألف، ماهى الأعدد ضئيل من كلمات اللغة (الأيْريَنْ ڤجِتَه) القديمة. وقد قمت، كما يرى القارىء الكريم. بمقارنتها مع الكلمات المتشابهة لها معناً ولفظاً في اللهجات الكردية المختلفة وعبرها توصلنا الى:

- يعتبر اللغة الكردية حفيدة اللغة (الأيْرَين ڤَجيةَ) وانحدارها رأساً مباشراً
- إن علاقتها باللغة الپارسية القديمة عبارة عن علاقة القرابة ليست إلا.
- تمتلك اللغة الپارسية القديمة بعض الاصوات التى لاتوجد مثلها مطلقاً في اللغة (الايرين ڤجيه).

## ڕوناكبیری له كتێبی

# "زمانی نەتەوایەتیی كوردیدا

غازی فاتح وەیس

زمانی نەتەوایەتی ی كوردی

: دانانی :

الدكتور كامل حسن البصير

ئەندامی كارای كۆڕی زانیاری عراق
پرۆفیسۆری یاریدەر ــ كۆلیجی ئەدەبیات
زانكۆی المستنصریە

١٤٠٤ ك ــ ١٩٨٤ ز

چاپخانەی كۆڕی زانیاری عیراق

**پێشەكی : ــ**

كتێبی (زمـانی نەتـەوایەتیی كوردی) یەكێكە لە بەرهەمە بە نرخەكانی مامۆستای زانا دوكتۆر كامل بەصیر، ئەم كتێبە بریتی‌یە لە (٨٩) لاپەڕەو كۆڕی زانیاریی عیراق (دەستەی كورد) لە ساڵی (١٩٨٤)دا لە چاپی داوە. ئەم بەرهەمەو هەریـەكێـك لە بەرهـەمـەكـانی‌تری دوكتۆر كامل، جێگای دیاری‌كراوی خۆیان لە مەزرای ئەدەب و زمانی كوردی‌دا هەیە.

زمـانی یەك گرتـووی كوردی هەمیشـە یەكێـك بووە لەو كێشە سەرەكی‌یانەی كە تووشی ڕۆشنبیری كورد بووە، چ زمـانــەوان بوویـــێ و چ ئەدیـب بووبێ. هۆی سەرەكـی سەرهـەڵ دانی ئەم كێشـەیـەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆریی زاری كوردی‌و زۆریی زاریش جۆرەهـا هۆی هەیـە. بێ‌گـومـان زۆری زار لە زمـان دا دیـاردەیـێـكـی سروشـتـی یـەو بە كەم وكورتی دانانرێ، بەڵام نەبوونی زمانێكی یەك گرتوو بۆ میللەتێك كۆسپێكی هەرە گەورەیە لە ڕێگەی ئەو میللەتەداو بە كەم وكورتی‌یێكی یەك جار گەورە دادەنرێ. لەبەر ئەمە، دەبینین لە كۆن و نوێدا بووەتە مایەی لێكۆڵینەوەو چەندو چوون كردن لە نێوان ڕۆشنبیرە كوردەكان داو هەریەكێك لە قوژبنێكـەوە ویستـوویەتی چارەسەرێكی بۆ بدۆزێتەوە. واتە خزمـەت گوزاری زمــانـی كوردی مەبـەسـتـی سەرەكـی هەموویان بووە. بۆ نموونە دوكتۆر كامل لەم كتێبەدا دەڵێ :

بۆیـە هیـواداریـن كە ئەم پسپـۆرە زانـایانە بێن بە دەنگی ئەم لێ‌كـۆڵینـەوەیـەوەو بە چاوی هەڵ سەنگـانـدن تەماشای بكەن و هەرچی تێ‌بینی‌یەكیان دەرحەقی هەیە بە مەبەستی خزمەت گوزاری زمانە شیرینەكەمان بیخەنە ڕوو. (ل ـ ٩).

ئەم جۆرە هەڵوێستە لە لێ‌كۆڵینەوەی هەموو یەكێك لەو لێكـۆڵـەرەوانــەدا دەبینرێ، چی بە ڕاستـەوخـۆو چی بە ناڕاستـەوخـۆ. لەبـەر ئەمـە منیش دەمـەوێ وەكـو ئەو لێكـۆڵـەرەوانـە خزمـەتێكی زمـانی كوردی بكەم و مەرجیش

ی یە ئەم وتارەی ئێمە تەنیا ڕەخنەگرتن بێ لە کتێبەکەی دوکتۆر کامل، بەڵکو بەشداری کردنێکە لەو ئەرکە پیرۆزەی دوکتۆر (کامل)دا، واتە مەبەستی هەموومان حەل کردنی ئەو کێشەیەیە کە پێی دەوترێ زمانی یەك گرتووی کوردی، (زمانی نەتەوایەتیی کوردی).

**یەکەم: ناونیشانی کتێبەکە.**

به لای منەوە هەر تەنیا ناونیشانی کتێبەکە، بێ ئەوەی تەماشای ناوەرۆکەکەی بکەین، جۆش و خرۆشی زمان پەروەرێتی دەخاتە دڵ و دەروونی خوێنەرەوە، دەوری گەیشتنی هەواڵێکی نەزانراو دەگەیەنێ، چونکە تا ئێستا، یان لەبەر ئەوەی ئێمە ڕێمان پێ نەبردووە، یان لەبەر ئێمان لاوازی بەرامبەر بە زمانی کوردی، کەسمان ئەم ناوەمان بەم جۆرە بەکار نەهێناوە. کەوابێ ئەم ناونیشانەیە ئەو هۆ سایکۆلۆژی یەی سریەوە کە لە دڵ و دەروونمان دا پەنگی خواردبۆوەو زمانەکەی خۆمانی لاسوك کردبووین. لە هەمان کات دا ئەم ناونیشانەیە وەکو گورزێك وایەو تەنگای حەزلێ نەکەرانی زمانی کوردی دەتۆزێنێتەوە. لەبەر ئەمە پێویستە پشتگیریی پرۆژەکەی دوکتۆر کامل بکرێ، چونکە لەگەڵ خواست و ئاواتی هەموو خوێندەوارێکی کوردا دەگونجێ.

**دووەم: ئەم کتێبە لە ڕووی ڕێبازی لێکۆڵینەوەوە**

ئەگەر تەماشای بەرهەمە کوردییەکان بکەین، دەبینین بە دەگمەن پەیرەوییێکی تەواوی ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوەیان تێدا کراوە، بەڵام لە گشت بەرهەمەکانی دوکتۆر (کامل)دا ئەم لایەنە فەرامۆش نەکراوەو زانستانە تەکنیکی فۆرم و ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەی زانستی تێیان دا چەسپاندووە. وە هەر دوکتۆر (کامل)یشە یەکەم لێکۆڵینەوەی دەربارەی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی بە زمانی کوردی نووسیوەتەوە.[1] لەبەر ئەمە نابێ لامان سەیر بێ ئەگەر ئەم ڕێبازە باڵی بەسەر هەموو بەرهەمەکانی ناوبراودا کێشابێ. بۆ نموونە لەم کتێبەیدا بە پێشەکییێکی گەلێ بە نرخ، بە کورتی ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کە بۆ دامەزراندنی زمانێکی یەك گرتووی کوردی دراون، دەست نیشان کردووە. ئەم هەوڵ و تەقەلایانەش بەستنی کۆڕو چاوپێکەوتن و نووسینەوەن دەربارەی زمانی یەك گرتووی کوردی. بەم جۆرە، جگە لە پێشنیارو بیروراکانی نێو کتێبەکە، سەرانسەری کتێبەکە کورتە مێژوویێکی گەلێ بە نرخە دەربارەی ئەو هەولانەی کە دەربارەی زمانی یەك گرتووی کوردی دراون و سوودێکی زۆری هەیە بۆ نەوە تازەکانی کورد. هەروەها دانەر بابەتەکانی نێو کتێبەکەی وەکو زنجیرێکی ئاڵقە بە ئاڵقە بەیەکەوە بەستووەو وای لە خوێنەر کردووە بە تام و چێژێکی زۆرەوە کتێبەکە بخوێنێتەوە. جگە لەمەش سەرانسەری کتێبەکەشی کردووە بە جۆرەها ئەنجام و پێشنیاری بەسوودو ئەوەندەی هێشتووەتەوە، یان دەبێت یەکسەر پەیرەوی بکەین، یان ئەوەتا چەندو چوونێکی زۆری لەسەر بکەین، بێ گومان ئەمەش مایەی شانازی کردنە لای ئەو کەسانەی کە نرخی زانستیان لا گرانە.

**سێیەم: ناوەرۆکی کتێبەکە.**

ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ، بە تایبەتی ئەوەی زمانەوانی ڕاستەقینە بێ، ئەوەیە کە دوکتۆر کامل زمان و زارو ئاخاوتنی لەیەك جیاکردۆتەوەو ئەم جیاکردنەوەیەش پێویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە، چونکە ئەم سێ بەشە لەم کتێبەدا سێ کوچکانەیێکی یەك نەگرتوویان پێك هێناوە. جگە لەمەش دانەر نرخێکی یەکجار کەمی بۆ ئاخاوتن داناوە. بۆ نموونە دەڵێ:

«قسەکەر لە سازکردنی دەنگ و وشەو ڕستەو داڕشتنە گشتییەکان دا تا ڕادەییێکی زۆر ئازادو سەربەستەو پەیرەوی

دەستوورو بنەواشەی زمانی ناکات. (ل ١٢) هەروەها دەڵێ:

لەم ڕۆژانەدا بە دەگمەن دەبیستین کە دوێنەری کورد لە کاتی ئاخاوتنیدا پەیرەوی دەستووری بنیات نانی ڕستەی کوردی رەسەن بکات. (ل ١٤).

دیسان دەڵێ:

کەچی ئاخاوتن چالاکییێکی کەسییە لە کۆری ئیش و کاری ڕۆژانەدا لەبەر خێرایی گەیشتن بە مەبەست بەبێ پەیرەویکردن شێوەی زارو دەستووری زمان ئەنجام دەدرێ. (ل ٢٢).

ئەگەر تەماشای ئەو کتێبانە بکەین کە دەربارەی زانستی زمان نووسراونەتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە مێژووی زمان دەکۆڵنەوە، دەبینین زۆر دەمێکە نووسینەوەو ئاخاوتن لە یەکدی جیاکراونەتەوەو هەریەکەش سنوورێکی تایبەتی بۆ دانراوە. لە کۆن دا کەرەسەی دیراسەکردنی ڕێزمانی زمان لە نووسینەوەوە وەردەگیرراو لە سەردەمی ئێستاش دا لە ئاخاوتنەوە تەنگ و چەڵەمەی زمان یەکالا دەکرێتەوە. بۆ نموونە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا زانای زمانەوانی (دی سۆسێر) زمان و ئاخاوتنی لەیەك جیاکردەوەو دیراساتی سینکرۆنیك (Synchronic) و[2] (دایەکرۆنیك)ی هێنایە کایەوە. بەم جیاکردنەوەیە دیراساتی زمانەوانی تازە دەستی پێکردو تا ئێستاش ناوی (دی سۆسێر) وەکو ئەستێرەیێکی گەش لە ئاسمانی دیراساتی زمانەوانیدا دەدرەوشێتەوە. بە گوێرەی بۆچوونی (دی سۆسێر) زمان بریتییە لە سیستەمێکی یەك گرتووو لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر دەگوێزرێتەوەو ئاخاوتنیش ئەو قسانەیە کە قسەکەر دەیلێ و لێیان تێدەگات. لەم دواییەدا (چۆمسکی) ناوی توانای تێگەیشتنی لە یەکەم ناو ئەوی دیکەشیان توانای بەکارهێنانی زمان. بەم جۆرە دەتوانین ناوی یەکەم بنێین دەستوورەکانی زمان و ئەویتریان بەکارهێنانی ئەو دەستوورانە. واتە زمان چی نووسینەوە بێ یان ئاخاوتن، بێ دەستوور کارناکات. ئەم دەستوورانەش لە مێشکی ئادەمیزاددا ڕەگ و ریشەیان داکوتاوەو هەرکاتێ بیەوێ بە ئاسانی و بێ هەڵەکردن بەکاریان دەهێنێ چی بۆ نووسینەوە بێ و چی بۆ ئاخاوتن.

ئەمجا بابزانین لە زانستی زمان دا چۆن تەماشای نووسینەوەو ئاخاوتن کراوە: بۆ نموونە چۆن لایۆنز دەڵێ:[3]

ڕێزمانزانە کۆنەکان وایان دەزانی کە زمانی قسەکردن پایەیێکی کەمتری هەیەو لە ئاخاوتن دا مرۆڤ پەنا دەباتە بەر نووسینەوە. (ل ٣٨).

هەر لە هەمان لاپەرەدا دەڵێ:

زمانەوانە تازەکان گەیشتنە ئەو راستییەی کە زمانی قسەکردن سەرەکییەو نووسینەوە تەمسیلی قسەکردنە لە بوارێکی جیاوازدا.

دیسان دەڵێ:

لە چاخەکانی ناوەراست داو هەتا سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم ڕێزمان زان ئەو زمانەی شی نەدەکردەوە کە خەڵکی بەکاری دەهێنا، بەڵکو ئەو زمانەی شی دەکردەوە کە لە کۆن دا شاعیرو فەیلەسووفەکان بەکاریان دەهێنا. ئەمەش ئەو هەڵەیەیە کە من ناوی دەنێم هەڵەی کلاسیکی لە بۆچوونی شیکردنەوەی زمانەوانیدا (ل ١٤).

ڕێزمان زانەکان وایان لەیەك دەدایەوە کە ڕێزمان هونەری نووسینەوەی تەواوەو دەبێ تەنیا لە نووسینەوەی ئەدیب و شاعیرەکانەوە نموونە وەربگیرێ (ل ١٨ - ١٩).

جگە لەمەش زانستی زمان ئەوەی سەلماندوە کە زمان هەمیشە لە گۆران دایەو مێشکی مرۆڤ بەرپرسیارە بەرامبەر بە گۆران و زیادکردن و لەناوچوونی دەنگ و سەرهەڵدانی وشەی نوێ و ئەو دەستەواژە تازانەی کە لە زمان دا دروست دەبن و ئاخاوتنیش مەڵبەندی ئەم جۆرە گۆرانەیەو دەبێ لە نووسینەوەدا پەیرەوی بکرێن.

بەم جۆرە زمانی قسەکردن ئەساسی زمانی نووسینەوەیە، چونکە هەر دوور نەرۆین مێژووی نووسینەوە لە شەش

هەزار ساڵ زیاتر تێ ناپەڕێ، بەڵام مێژووی قسەکردن دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی ئادەمیزاد پەیدابووە.

لە نووسینەوەو ئاخاوتن دا دوو ئاستی جیاواز هەیەو بە پێی دەستووری گواستنەوە بەیەکەوە دەبەسترێن، یەکێکیان پێی دەوترێ ئاستی ژێرەوەو ئەوی تریان ئاستی سەرەوە. لە نووسینەوەدا زۆرتر ئاستی ژێرەوە بەکار دەهێنرێ، چونکە مرۆڤ لە نووسینەوەدا بیرکردنەوەییێکی قوڵ تر بەکار دەهێنێو هەمیشە دەیەوێ زیاتر بیرەکەی ڕوون بکاتەوە، چونکە کەس بەرامبەری ناوەستێو تەنیا خۆیو کاغەزەکەی بەردەستی بەشداری دەکەن، بەڵام لە قسەکردن دا زیاتر ئاستی سەرەوە بەکار دەهێنرێ، چونکە ئەوەی پێویستە ئەوترێو ئەوەی پێوەندی بە ئاستی ژێرەوەیە لە قسەکردندا، لە مێشکی قسەکەرو بیسەردا لەیەك دەدرێتەوە. بەشێك لە ئاستی ژێرەوە ڕاستەوخۆ بەستراوە بەو ڕوداوەوە کە قسەکەرو بیسەر باسی لێوە دەکەن و هەندێکی تریشیان بە لەش، یان بە بزواندنی دەست و سەرو شان... هتد دەردەبردرێن.

بەم جۆرە لە ئاخاوتندا ئەوەی زۆر گرنگ نەبێ ناوترێت، بەڵام دیسان ئەوانەی کە دەوترێن بەپێی دەستووری تایبەتی ئاخاوتن جێبەجێ دەکرێن، چونکە ئەگەر بەپێی دەستوور ئەنجام نەدرێن، ئەوا ناتوانرێ ناوی زمانیان لێبنرێ. هەر بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لە قسەکردن دا درێژە بە قسەکردن بداو ئەوانەی کە پێویست نین دووبارەیان بکاتەوەو وشەو ڕستەی زیاد لە پێویست بجوێتەوە، ناوی چەنەباز، یان زۆربلێ، یان خەڵەفاوی لێدەنێین، هەر نەبێ ئەوەی گوێ دەگرێ وەڕس دەبێو واتێدەگات کە قسەکەرەکە بە نەزانی دادەنێ. بەڵام لە نووسینەوەدا پێویستە نووسەر گەلێ شت ڕوون بکاتەوە چونکە کاتێ خوێنەر ئەو نووسینەوەیە دەخوێنێتەوە نووسەرەکەی لەبەردەم دا نی یە بۆ ئەوەی شتی پێویستی بۆ ڕوون بکاتەوە.

بۆ نموونە دوکتۆر کامل لە لاپەڕە (١٢٢)دا دەڵێ:

زمان هۆی دەربڕینی گشت ئەندامەکانی نەتەوەیەکە بەڵام زار شێوازی دەربڕینی کۆمەڵێك لەو نەتەوەیەیە.. کەچی ئاخاوتن چالاکی یێکی کەسی یە. (ل ٢٢).,

ئەوەی ڕاستی بێ زمان بەم شێوەیە دابەش دەکرێ:




بەم جۆرە ئاخاوتنی زمانی ستاندەرد دەبەسترێت بە نووسینەوەوە، چونکە نووسینەوە، کەرەسەکانی لە ئاخاوتنەوە وەردەگرێ، بەڵام زارو ئاکسێنت لە ئاخاوتن بەولاوە نارۆن. ڕاستە ئاخاوتن چالاکی یێکی کەسی یە، بەڵام هیچ جۆرە تایبەتیەك نی یە لە زمانی ستاندەردو زاری جیا بکاتەوە، چونکە زمان هەرچی بێ، زمانی ستاندەرد بێ یان زار ئاخاوتنی هەیەو ئەو زمانەی ئاخاوتنی نەبێ بە زمانێکی مردوو دادەنرێ.

بۆ نموونە پیتی (K) ی وشەی (Knife) ی ئینگلیزی بە پیتێکی مردوو دادەنرێ لەم وشەیەدا چونکە نادرکێنرێو ئەو وشەیەی کە بۆ ماوەیێکی زۆر لە ئاخاوتن دا بەکار نەهێنرێ دەمرێو تەنیا لە فەرهەنگ دا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو بەپێی دەست نیشان کردنەکەی دوکتۆر کامل بڕۆین دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە دەست نیشانی زمانی کوردیو زارەکانی بکەین:,



لێرەدا ئاخاوتنمان هەڵ گرت، ئەگەرچی ئەم کارە دژی هەمــوو یاســایێکی زانستی زمــانە، چونکە زمان هەرچۆنێك دابەش بکرێت دەبێ دوو بەش بێ، یەکێکیان نووسینەوەو ئەوی‌تر ئاخاوتن. هەروەها ئەگەر ئاخاوتنیش هەڵ بگرین، ئەوا دەبێ زانستی دەنــگ و فۆنــۆلۆجیش لە بەشــەکانی‌تری زمــان دابــڕین. بەڵام گریمــان وازمان لە هەموو یاسایێکی زانستی زمــان هێنــاو تەنیــا لەبــەر خاتــری ئەوەی زمــانێکی یەك گرتــووی کوردی دروست ببێ، هەمــوو ڕێگــەیێکی نابــەجێ‌ی زمــانــەوانیمــان بەکــارهێنــاو ئاخــاوتنمان بە هیچ دانــەنــا، دەبێ یەکــەم شت ئەوە بکــەین کە نەهێڵین بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کەس قسەبکات و کەسیش لەو شتانە زیاتر نەنووسێتەوە کە ئێمە پێی دەڵێین و دەبێ ئەوەی ئێمەش دای‌دەنێین لە ئاخــاوتنــەوە وەرنــەگیرێ. ئەگەر چی دیسان ئەمەش دژی زانستی زمانە، چونکە زانستی زمان دەڵێ: دەبێ زمــانــەوان وەسفی ئەو ڕێگــەیــە بکــات کە قســەکــەر بەکاری دەهێنێ لە قسەکردن دا، نەك وەسفی ئەو ڕێگەیەی کە فەرزدەکرێ‌و ئەبێ قسەکەر لە سەری بڕوات.

دیســان گریمــان بە پێچەوانــەی زانستی زمــانــەوە ئەم کارەمــان جێ‌بــەجێ کرد، ئایــا دەتــوانین زمــانی هەمــوو کوردێــك ببــەستینــەوە؟ یان ئایــا دەتــوانین قەڵــەم لە هەموو کوردێك بسێنینەوە، یان قەڵەم هەڵ گرتن قەدەغە بکەین و تەنیا پەیڕەوی قسەکانی ئێمە دەکەن؟

ئەوەی شایــانی باســە ئەگــەر زارێــك هەل و مەرجی بۆ ڕێــك کەوت و بوویــە ئەســاسی زمــانی ستــانــدەرد، دەبێ هەموو هەل و مەرجێکی‌تری بۆ دروست بکرێ بۆ ئەوەی ئەو ئەساسە نەڕووخێ یان بۆ ئەوەی ئەو ئەساسە تەواوبکرێ. بەڵام ئەگــەر هاتــوو زارێکی‌تــر لە پاڵ ئاخــاوتنــەوە، پێی نووســرایــەوەو بەرامبــەر بەو زارەکــەی‌تــر وەستا، ئەوا گومانی تێ‌دا نی‌یە دەبێ یەکێك لەم دوو شتە بقەومێ:

١ ـ یان دەبێ ئەو زارەی کە لەپێشەوە نیمچە زمانێکی ستــانــدەردی لێ دروست بووە سەرشــۆڕبکــات و چی‌تــر بەردەوام نەبێ لەو هەوڵەی‌دا.

٢ ـ یان دەبێ زاری یەکەم و زاری دووەم هەریەکێکـ ـ بین بە زمــانێکی سەربــەخــۆ. وە ئەگــەر سەیــری مێژوو‌ی ـ زمــانــەکــانی گێتی بکــەین دەبینین بەم شێوەیە زمان یان ... مردووەو زمانی تازەو زاری تازە دروست بووە. ئەمەش حەی ئێستای زمانی کوردی‌یە، ئەگەر بمانەوێ‌و نەمانەوێ.

بەپێی ڕای ڕۆمان یاکۆپسن، زمان وەکو زیندەوەر وایە بەپێی ماوە هەنــدێ لە شانــەکــانی دەمــرن و هەندێ شانەی نوێ جێگایان دەگرنەوە.

بەم جۆرە گۆڕان دروست دەبێ‌و ئەم گۆڕانەش زیاتر ـ گۆڕانی دەنگەوە دەست پێ‌دەکات و بە تایبەتی بزوێنەکانی (ڤاوڵەکانی) وشەو بە هۆی گۆڕانیانەوە لە ماوەیێکی دوورو درێــژدا وشــە دەگــۆڕێ‌و لە ماوەیەکی دوورو درێژ تریش د سیستەمی ڕستە، یان بەشەکانی ڕستە دەگۆڕێ یان بابڵێین ستراکچەری زمانەکە دەگۆڕێ.

گومــانیش لەوەدا نی‌یــە کە زمــان بریتی‌یــە لە کۆمــەڵێك ستراکچەری چنراوو بە هۆی دەستوورەوە لەیەك دەدرێن. کەوابو زمان تەنیا لە وشە پێك نەهاتووە بەڵکو لە دەنگ و فۆنیم و مۆرفیم و وشــەو فرەیــزو لاڕستــەو ڕستە پێك هاتووەو هەریــەکێــك لەمــانــەش لە ئاستــێکی تایبــەتی‌دا لێی دەکۆڵدرێتەوە. بەڵام یەك شت هەیە لێرەداو نابێ لە بیری بکەین ئەویش مەسەلەی دەوڵەمەندی زمانە، ئەگەر زمان لە هەموو بوارێك دا بەشێوەیێکی فراوان بەکارهێنرا، ئەوا بەم لاو ئەو لادا پەل دەهاوێژێ‌و لە هەموو کون و قوژبنێکەوە وشە وەردەگرێ بەرەبەرە دەوڵەمەند دەبێ.

لە لایەکی‌ترەوە دوکتۆر کامل دڵێ بەوە خۆشە کە دوکتۆر جەمال نەبەز دەڵێ: ڕۆژێ لە ڕۆژان هەندێ لە ڕاناوەکانی کرمانجی ژوورو لە کرمانجی ناوەڕاست دا هەبوون.

ئێمــە لێرەدا دەڵێین: لە سەدەی حەڤــدەهــەم دا چەنــد زانــایێکی زمــانــەوانی دەرکیــان بە هەبوونی هاوبەشی نێوان زمــانــی لاتــینی‌و سەنسکــریتی‌و گریکی‌و جەرمــانی کردو

دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی فیلۆلۆژی بەراووردو ئەوەیان بۆ ڕوون بووەوە کە ئەم زمانانە لە بنەڕەت دا سەربەیەك بنەماڵە بوون، چونکە لە گەلێ ڕووەوە لەیەك دەچوون. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە لەو سەردەمەدا گەلێ بەنرخ بوو بۆ یەکلاکردنەوەی مێژووی خێزانە زمانەکان. بەڵام ئایا بەراوردکردنی زارەکوردییەکان چ سوودێکی هەیە بۆ بنیات نانی زمانێکی یەك گرتووی کوردی؟ لە وەڵام دا دەتوانین بڵێین بەراوردکردنی زارە کوردییەکان بە لای کەمەوە سێ سوود بە ئێمە دەبەخشێ: -

**٢ - دەرخستنی لایەنی لێك چوونی نێوانیان.**

**٣ - وەرگرتنی وشەو زاراوە لە یەکدییەوە.**

بەراوردکردنی ئەو زمانانەی سەرەوە بە هیچ شێوەیێك ئەو زمانانەی لەیەکدییەوە نزیك نەدەکردەوە چونکە هیچ هۆیێك نەبوو یەکیان بخاتەوە، بەڵام بەراوردکردنی زارەکوردییەکان، لە یەکدییەوە نزیکیان دەخاتەوە چونکە هەموو هۆیێك لە ئارادایە بۆ ئەم مەبەستە تەنیا هۆی ڕۆشنبیری خاوەن زارەکان نەبێ! هەروەها بۆ نموونە ئەگەر ئێستە خەڵکی ڕۆما هەرچییێك بکەن ناتوانن ئەو زارە زیندوو بکەنەوە کە زمانی لاتینی لێ‌دروست بووە، جگە لەمەش زاری ڕۆما نەبوو بەو زمانە لاتینییەی کە هەموومان شتێکمان دەربارەی بیستووە، هەتا فەلسەفەو ئەدەب و مێژووی پێ نەنووسرایەوە، هەر کە بۆ نووسینەوە بەکارهێنرا ئەوانەی سەر بەزارەکانی‌تر بوون وازیان لەوە هێنا کە بەو زارانە بنووسنەوە، بەڵام وازیان لەوە نەهێنا کە قسەیان پێ بکەن.

هەر بۆ نموونە لە چاخەکانی ناوەڕاست داو لە چاخی ڕاپەڕینیش دا قەشەکانی ئەورووپا لە کەنیسەدا زمانی لاتینیان بەکار دەهێناو ئەو سەردەمانەش زمانی لاتینی زمانێکی مردوو بوو و هەوڵێکی زۆریشیان دا، بۆ ئەوەی زمانی لاتینی زیندووبکەنەوە، بەڵام هەوڵ دانەکەیان سەری نەگرت چونکە گەلێ هەل و مەرجی‌تر هەبوو، دەبوایە لەگەڵ هۆ ئاینییەکەدا یەك گرنەوەو یەکێك لەم هەل و مەرجانەش بەکارهێنانی زمانی لاتینی بوو بۆ نووسینەوەی ئەدەب و فەلسەفەو کتێب و ڕۆژنامەو بۆ هەڵسووراندنی کاروباری ڕەسمی. هەر دیسان بۆ نموونە، هەموو عەرەب هەستێ دەتوانێ زمانی قورئانی پیرۆز بەکارنەهێنێ بۆ نووسینەوە؟ نەخێر ناتوانن چونکە هەموو هەل و مەرجێکی‌تر لەگەڵ هۆ ئاینییەکەدا یەکیان گرتووە، با هەرچی هونەرمەندی میسریش هەیە بە زاری میسری فیلم دەربکەن!

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ هەموو هەل و مەرجێك لە ئارادا بێ ئەمجا دەتوانرێ زمانێکی یەك گرتوو دروست بکرێت، ئەگەرچی زمان دروست ناکرێت بەڵکو دروست دەبێ..

ئەمجا با بێینە سەر ئەو ڕێبازانەی کە بەڕێز دوکتۆر کامل بۆ سازکردنی زمانی نەتەوایەتیی کوردی پێشنیاری کردوون.

یەکەم ڕێباز، بوژاندنەوەی زمانی کوردییە لە ڕێگەی بزاوتنی ڕابووردووی دێرینی زمانەکەو پشت بەستن بە موتربەکردنی. دوکتۆر کامل ئەم ڕێبازەی بە چاك نەزانیوەو دەڵێ وەکو پینەدۆزی وایەو زوو هەڵ دەوەشێتەوە.

لێرەدا ئێمە پەنا دەبەینە بەر ڕای جۆن لایۆنز کە دەڵێ:

**١ - زمانی ستاندەرد ئەگەر دروستیش بێ بەرگۆڕان دەکەوێ.**

**٢ - بنەمای ئەو زمانە دروست بووە زمانی قسەکردنە، بە تایبەتی زمانی قسەکردنی کۆمەڵێك و قسەکردنی ئەو کۆمەڵە خەڵکەش زیادی بەسەر قسەکردنی کۆمەڵە خەڵکێکی‌تردا نییە، ئەگەر قسەکردنیان بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ بۆ نووسینەوەی ئەدەب و لایەنەکانی ڕۆشنبیریو زانست بەکارنەهێنرێت.**

لە پاڵ ئەم ڕایەدا دوو لایەنی گرنگ سەر هەڵ دەدەن:

١ - ناتوانرێ ناتەواویو تەواوی دەست نیشان بکرێت لە زمان دا، واتە ڕاستیو ناڕاستی دوو زار، یان دوو زمان،

دەست نیشـان ناکـرێت ئەگـەر لەگـەڵ یەکتـردا بەراورد نەکـرێن. کەوابێ ناتـەواوی یان تەواوی زارێـك لە چاو ئەویتردا دەردەکەوێو لە ڕاستیدا هیچیان ناتەواونین.

٢ ـ مەسەلەی تێك شکانی زمان و پەرەسەندنی، لە یەك جیـاناکـرێتـەوە. تێك شکانەکە ئەگەر سروشتی بوو ئەوا بە پەرەســەنــدن دادەنـرێ، چونکـە بە گۆڕانێکی سروشتی دادەنرێو گۆڕانی سروشتیش مێشکی خاوەن زمان دروستی دەکات.

بەم جۆرە زار، یان زمـان، نوقســتــان نییـە تا ئەو نوقستـانییـە پڕ بکـرێتـەوە لە ڕێگـەی موتـربەکردنەوە، هەر پەرەسەندنێکیش سروشتی نەبێ سەرناگرێت.

دووەم ڕێبـاز ئەوەیـە کە دەبێ لە ڕێگـەی لێکـۆڵینـەوەوە زمـانی یەك گرتـووی کوردی (نەتەوایەتی) دروست بکرێت بێ ئەوەی هیچ زارێکی کوردی بە سەرەکی دابنرێ.

بۆ پتـەوکـردنی قایـل نەبوونی دوکتۆر کامل بەرامبەر بەم ڕێبازە دەبێ بپرسین: ئایا دەبێ بە چی زارێك لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێ؟ ئەگەر بە هەموو زارەکانی کوردی لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێ دەربارەی خۆیان، ئەوا بۆ ماوەیەیکی کەم، زیاتر لە پێنج زمانی کوردی دروست دەبێ!

لە سێیـەم ڕێبـازدا، دوکتـۆر کامل سازگەی دەنگەکانی زارە کوردییـەکـان دەکـاتـە بنـەڕەتی دامـەزرانـدنی زمانی نەتەوایەتیو ئەمجا هەڵ بژاردنی ئەو دەنگانەی کە ڕەسەنن. لێـرەدا دەبێ پەنـا بەرینـەبەر زمانی قسەکردن و قسەکردنیش هەمیشـە لە گۆڕان دایـەو ناتـوانرێ دیراسەی مێژووی زمان بکرێت بەپێی ئاخاوتن.

لە چوارەم ڕێبـازدا دەڵێ دەبێ تاقـە وشـەیـەك بۆ تاقە مەبـەستێـك بەکـاربهێنـرێت. کەوابێ، بەپێی ڕای دوکتـۆر کامل، دەبێ واز لە جۆرەها وشەی هاوچەشن بهێنین کە لە زارە کوردییـەکـان دا بەکـاردەهێنـرێن. لێـرەدا دەبێ دۆش دابمێنین بەرامبەر بەوەی کە ئایا، بۆ نموونە، چی وشەیێك لەم سێ وشانە بەکاربهێنین کە هەموویان بۆ یەك مەبەست بەکاردەهێنرێن: شاخ، چیا، کێو.

بێ گـومـان دەبێ ئەوەش بڵێین کە دوکتـور کامل خۆشی ئەم ڕێبازەی بە چاك نەزانیوە.

لە پێنجەم ڕێبازدا دەبێ لە ڕێگەی وشەی ڕەسەنی زمانی کوردییەوە زاراوەو وشە دروست بکرێت و ئەمجا سازکردنی زمـانی نەتـەوایـەتیی کوردی. واتـە بە پێـوانـەکردنی وشەی ڕەسـەنی کوردی، وشـەی تازە دروست بکـرێت لە زمـانـە نەتەوایەتییەکەدا. لێرەدا پەنا دەبەینە بەر ڕای جۆن لایۆنز کە دەڵێ: بۆ ماوەییەکی دوورودرێژ زمانەوانەکان لەو باوەڕەدا بوون کە بە هۆی قیـاســەوە وشــە لەدایــك دەبــێ یان سازدەکـرێت و هەنـدێ لە زمــانـەوانـەکـانیش ئەم جۆرە قیـاسـەیـان بە ڕووخـاندن دادەنا، چونکە هەموو وشەکانی زمانێك بە تاقە ڕێگەیەك پێك ناهێنرێن. هەروەها لەوانەیە لە ئاکـامی تەشبیهـ کردن دا، بەپێی ڕێبــازێکی نەسـازی پێــك هێنـان، وشـەی نارەوا دروست ببێ، بە تایبـەتی لەو کاتەدا کە منالێ تازە فێری زمان دەبێ بەڵام بەپێی ڕای جۆن لایـۆنـز، دروست بوونی وشـەی تازە بە هۆی قیـاسـەوە بە ڕووخـانـدن دانانرێ بەڵکو بە دەوڵەمەند بوون دەژمێردرێو منـاڵیش کاتێ بەپێی ڕێبـازی نەسـازی پێك هێنان، وشەی نارەوا دروست دەکات، کاتێ گەورە بوو ڕاستی دەکاتەوە!

لە ڕێبــازی شەشـەم دا دوکـتـۆر کامــل پێشنیــاری تێکەڵ کردنی ڕێزمانی زارە کوردییەکان دەکات بۆ وەدەست هێنانی زمانی یەك گرتووی کوردی.

ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە کە هەر زمانێك سیستەمێکی تایبەتی هەیە، زاریش بە هەمان شێوە سیستەمێکی تایبەتی هەیە، ئەگینا بەزار دانانرێ.

دکتۆر کامل لە سازکردنی ڕستەداو لێکدانی ڕستەی کرمانجی ناوەڕاست و ژوورو، (کوژ را)و (هاتەکوشتن) دەکاتە نموونەو بەپێی ڕای دوکتۆر ئەگەر بڵێین (پیاوەکە کوژ را) ئەوا دەتوانرێ بکەرەکەی بناسێنرێ، بەڵام لە (هاتەکوشتن)دا بکەرەکە نادیارەو ناتوانرێ بناسێنرێ. لێرەدا ئەگەر لە بادینانی‌یەکیش بپرسیین ئەویش دەڵێ لە (هاتە کوشتن)دا دەتوانرێ بکەرەکەی بناسێنرێ. ئەم جۆرە هەست کردنە تەنیا خاوەن زاریان خاوەن زمان دەرکی پێ‌دەکات و ئەمەش سری زمان و زاری ڕەچەڵەکە.

هەروەکو وتمان هەوڵ دانەکەی دوکتۆر کامل پرۆژەیێکی گەلێ بەکەڵکەو دەبێ پشتگیری بکرێت، چونکە سەلماندوویەتی کە میللەتی کورد خاوەنی زمانێکی نەتەوایەتی خۆی بووەو دەبێت ئەو زمانە یەك بگرێتەوە. ئەگەر تەماشای کتێبی (زمانی ئەڤێستا)[٤] بکەین، بەداخەوە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نی‌یە چەند نموونەیێکی زمانەوانی پتەوی پیشان خوێنەر بدەین، گەلێ بەڵگەی بە نرخمان دەست دەکەوێ کە زمانی کوردی سەدان ساڵ پێش ئێستا زمانێکی سەربەخۆی دەوڵەمەندبووەو بە هیچ شێوەیێك لە فارسی تازەو کۆنەوە دانەڕێژراوە. بەم جۆرە پێویستە هەمووومان هەوڵی ئەوە بدەین بە چی ڕێبازێکی زانستانەی ئاسان و پڕ مەبەست ئەو زمانە ببووژێنینەوەو گومانیش لەوەدا نی‌یە ئەو ڕێبازانەی کە دوکتۆر کامل لە کتێبەکەی‌دا پێشنیاری کردوون، گەلێ لایەنی بە نرخیان تێ‌دایە لەم بارەیەوەو بە لێ‌کۆڵینەوەی زیاترو پێڕەوی کردنێکی زانستانەش لایەنە بە نرخ و چاکەکانیان دەردەکەوێ، بێ‌گومان ئەمەش ئەرکی گەرشانی هەمووومانە.

لە کۆتایی‌دا سەرکەوتن بۆ دوکتۆر کامل دەخوازم و بۆ ئەوانەش کە لە پەنای دکتۆر (کامل)ەوە دڵسۆزانە دەڕواننە زمانی کوردی.

## پەراوێزەکان

---

١ - بڕوانە بەرگی یازدەهەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد. ل (١٢ - ٢٩) ١٩٨٤:

٢ - دیراساتی سینکرۆنیك، واتە دیراسەکردنی زمان لە ماوەیێکی دەست نیشان کراوی تایبەتی‌داو دایەکرۆنیکیش دیراسەکردنی زمانە بە درێژایی مێژوو.

٣ - بڕوانە کتێبی Loyns. J. Introduction to Theoretical Linguistics. (1968).

٤ - دوو ساڵ زیاترە خەریکی وەرگێرانی زمانی ئەڤێستام و ئێستا خەریکی پاك نووس کردنیم. لەم کتێبەدا گەلێ بەڵگەی پتەوم دەست کەوتووە کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆ بووە. داوا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم چاوەڕوانی دەرچوونی بێت.

## ملخص البحث

# التنوير في كتاب «زمانى نەتەوايەتى كوردى - اللغة القومية الكردية»

غازى فاتح وەيس

يتناول هذا التحليل هذا الكتاب الذي الفه الدكتور كامل البصير وصدر عام ١٩٨٤ من الهيئة الكردية في المجمع العلمي العراقي، يشيد الكاتب باهمية الكتاب في المقدمة ويتناول تلك المشكلة التي اشغلت افكار المثقفين الكرد، وان اسباب بروز هذه المشكلة تعود الى تعدد اللهجات الكردية، وهذه ظاهرة طبيعية ولا تعد نقصاً او عيباً، وان عدم وجود لغة موحده لشعب ما يعتبر عائقاً كبيراً في طريق هذا الشعب ونقصاً كبيراً جداً، ولهذا باتت تلك المشكلة منذ القدم وليومنا هذا مثار نقاش ودراسات المثقفين. بعد ذلك يقف السيد غازى على عنوان الكتاب ويدعو الى دعم المشروع الذي يطرحه الدكتور كامل لذا يتفق مع آمال وطموحاتنا جميعاً. وبعد ذلك ينتقل الى تقييم الكتاب من حيث المنهج الدراسي الذي يلحق المضمون بالشكل، اي انه لم يهمل جهود الذين سبقوه في هذا المجال وبهذا يعتبر نبذة تاريخية عن المحاولات والجهود الذي بذلت في هذا الطريق. ثم يقف على محتوى الكتاب ومضمونه ويحلل ويناقش آراء الدكتور كامل البصير، مثلاً يقول الدكتور كامل ان اللغة ما معناه تتمثل بجميع افراد الامة وهي وسيلة للتعبير اما اللهجة فهي وسيلة لمجموعة من تلك الامة. ثم يقف على تقسيم اللغة - اللغة الاساسية - القاعدية - اللنهجة - اكسيت.

وان اللغة الكردية - القومية بلهجاتها تشكل اللغة الاساسية التي لها قاعدة واساس راسخ.

ثم يدعو الى بذل الجهود لتكوين لغة فصيحة موحدة، ثم يشير الى الاتجاهات التي حددها مؤلف الكتاب واقتراحه لتكوين اللغة القومية الكردية، حيث يحددها بتطوير اللغة الكردية عبر تحريك التراث القومي والاعتماد على تصحيح اللغة الكردية بموروثنا القديم.

ثمة رأيان هامان:

١ - لايمكن تحديد النقص والتكامل في اللغة، اي صحة وعدم صحة لهجتين اولغتين اذا لم تطابقا معاً، وفي الواقع ان ايا منهما غير ناقصه.

٢ - لايفصل بين تحطيم اللغة وتطويرها، فاذا كان التحطيم طبيعياً فهو يعتبر تطوراً لأنه يعتبر تطوراً طبيعياً لصيغه دماغ الناطق باللغة. ولهذا لاتكون اللغة او اللهجة نقصاً حتى يسد هذا النقص او يعالج وكل تطور لايمكن ان يستمر ان لم يكن طبيعياً. والاتجاه الثاني يتم عن طريق الدراسة دون فرض لهجة على أخرىٰ، والاتجاه الثالث يجعل الاصوات الكردية قاعدة لتكوين اللغة القومية ثم اختيار الاصوات الاصيلة، والاتجاه الرابع يذهب ان نستخدم المفردة لغرض واحد اي التخلي عن المفردات المترادفة والاتجاه الخامس يقترح بان تكون المصطلحات والمفردات عن طريق الكلمات الاصيلة الكردية ثم نبدأ بتكوين اللغة القومية الكردية.

وفي الكتاب جملة من المسائل الاخرى تناولها السيد غازى باسهاب.

# پێناسینی زاراوە

حەسەن
د. کامل بەصیر

•

ئێمە لەو باوەڕەداین کە هەموو بابەتێکی زمانی پێویستە لە ڕوانگەیێکی نەتەوایەتی‌یەوە شی بکرێتەوەو بخرێتەبەر لێکۆڵینەوەو هەڵ سەنگاندن، چونکە زمان دەنگی هەست و سۆزەو ئاوێنەی مێشك و بیرەو هەنگاو بە هەنگاو بەدرێژایی مێژوو لە بۆدەقەی (بوتەی) ژیان دا بنەواشەو دەستوورەکانی لە ڕووی دەنگ سازی‌و وشەسازی‌و ڕستەسازی‌و شێوازەوە پێك هاتوون.

لە بەر تیشکی ئەم ڕاستی‌یەدا، کە لە نرخی زمان دەکۆڵینەوە دەڵین: زمان نەتەوەیەو نەتەوەش زمانە.

هەروەها جیاوازی زمانێك لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیێکی‌دی بە ئاکامێکی پیرۆز لە قەڵەم دەدرێ‌و بە شورەی پاراستن تەماشا دەکرێت.

ڕاستە، کە هەندێ کەس بێ‌دوو و سێ لێ‌کردن بروا بەم ڕاستی‌یە بەڵگە نەویستە ناهێنن، بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم کەسانە لە چ بەرەیەك دان و چۆن؟ بیردەکەنەوەو پلەی پسپۆرییان چەندە؟ چونکە بابەتی زمان لەسەر دەمی زۆرانی ئابوری‌و ڕامیاری‌و نەتەوایەتی‌دا بووە بە کێشەیێکی ژیانی‌و ئەرکی چەگی مان و نەمان دەگێرێ.

بەم پێیە هەر زمانەوانێك لە بۆچوونێکی فەلسەفی تایبەتی خۆیەوە دەڕوانێتە سروشت و بەهای زمان. نەخشەی جیهانی لەم ڕووەوە دەی‌سەلمێنێت کە سێ ڕووکاری دەستەو یەخە دەجەنگێن:ـ

یەکەم:

ـــــــــ ڕووکاری کەسی سەرمایەداری: کە زمان بە هۆیێکی دەربڕینی ڕۆژانە هەڵ دەسەنگێنی‌و تاقە نرخی لەوەدا دەست نیشان دەکات کە وەکو هەموو شمەکێکی‌دی قازانجێکی کەسی دەهێنێتە دی‌و ئەرکێکی ڕۆژانە دەبابەڕێوە. پەیڕەوی‌کەرەکانی ئەم ڕووکارە بەلایانەوە گرنگ نی‌یە، لەم کۆڕەدا بە زمانی زگماکی‌یان قسە بکەن، یان بە زمانێکی بیانی، چونکە بەلایانەوە گرنگ ئەوەیە کە بەرژەوەندی‌یان بچێ بەڕێوەو سوودی کەسی‌یان وەچنگ بهێنن.

سەر ئەنجامی سامناکی ئەم ڕووکارە لەوەدا دێتە بەرچاو کە گرنگی بە وشەی ڕەسەن نادات و دەستووری زمان پەیڕەوی ناکات و دەرگا دەخاتە سەر گازی پشت بۆ وەرگرتنی زاراوەی بیانی‌و سنگ کردنەوە بۆ گشت کارتێ‌کردنێکی نارەسەن.

دووەم:

ـــــــــ ڕووکاری کۆمەڵەیی چینایەتی: کە زمان بە پێوانەی قازانجی چینەکانی نەتەوە هەڵ دەسەنگێنێ‌و دەی‌کا بە ڕواڵەتی ژیانی چینەکان و بەگوێرەی ئامانجی چینی سەرکەوتوو لە خەباتی چینایەتی‌دا نرخی دەداتێ‌و بواری خەملاندنی بۆ دابین دەکات و ڕێگای پەرەسەندنی لە هەموو ڕوویەکەوە دەست نیشان دەکات.

سێیەم:

ـــــــ ڕووکاری نەتەوایەتی، کە زمان بە سامانی میللەت دەزانێ و بۆ پاراستنی لە دەستکاریکردن و لە خشتەبردن و پینەکردنی زانستە زمانییەکان بەکار دەهێنێت و بە هیچ جۆرێک ڕێگا نادات وشەی بێگانەو زاراوەی نارەسەن و دەربڕینی نازگماکی بهاوژێنە ناو فەرهەنگی زمانی نەتەوایەتییەوە.

زەمینەی بابەتی زاراوە، کە شابابەتە زمانییەکانە لە دێرترین سەردەمەوە بەو سێ ڕووکارە شەپۆلی داوەتەوەو لایەنە جۆر بە جۆرەکانی جێگای مشتومڕی زمانەوانەکانە، بۆیە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ پێناسینی زاراوە ڕێبازێکی شیکەرەوەو بەراوردکار دەگرینە بەروو، هەموو بەندێکی پاش یەکالاکردنەوە دەچەسپێنین و قۆناغ بە قۆناغ پێکی دەهێنین.

زمانەوانەکان بە درێژایی مێژووی زمانی مرۆڤایەتی چ یونانی و ڕۆمانی بن، چ عەرەب لەسەر ئەوە یەکدگیرن، کە زاراوە وشەیەکە، ئەمجا بەرەنگاری پرسیارێک دەبن کە دەپرسێت: نرخی وشە لە زمان دا چییە؟

ئایا وشە لەچاو ڕێزمان کە بڕبڕەی پشتی زمانە پایەی هەیە یاخود ئاکامێکی ڕواڵەتییەو لە بنیات نانی زمان دا ئەرکێکی گرنگی نییە.

ئەم پرسیارە زمانەوانەکان بەسەر دوو تاقم دا دابەشی دەکات:ـ

تاقمی یەکەم: کە ڕابەرەکەیان بەگوێرەی مێژوو (أرسطوطاليس)ە لەو باوەڕەدان کە وشە بەردی بناغەی زمانەو ناشێ بەبێ بنەواشەو دەستوور سازبکرێ و واتاکەی بگۆڕدرێ.

أرسطوطاليس[1] لەم کۆڕەدا بۆ دەستکاری کردنی واتای وشەی بە مەبەستی سازکردنی زاراوە: میتافور[1] چوار بناغەی چەسپاندووە:ـ بناغەی گواستنەوەی واتای وشە لە ڕەگەزەوە بۆ جۆر، بناغەی گواستنەوەی واتای وشە لە جۆرەوە بۆ ڕەگەز، گواستنەوەی واتای وشە لە جۆرەوە بۆ جۆر، گواستنەوەی واتای وشە بەپێی ڕادەی پەیوەندی.

تاقمی دووەم: کە سەرکردەکەیان (هۆراس)ی[2] ڕۆمانییە بیرو ڕایان وایە کە وشە لە بنیات نانی زمان دا ڕەسەنی و نارەسەنییەکەی گرنگ نییە بۆیە لە میانی بەراوردکاری‌دا وشە بە گەڵای درەخت دەشوبێنن و ڕێزمان بە ڕەگ و ڕیشە لە قەڵەم دەدەن. مێژوو نووسەکانی زمان کە بۆچوونی ئەم دوو تاقمە هەڵ دەسەنگێنن، سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشن کە تاقمی یەکەم بۆ چوونەکەیان کاردانەوەی هەڵوێستی (سوفسطائی)یەکانە، چونکە (سۆفسطای)یەکان ڕایان وابوو کە.وشە داردەستی دوێنەرەو دوێنەر بۆی هەیە بە گوێرەی مەبەستی خۆی بەکاری بهێنێ و بۆ قازانجی تایبەتی ڕاڤەی بکات و واتاکەی لێك بداتەوە بۆچوونی تاقمی دووەم: لەوەوە هاتووە کە زانا ڕۆمانییەکان زمانی یونانی یان دەپەرست و بڕوایان بە توانای زمانی نەتەوەکەیان نەبوو کە پێی بکرێ پەرە بسێنێ و زاراوەی ڕەسەن بۆ واتای تازەو پێداویستی نوێ ساز بکات.

ئەم هەڵ سەنگاندنە بەلای ئێمەوە لە ڕاست کێشەکەوە دوورە، چونکە وشە لە زەمینەی زاراوەدا پەیوەندی بە هەست و نەست و تێ‌ڕوانینی نەتەوەوە هەیەو بە هیچ جۆرێك نیشانەیێکی بێ‌گیان و مردوو نییە، بەڵکو ڕوەکێکە لە کێڵگەی ژیانی جەماوەردا ڕواوە.

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم بۆچوونەمان هەر وشەیێکی کوردی ڕەسەن وەربگرین بۆمان دەردەکەوێت کە تۆمارگای مێژووی نەتەوەی کوردەو هەموو ڕۆڵەیێکی ئەم نەتەوەیە کە لە منداڵییەوە بەکاری هێناوەو، هۆگری بووەو دان یادگاری کەسی بە هۆیەوە ڕوونووس کردووە.

بۆ نموونە وشەی (پشتیوان)[3] لە فەرهەنگی کوردەواری‌دا بە واتای دارێك هاتووەکە لە پشت دەرگاوە دا دەچەقێنرێ بۆ ئەمەی بخرێتە بەر پشکۆڵ بۆ قاییمی...

لە کۆری ڕۆژانەدا مرۆڤی کورد پەرەی بەو واتایەی داوەو بەرامبەری بە هەموو مەبەستەکانی برایەتی و هاوڕێیەتی و

(١) میتافۆر: Metaphor: خوازە: مەجاز
المجاز:

هاوقازانج بەکاری هێناوە.

ئیستاش لە بواری ئابوری‌دا بووە بە زاراوەیێکی دارایی بە واتـای (الـرصیـد)ی عەرەبی، بۆیـە کە هەموو کوردێك زاراوەی پشتیـوان بەکـار دەهێنێ یادگـارەکـانی لەگـەڵ ئەم وشـەیـەدا دەبـوژێتـەوەو واتـا دێـرینەکانی دەهێنێتە بەرچاو و ئەرگی داریی لە ژیان دا چاك دەزانێ.

بەپێچەوانەی ئەم بارەوە ئەگەر هات و وشەیێکی بییانیمان لەبـری زاراوەی پشتیـوان بەکـارهێنـا، هیـچ هەستێکمـان ناجـوولێ‌و وەکـو نیشـانـەیێکی ئامێـریی بێ‌گیـان بەکـاری دەهێنین بەپێی ئەم بۆچوونەمان کە بەندی یەکەمی پێناسەی زاراوە بە وشـە دەچـەسپێنین، پێـویستـە ئاوەڵنـاوی رەسەنی بخرێتە پالی‌یەوەو بوترێ: زاراوە وشەیێکی رەسەنە.

بەگـوێـرەی شی‌کردنەوەی سروشتی زاراوە پێویستە لێرەدا سەرنج بۆ ئەوە رابکێشین، کە وشە بە گشتی سێ بەشە: ئامرازو ناوو فرمان.

جا لەبـەر ئەوەی ئامـرازو فرمـان بۆ سازکـردنی زاراوە بە زۆری دەست نادەن دەبێ واژەی وشە لە پێناسەکەدا بکرێ بە ناو و بوترێ: زاراوە، ناوێکی رەسەنە.

زمـانـەوانـە هاوچەرخەکان کە لەسەر رێگا دەست نیشان کراوەکـانی (أرسطـو) بۆ گواستنـەوەی وشـە لە واتایەکەوە بۆ واتـایێکی تێبینیـان هەیـە سێ ریگـای[٤] دی لەم سووچـەوە دەخەنە روو:

یەکـەم: فراوان کردنی واتـای وشـەو شکاندنی سنووری لە چەمـەگێکی تایبـەتی‌یەوە بۆ مەبەستێکی فراوان... نموونە بۆ روون کردنەوەی ئەم رێگایە لە زمانی کوردی‌دا زاراوەی (سـەرچـاوەیـە) کە لە فەرهـەنـگ دا بۆ واتـایـێـکـی دەست نیشـان کراو بەکـارهـاتـووەو لە مەیـانی رۆشنبیـری‌و زانیاری‌و زانستی‌دا بووە بە زاراوەیێکی ژیاری فراوان.

دووەم: تایبـەتی کردنی واتـای فراوانی وشـەیـێـك و گواستنەوەی لە جوغزیکی بەربڵاوەوە بۆ ئەرکێکی دەست نیشان کراو: وێنـە بۆ ئەم رێگـایـە لە زمـانی کوردی‌دا، با زاراوەی (گەرێن) بێت کە بۆ واتای (ئۆتومۆبیل) سازکراوە:- وشـەی (گـەرێن) لە فەرهەنگی کوردی‌دا ئاوەڵناوێکە بۆ هەموو شتێك کە پێی بکرێت هاتووچۆ بکات. زمانەوانی کورد کە ئەم وشـەیـەی کردووە بە زاراوە، واتـا گشتی‌یەکی تەنگەبەر کردووەو بۆ شتێکی تایبەتی بەکاری هێناوە.

سێیـەم: گواستنـەوەی وشـەیـێـك لە واتـایـەکـەوە بۆ واتایێکی‌دی لەبەر جۆرە لێك چوون و پەیوەندی‌یەك: بەڵگە بۆ روون کردنەوەی ئەم رێگایە لە زمانی کوردی‌دا زاراوەی (رێنووس)ە، کە واتا راستەقینەکەی بە هۆی یەك چوونەوە بووە بە زاراوەیێك بۆ دەرکاندنی رێ‌و شوێنی نووسین.

بەڵگەیێکی‌دی، با وشەی (زمان) بێت کە لە فەرهەنگی کوردەواری‌دا واتـای هۆی ئاخـاوتن دەگەیەنێ‌و زاراوەسازی کورد بەرامبەر بە زاراوەی (اللغە)ی عەرەبی بەکاری هێناوە، چونکە لە نێوانی ئەم دوو واتەیەدا پەیوەندیی هۆی هەیە.

ئەم سێ رێگـایـەی سازکـردنی زاراوە لە زانستی زمـانی هاوچـەرخ دا رەنگـە لەچـاو بۆچـوونـەکـەی(ارسطـوطالیس) کارێکی تازە نەبێت، بگرە بە زۆری لە چوار بناغەکانی ئەم فەیلەسوفە یونانی‌یە دەچن.

ئەمـە راستی‌یێکی ئاشکـرایـە، بەڵام دووپات کردنەوەی چۆنیـەتی سازکـردنی زاراوەو خستنـە رووی ئەو رێگـایـانـە پرسیارێکی گرنگ بەرپا دەکات، کە دەپرسێت: وشە کە لە واتـایـەکـەوە بۆ واتـایێکی‌دی دەگـوێـزرێتـەوەو دەکـرێ بە زاراوە... ئایـا واتـا دێـرینـەکەی دەفەوتێ‌و لەیاد دەچێت، یاخوود بە زندویەتی لەتەك واتا زاراوەیی یەکەی وشەکەدا دەمێنێتەوە؟.

زۆربـەی زمـانـەوانـەکـان لەو باوەڕەدان کە وشـە بوو بە زاراوە، تەنیـا واتـا زاراوەیی‌یـەکـەی مەبـەستەو پێویستە واتا پێشووەکەی لەیاد بکرێت.

زمانەوانە دێرینە عەرەبەکان[٥] لەبەر تیشکی ئەم باوەڕەدا، کە جۆرەکانی وشەی لە رووی گۆڕینی واتاوە شی دەکەنەوە دەڵێن: وشە لەم رووەوە سێ جۆرە:

یەکەم: (الحقائق اللغویة)

واتـە ئەو وشـانـە کە واتـاکـانیان بە گوێرەی بەکارهێنانی زمانەوە ڕاستەقینەن و مەجاز نین. وەکو وشە:-
الاسد: شێر
الام: دایك
الارض: زەوی
دووەم: (الحقائق الشرعیة)
واتـە ئەو وشـانـە کە ئایینی ئیسـلامی پیرۆز بۆ واتایێکی شەرعی بەکاریان دەهێنێ وەکو وشەی:
الصلاة: نوێژ
الصیام: ڕۆژوو
الحج: چوون بۆ ماڵی خوا
سێیەم: (الحقائق العرفیة)
واتە ئەو وشانە کە بەگوێرەی مەبەستی کۆمەڵ بۆ واتایکی تایبەتی بەکار دەهێنرێن وەکو وشەی:-
الدابة: گوێدرێژ.
ئاکـامـی ئەم لایـەنـە لە بابـەتی پێنـاسینی زاراوەدا کێشەیێکی گرنگ دەربارەی ڕەسەنی و نارەسەنی زاراوە بەرپا دەکات و ڕێگا بە هەندێ زمانەوان دەدات کە بڵێن: مەرج نی یە زاراوەی نوێباو هەمیشە لە فەرهەنگی نەتەوایەتی یەوە وەرگیرابێت، بەڵکو دەشی وشەیێکی بیانی بێت، بەتایبەتی لە زانستـە هاوچـەرخـەکـان دا کە لە باوەشی شارستـانیەتی ئەوروپایی دا لەدایك بوون.
سەرنـج دانێـك لە فەرهـەنگی زاراوەی کوردی دووپاتی دەکـاتـەوە، کە بەداخـەوە هەنـدێ لە زمـانـەوانە کوردەکان گیـرۆدەی ئەم داوەن و بەبێ باکی زاراوەی بیـانی بەسـەر زمـانـە نەتـەوایەتی یەکەمان دا دەسەپێنن و تێ ناکوشن لەبری ئەو زاراوە بیانی یانە زاراوەی کوردی ڕەسەن ساز بکەن.
• هۆی ئەم بارە هەرچـی بێـت، پێـویستـە بۆ نەهێشتنی ڕوونی بکـەینـەوە، کە وشـە بە گشتیو زاراوە بەتـایبـەتی ڕ[illegible]نیکـە نە کێنگـەی بوونی مرۆڤ دا سەوز بووە:- زانـای بەناوبانگ (برووکا)[ ] لەم ڕووەوە دەڵێ: مەڵبەندی ئاخاوتن لە توێی سێیەمی لای چەپی مەغزی مرۆڤ دایەو مرۆڤ هەر وشـەیێـك لە نەتـەوەکـەیـەوە فێـر دەبێت لەو مەڵبەندەدا تۆمـاری دەکـات و لە کاتی پێـویستیدا یادی دەکـاتـەوەو بۆ وتووێژ لەگەڵ هاوزمانەکانیدا بەکاری دەهێنێ.
ئێمە پشت بەم وتەیەی (برووکا) دەبەستین و دووپاتی[٧] دەکـەینـەوە کە بەکـارهێنـانی وشـە کارێکی هۆشمـەنـدیو دەروونی یەو بە دوو هەنگاوی سەرەکی ئەنجام دەدرێ:-
یەکەم:
ـــــــ هەنگاوی تۆمارکردنی زاراوە لە مێشکی مرۆڤ دا کە لە ڕێگـای یەکێـك لە هەستکـارەکـانـەوە لە ژینگـەدا وەردەگیـریو وەکـو نیشـانـەیێکی دەنگی لەبـری شمەکە ناو لێنراوەکەی دەچەسپێنرێ.
دووەم:
ـــــــ هەنگاوی وروژاندنی زاراوەکە لە تۆمارگاکەیەوە کە مرۆڤ هەست بە شمـەکـە ناولێنـراوەکـەی دەکـات و دەیەوێ دەربارەی بدوێت.
هەرچـۆنێـك بێت ئەم دوو هەنگـاوەی وەرگـرتنی زاراوەو بەکارهێنانی دەیسەلمێنن کە زمانی نەتەوایەتی زەمینەیێکی بێخـاوەن نی یـەو بەبێ ڕێو شوێن ڕەشـەبـا لەم لاو لەو لا تووی ناهەمواری تێدا بوەشێنی، بەڵکو سەرچاوەی نەمری ژیانی جەماوەرە.
زاراوەی بیـانی کە بەسـەر پێـچ کردن لەم ڕاستی یـانـە دەهـاوێـژ رێنـە ناو زمـانـە شیرینەکەمانەوە زۆر جار بە هەڵە بەکار دەهێنرێن، بۆ نموونە زاراوەی کلاسیکی کە هەندێ خوێنەری کورد بۆ واتان هۆنراوەی دەێرین بەکاری دەهێنن، لە فەرهەنگی ڕەخنەسازی ئەوروپایی دا مەبەستەکەی وا نی یـە[٨]، بەڵکـو چەشنی شانـۆگـەری تراجیـدیو کۆمیـدی دەگەیەنێ هەندێ زاراوەسازی کورد لە هەمان ڕووکاری هەڵەوە زاراوەی پینـەکـراو لە وشـەیێکی عەرەبیو پاشگـرێکی لاتینی دادەتـاشن، وەکـو زاراوەی (صـۆفیزم). یاخود بە هەڵە زاراوەی عەرەبی وەردەگێرنە[٩] سەر زمانی کوردی...
بۆ نمـوونـە زاراوەی (خـۆیـیشـان دان) بەرامبـەر زاراوەی (المظاهرة)، کە واتاکەی لە زمانی عەرەبیدا (پشگیری لە یەك

ـرنـ)ە .

ـەلای ئێمەوە زمانی نەتەوایەتی کوردی ئەگەر بێت و شارەزای ـێ ئەوەنـدە دەوڵـەمـەنـد بە پیتە بۆ سازکردنی هەموو زاراوەیێکی ـێـویـست دەست دەدات بۆ بەڵگە ڕێبازەکانی ئەم زمانە بێ خاوەنە ـە کۆڕی زاراوەسـازیدا حەوت ڕێبـاز[١٠] دەخـاتـە بەردەستی ـ ـوەسازی کورد کە ئەمانەی خوارەوەن :ـ

**یەکەم: ڕێبازی وەرگرتن.**

**دووەم: ڕێبازی ئاوەڵواتا.**

**سێیەم: ڕێبازی لێکدان.**

**چوارەم: ڕێبازی داتاشین.**

**پێنجەم: ڕێبازی دارشتن**

**شەشەم: ڕێبازی وەرگێران**

**حەوتەم: ڕێبازی نازرەرێژ.**

کەوابـوو بەنـدێکی دووەمی پێنـاسینی زاراوەی کوردی بەوە ئەیخەینە ڕوو کە پێویستە بە یەکێك لەو ڕێبازانە ساز بکرێت.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ڕووی دەممان تێ دەکات و دەپرسێت: ئەوانەی زاراوە سازدەکەن کێن و بۆ چ مەبەستێك سازی دەکەن؟.

بەداخەوە هەر وەکو بزانین بەر لە ئێمە[١١] هیچ زمانەوانێکی کورد پێناسینی زاراوەی نەکردووە، بۆیە ئەو پرسیارەمان بەرپا کرد.

لەم کۆڕەدا بە زمـانی عەرەبی لە مێـژەوە پێنـاسینی زاراوەیـان کردووە بۆ نمـوونـە (الـشـریـف الـجـرجـانـی)[١٢] واژەی (الأصطـلاح)ی بە زمـانی عەرەبی دانـاوەو پێناسـەی کردووەو وتـویـەتی: (الأصطـلاح): واتـە زاراوە ـ ڕێکەوتنی تاقمێکە لە کۆمـەڵانی خەڵکی دەربـارەی ناونـانی شتێـك یاخود کارێك بە وشەیێك کە لە واتایەکەوە بۆ واتایێکی‌دی گواسترابێتەوە.

دوا بە دوای ئەم زانایە (الکفوی)[١٣] لەسەر هەمان ڕێچکە هەنگـاوی ناوەو پێنـاسـەی (الأصطلاح)ی بە دووپات کردنەوەی قسـەکـانی (الجـرجانی) کردووە، سەرەڕای ڕوون کردنەوەیێکی تازە بۆ لایـەنـەکـانی پێنـاسەکە بە باس کردنی ئەوەی، کە زاراوە وشــەیێکی تایبـەتی‌یـە، لە بابـەتێـك لە بابـەتـەکـانی زانست و زانیاری‌و ڕۆشنبیری‌و شارستانێتی‌و لە کاروباری ڕۆژانەدا بە هۆی ئەوانەی کە پەیوەندی‌یان بەو بابەتانەوە هەیە بەکاری دەهێنن.

بێ‌گـومـان پێنـاسـەکـەی (الجـرجـانی)و ڕوون کردنـەوەکەی (الکفود) دەربارەی زاراوە هەموو شتێك لەم ڕووەوە پێك ناهێنن، چونکە ئەمانە هەموویان سەرتایێك بوون لە پێناوی ڕەچاوکردنی پێناسینی زاراوەدا، بەڵام ئەم سەرەتایەو ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی‌دا، ئەنجـام دراوە پێکـەوە لەم ڕۆژانـەدا یەکـان گیـربـوون و چوار تایبەتی‌یان بۆ چەمەکی زاراوە دەست نیشان کردووە:

تایبەتی یەکەم: ئەوە دەسەلمێنی کە زاراوە چەشنێکە لە وشە.

تایبەتی دووەم: ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە زاراوە تاقمێك لە کۆمـەڵانـی خەڵکی سازی دەکـەن و بۆ ئیش وکـاری تایبەتی خۆیان بەکاری دەهێنن.

تایبــەتی سێ‌یــەم: ئەوە دووپـات دەکـاتـەوە کە زاراوە واژەیێکی نوێ‌یە دوو واتا، یان پتری هەیە.

تایبەتی چوارەم: ئەوە ڕاڤە دەکات کە ڕێبازی سەرەکی لە ڕێبـازەکـانی دانـان و لەدایك بوونی زاراوە، گواستنەوەی وشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایێکی تازە.

کەوابـوو هەمـوو وشـەیێـك زاراوە نی‌یـە، بەڵام هەمـوو زاراوەیێـك وشـەیـەکەو ئەم وتەیەش سنوورێکی تەنگەبەری هەیە کە بەکارهێنانی لەلایەن تاقمێك لە خەڵکی لە کۆڕێك لە کۆڕەکـانـی ژیـان دا شوورەی کێـشـراوەو لە وشــەی ئەرهەنگی‌یەوە وەرگیراوە..

لەم گەشتەدا دوو خاڵی سەرەکیمان بۆ ڕەچاو دەبن:ـ

یەکەم ئەوانەی زاراوە، ساز دەکەن کەسێکە یان پتر لە تاقـمێکی پسپـۆرو خاوەن جۆرە تایبــەتی‌یێــك لە کۆڕی زانیاری، یان ژیانی‌دا.

دووەم: زاراوە بۆ دەربرین لە پسپۆریەتی‌یەکی تایبەتی‌و مەودایێکی دەست نیشان کراودا بەکار دەهێنرێ.

بۆ نمـوونـە زاراوەی ڕێـزمان زمانەوانێکی کورد، یان پتر سازیان کردووەو لە بابەتێکی زمانی‌دا بەکار دێت و زاراوەی سێ‌گـۆشـە ئەوانـەی سازیـان کردووە بواریـان داوە تەنیا لە

بابەتی بیرکاریو ئەندازیاری‌دا بەکار بهێنرێ ئەم دووخاڵە ڕەنگە لە زاراوەسازی کوردی‌دا جێگای مشتومڕ بن، چونکە تێبینی دەکەین کە کەسانی ناشارەزاو ناپسپۆڕ زاراوە ساز دەکەن و زاراوە سازە پسپۆڕە کوردەکان لەم کارەدا یەك نین، بۆیە بە زەقی لەم مەیانەدا دوو دیاردەی ناهەموار بەرچاو دەکەن:

**یەکەم: *داتاشینی زاراوە بە هەڵە وەکو زاراوەی پەیمانگا* بەرامبەر (المعهد)**

**دووەم: دانانی لە یەك زاراوە پتر بۆ یەك واتا وەکو زاراوەی هۆنەرو بوێژو هەستیار بەرامبەر بە واتای شاعری عەرەبی.**

هەرچۆنێك بێت ئەم گەشتە بەربلاوە لە زەمینەی پێناسین زاراوەداو شی‌کردنەوەی لایەنە زمانیو نەتەوایەتیو دەروونیو فەرهەنگەکانی دەرفەتمان دەداتێ بۆ پێناسینی زاراوەی کوردی ئەم بەندانەی خوارەوە بچەسپێنین:-

یەکەم: زاراوەی کوردی ناوێکە دەشێ (سادە) بێت و دەشێ (ناسادە).

دووەم: ئەم ناوە وشەیێکی کوردی ڕەسەنە.

سێیەم: لە نێوانی زاراوەو واتا پێشووەکەی‌دا پێویستە جۆرە پەیوەندی‌یێك هەبێت.

چوارەم: واژەی زاراوە دەبێ لەبەر یەکێك لە ڕێبازەکانی لەدایك بوون و پێك هێنانی وشەی کوردی‌دا ساز کرابێت.

پێنجەم: هەر زاراوەیێك پێویستە بۆ یەك مەبەست دانرا بێت.

شەشەم: بنیات نانی زاراوە ناشی لەلایەن ناشارەزای زمانی کوردیو ناپسپۆری بابەتەکەیەوە ئەنجام درابێت.

حەوتەم: زاراوە تایبەتە بە لایەنێك لە لایەنەکانی زانیاریو زیاریو ڕۆشنبیری. . لەبەر تیشکی ئەم حەوت بەندەدا دەتوانین پێناسەی زاراوەی کوردی بەوە بکەین کە:

**ناوێکی ڕەسەنە، لە فەرهەنگی نەتەوایەتی کوردی‌یەوە بە گوێرەی ڕێبازێکی پێك هێنانی وشەی کوردی، بۆ مەبەستێکی دەست نیشان کراو لە کۆڕی پسپۆری‌دا - سازکراوە.**

## سەرچاوەکان:-


١ - بڕوانە کتێبی (فن الشعر) ارسطوطاليس، وەرگێرا[نی] عبدالرحمان البدوی/ل ٥٦ چاپخانەی مكتبة النهضة العر[بية] /١٩٥٣ز.

٢ - بڕوانە هونراوەی (فن الشعر) هوراس: وەرگێرانی د. لويس عوض. ل١١٢ - ١١٤/ الهيئة العامة للتاليف والنشر/ چا[پی] دووەم/ ١٩٧٠ز

٣ - بڕوانە فەرهەنگی خاڵ: شیخ محەمەدی خاڵ/ل٨[؟] چاپخانەی کامەران سلێمانی /بەرگی یەکەم /١٩٦٠ز

٤ - بڕوانە کتێبی (فقه اللغة وخصائص العربية): محمد المبارك/ ل٢١٨ چاپی دووەم ١٩٦٤ز/ چاپخانە دارالفكر الحديث لبنان.

٥ - بڕوانە کتێبی المزهر من علوم اللغه: السيوطی جلال الد[ين] عبدالرحمن بن أبی بكر/ بەرگی‌یەکەم/ ل١٧٤ چاپخانە محمد علي صبيح /مصر.

٦ - بڕوانە کتێبی اللغة: ج ڤندريس/ وەرگێرانی عبدالحم[يد] الداخلي ومحمد القصاص ل ٣٧ - ٣٨/ چاپخانەی لجن[ة] البيان العربي/ القاهرة.

٧ - بڕوانە توێژینەوەی المنهج القرآني وصياغ[ة] المصطلحات/ د. كامل البصير گۆڤاری کۆڕی زانیاری عراق ل ٤٨ بەرگی یەکەم/ جزمی سی‌و یەك /ساڵی ١٩٨٠ز.

٨ - بڕوانە توێژینەوەی هۆنراوەی کوردیو زاراوەی کلاسیزم [له] ڕەخنەسازی ئەوروپی‌دا: د. کامل بەصیر/ گۆڤاری بەیان/ل٢ /ژمارەی ٧٥ی مانگی کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٨١ز.

٩ - بڕوانە توێژینەوەی (زمانی عەرەبیو کێشەی زاراوە[ی] کوردی): د. کامل بەصیر /گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی دووەم/ بەشی یەکەم/ ل٧٥١ ١٩٧٤ز.

١٠ - بڕوانە کتێبی زاراوەی کوردی/ د. کامل بەصیر/ ل٦٩ ٨١١٤ چاپخانەی زانکۆی سلێمانی/ ساڵی ١٩٧٩ز

١١ بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل٤٦ - ٦٩

١٢ - بڕوانە کتێبی (التعريفات) علي بن محی الشريف الجرجاني/ ل٢٨/ چاپخانەی مكتبة لبنان/ ١٩٦٩ز

١٣ - بڕوانە کتێبی (الكليات) أبو البقاء ايوب بن موس[ى] الحسين الكفوی /ل ٢٠١ - ٢٠٢ /دمشق ١٩٧٥ز.

# تعريف المصطلح عرض وتلخيص

د. كامل حسن البصير

يمثل المصطلح في العلوم النظرية والتطبيقية والانسانية العمود الفقري للغة القومية عند الامم المتحضرة، ومن هنا لقي اهتماماً خاصاً في الدراسات اللغوية التي تناولته من جوانب شتى وفي مقدمتها تعريفه وحده.

ويأتي هذا البحث في الدراسات اللغوية الكردية محاولة علمية سبقتها محاولة في كتابي المصطلح الكردي وذلك بغية اقرار تعريف جامع مانع لهذا اللون من المفردات اللغوية الكردية.

ومما دعاني إلى تكرار المحاولة: ان مفهوم المصطلح لم يتضح في البحوث اللغوية الكردية كل الاتضاح وان ظواهر سلبية تكتنفه في الغالب منها الخلط بين مفهوم المصطلح ومفهوم الكلمة اللغوية والتساهل في فتح باب غزو المصطلحات الكردية والغلط في صياغته.

وفي ضوء هذه الظواهر السلبية مضى البحث خطوة فخطوة فبين أهمية المصطلح وحلل جذوره العضوية في كيان الانسان وتعرض لبنود تعريفه على أساس مايتعلق به من النواحي الفكرية والاجتماعية واللغوية.

وبعد هذا كله حلل ضرورة أرتباط مدلول المصطلح بمدلولاته اللغوية وتتبع الأسس التي تنتقل في ضوئها الكلمة من معانيها اللغوية إلى المدلول الاصطلاحي.

لقد أستنتج البحث إثر هذه الرحلة تعريف المصطلح الكردي وحده وأكد في ذلك المعايير الآتية: -

اولها: ضرورة ان يكون المصطلح أصيلاً غير مقترض.

ثانيها: وجود توفر علاقة وملابسة بين مدلول المصطلح واستعمالاته اللغوية

وثالثها: صياغته على وفق قواعد اللغة وسنن التعبير.

ورابعها: اقرار مصطلح واحد للمدلول الواحد.

وخامسها: الافادة من اللهجات الكردية كافة على أساس أنها روافد من اللغة القومية التي عاشت في ضمير الأمة موحدة وناضجة.

# زاراوە سازیی پێوانە

«المصطلح القیاسي»

مسعود محمد

بێ گومان ڕۆنانی زاراوە لە هەر بابەتێك بێت، گەلێك ئەستەمترە لە وەرگێڕانی تێکڕای بابەت، چونکە دەشێ بابەت هەر چی‌یێك بێ بدرێتەوە بە هۆش و پێ‌زانین و سەقافەت و لەوانەوە دارشتنێکی سەرجەمی بۆ ڕێك بخرێ بەو زمانەی کە وەرگێڕانەکەی پێ‌دەکرێ، لەو هەوڵەش دا وەرگێڕ دەتوانێ بە پێی پێویست ڕێگا کورت و درێژ بکاتەوە تا دەگاتە ئەو دەقەی کە واتای بابەتی وەرگێڕدراوەکە ڕادەگەیەنێ، کەچی تاکە وشە بە تێکڕایی‌و وشەی زاراوە بە تایبەتی دەرفەتی دڵخوازی تێدا یەك جار بەرتەنگەو خوایيشت گۆڕی تێدا لە زەحمەت زەحمەتترە تا ئەگەر بمانەوێ لە ڕێی وێك چواندنەوە نموونە بهێنینەوە دەتوانین بڵێین پێکانی مەبەست لە وەرگێڕان دا وەك پێکانی دیوارێکە، کەچی پێکانی مەبەست لە ڕۆنان، یاخود وەرگێڕانی وشەی ئاسایی‌دا وەك پێکانی بەردێکە لەو دیوارەدا، ئەمما پێکانی نیشانە لە دانانی زاراوەدا وەك پێکانی پنتێکە بەو بەردەوە.

نی تاکە وشەی ئاسایی‌و تاکە وشەی زاراوە بەوەدا لەیەکدی جودا ە دەبنەوە کە:

١ ـ وشەی ئاسایی لە دوو زمان، یاخود سەد زمان دا بەرهەمێکی کۆمەلایەتیی مرۆڤایەتی‌یە، کە وەك جریوەی چۆلەکەو قاسپەی کەو، تاکە مەبەستی ڕاگەیاندنی نیازی ئاخێوەری ڕەچاو کردووە. بێ ئەوەی گوێی دابێتە زمانێکی‌دیکە لەوەدا ئایا بۆ ئەو ڕاگەیاندنە چ وشەیێکی هەڵ ناوەو لەو هەڵ نانەدا چ شتێکی تێ‌خوێندوتەوە. هەرچی زاراوەیە لە سەرەتاوە مەبەستێکی نائاسایی بە مل خۆیەوە گرتووە، ئەوجا بە زۆریش لە ڕێی چاولێکەری سەقافەتێکی پێشکەوتووەوە پێوانەو

کێشانەی زانستی‌و هونەری‌و ئەدەبی لەگەڵ دا کردووە. بە ڕێکەوت کورد گوتوەتی (بەرد) عەرەبیش گوتوەتی (حجر). بەڵام بە مەبەست و بە ئەرك و لێکدانەوە کورد لە بری (قواعد اللغة، قواعد الأملاء) ڕێزمان و ڕێنووسی دۆزی‌یەوە، زۆر جارانیش لەو دۆزینەوەیەدا هەڵەی وەهای کردووە کە ناشێ ئاپۆرەی ئاخێوەر لە داهێنانی وشەی عادەتی‌دا هەڵەی ئەوتۆیی بکات وەك کە زمانزان هاتووە لە بری (ضمیر، Pronoun) زاراوەی (ڕاناو)ی پەسەند کردووە یاخود زۆر کەس لە جێگەی (فعل)ی عەرەبی (فرمان)یان بەباش زانیوە کەچی وشەی ناپەسەندتر لە (ڕاناو، فرمان) بە زۆرەملێ نەبێ هەر دەست ناکەوێ: وشەی (ڕاناو) ئەگەر لە پێشگری (ڕا ـ ڕاهاتن ـ ڕاپسکاوتن ـ ڕابووردن..)و وشەی (ناو) پەیدا بووبێ وەك ئەوەیە لۆکە بە ئاسن دا بدروویت چونکە پێشگری (ڕا) هەر لەگەڵ کاردا دێت. کەس نەی‌بیستووە گوترابێ: ڕابەرد، ڕاعەلی‌شیش، ڕازوڕنا... ئەگەر لە (ئەڕا) بە واتای (بۆ)وە هاتبێ دەبێ بگوترێ (ئەڕای ناو) وەك کە هەندێك دەنووسن (بۆناو). هەڵبەت بۆناو لەگەڵ ناقبوڵایی خۆی‌دا پەسەندترە لە ڕاناو. وشەی (فرمان) هەمان (فەرمان)ە کە بە واتای (أمر) هاتووە: نەخوێندووی کورد لە هەندێ شوێنی کوردنشین دا دەڵێن (فرمانی خۆم جێ‌بەجێ کرد) مەبەستیشیان ئەوەیە کە ئەمرێکی بەسەریانەوە یاخود پێداویستێکی لێیان داوا دەکرێ جێ‌بەجێیان کردووە. بەشێکی خوێندەواری کورد بۆ ئەوە چوو کە فرمان لەو بەکارهێنانەدا بە واتای (عمل. فعل) هاتووە ئیتر گورج فرمانیان لە جێگەی فعلی ڕێزمانی عەرەبی هەڵ نا، بۆ ڕێزمانی کوردی.

٢ ـ ئاپۆرەی خەلق کە دێن بە پێی تواناو بۆچوونی زگماکیان وشەی لێکدراو دروست دەکەن بەسەر باریکەرێگەی زەوقی زمانزانییان دا بەرەو مەبەستی سادەی ئەو ئەرکە عادەتییەوە دەڕۆن کەمیش وەها دەبێ ساتمەی تێدابکەن چونکە ڕابەریان چرای ناوەکی زمانەکەیانە کە بە نەبزی دڵیان لێ‌دەدات نەك گڵۆپی خوازراوەی فەلسەفەی زمانناسی (فقه اللغة). لەو بوارە ڕوونەوە خەلقەکە توانی بە لووسولێکیو ڕێکوپێکی بڵێ: بەربەست، پارزۆنگ، دەمەوانە، زارەراش، دارەمەیت، دەستکێش... یاخود هات و لە ڕێی بەکار هێنانی ئامێری وەکو کاروباری جووت و ئاش و خەرەك ناوێکی لەباری بۆ هەریەکێك لە وردە ئامرازی ئەو ئامێرانە پەسەندکرد کە لەگەڵ کاری ئامرازەکەدا دەگونجێت. یەکێك لەگەڵ جووت خەریك نەبوبێ ناتوانێ لەلاوە بیر لە وشەی لێکدراوی وەك (بەن کەڵەمە) بکاتەوە یاخود (دەستەندوو) ڕۆبنێت. بابای زمانزان و پسپۆری ڕێزمان و دەنگناسیو فەرهەنگنووسی بە هۆی خنکانی لە گۆمی خوێندنەوەکانیدا بە درەنگەوە هەناسە لە مەزرای بەربەرەڵڵای زمانە دایکزاکەی خۆی هەڵ دەکێشێ چونکە دەستوورەکانی ناو کتێبان ڕێی پێ‌دەگرن و خۆیان بەسەر هۆشی ئاگاو ویدا دەسەپێنن کە ئیتر لەوانەیە زاراوەی دەستووریو یاسایی وەها دابڕێژێ چ خزمایەتی بە زمانی خۆیەوە نەبێت و خەلق بە بیستنی گوێ‌قوت بێت.

ئەگەر هاتبایە لکە بێ ئەژمارەکانی زانست و پیشەسازیو تەکنیك کە سەرچاوەی داهێنانی جۆرەها دروست کراوی سەرسووڕێنی وەکو فڕۆك و کۆمپیوتەرو کەشتی ئاسمانین بە زمانی کوردیو لە مێشکی کوردو بۆ ساختمانی کورد ڕسکابان ئەوسا زانای کوردیش بە ئاسانی زاراوەی لەباری بۆ هەزاران هەزار ئامێری وردو درشتی ئەو دروست کراوانە دادەنا، هەروەك لەخۆوە فەلاح زاراوەی بۆ وردە ئامرازی کاروباری جووت دانا، هەروەهاش خەرەك ڕێس و وەستای ئاش.

ئێمە کە بێین بمانەوێ زاراوە بۆ هەموو ئامێرو ڕشتەو بەشەکانی دروست کراوێکی وەکو فڕۆك دابنێین پێویستە لەپێشەوە زانستی فڕین بە زمانی کوردی بخوێنین و بنووسین، کە ئەمە هەنگاوێکی سەرەتایی ئەوتۆیە بە هیچ زاراوەیەکمان ناگەیەنێ چونکە خۆمان دروست کەری فڕۆکە نین وەك کە دروست کەری خەرەك و ئاشی ئاوین یاخود بووین: دەبێ لەپاش بەڵەدی لە زانستی فڕین و پێ‌بردن بە دروست کردنی فڕۆك ئنجا ئەرکە هەناسەبرەکەی ڕەچاوکردنی فەرمانی هەریەك لە وردە ئامێرەکانی هەڵ بگرین بۆ ئەوەی بتوانین لە دەفتەرخانەی زمانی کوردی بەخۆیو فەرهەنگ و مەتەڵ و قسەی نەستەق و کەلەپووری پێشینانییەوە وشەی گونجاو لەگەڵ ئەو فەرمانەدا هەڵ بژێرین و لە باری پێویست دا وشەی لێکدراو و دەستەواژەی سەرلەبەریش ڕۆ بنێین بەلکو خواوراستان زاراوەیێکی پڕبەپێست یاخود هەر نەبێ خزم بەو ئامێرە دەست نیشان بکەین. سەرنجێکی سەرپێیی لێمان ڕوون دەکاتەوە کەوا ڕەنگە وردە ئامێری چەند دروست کراوی وەکو فڕۆکەو فابریقەی هێزی ئاتۆم و چاپەمەنی ڕووبەرووی دەیان هەزارو پتریش لە وشەی سەرسەختی دوورە دەستی خزو سڵمان بکات کە هۆش تێی‌دا ئەبڵەق دەبێت.

زەحمەتیی ئەو کارە لەوەندەش ناوەستێ: پێویستە پسپۆرانی لکی هەر یەك لە زانستەکان و دروست کراوەکان لە نێوان خۆیان دا ئاگاداری کاری یەکتربن، نەکا هەر تاقمە ملی ڕێگەیێك بگرێ کە لە ئاکام دا زاراوەی بەرەواژی لەیەکدی جودا بۆ وردە ئامێری ئەوتۆ دابنێن هەمان فەرمان جێ‌بەجێ دەکات لە دوو دروست کراوی جودادا. ڕاستییەکەی ئێمە هەتا ئێستاکە نازانین گەلە پێشکەوتووەکان چۆناوچۆنی بۆیان دەلوێ زاراوەی ڕێکوپێك بۆ هەموو پێویستێك دابنێن بێ ئەوەی زاراوەکانیان تێك بئاڵێن. دەشێ بەدەگمەن ڕێك بکەوێ کە زاراوەیێکی ئارکایۆلۆجی لەگەڵ زاراوەیێکی فەلسەفەی مێژوو دژی یەکتر بوەستن، بەڵام ئەوەندەی لە خوێندنەوەو نووسین دێتە بەر زەینەوە دژ وەستانێکی ئەوتۆیی ڕەچاو نەکراوە. بە هەمە حاڵ ئێمە لە بارێکدا نین خەفەت بۆ ئەو گەلە پێشکەوتووانە بخۆین و ڕێبازی بێ‌کۆسپیان لە زاراوە سازیدا بۆ ڕەنگە ڕێژ بکەین: ئێمە ئەگەر بتوانین بەرە شڕەی خۆمان لە ئاو دەربهێنین بەسمانە، کە دەشێم بۆ ئەو تەرزە تێ‌بینییانەوە دەڕۆم مەبەستم ڕوون کردنەوەی لایەنە

ئەستەمەکانی زاراوەسازی‌یە. دەبێ بزانین زاراوە دانان بەوەندە پێك نایەت دەست بدەینە قەڵەم و بە پێی هۆش پێشکان و دەسەڵاتی زمان زانیمان بۆ (سیارە) گەڕۆك و بۆ (طیارە) فڕۆك، فڕۆکە دابنێین. زاراوە دانان بەر لە هەموو شتێك پێویستی بە زانستی فەرهەنگ سازی هەیە چونکە لە ئاکام دا بابی فەرهەنگێك وشە ڕۆدەنێت. ئەوجا وەکو گوتم، پێویستی بەو زانستە هەیە کە زاراوەی بۆ دادەندرێت. دوای ئەمە پێویستی هەیە بە زانستی زمان و دەنگناسی‌و[1] هەموو لکەکانی‌دیکە کە زمان باوەشی پێدا دەگرێت. دەبێ بەلانی کەمەوە شارەزایی لە زمانێکی پێشکەوتووی ئەم سەردەمە پاڵپشتی زاراوەساز بێت. دەبێ زاراوەساز هەستیارو مووقلاش و وردبین و سەلیقەدار بێت.

ئێمەی کورد لە هیچ ڕوویەکەوە بۆمان نەلواوە بتوانین بابی پێویست، بگرە دەیەکی پێویست، ئامادەی زاراوەسازی بین. سوزو عاتیفە وەها دەکات لێرەو لەوێ مێرخاسێکی کورد بە ئەرکی ماددی‌و بە ڕادەی لێ‌هاتوویی خوی خەریکی گرتنی بەشێکی ئەو کەلێنە زلەی زاراوەی کوردی بێت، وەك کە مامۆستا کەمال جەلال غەریب و مێرخاسی‌دیکەش بە گیانی لەخۆبووردووانەوە چەند ساڵە خەریك و عەوداڵن. فەرهەنگ نووسەکانیشمان لەو مەیدانەدا هەستی پەرۆش بۆ زمانی کوردی پاڵی پێوە ناوون هێندەی هەنگ کە لە هەزاران هەزار گوڵ شەربەت دەمژێ بۆ شانە هەنگوینی پوورە هەنگ، ئەوانیش کەشکۆڵی سواڵ و سەدەقەو پارانەوە لەم و لەو بەکۆڵ دا دەدەن و دێ‌بەدێ ترخێنە بە ئەسکوێ، وشەیەك لە هەورەمان و یەکێك لە ئەردەلان و دووان لە بابان و سێیان لە موکریان دەخەنە تۆمارخانەی فەرهەنگی کوردی‌یەوە، سەد هەزار جار کاریان ڕاست بێ‌و ئەوەی مردووە هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی، هەرچەند دەروێشی یەکەیان بێ گەشت و گەڕانیشە چونکە ئەگەر وەهایان نەکردبایە فەرهەنگێکی کوردی چاوی لە ڕۆژگار هەڵ نەدەهێنا. تا دەهات فەرهەنگ نووسی کورد لە بنگە سەقافی‌یەکانی ئەم جیهانەدا دەبوون بە پسپۆری فەرهەنگ و دەکەوتنە گەشت و پشکنینەوە (گورگان نێرە هەری مەلایان دەخوارد) مەگەر لە خەون دەنا فەرهەنگی کوردیمان بە چاوی خۆمان نەدەدیت. ئەوەندەی زانیبێتم نەم بیستووە تا ئێستاکەش بەخوێندن و شەهادە چ کوردێك بووبێتە پسپۆڕو شارەزای فەرهەنگ و زاراوە، خۆ ئەوساش هەر دەمێنێتەوە فەرهەنگ ڕێك بخرێت و زاراوە سازبدرێت، نایەتە باوەڕیشمەوە کەسێکی کورد لە بەرنامەی‌دا بێت بۆ کۆکردنەوەی وشەی کوردی کەشکۆڵی دەروێشی بە ئەستۆوە بگرێت. بێ‌گومان تا ئەو ڕۆژەی لێ‌زانی فەرهەنگ و زاراوەی کوردی لە کورد پەیدادەبێ ئەگەر وشەی کوردی بە نووسین نەپارێزرێ، وەك کە فەرهەنگ نووسەکانمان بەشێکی زۆریان لێ‌پاراستووە، سامانێکی سەرلەبەری وشەی کوردی تێ‌دەچێت بەتایبەتی ئەو وشانەی بەسەر زاری ئێلەکان و لادێ نشینەکانی کوردەوەن. تا ئەم ڕۆژەی کە من لە بەرەو کۆتایی مانگی دوواینی ساڵی ١٩٨٥ خەریکی ئەم نووسینەم خەرمانێکی بە پۆزی وشەی کوردی لە بابەتی کەلەپووری وەکو گەپ و مەتەڵ و بەیت و بالۆرەو کێڵان و دروون و چنین و جۆرەها پیشەسازی‌و کەسب و کاری زەحمەتکێش و ڕووتاریا [پرولیتاریا]ی کورد لە بیران چۆتەوە، چی ماویشە لەم بابەتە ئەگەر بەسەری ڕانەگەین لە ماوەیێکی کورت دا تێ‌دەچێت. بە نموونە کەسابەتی لبادچیەتی، یان مەنجەڵ سپی‌کردنەوە، یان خەرەك ڕێسی، یان پەڕەکردن، یان دروێنەو خەرمان، یان یاری سێ‌بازو تۆپێنەو چکەندەرەو تەندووری سووری‌و خوازەڵێ... و سەدان بابەتی فۆلکلۆری ئەوتۆیی بەزەینی خۆت دا تێ‌بپەڕێنەو بەحیسابێکی سەرپێ‌یی لێك بدەوە چەندین سەدان لە وشەی کوردی سەر بەم وردە کارانە هەتا ئێستا لە بیران چوونەتەوەو لە دەفتەر خانەی زمانەکەمان شوورانەوە. زەخیرەیێکی لە زاراوەی ئەو بابەتە فۆلکلۆری یانەدا هەبوو هی وەهای تێدابوو ببێتە بنیچەی زاراوەی زانستی، یان میکانیکی، یان هەرچی دەبێ بابێ وەك ئەوەی لە یاری (تۆپێنە ـ نان نانانێ) شوێنێکی یاریەکەی لێ دەست پێ‌دەکراو هەر جارە بۆ ئەوێ دەچۆوە پێی دەگوترا (سەرشان). دەشێ ئەم وشەیە بۆ گەلێك بابەتی گرنگ بەکاربهێندرێ وەك کە بڵێی: سەرشاری پرۆژە کشتوکاڵی‌یەکەی

ـرمزوورو ناوچـەی پێنجوین ئاوایی سەیـد سادقـە. لەیـاری ـیـەلیکـانێ ـ هەلـووك) وشـەی پەلیـك ڕیشـەی دەچێتـەوە بۆ میـژ وویکی زێـدە کۆنی زمـانی کوردی: لە کۆنی هەرەکـۆنـەوە پشگری (یك) بۆ نیسبەت بەکار هاتووە بەڵام دەنگی (ك)ەکەی سوواوەو ئێستا ماوەتەوە دەنگی (ی). لە خوێندنەوەم دا دیتوومە، مـوستـایـانی توژینـەوە لە پەهلەوی‌و بەرەژوورتـر دوو وشـەیان دۆزیـوەتـەوە تا ئێستـا پاشگـری (یك)یان پێوە ماوە ئەوانیش دوو وشـەی (تـاریـك، نزدیـك)ن. لە ڕێی قیاسەوە ئاشکرایە وشەی (پەلیك)یش بریتی‌یە لە (پەل + یك) چونکە ئەو دارە بچووکەی ـی دەگـوتـرێ (پـەلیـك) لە سەرێکی‌یـەوە پەل دەکـرێت تاکو بە دەسپـەل لیێ‌بـدرێت و هەڵ بەزێتـەوە. لە سەرنج گرتنی خۆمەوە بۆمهای بۆ دەچم کە ڕێژەیێکی نیسبەتی کوردی وەك (پەنامەکی، شەوەکی، دەرەکی) شێوەیێکی گۆڕاوی ئەو ڕێژەی نیسبەتی کۆن کە بە هۆی (یـك) پێـك دەهـات واتـە لە بنەڕەت دا (شەویك، دەریـك، پەنـامیـك..) بوون و لە بەکـارهێنـانی بێ‌نـووسین دا گۆڕاوون. بە هەمـەحـاڵ لە گۆڕانی شێـوەی ئەو ڕێـژەیە، ئەگەر گۆڕابێ، چ زەرەرێکمـان نەکـردووەو دەتـوانین سوودی لێ‌ببینین بەتایبەتی لە ڕێژە نیسبەتی ئەو و شانەی کە لەگەڵ تاکە دەنگی (ی) خۆ بە دەست نیسبـەتـەوە نادەن: هەمـوو ئەو وشـانـەی کۆتـایی‌یـان بە (ی) دێت وەك (مـاسی، سپی، ترۆزی..) لە نیسبـەت دا (ی) بە خۆیـانـەوە ناگـرن. ئنجـا ئەگـەر بڵێین (مـاسیـەکی، سپیـەکی، ترۆزیـەکی..) ڕێـژەیێکی ڕەسـەنی کوردیمـان بەکـارهێنـاوە. ئەو وشـانەش کە وصفیان تێدایە ئەگەر (ی)یان بە دوادا هات بۆ لای تجرید Abstract یان دەباتەوە وەك: جوانـی، ئازایـی، لەسـەرخـۆیی.. لێـرەش دا کە گوتمـان جوانەکی، ئازایەکی، لەسەرەخۆ یەکی لە گرفتی تێکەڵ بوونی نیسبەت و تجرید ڕزگار دەبین. نموونەیێکی ڕوون کەرەوەتر لە وشـەی (دز) دەهێنمـەوە: کە گوتمـان (دزی) یەکسـەر بۆ (سـرقـة) دەچینـەوە. (سـارقـی) دەبێتـە (دزەکـی). نیسبـەت بۆ (دزی) دەبێتـە (دزیەکی). نیسبەت بۆ (دزیەتی) دەبێتە (دزیەتیەکی). وەك کە لە ئینگلیزی‌دا وشەی pecune دەشێ ببێتە pecunious بە واتای خاوەن پارە. ئەمیشیان لەگەڵ پێشگر دەبێتە impecunious بە واتای بێ‌پـارە. impecuniousity دەبێتـە بێ‌پـارەیی، إفلاس. pecune بە پێشگرو پاشگرو بە تەنها چوار وێنەی وەرگرت.

ساڵی ١٩٧٥ کە لە کۆڕی زانیاری کورد بووم لیژنەیێك بە دەمڕاستی‌ی خۆم بۆ زاراوە پێك هات، بە ئەندامەتی مامۆستایان شوکـور مصطفی، هێمن موکـریـانی، د. ئاوڕەحمـانی حاجی مارف. دەوری هەزار زاراوەیێـك سازدراو لە بەرگـی چوارەمـی گۆڤـاری کۆڕ ساڵی ١٩٧٦ بڵاوکـرایـەوە. لەوێش دا لیـژنـە پشتگیـری کرد لە بەکـارهێنـانی پاشگـری (ەکی) بۆ ڕێـژەی نیسبەت. پێشەکی‌و لیستەی زاراوەکان لە لاپەڕە ٤٣٣ تا لاپەڕە ٤٧٩ی ئەو گۆڤارەی پڕکردەوە. شایانی باسە کە یەکەم جار ئەم (یك)ی نیسبەت و (یهـ) ناوی مەعنا [هەردوویان بوونەتە «ی»] لە گوتارێکی د. فاروق عمر صدیق کە لە ژمارەیێکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوکرایەوە کەوتە بەر گوێی کوردی عیراق.

وەك خوێنەر دەبینێت ئەم شریتەیەی تێ‌بینی‌و لێکدانەوەیە لە تاکە وشەی (پەلیك)ەوە هات کە دارۆچکەیێکی یەك لە یاری‌یە کۆنینـەکـانی کوردەواری‌یە. بێ‌گومان هەرچی کەلەپوور هەیە لە پۆشـاك و خۆراك و یاری‌و وردە پیشـەسـازی‌و کەسب و کاری گوزەران، سەرلـەبـەریـان، خاوەن وشـەی ئەوتـۆن کەڵکی فەرهەنگ و زاراوەیان پێوەبێت. نموونەیێکی دیکەی ئەم ڕایەم لە خانـوو دروست کردنی لادێ وەردەگـرین. دەزانین خانـوویێکی دیـواری هەڵ نرابێ‌و سەری نەگیـرابێ پێی دەڵێن (کـەیـل)، هەر یەکێکیش لە ژوورەکانی ئەو خانووە پێی دەڵێن (چاوە). بەو پێ‌یە چاوە بە بۆشـایی دەورەگیـراو دەگـوتـرێ. هەر چونکـە ئەستێـرك پێشـەوەی کراوەتـەوە پێی دەڵێن (چـاوی ئەستێـرك) نەك (چـاوەی ئەستێرك) لەمەوە دەتوانین وشەی چاوە بۆ (حجیرە، cell) و هەموو ئەو ئەندام یاخود دروست کراوانەی خاوەن بۆشایی دەورەگیراوون بەکـاربهێنین. میللەتـە پێشکـەوتـووەکـان شەرم ناکـەن لە بەکارهێنانی cell کە لە بنەڕەت دا بە ژووری ژێرزەمین دەگوترێ ئێمەش نابێ کۆمە بکەین لە بەکارهێنانی چاوەو غەیری چاوە بۆ

مەبەستێکی لەگەڵی بگونجێت.

لە نموونەی چوونەوە بۆ بنەچەکی زمان ئەم تەجرەبەیەی خۆم دەهێنمەوە: لە گوتارێکم دا بۆ چوونێکی هەڵە وەهای لێ خۆش هێنام کە وشەی هەناسە هێمای تێدابێ بۆ دەنگی (هـ) کە لە هەناسە سواری‌دا دەبیسترێ، کەرتی (ناسە)ش بە نەزانراوی دەمێنێتەوە. دواتر لە کتێبی (فرهنگ[٢] ایران باستان)دا خوێندمەوە کە لە ئاڤێستادا (ئەن) بە واتای نەفەس وەرگرتن یاخود هەناسە هاتووە. لەووەوە هەڵەی خۆمم بەسەرگرتەوە زانیم (هەن)ی هەناسە ئەو (ئەن)ەیەو هەمزەکەی گۆڕاوە بە (هـ).

دواتر سەرنجم بۆ ئەوە کشا کە لە خوێندنەوەم دا دیتوومە (اسە) لە ئاڤێستادا بە واتای (خۆرا) بە کارهاتووە کە ئەویش لە (ئەت) بە واتای خواردن وەرگیراوە تەنانەت (کرگس) لە (کهرکە اسە - کەهرکەئا سە)وە هاتووە بە واتای تەیرخۆر (لاپەرە ٢٢٣ فرهنگ ایران باستان) لەووەوە تێ‌گەیشتم (ئەن ئاسە) بۆتە (هەناسە) بە واتای هەواخواردن. ئنجا ئێستاکە دەڵێم ئەگەر (هەن) بکەین بە پێشگر بۆ ئەو وشانەی لە پزیشکی یاخود کیمیا یاخود هەر زانستێکی دیکە بێت دەخلی بەسەر هەناسەو هەواوە هەبێ کارێکی سوودبەخشمان کردووە وەك بڵێین: هەنگر، هەندەر، هەنبەست، هەنکورت، هەنمژ...

بە بۆنەی هاتنی وشەی (کەهرکە)وە دەڵێم، بەپێی بۆچوونی خۆم وادەزانم وشەی (کەڵەباب) کە لەبەری سۆران (کەرەباب)ی پێ‌دەڵێن لە (کەهرکەباب)ەوە هاتووە بە واتای (مەلی بابانە، نێر)، تەنانەت (کەڵەشێر)یش لە (کەهرکەشێر)ەوە بەواتای مەلی وەك شێر هاتووە بەلام دەنگی (ر)ی لاواز تێی‌دا گۆڕاوە بە (ڵ) وەك دەش زانین لە کۆنی کۆنەوە دەنگی (ل) لە کوردی‌دا نەبووە چونکە ئاڤێستا دەنگی (ل)ی تێدا نی‌یە. سەرنج بگرێت دەبینیت (کەڵەباب) وەك ئەوەیە بڵێیت (کەڵەکەڵ - بابەباب) چونکە هەردوو وشەی واتای نێرایەتی دەگەیەنن کەچی (کەهرکەباب) پڕ بە پێستی ئەو مەلەیە.

نموونەیێکی‌دیکە لە چوونەوە بۆ بنەچەکی زمانەکەمان: پێشگری (وەر) لە (وەرچەرخان، وەرگرتن، وەرکەوتن..)دا کەوا جۆرێك سوورانیان تێدایە دەچێتەوە بۆ فعلی (ڤەریتەن)ی ئاڤێستا بە واتای سووڕان و خول خواردن. شایانی باسە بڵێم (ڤەر، وەر) لە فارسی ئێستاکەدا بەرچاو ناکەوێت.

وشەی (پەز) لە ئاڤێستادا (پەشوو، پەسوو) بووە. لەووەوە دیارە (شوان) لە (پەشوان)ەوە هاتووە کە فارس کردوویەتی بە (چوپان). دەتوانین وشەی (پەز) کە تەمەنێکی سێ هەزار ساڵی هەیە بکەین بە سەرچاوە بۆ هەر زاراوەیێکی ئاژەڵناسی‌و بەیتەری کە پێوەندی بە مەڕەوە هەبێت.

زۆرم پێ‌خۆش بوو کە زانیم لە ئاڤێستادا وشەی (ئافەنت) بە واتای دەفری ئاو هاتووە (لاپەرە ٦٥ لە فرهنگ ایران باستانی ناویراو). لەووەوە زانیم (ئافتاوە)ی ئێستاکەمان هەمان (ئافەنت)ی ئاڤێستایە واتاکەی گۆڕاوە بۆ (دەفر)و نوونەکەی سوواوە و سەرلەنوێ (ئاو)ی خراوەتەوە سەر. دیارە (ئاف)ی ئافەنت بە واتای (ئاو)ە. زۆر بە لەباری دەتوانین (ئافەنت) کە ماڵی حەلاڵی کوردە لە بری (وعاء) بەکار بهێنین وەك کە لە (ئافتاوە)دا جێگەی (وعاء)ی گرتۆتەوە، بۆشمان هەیە کەرتی (ئاف) بکەین بە پێشگر بۆ هەر وشەیەکی پێوەندی بە (وعاء)ەوە هەبێت.

بێ‌گومان ئاوڕ دانەوە لە ڕابووردووی زمانەکەمان یارمەتی‌یەکی گەورەمان دەدات لە ڕۆنانی زاراوە و وشەی عادەتیش د راستی‌یەکەی، زاراوە هەتا لە وشەی نەبیستراو ساز بدرێت کەمتر خەڵقی لێ دەسەنگرێتەوە: بە نموونە، کە دەڵێین (ئۆکسۆجین. مولد الحموضة) پێمان سەیر نی‌یە. بەلام کە گوترا (ترشەزێ) وشتمان دەکات. ئەم (ترشە زێ)یەقیاس لە (شفتەژێ - کە گۆڕاوی جفتە زێ‌یە) دێت کە بە ئافرەتێك دەگوترێ لە ساڵێکدا دوو جاران زابێت. جگە لەم لایەنە، هەڵ نانی پێوەندی لە نێوان زمانی ئەدەبی ئێستاکەمان و زمانی کۆنینەمان، خۆی لە خۆی‌دا گەشە کردنێکی بایەخداری ڕۆشنبیری کوردی‌یە.

چی گوتم لەو ڕووپەڕانەدا دەروازە بوو بۆ ناو باسی زاراوە سازی کە ئەگەر مافی تەواوی پێ‌بدرێ دەبێ بە هەناسەیەکی درێژتر ڕێگای چوونە ناو باسەکە هەموار بکرێ بەر لەوەی

قەڵــەم لە ناوەرۆکی بگــەڕێ: هەر وەك مرۆڤ بە خۆ ڕاهێنــانی مانگەهاو ساڵەها ئنجا دەبێتە سوارچاك هەر وەهاش بە سەرنج گرتن لە زمـان و بە ئەم دیـو ئەو دیـو کردنی پێـك هێنـەرەکـانیو هەڵ سەنگاندنی ئاخاوتنی عادەتی لە ڕووی دەسەڵاتی داڕشتنی وشــەو ورد بوونــەوە لە جۆری زاراوە سازی لە لایــەن ئاخێـوەری کوردو چوونــەوە بۆ بنـەچـەکی زمـانـەکـەو بەیـەکدی گرتنی زمانی کوردی لەگەڵ زمـانیدیکـە لە ڕاڕەوی وشــە ڕۆنان داو گەلێك باریدیکەی سەر بەزمـان وجـۆری ئاخاوتن و تێك هەڵ کێشانی وشەو تێك بەستنی ڕستەو. . هتد زمانەوان هێزی زاراوەسازی تێدا بەرەو فراژ ووتن دەبێتەوە.

بە دوا ئەم تێبینیو ڕوون کردنــەوانــەدا دێین بۆ سەر چەقی باسی زاراوەسازی پێوانە لە کوردیدا.

جارێکیدیکــەشی دان بەوەدا دەهێنم، لە وزەی من و هیــچ کەسێك دا نییە، بتوانێ نیگای خۆی وەها فراوان بکات هەموو زانست و تەکنیــك و دروست کراوە سەرســووڕێنـەکـانی سەردەم بگرێتەوە. خۆ ئەگەر کەوانەی قسە لێکدیبکێشینەوە دەڵێین چ جایی کورد یاخــود میللەتی لە کورد پێشکــەوتــووتــری وەکــو عەرەب، بگــرە میللەتــە هەڵ کشیـوەکـانیش ناتـوانن لە زمـانی دایکـزای خۆیـان زاراوە سازبـدەن بۆ هەموو ئەو کەرستە هەمە چەشنـەیـەی کە خۆیـان دروستیـان کردووە. . . لە ناچـارییەوە بەرەو ئەو بەرژەوەندە چوون کە ڕازی بن بە زاراوەی زمانێکی لە کۆنـەوە سەلمێنـدراو ببێتـە سەرچـاوە ئەویش لە پلەی یەکـەم دا لاتینییــە، بەوەش دا خزمــەتێکی گەورەی هاوچــەشن کردنی سەقافەتی میللەتان کرا چونکە ماوەی تێك گەیشتنیان بە هەزاران هەزار زاراوەی موشتەرەك کورت کردەوە. دەبینین لە تەلەفزیۆن زۆربــەی زاراوەکـانی فیلم سازی سۆڤیــەت و پۆڵـۆنیـاو ئەڵمـانیاو فەرەنســە. . . یەك شتــە مەگــەر لە ڕێنـووس دا فەرقی پێبکرێ. لەمەوە بێکۆمە کردن دەڵێم، ئێمەی کورد کە یەکجار دابڕواین لە کاروانی زانست و خوێندن و تەکنیك ناشێ خۆمان بخەینە ژێر بارە قورسەکەی وەرگێڕانی ئەو وشانەی لە زمانە پێشکەوتووەکانەوە بە دنیادا بڵاوبوونەتەوە وەکو تەلەفۆن، کۆمپیووتەر، ستراتۆسفیر، پەنچــەر. . . چ پێـویـست نییـە تەلـەفـۆن بکـەین بە (دوورە دەنگ) چونکە ڕووبەڕووی زۆر وشەیدیکە دەبین کە نەتوانین بۆ سەر کوردییان وەرگێڕین. خۆو بەخت لە کۆنەوە دووربین لە بری تەلەسکۆپ بەکار هات: هەر وشەیێکی ئەوتۆیی هەبێ باوەشی پێدادەگرین و ڕەنگە لاریم نەبێ لە ڕێی پێوانەوە مایکرۆسکۆپیش بکەین بە (وردبین) چونکە لەگەڵ سەلیقە دەگونجێت و لە وشە بێگانەکە کوسترەو خزمیشە لەگەڵ دووربین لەم تێبینییەوە بۆ دوو خاڵی گرنگ دەڕۆم:

(١) یەکیان ئەوەیە، هەر وشەیێکی توانرا بێئەوەی زەق لە چاوان بچــەقێ، بکـرێ بە کوردی با بکـرێ چونکـە هەروەك شەڕ بە زەوق و سەلیقـە نافـرۆشین شەڕ بە زمـانـەکـەشمـان نافرۆشین. ڕاستییـەکـەی چونکـە ڕێنـووسمـان بە پیتی عەرەبییە بەدەست خۆت و خۆم نییە وشەی کوردی بەو ڕێنووسە لە بارتر دێتەبەر چاووهــەست لەوەی وشــەی بێگـانــەی پێبنـووسین. بە نمـوونە وشــەی Transmogrifi cation یاخــود Trans ub stan tiation زۆر بە زەق و زۆپــی خۆی بە دەســت ڕێنــووسی کوردییــەوە دەدات (ترانسبستانشیێشن). ڕەنگە لەو بارانەدا کە هەر چارمان نەما وەها باش بێ ئەو جۆرە وشانە بە ڕێنووسی لاتینی بنووسین. بە هەمە حاڵ ئێمــە لە مەیــدانێکی بەرتــەســك دا دەتـوانین مل بنێنـە وەرگێڕانی زاراوە سەختەکانی زانست و تەکنیك، کە چووینە ناو ڕایـەڵـەکـانی کارگەو بنگە ئاتۆمییەکانەوە سەرەدەرییان لێناکەین چ جاي ئەوەی لە ناونانیان ڕێگۆڕکێی دڵخوازانە بکەین.

(٢) دوەمیـان ئەوەیـە کە هەر هاتین زاراوەی بێگـانـە بەکـاربهێنین ناشێ بە زۆرەملێ زاراوەیێکی زەق و زۆپ بەسەر زمانەکەمان دا بسـەپێنین مادەم پێشتـر زاراوەی یەکێـك لە زمـانـە ڕۆژهەڵاتییە کانمــان بە ناودا بڵاویــوویێتـەوە. من ئەگــەر زووتـر لە وشــەی ئۆتۆمۆبیل ـ ترومبیل ڕانەهاتبامایە چ لاریم لە (سیارە) نەدەبوو هەرنە بێ چونکە ئەمیان کورتترە. کە هەستی زگماکی زمانناسیم بەســەر هەنـاسـەی وشـان دا ڕادەگـرم فەلـەکیـاتم پێڕەوانتـرە لە ئەستـرۆنـۆمی ریـازیـاتیشم پێ لە بارترە لە ماتەماتیك. ئەگەر لە

سەرەتاوە بەو وتە رۆژئاواییانە راهاتباین پێویست نەدەما بەوەی لێیان بادەینەوە بۆ سەر عەرەبی هەروەك ئیستاکە زەوقم لە (تەلەفۆن)ەوە بۆ (هاتف) راناگۆیزم مەگەر تۆبزی لە خۆم بکەم، لە عەقیدەو پەرستن و مامڵەتی رۆژانەمان دا چەندین وشەی عەرەبی بۆمان بۆتە فەرهەنگۆکی ئاخاوتن، چ پێی ناوێ کۆمەبکەین لە زاراوەییێك کە بە کوردی پەیدانەکرێ عەرەبی‌یەکەی بەکاربهێنین. تۆ لە کورد بگەرێو سەیری تورك بکە: پەنجا ساڵ دوای پشت لە ئیسلام و عەرەب کردن و گۆرینی رێنوسی عەرەبی بەلاتینی ئنجا دەڵێن و دەنووسن (مع مافیە). خۆ فارسی هەر خنکاوی وشەی عەرەبی‌یە تا ئەوەی واز لە فارسی‌یەکە دەهێنن بۆ عەرەبی. تەنها مەرجێك هەبێ لە پەسەند کردنی وشەی بێگانە بۆ ئەو واتایەی لە کوردی‌دا وشەی نی‌یە هەر هێندەیە کە زەق و سەخت نەبێ وەکو ئیسکەماسی بە گەرووی زمانەکەمان دا نەچێتە خوار.

دوای ئەمە بێنە سەر حیسابی کەسێکی خەریك دەبی لە کوردی‌دا زاراوە دابنێ. وێرای ئەو مەرجانەی لە سەرەتای نووسینم دا دەست نیشانم کردن پێویستی هەرە پێویست بۆ زاراوەسازی کوردی ئەوەیە شارەزای زارەجوداکانی کوردی بێ‌و فەرهەنگۆکیان بزانێ‌و تا رادەی بۆلوان شارەزای بابەتە فۆلکلۆری‌یەکانیان بێ، چونکە سەرەنجام هەردەبێ پەنا بۆ زمانەکەی کوردی ببات، ئنجا ئەگەر لەوێ‌دا هەژار بوو هەرچی زانست و رێزمانی دنیا هەیە بە کەڵکی نایێ وەك ئەوەی کە هەزار تۆن چەمەنتۆو هەزار تۆن شیشەو هەرچی کەرەستەی خانوەو تەسلیمی ناوەستای بکەی ناتوانێ دیوارێکی خوار هەڵ نێ. کە دەڵێم دەبێ شارەزای زارە جوداکان بێ هەرگیز لەبیر ناکەم کە بارتەقای زانینی ئەو زارانە دەبێ شارەزای نووسینی ئەدەبی‌و لکەکانی زانستی زمان بێ‌و تێیان دا مەعلان بێ چونکە لەمیان دا کەرەستەی پوخت و بەپێوانە هەیە کەوا هەم خۆی لە خۆی‌دا سامانێکی زمانی‌یەو هەم دەبێتە رێك خەری ئەو کەرەستەیەی بە خامی لە ئاخاوتنەوە خۆبەدەست فەرهەنگ و زاراوەسازی‌یەوە دەدات. زمانزانی کە بەکەڵکی زاراوەسازی بێت هەر دوو جۆری

ئەدەبی‌و رەمەکی دەگرێتەوە خۆ ئەوەی راستی بێ زمانی ئەدەبی‌و رێزمان و لکەکانی‌دیکەی زانستی زمان هەمووی هەر نەمامی بنەداری ئاخاوتنن بەتایبەتی لە زمانێکی وەکو کوردی‌دا کە شێوە ئەدەبی‌یەکەی جارێ زۆر شلکەو بە حاڵ شەقڵێکی جوداکەرەوەی بۆ خۆی دارشتووەو رێزمانیشی تا ئیستا لەسەر دەقێکی سەلمێنراو بەتەواوی نەوەستاوە.

زاراوەساز، پاش شارەزایی لە زانستی زمان و زارەجوداکانی زمانی کوردی. دەبێ لە بەرنامەی‌دا بێ بەرەو ئاسانی‌و کەم ئەرکی‌یەوە رێگە دەربکات. هەتا زاراوە کورتترو سادەتر بێ پەسەندترە. کە سادەیی‌و کورتی دەست نەکەوت پێویستە هەتا بلوێ زاراوە لە کەمترین ژمارەی کەرت سازبدرێ نەك خۆی لێك بکێشێتەوە بۆ دەستەواژە. بە نموونە، ئەو ئامێرەی مەکینەی جووت کە پێی‌دەڵێن (خرماشە)و گۆراوی (خماش)ەیە لە (خَمْش) بە واتای (رنینەوە) دێت: لە کوردی‌دا ناوی ئالەت لە رنین وەرگیراوەو دەگوترێ (رنەك ـ لە کێشی کوتەك، پەستەك.. کە لە کوتان و پەستنەوە هاتوون). دەبێ زاراوەساز بۆ خرماشە وشەی رنەك هەڵ بژێرێ نەك (زەوی‌رن) یاخود وشەی دیکەی ئەوتۆیی کە لە سادەیی دەردەچێت. نموونەیێکی دیکە لە (پارزنین) دەهێنمەوە: کابانی ماڵەکورد (پارزۆنگە)یان لێ‌دارشتوە بە واتای (مصفاة). ئەم پارزۆنگە بۆ هەموو ئامێرێکی پارزنین دەست دەدات و بە هۆی کورتی‌و سادەیی‌یەوە بۆ زاراوە نرخی تەواو نابێت.

هەتا بشێ تاکە وشە پەسەندە بۆ زاراوە، کە نەشیا ئنجا دارێژرا و کە بریتی‌یە لە وشەیێکی سەربەخۆو زیادی وەکو

پێشگرو پاشگر. که ئەو مومکین نەبوو ئنجا وشەی لێکدراو و ئاوێتەو دەستەواژە که بریتیین لە دوو وشەی سەربەخۆو لە دوو وشەو زیادی . . و . . هتد.

دەبێ ئەمە دەستووری گشتیمان بێ بەڵام نابێ دەستوورەکە بەلای ناقۆڵاییمانەوە ببات: هەر کاتێك وشەی سادە دەستی نەدا بۆ زاراوە پەنا دەبەین بۆ دارێژراو، لێکدراو. هەڵبەت ئەم تەرزە کارەش دەچێتەوە بۆ زەوقی زمانناسی و زاراوەسازی، هەرگیز وشەی لەبار لەخۆوە هەڵ نافرێ بۆ ناو فەرهەنگەکانمان.

مەرجێکی دیکە لەو بابەتەی کە زاراوەسازو زاراوەش دەگرێتەوە ئەوەیە کە ناشێ لە دارشتن و پێکەوەنانی زاراوە رێی هەموار بەلاوە بندرێ بۆ ئاستەنگ و هەڵ دێران: لە سنووری لووان دا کام رێگە کورت و تەختە ئەویان پەسەندە. بە کورتی ناشێ زاراوەساز مەرجی قورسی وەرسکەر بەسەر دەقی زاراوەدا بسەپێنێ و پێوانەی وەها تەسکی تێدابەکاربهێنێ بۆ خنکاندن دەست بدات نەك دەربازکردن. بەشی زۆری ئەو وشانەی لە زمانە پێشکەوتووەکان دا بۆ زاراوە پەسەند کراوون ئەگەر رەخنەی تەسك و تروسك و پێوانەی وردو ووقلاشیان لێ بەکاربهێنیت وەکو گوێزی پووچەڵیان لێ دیت. بە نموونە زاراوەی (مربع) جگە لە خۆی (مستطیل و معین و شبەمنحرف)یش دەگرێتەوە چونکە هەموویان چوار گۆشەیین. وشەی (مستطیل)یش (شبەمنحرف)و ئەو فرە گۆشانەش دەگرێتەوە کە درێژ ووکە نەخشکێش کرابن سەرەرای ئەوەی کە هەرچی بوونەوەرێکی درێژ ووکە هەبێ بەر واتای (مستطیل) دەکەوێ وەکو: گوریس، مار، کرم، شەقام، کلکی مەیموون. . . ئێمە ئەگەر چاونەچووقێنین لە کەموکووری وشەی (چوارگۆشە)و بمانەوێ زاراوەیەکی بۆ دابنێین کە هەر ئەو بگرێتەوە دەبێ بڵێین: چوارگۆشەی خاوەن چوار درێژایی وەکو یەك و چوارگۆشەی نەوەد پلەیی. زاراوە کە هات دارشتنەکەی لەبارو پێوانەیی بوو دژە مەبەستیش نەبوو تا رادەی پێناسینیش نیشانەی پێکابوو بەزاراوە وەردەگیرێت و خۆشامەد یشی لێ دەکرێت.

دەبێ لەبیرمان بێ، لە بنەرەت دا وشەی زمانی ئاخاوتن کە هەر خۆی دەبێتە وشەی فەرهەنگ و زمانی ئەدەبی بە ئارەزۆی ئاخێوەر ئەو واتایەی بەخشیوە کە تێمان دەگەیەنێ دەنا هیچ هۆیێکی بەرهەست نی یە بۆ ئەوەی کە (گۆشت) واتای (لحم، meat) بگەیەنێ یاخود (رۆیشت) رابوردوو بێت و (برۆ)ش فەرمان. دیاردەکانی سروشت لەدەست مرۆڤ دا نین و بەپێی دەستوورە ئەزەلی یە ئەبەدی یە ناچاری یەکان روو دەدەن، بەڵام دیاردە کۆمەڵایەتی یەکان لە خوازو پێداویست و هەست و نەست و زانین و نەزانین و رازی بوون و نارەزامەندی. . و. . ی مرۆڤ سەر هەڵ دەدەن هەر بۆیەیشە لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێك باری کۆمەڵایەتی کە زمان بەشێکیەتی تا رادەی پشتاوەژ وو بوون لێك دەترازێن. زاراوەش هەر نەبێ جێی ٥٠ . / . ی دڵخوازی زاراوەسازی دەبێ تێدابێتەوە نیوەکەی دیکەشی دەچێتەوە بۆ دەستوورەکانی زمان و پێداویستی واتا بەدەستەوە دان. لەم روانگەوە دەڵێم دەبێ ٥٠ . / . کەی خوازی زاراوەساز بۆ ئاسانی و هەمواری و چاوپۆشی ژیرانە بروات وەك کە جیهانی بەرەوپێش بوویەوە بۆی دەروات. لە نموونەدا دەڵێم، کاتی خۆی کە ویستمان ناوێك بۆ (مجمع علمي کردي) دابنێین لە پێشەوە بریارمان دا ناوەکە کوردی بێت و هەموو وشەی بێگانەمان بەلاوە نا یەك لەوان (ئەکادیمی). وشەی ئەنجومەن هەڵ گیرا بۆ (مجلس المجمع). لە نێوان سەرلەبەری ئەو وشانەی هاتنەبەر دەست و زیهنی ئەندامەکان وشەی (کۆر) پەسەندکرا، چونکە کوردی یەو واتای جێگەو کۆبوونەوەش دەبەخشێت. رەخنەیەکمان لەوەدا لێ گیرا کە (کۆر) بۆ مەبەستی کاتەکی نەك هەمیشەیی دەگیرێ، لە وەڵام دا بە نووسین بڵاوم کردەوە، هەموو زاراوەیێك لەم جیهانەدا رەخنە هەڵ دەگرێ ئەگەر چاوپۆشی لەگەڵ دا نەکرێ: بۆ دەبێ ئێمە زێدە لە هەموو جیهان وەها تەسك پێو بین. وشەی (زانیار) بەسەر (زانین، زانست)دا هەڵاواردرا بە هۆی ئەوەوە کە لە رێژەی زانیار، پرسیار، بریار، کردار، گوتار. . .)دا لایەنی (تجرید) بەهێزترە تا (زانین). هەرچی زانستە بۆ science دەروات کەچی کۆر بۆ زمان و ئەدەب و زانست و مێژوو و هەموو لکەکانی رۆشنبیری پەل

دەهاوێت. زانیار خزمی (معرفة)یەو پتر لەگەڵ (مصدرمیمی)دا ڕێك دەكەوێت، . كە بڵێین (كوشتار) واتای (مقتلة)مان بەبیردا دێت نەك (قتل). هەندێك وەها دەزانێ زانیار ناوی كارا (اسم فاعل) بێت ئیتر كە گوترا زانیاری گۆیا دەبێتە ناوی مەعنا كەچی زانیـار خۆی ناوی مەعنـایـە بە لێ‌زیادكردنی (ی) دەبێتە ڕێژەی نیسبەت وشەی (دزیار) دەبێتە (دزیاری) ئنجا لەكار دێت چونكە ناشێ بڵێین: ئەو ماڵە دزیارە. زۆر كەس لە خوێندەواران وەها دەزانن بەختیـار، هۆشیـار، جووتیـار، زانیـار نووسیار هەموویان صفەتن كەچی بەختیار، هۆشیار، جووتیار بریتین لە (جووت + یار، بەخت + یار، هۆش + یار)و بوونـەتـە (صفـة). هەرچی (زانیـار، پرسیـار، بریـار، نووسیـار)ە ڕەفیقی (كـردار، ڕەفتـار، گوتار)ە بە لێ‌زیادكردنی (ار)ی ناوی مەعنا ئەوەندە هەیە تاقمە فیعلی یەكەم هەمووی (ی)یان تێدایە بۆیە لە ڕواڵەت دا (یار) دەرسكێ. تەنهـا فیعلێـك هەبێ لەو بابـەتـە فیعلی (كریار)ە كە بۆتە صفة لەتەك فرۆشیاردا. دیارە لە ئەسڵ دا (كری + یار) بووە یەك لەو دوو (ی)ەی سوواوە.

هیچ بەرهەڵستیم نی‌یە لەوەدا ئەم پاشگرەی (ار) لە شوێنی گونجاو و باری پێویست دا بچێتە پاڵ ئەو كارانەی كە پێشتر كورد نەی‌خستـوتـە پاڵیـانەوە وەك كە مشتن، بەستن، دروون، ڕستن بنە: مشتار، بەستار، دروار، ڕستار و بڵێین: درواری ڕێكە، بەستاری مەحكەمە، مشتاری شیرنە. . . بە زۆریش ئەم (ار)ە لەگـەڵ تێپـەڕدا دێت: تەنهـا (ڕەفتـار، مردار)م دیتووە لە تێنەپەڕ (ار)ی بە خۆیەوە گرتبێ بەڵام (ڕفتار) فارسی‌یە، مرداریش بۆتە صفة نەك ناوی مەعنا.

زاراوەسـاز دەبێ ئاگـادار بێ ڕوواڵـەتی وشـە فێڵی لێ‌نەكات وەك ئەوەی كە (ار)ی ئەبستراكت لەگەڵ (ار)ی بنەڕەتی‌و (ار)ی وشەكانی (بنار، دیوار، لێوار، هەوار. .) بەیەك شت بزانێ. لە (هـەنـار، مار، سەگسـار، دار)دا ئەو (ار)ە بنـەڕەتی‌یـە. لە (دیوار. .)و هاوڕێكانی‌دا (ار) بۆ لای زەوی دەچێتەوە.

سەرنج بگـرە (هـەنـار، هەنگـوین، هەنـدرێشە، هەنجیر، هەنبـان) هەمـووی ڕاگـەیـەنی شیرنی‌و شتی خۆشە، هەر دەڵێی (هـەن) لە بنـەڕەت دا بە پێشگـری ئەو مەبەستەی ڕاگەیاندووە. دەشێ بە بەرفرەوانی زیندوو بكرێتەوە.

لە نمـونـەی بە هەڵەداچوونی زمانناس (ڕاكردن) دەهێنمەوە: بە ڕوواڵـەت وەهـا دیـارە ئەم (ڕا) یە هەمـان پێـشـگـری (ڕاگـوشین، ڕاوەستـان. .) بێت كەچی كورت كراوەی (هەڕا)یە بە واتـای (غـار). لە فۆلكلۆردا هاتـووە: قونـدەكـە قونـدەكـە لەسـەربـانـان هەڕاكە بۆقەو پێت ناڵیم. ئاشكرایە ئەم (هەڕا)یەو (hurry) ئینگلیزی یەك شتن. وادەزانم (خێرا)ش هەر لەم ڕیشەیە هاتووە. لە كوردی‌دا دەنگی (خ، هـ) بەیەكدی دەگۆڕێن وەك كە (هــەر)ی كوردی‌و (خــر)ی فارسی یەك شتن (ئـاخ، ئـاه)یش نموونەن (خۆر، هۆر، خوون، هوون. . . هتد). ڕاكردن، وەك دەزانیت، تێنـەپـەڕە كەچی فیعلی (كـردن) تێپـەڕە، پێشگـریش سروشتی فیعـل ناگـۆڕێ. بە نمـوونـە: داگـرتن، ،ڕاگـرتن، هەڵ گرتن. . هەموویان هەر تێپەڕن. (بەر، سەر) كە لە شكڵێ پێشگـردا دێن چونكـە لە بنـەڕەت دا ناوی جێگـەن خۆیان دەبنە مەفعـوولی فیعلەكـە. ناونـاوە بەكـارهێنانێكی ڕیزپەڕ (شاذ) دێتە بەرچاو وەك كە (هەڵ كردن) لە واتایەكی‌دا تێ‌نەپەڕە. دەڵێ: بێ تۆ هەڵ ناكـەم. واتـاكـانی‌دیكـەی (چـراهـەڵ دەكـەم، ئارات هەڵ كرد. .) تێپەڕن. لە ئاخاوتنی ئیستاكەدا دەگوترێ (با هەڵی كرد) كە تێنەپەڕە. ڕاستییەكەی بە ئەسڵ: (بای هەڵكرد)ەو ئیستـاش وەهـا دەگـوتـرێ‌و لێـرەدا (بـا) مەفعـوولە، فاعیلیش لە تصوردایە وەك: سروشت، جیهان. .

ئەم لابـاسـە پتـری بە بەرەوەیـە وەك كە بچیـن بۆ (تێ‌هەڵ كردن)و كنەی تێدا بكەین. كاری‌دیكەش هەن وەكو: تێ‌هـەڵ پێچـان، تێ‌هـەڵ دان جێ لێكـۆڵێنـەوەن بە تایبەتی لە ڕووی دۆزینـەوەی دەوری (تێ) كە لە پرپیـۆزیشنـەوە هاتـووەو چۆنیەتی كاركردنی بۆ سەر ئەو مەفعوولەی دەبێ فیعلی (پێچان) هەی‌بێ. كوا مەفعـوول لە تێ‌هـەڵ پێچـان و تێ‌هـەڵ دان؟ ڕاستی‌یەكەی ئەم جۆرە تۆژینەوەیە بە لای ڕێزمانمان دا دەبـەوە هەرچەند پێوەندی‌یەكیشی بە زاراوە سازی‌یەوە هەر دەمێنێ. بە هەمـەحـاڵ پێشگـرەكـانی (تێ، پێ، لێ) كە لە بنـەڕەت دا

پریپــۆزیشنن و بوونـەتـە پێشگـر جێگـەی لە بارتـریـان هەیـە بۆ ێکۆڵینەوەیان، لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم (لێ، تێ) هەردوویان گۆڕاوی پریپۆزیشنی (لە)ن: دەگوترێ (لە دارا دوام ـ لێی دوام) (لــە تۆ ناگــەم ـ تێت ناگـەم) هەرچی (پێ)یـە لە پریپـۆزیشنی (بە)وە هاتووە: بە ئێمەیان گوت ـ پێیان گوتین، بە دارا دەڵێم، پێی‌دەڵێم. هەر سێ پێشگر لەگەڵ (فیعل)دا دێن بەڵام (لێ، پێ) لەگەڵ ڕستەی (مبتدأ وخبر) دا دێن کە فیعلی ئاشکرایان نی‌یــە وەك: لێت ڕازیم، پێمـان شادن. ئەم ڕستـانـە لە کۆنی کۆن دا فیـعـلی (بــوون، verb Tobe) یان هەبــوەو سواون. . . چونکــە پێشگـری فعلیشن هیچیـان بە ناو و ڕانـاوی نەلکـاوەوە نانووسێن. بە مەندە لەو سێ پێشگرە واز دەهێنم چونکە لە باسە سەرەکی‌یەکەم دادەبڕن.

هەر لە زەمینەی ئاگا لەخۆبوون دەڵێم پێشگری (ڕا) جودایە لەو (ڕا)یــەی کە لە (تێ‌ڕاڕۆییشتن، تێ‌ڕاچـوون، تێ‌ڕاکـردن، تێ‌ڕادیتن. . .)دا دەدیتــرێن. هەرچی ئەم (ڕا)یــەی دوایی‌یــە تەواوکـەری پێشگـری (تێ)یـە واتای (ناو، ناوەرۆك) دەگەیەنێ. تێ‌ڕاڕۆیـیـشـتـن لە واتــای (بــە ناودا ڕۆیـیـشـتـن) نزیکــە، تێ‌ڕاچـوونیش (چـوونـەنـاو) دەگـەیـەنێ. ئنجـا دیـسـانەوە نابێ پێشگری (ڕا)و تەواوکەری (تێ) لەگەڵ تەواوکەری (لە) تێکەڵ بن کە ئەویش هەر (ڕا)یــە. دەڵـێی: لە پەنجــوین ڕا دێم. لە من ڕا دیــارن. لە زاری سلێمـانی ئەم (ڕا) یە نی‌یـە لە جیـاتی دەڵێن: لە پێنجـوینـەوە. لەمنــەوە. بەڵام دەر نەکەوتنی لە زاری سلێمانی بێ‌نیازمان ناکات لەوەی سەرنجی لێ‌بگرین و تێ نگەین.

(پێ، تێ) هەردوویان تەواوکەرێکیان هەیە (دا) کە ئەویش بە ڕووالەت وەکو پێشگری (دا) خۆ دەنوێنێ. لێرەش دا پێویستە زمـانـزان و زاراوەســازو فەرهـەنـگ نووس ئاگـادار بن و تێکـەڵ یەکتریان نەکەن تەنانەت لە نووسینیش دا دەبێ فەرقیان بکرێ: ئەگــەر (دا) تەواوکــەربــوو دەبـێ بەپـێشگــرەوە بلکێت وەك: پێداهێنانەوە، تێدازیـان. ئەگـەر پێشگر بوو دەبێ لە پێشگری (پێ، تـێ) جودا ببێـتــەوە وەك: تێــدادانـیـشتن teda danistin پێداڕۆیشتن daogirtin تێڕامان teraman.

دیسانەوە نابێ (پێ)ی پێشگر لەگەڵ (پێ) بە واتای (قَدَم) تێکــەڵی یەکــدی ببن: پێ‌لێ‌هــەڵ بڕین، پێ‌داگـرتن لەسـەر دوژمنایەتی بەواتای (قَدَم) هاتووە. کاغەز پێداهەناردن بۆ پێشگرە.

کە دەگـوتـرێ دەشێ دوو پێشگـر بە دوا یەکـدی‌دا بێن وەکـو (تێ‌وەرپێچان، لێ‌هەڵاتن، پێ‌ڕاهاتن) دەبێ بزانین کەوا تەنها بەهۆی (پێ، لێ، تێ) ئەم بە دوا یەکدی‌دا هاتنە مومکین دەبێ دەنا پێشگرە ناودارەکانی (هەڵ، دا، ڕا، وەر)و هەرچی هەیە بە دوایــەکــدی‌دا نایـەن. (پێ، لێ)ش پێش (تێ) دەکـەونـەوە: لێ‌تێ‌گەییشتن، پێ‌تێ‌کردن.

پریپـۆزیشنی (بـۆ) ناونـاوە وەکـو پێشگـر دێتـە بەرایی هەندێ فیعلەوە وەکو: بۆهاتن، بوگەڕان، بۆهەناردن، بۆچوون. . (بۆ) خۆی‌لــەخــۆی‌دا هێمــای بۆ مەودا هەیــە وەك: بۆت دەمێنم، بۆت دەگریم. ئنجا بەپێی باوەڕی من (بۆ) بەبەریەوە هەیە وشەی فەرهــەنگی دروست بکــات لەگــەڵ بەشێکی ئەو فیعــلانـەی بزووتنەوەیان تێدایە. لە نووسینی سەردەم دا بۆچوون، بۆهاتن، بوگەڕان باون دەمێکیشە بەسەر زمانەوەن. لەم بوارەوە دەشێ بە مەعـلانی لەگـەڵ فیعلی‌دیکـەی گونجـاودا بەکـار بێت و وشـەی تازەی پێ‌دابندرێت بەڵام ناشێ هەنگاوی بەرین بەو پریپۆزیشنە بهـاوێـژین، مەیـدانیشی لە وشـە ڕۆنـان دا هەر لەگـەڵ فیعلە، چونکــە هەر لەگــەڵ فیعلیش دا بۆ وشــەڕۆنــان بەکـاردێت بە ڕاشکاوی ڕاناوی لکاو بە دوا خۆی‌دا دەهێنێت وەك: بۆت دێم، بۆمـان ڕاوەستـا، بۆیـان چووین. . لە عەرەبی‌دا (حـروف الجر) بەپێش ڕاناوی لکاو دەکەونەوە، نەلکاوەکان حاڵەتی (جر، نصب) ناسەلمێنن.

ڕەچـاوکـردنی ئەم ڕاستی‌یـانـە زۆر گرنگـە بۆ یەکێکی وشـەو زاراوە دابنێت چونکە هەروەك دواتر دەردەکەوێ پێشگرو پاشگر دەوریان هەیە لە دانانی وشە چ لەگەڵ فیعل چ لەگەڵ غەیری فیعل دا بێن.

کە قســەمــان لە زاراوەی کوردی بێت ناچـارم تێ‌بینی‌یکی

لە ڕێی واتاکێشەکێوە (تداعی المعانی) بۆ وشەیێکی دیکە دەڕۆم پتر سوورو دەوردانەوەی تێدایە هەرچەند لە پاشگری (ەوە)مان دەدزێتەوە بۆ مەودای بەرینتر.

وشەی (با) لە بادان و بادانەوەدا، کە دەشبێتە (باهەڵ دان) سەرچاوەی ڕوونی لەمنەوە دیار نی یە: بۆچی (با) ئەو واتایە دەبەخشێ؟ زانیمان (وەڕ) لە (ڤەریتەن)ەوە هاتووە، وەهاشمان ڕانواند کە (چەم..) لە (کەم)ی کەمانەوە هاتبێ کەچی نازانم (با) لە کوێوە دەرقوڵاوە. بێگومان لە کۆن دا درێژتر بووە لێی قرتاوە. بەپێی ئەوەی کە لە بەرایی (هەڵ)ەوە دێت خۆی پێشگر نی یە جگە لەوە کە بەسەربەخۆییش بەکاردێت وەك کە دەڵێ: بای خواردووە.

بادانەوە بۆ سووڕانەوەی ٩٠ پلەیی و ١٨٠ پلەییش بەکار دێت.

[١]یەکێك تا کەمەری لە قوڕ چەقیبێ و بیەوێ خۆی دەربهێنێ (خۆی با هەڵ دەدا). جەربادەر، دەیناسین چی یە. ئەگەر جەربادەر هەبێ شتان بەرەو دەرەوە بهێنێ دەبێ (باهەڵدەر)ی پێ بگوترێ. پەتێك یاخود وایەرێك لەوانە بێ بانەخوات دەبێ (بانەخۆڕ)ی پێ بگوترێ.

نەهێشتنی بادراوی و نەمانی بادراوی خاوکردنەوەو خاوبوونەوە دەگوترێ. شتێکی لەوانەبێ با بخوات (باخۆر، باگر)ی بۆ دەست دەدات.

ئەم (با)یە چ پێوەندی بە (با)ی ڕەشەباوە نی یە. ئیحتمالیك لەوەدا دەبینم کە کورت کراوەی (باف) بێت کە جۆرێکە لە هۆنینەوە. جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، زمانی کوردی لەو (باف)ە، بەپێی زانینی من، تەنها ئەو (با)یەی بەدەستەوە ماوە. کە دەڵێن (زەربا‌و، زێربا‌و) لە (زرباف)ی فارسی یەوە هاتووە. بچینەوە بۆ پاشگری (ەوە):

(تێهێنانەوە) بە سوودێك دەڵێن زەرەرێکی پڕ کردبێتەوە. دەشێ لە جیاتی (سدالنقص، موازنة الخسارة) بەکاربێت. تێهاتنەوە تینەپەڕیەتی. تێهات وەك داهات.

- (بەسەرکردنەوە) دەستەواژەیە بە واتای (تفقد التثبت) بێت نەك ڕووکەشە.

- (سەراسۆیی) بۆ (تفقد)ی عادەتی دەست دەدات.

- (لێپرسینەوە) بە زاراوەی ڕەسمی بۆ (مساءلة) وەك کە بەرپرسیار بۆ (مسؤول) ڕۆییشتووەو وشەیێکی ڕەسەنیشە.

- لێتوێژینەوە (تحقيق رسمي). ئەگەر (توێژەر) بۆ (باحث محقق) بێ (لێتوێژ) بۆ (محقق عدلي، جنائي) دەست دەدات وەك (لێزان) بۆ (خبير)و (پسپۆر) بۆ (متخصص).

- (دەنگ دانەوە) بۆ echo ، رجع الصدى، هەروەها بۆ (انتشار الخبر) لەبارە.

- (ڕەنگ دانەوە) بۆ (ظهورالأثر) وەك کە بڵێی: بەرژەوەند لە ڕەفتاری مرۆڤ ڕەنگ دەداتەوە.

- (ڕەنگ هێنانەوە) بۆ (استعادة الأزدهار...).

- داهاتنەوە بۆ ركوع. داهێنانەوە بۆ تركيع.

- لێبردنەوە: الغلبة او التغلب على الخصم.

- پێداهاتنەوە: مراجعة.

- دڵدانەوە: مواساة - دڵدەرەوە: معزّي، مواسي - هەروەها: پرسەکار: معزّي - پرسەگێر، پرسەدار: خاوەن تازیە.

سێ وشە هەن ڕێژەیان دەگمەنە: کردەوە، بردەوە، گیرەوە.. لە سلێمانی گیرەوە باوە. ڕەنگە گیرەوەو گیرۆدە بە یەك وشە بزاندرێ، کە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، بەڵام هەردووکیان سەربەخۆن و بەکار دەهێندرێن:

بێکەس دەڵێ: فەرامۆشم نەکەی من گیرەوەی تۆم

دیسان دەڵێ: گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە

وشەکان ناوی بەرکارن. (کردەوە) بۆ (منجزات) زۆر لەبارە.

بردەوە پێوەندی بە بردنەوەی (ربح)ەوە نی یە. دەگوترێ: کردەوەی ئەوەو بردەوەی شەیتانە. لە گوتەی (خوا لە بۆخۆی بردەوە)وە هاتووە. بردەوە بۆ (مستعاد) دەست دەدات بەڵام بەم واتایە لە عەینی (بردەوە) فیعل هەڵ ناستێ.

(گیرەوە) بە واتای گیراو و بەندو بەستە. بۆ (مبلغ مرصود) زاراوەییکی باشە، وەك کە بڵێی: پارەی گیرەوە بۆ خێزەڵاندنی هەورەمان دوو ملیۆن دینارە.

بە قیاس لە (کردەوە) کە (منجز)بێ دەتوانین بڵێین:

گوێزەوە: المال المنقول

نەگوێزەوە: المال غير المنقول

دیتەوە: اللقى الأثرية

دۆزەوە: مكتشفات

خوازەوە: مستعار سووکترە لە خوازرایەوە. . هتد.

پێویستە قیاس کردن لە (کردەوە) بۆ فیعلی ئەوتۆ بێت بزووتنەوەیان تێدا بێ وەکو کردەوە خۆی. ڕاستی‌یەکەی ئەم مەرجە بۆ قیاس لە (بردەوە)و (گیرەوە)ش هەر پێویستە. جگە لەمە دەبێ فیعلەکە تێ‌پەڕ بێ دەنا بەرکار قبوڵ ناکات. ئنجا ئەگەر وشەی حازر بەدەستمان هەبێ قیاسەکە لزومی نامێنێ من کە (دابەستە)م هەبێ نابێ (بەستەوە)ی بۆ دابنێم.

بەپێی دەستوور ئەگەر فیعلێك سادەو ناسادەی هەبوو ڕێژەی ئەو سێ وشە دەگمەنە بۆ سادەکە دەچێتەوە بە نموونە، داهێنان و داهێنانەوە هەن. ئنجا ئەگەر (داهێنەوە) پەسەند بکرێ بۆ (داهێنان) دەڕوات و دەبێتە (مخترعات). پووچاندنەوە بۆ (إبطال) باشترین زاراوەیە. پوولی پۆستە بە تەمغە دەپووچێتەوە. داواکاری لە دادگا بێ لە زانست بێ بە شایەدو بە بەڵگەو بە سەنەد دەپووچێتەوە. بەڵێن بە نەهێنانە دی دەپووچێتەوە. پوولی ئەرزوحاڵ بە ئیمزا دەپووچێتەوە. هەرۆگیفی بێ‌برشت لە خۆوە دەپووچێتەوە. پووچانەوە تێ‌نەپەڕە، پووچاندنەوە تێ‌پەڕە، بەپێی داخوازی واتا بەکاردێن.

بڕژاندنەوەو گیرساندنەوەی برین (تعقيم الجرح)ە. دەرمانەکە دەبێ پێی بگوترێ (بڕژێنەوە، گیرسێنەوە). کەسێکی کارەکە بکات (بڕژێنەك). یاخود ئەو کەسە (بڕژێنەوە) بێت و (بڕژێنەك) دەرمان بێت. [گیرسێنەك].

(شلانەوە) بۆ ڕوییشتنێکە نازی خۆبادانی تێدابێ بەملاو بەو لادا. پێم وایە لە (شل)ەوە هاتووە کە بۆتە (شلەقا)ش. شلوق لە شلەقانەوە هاتووە. ئەم شلانەوەیە بۆ fluctuation کە (تذبذب، تردد، عدم ثبات)ی تێدایە لە ئاست باری بازاڕو نرخی شتان، بگرە وەزعی عەسکەری نێوان دوو لەشکرانیش، بە زاراوە دەڕوات. دەمێنێتەوە وەسفێکی ناوی کارای لێ‌وەربگرین [وەك کە شلۆق وەرگیراوە] بۆ fluctuant فکرم بە زۆر لادا دەڕوات بەڵام لەسەر دەقی (شلانگ) کە لە قاڵبی (ڕەش، ڕەشانگ) خۆی هەڵناوە ڕادەوەستێ. ئەمیان نەبێ (شلۆك) بەرانبەر (شلۆق) لە ئاوێنەی بەراووردا خۆ دەنوێنێ. ئەم نەبێ (شلەك) وەك (ڕووەك). وشەی (شلك) زۆر باوە بەڵام هەتا لە نەمام و لە ساوای دەستێنینەوە پێ دەوێ، جگە لەوەی کە شتێکی خۆی دواتر دەشلێتەوە لە سەرەتاوە شلکە. لەبەکارهێنان دا دەڵێین: ئابووری جیهانی دوای جەنگ بۆ ماوەی چەند ساڵ شلایەوە. داراو دانا لە زۆرانێ نیو سەعات پێکدا شلانەوە. بوورسە بازارمان لێ دەشلێنێتەوە. باری کۆمەلایەتیمان هەمووی شلانگە. هەمووی شلۆکە. هەمووی شلەکە.

زاراوەکە بەبەرییەوە هەیە خۆی لێك بکێشێتەوە بۆ تەعبیر تا ئەوەی بڵێین: تۆ وەزعت باش بوو، دوایی تێ‌شلایت، تێ‌شلایتەوە. تێوە شلایت [وەك تێوەگلایت].

برانەوە تێ‌نەپەڕە بۆ (انقراض) هاتووە. تێ‌پەڕکردنی نابێتە (برینەوە) دەبێتە (براندنەوە) چونکە برینەوە بۆ (جزالصوف. .) هاتووە. لە گەردان دا دەڵێ: مەیان برێنەوە، نەك مەیان برەوە. براندنەوە گەلێك لە قەڵاچۆ پێ‌کردن لەبارترە. براندنەوەو بنەبرکردن یەك شتن بۆ زاراوە.

پاشگرە باس کراوەکان زۆریان بە بەرەوەیە. بێت و بەتەواوی لەسەر تەنها فیعلی (گەڕان) کە لە (گەڕ)ەوە هاتووە بدوێین و هەموو شێوەکانی بە پاشگرو پێشگرەوە باس بکەین و گەڕانەوەو گێڕانەوەو بەگەڕ هاتنەوەو بەگەڕهێنانەوە بەگشت لایەك دا بخەین و دەستوورەکانی زاراوەسازیو وشەڕۆنانیان لێ بەکاربهێنین بلێی گوتارێکی پێ‌دەوێت. شتێکی من یا یەکێکی‌دیکە لەو بوارانەوە بێ‌نووسێت لەوە تێپەڕ ناکات کە ڕۆشنە بکاتەوە بۆ سەر جیهانی بەرینی (وشە) کە دەزانین (وشە) تەرجومانی ژین و ژیارە.

ئەو پاشگرانەی بە دوا (فیعل)دا دێن و لە فیعلایەتی دەیەخن زۆرن، ئەمانە مەشوورەکانیانن، زەحمەتیشە تاکە کەس هەموو پاشگرەکان لە ماوەی کورت دا بدوزێتەوە:

١ ـ دەنگی فەتحە بەستە، لێ‌کەوتە، هەڵاتە

٢ ـ ا دەنگی ئەلف زانا، بینا، کارا

٣ ـ و دەنگی‌واو خوێندوو، داماو

٤ ـ ك درك، برك

٥ ـ ەك پەستەك، کوتەك، نووسەك

٦ ـ کە فرکە، سوورکە (سەرەسوورکە)

٧ ـ ۆك فرۆك، گەرۆك

٨ ـ ان لەرزان، باران

٩ ـ ار کوشتار، گوتار

١٠ ـ ەر بینەر، نووسەر

١ ـ ینگ بێژینگ، برینگ

١٢ ـ گە ئیستگە، ڕووانگە

١٣ ـ پاشگری تاك تاکی وشە وەك پارزۆنگ، تێزانگ، گوتەنی (واتەنی). نیشتمان.

١٤ ـ مانە دیمانە: بە قیاس لەو: (شیمانە بۆ إحتمال) (گریمانە بۆ فرضیة)

١٥ ـ اك خۆراك، پۆشاك

١٦ ـ دەشێ سێ وشەی (کردەوە، بردەوە، گیرەوە) لەگەڵ وشەی‌دیکەی وەکو: سووتەن ئەنگێوە، زۆنگ [لە زانەوە هاتووە]، کێشانە، پێوانە.. و گەلێکی‌دیکەش کە لێی‌بگەڕێین دەی‌دۆزینەوە بخرێنە سەر بەندی سێزدەمین یاخود هەندێکیان بخرێنەسەر بەندی چواردەمین.. خولاسە پاشگری ئەوتۆیی ناچنە ژێرخاڵ و بەندی بە ئەژمار، هەر دیتە بەسەر یەکێکی تازەدا کەوتیت. هەندێکیش لەو بەندانە خۆیان نموونەیان کەمن بەڵام پشتگوێ ناخرێن.

لەو پاشگرانە هەندێکیان بەپێی داخوازی نووسین هاتنە پێشمان، هەندێکشیان جارێ قسەیان لێوە نەکراوە. لە فیعلی کاراناديار (مبنی للمجهول) ڕێژەی: دیتراو، خوراو، بیستراو لە بنەڕەت دا بەو (و)ە دروست بووە کە بەدوا فیعلی کارادیاردا دێت وەکو (خویندوو، هەڵستاو) بەڵام لە کارا نادیاردا ناوی بەرکار (اسم مفعول) پێك دەهێنێت، ئەویش هەر ئاوەڵناوە.

پارزۆنگ کە لە (پارزنین)ەوە هاتووە ڕێژەیێکی ڕیزپەڕە دەبوو وەکو: بێژینگ، برینگ ئەویش پارزینگ بێ. سماق پارزن ئەو پارزۆنگەیە، بێژینگ ئارد دادەبێژێ برینگ مەقەسێکی گەورەیە مەڕو بزنی پێ‌دەبڕنەوە. پارزۆنگ (مصفاة)ی تەواوە.

بە لێ‌گەڕان دەردەکەوێ هەر تاقمە فیعلە لەگەڵ هەندێك لەو پاشگرانە ئاشنایە. تۆژینەوە لەو پاشگرانە بکەین زانیاری نوێیان لێ وەردەگرین، بە نموونە: بێژینگ و هاو قاڵب و هاونەوان لەگەڵ: گوڵێنگ، پڵینگ، سینگ، ترینگ، خرینگ.. وشەی (گوڵ) بۆتە گوڵێنگ. پڵینگی ولاتی ئێمە پنۆك پنۆکە هەر پنۆکە بریتییە لە (پڵ). سینگ لە ژوورەوەی‌دا دوو (سی) هەیە. وەها پێ‌دەچێ هەروەك لە برینگ و بێژینگ دا، پاشگر دەوری هەیە، هەمان پاشگر لەو ناوانە دەوری هەیە. وادەزانم ئەو وشەی (ینگ)ی لە کۆتایی‌دا بێت هەمووی پاشگردارو لە بەشی دارێژ راوون. کولێنگ ئامێرێکە زەوی دەکوڵێ. خرینگ و زرینگ دەنگێك ڕادەگەیەنن کە نزیك بێ لە دەنگی (خر، زر). دەشێ (شینگ و تاقەت) مەبەست بەوەدارابگەیەنێ کە ڕوەکی (شین) لە تاقەتدایە.

وەك دیارە ئەو پاشگرانە هی وەهایان تێدایە لەگەڵ فیعلیش و ناویش دا دەور دەبینن. نموونەی دیکە لەم وشانەی خوارەوەدا نیشانمان دەدەن چۆن بە هەردوو ڕێبازی فیعل و ناویش دا دێن:

| پاشگر | نموونەی فیعل |
|---|---|
| گە | ئیستگە، ڕووانگە |
| ە | لێ‌کەوتە، بەستە |
| و | نووستوو، خویندوو |
| ۆك | لەرزۆك، فرۆك |
| ەك | نووسەك، کوڵەك |
| اك | خۆراك، پۆشاك |

| نموونەی ناو |
|---|
| جۆگە، ڕاوگە |
| چاکە، کورتە |
| ژووروو، ڕۆژوو |
| قرچۆك، بێزۆك |
| کورتەك، دەستەك |

ئەمـەنـدە نمـوونـەیـە بە كافی دەزانم، هی‌دیكـەش هەن پێویستمان پێیان نی‌یە.

پاشگـرەكـان بەپێی دەورێكی دەی‌بینن و لێیـان چاوەڕووان دەكرێ داوای فیعلی ئەوتۆ دەكەن لەگەڵیان دا بگونجێ. فیعل هەیە بە گەلێكیان ڕازی‌یە چ پێشگر چ پاشگر. هەیشە بە حاڵ پاشگرو پێشگر قبـوڵ دەكـات [پاشگرو پێشگرو ناوگر تێكرایان پێویستە زاراوەیەك هەبێ بیان گرێتەوە. باشترین وشە «گیرەك»ە. نووسـەك خراپ نی‌یـە بەلام. درووییـەك هەیـە نووسـەكـەی پێ‌دەڵێن، وشـەكـەش لە «گیـر»ەوە نەهـاتووە] لە نموونەدا دەڵێم فیعلی (كەوتن) زۆربەی پێشگرو پاشگری فیعلایەتی بەخۆیەوە دەگرێ وەكـو: هەڵ كەوتن، داكـەوتن، وەركەوتن، بەركەوتن، دەركـەوتن، سەركـەوتن، ژێـركـەوتن، لێ‌كـەوتن، پێ‌كـەوتن، تێ‌كـەوتـن، كەوتـنـەوە كەوانـدن. كەچـی خواردن هەر (لێ‌خـواردن)، بەحـاڵیش (پێ‌خـواردن)ی لێ‌پـەیـدا دەبێ. خواردنەوەش خاتری تۆ..

پێـویستـە زاراوەسـاز ئەو فیعـلانە بناسێتەوە كە پێوانە لێ‌كردن هەڵ دەگـرن و ئەو فیعـلانـەش هەست پێ بكـات وشـەی تازە دروست دەكـەن.. بەپێی بۆچـوونی خۆم ئەو مەرجـانـە دەست نیشـان دەكـەم كە زاراوە دارشتنیـان بە دروستی پێ دەكـرێ، لێرەش دا لە پلەی یەكەم بەكارهێنانی پاشگر مەبەستە:

١ ـ وشـەی لەبـار بۆ پاشگـر هەڵ بژێـریت.. بە نمـوونە، لە وشەی (بێژینگ) كە پاشگری (ینگ)ی لەگەڵ دایە دەتوانین بە قیاس (ژمارینگ) بۆ (حاسبە) بەكار بهێنین. بژاركۆڵمان هەیە بۆ (آلە العزق)و هەر دەشمێنێ بەلام دەتوانین بۆ هەموو ئالەتێكی بژار لە ڕێ قیـاسـەوە (بـژارینگ) دابـرێژین. ئەمانە هەمووی ناوی ئامێـرو لە فیعلی تێ‌پـەڕ وەرگیـراوون، ناشێ بازدەین بۆ تێ‌نەپەڕ و ناوی ئامێری فڕین و ڕۆیشتنی لێ دابرێژین. وشـەی (تێـزانـگ) بە واتـای مـنـداڵدان كە ناوی جێگایە دەشێ پێوانەی لێ‌بكرێ بۆ دارشتنی (هەڵدانگ) بۆ شوێنی شت لێ هەڵ دان وەك جێگایێكی ئۆتۆمۆبیلی سەكەتی لێ‌فڕێ دەدەن. دەشێ بۆ دارشتنی (نـۆشـانـگ) بڕۆین بە واتـای جێگـایێكی تەرەمـەنی (مـرطبـات)ی لێ‌بخـورێتـەوە. لە (خـواردن)ەوە بۆ جێگـەی لێ‌خواردن بڕۆین دوو بوار هەیە: یەكیان، بەپێی دەستووری فۆنەتیكی كوردی لە جیاتی (خوارانگ) بڵێین (خوارنگ) چونكە ئەلـفی (خـواردن) حەز لە ئەلفی دووەم ناكـات. بواری دووەم ئەوەیە بڵێین: خورانگ.

قیاس كردن لە (لەرزان، باران) مەرجی هەیە: فیعلێكی بە قیـاس لەوان زاراوەی لێ‌وەربگیـرێ دەبێ بزووتنـەوەی تێـدابێ. (ڕەوان) بۆیـە دروست بووە، ئەمـا (نـووستـان، نیشتـان...) قیاس بەدەرن.

٢ ـ وشـەی ناقـۆلایـان لێ‌دانـەرێـژرێ هەرچـەنـد بەپێی دەستووریش ڕەوابن.

٣ ـ وشەی زیندوو لەو واتایەی زاراوەی بۆ دادەندرێ چەنگ نەكـەوێ، بەتـایبـەتی ئەگـەر زاراوەكـە هێنـدەی وشـەكە شیرین نەبوو. ئەگەر بە مانای (ژمارینگ، بژارینگ..) وشەمان هەبایە پۆیست نەبوو لە نوێ دایان ڕێژین. (جووت) پێی ناوێ وشەی نوێی بۆ دارێـژرێ بەلام مەكینـەی جووت لەوانـەیـە بە قیـاس (كێڵنـگ)ی بۆ بشێ. (حـاصـود)یش (دروینگ)و (دراسـة)ش (كوتینگ)یان لێ بەزیاد ناگیرێ دینگی برنج كوتان مەشوورە.

٤ ـ دەبێ ڕێژەییێكی لە كوردی‌دا هەر بۆ تێ‌پەڕ یاخود تێ‌نەپەڕ بەكـارهـاتبێ لە قیـاسیش دا چاوەدێـری بكرێ. نووسـەرم دیتووە (هەڵستەر)ی بەكارهێناوەو تێ‌بینی ئەوەی نەكردووەئەم پاشگرەی (ەر) هی تێپـەڕەو بەس. لەكـۆنـەوە كەس نەی‌گـوتبوو: بیستەر، نووسەر، بینەر.. بەلام لەلای نووسەرانەوە بەكارهێنران بە قیاس لە (نان دەر، ئیش كەر..)

٥ ـ دەبـێ لە سنـووری دەسـەلاتـی زاراوەسـازدا هەمـوو مەرجەكانی وردی‌و جوانی لە زاراوەی تازە دروست كراودا ڕەچاو بكـرێن. كەسیش لـێ داوانـاكـرێ بەو لای دەسـەلاتەوە بۆ هیچ كارێك بچێت.

پاشگـرێكم پاش خست بۆ باس لێـوەكـردنی‌و لە لیستـەی پاشگرەكان دا نەم نووسی ئەویش پاشگری (شت)ە. هۆی ئەم پاش خستنـە لەوەوە هات كە بیستـوومـە لە كەسـانێـك دەڵێن

پاشگرەکە فارسی‌یەو هەندێ جار لە بری (ش) دەکرێتە (شت) وەك (رەووش، کۆشەش، خورش، دورارش...) کە فارسین دەکرێنە (رەووشت، خۆرشت، گوزارشت..) کوشەش دەبێتە کۆشش.

ئەوەی من باوەری پێ دەکەم شتێکە لە ناوەراست دایە: بەکارهێنانی ئەو (ش)ە لە فارسی‌دا گەلێك فراوانترە لە (شت)ی کوردی، دەبوو ئەگەر کوردی لاسایی فارسی کردبێتەوە وشەی زۆری هەبن کە هی فارسی بێت و خواستبێتیەوە، مەبەسیش لێرەدا پاشگرە نەك لە بنەرەت دا کوردی ئایا چەند جاران (ش)و (ت)ی بەدوایەکدیدا هێناوە. بۆ دەبێ فارس بلێ (دانش)و کورد بلێ (زانست)؟ هەر نەبوایە (زانشت)ی گوتبایە. سەیری چۆن کۆشش (ت)ی پێوە نەنوساوە، ئەگەر چاولێکەری بووایە دەبوو کۆششت بووایە. گوزارشت کوردی نی‌یە، بەلام برشت، رەووشت، خورشت، خارشت... کوردین. سەیر لەوەدایە کە کورد لە (فیعل)دا، ئەم پاشگرەی کەم بەکارهێناوە چونکە دەنگی (ش) شەیدای دەنگی (ت)ە و لەگەڵ هیچ دەنگێکی‌دیکە هێندە ناگونجێ. لە (بێشتن) هەتا (هێشتن) کوردی حەفدە فیعلی هەیە، کە من بەبیرم دێنەوە، بەم (شت)ە کۆتایی‌یان دێت.

زانست، وەك بزانم، تاکە فیعلە ئەم (ست)ەی لێ بووبێتە پاشگر، ئەگەر فیعلی‌دیکە هەبێ ئێستا نایەتەوە بیرم. ئەم وشەیە ئالقەیەکە زمانی کوردی بە زمانە رۆژاوایی‌یەکان دەگەیەنێتەوە کە لە بەرەی هیندی ئەوروپایین. زانست بەرانبەر gnost دەوەستێ بە واتای (معرفة). عەرەبەکان لە کۆنەوە (گنوست)یان کردە (الغنوصية). زانست و گنۆست یەك واتان، دەنگی (ز)ی بەرایی زانست بەپێی دەستوورێکی ئەو بەرە زمانانە لەگەڵ (گ) پێك دەگۆرینەوە وەك کە ئاگر بۆتە (آزر)، تەزرەکە بۆتە (تگرکە)، مەزن بۆتە ماگن.. [ماگناکارتای ٧٠٠ ساڵ و ئەوەندەی پێش ئیستای بریتانیا ئەو مەزنەیە] زێر و زەرد هاوریشەن لەگەڵ gold..

زانست پێوانەی لێ‌ناکرێ بە تاقانەیی دەمێنێتەوە.

پاشگری (گە) کە هێمای بۆ (مکان)ە بەبەریەوە هەیە قیاسی لێ بکرێ وەك کە بە (مطار) بلێین: فرگە. بە جێگەی نووستن بلێین: خەوگە

خوولگەو سوورگە لە بارن بۆ شوێنی پێویست.

جمگە ئەو شوێنەیە لە قەد پاڵی گردو شاخ (جمین)ی لێ‌بووبێ. (جمگە) کە دەی‌کەنە جومگە بەواتای (مفصل) لە (جمعگە)وە هاتووە هەروەك جەمسەر جمعسەرە بەلام بوونەتە کوردی. (مفصل) لە کوردی رەسەن دا (گرێ)یە وەك: گرێی پەنجەکان، گرێی بربرە...

پاشگری (نۆك) لە (گرینۆك و ترسنۆك)دا لەوانەیە بە هی فیعل و بە هی ناوی مەعناش بروات. لەمیش دا قیاس زەحمەتە. ئایا لە (گریەو ترس)ەوە یاخود لە (گریان و ترسان)ەوە ئەو دوو وشەیە پەیدابوون؟ رەنگە لە باری وەهادا وشەی ئەوتۆ بەر قیاس بخرێ کە ئەویش هەڵ بگری بەلای ناویش و بەلای فیعلیش دا بشکێتەوە وەك (میز) کە دەبێتە فیعل و دەگوترێ (میست) ئیتر بە یەکێکی لە ژێر خۆی بمیزێ بگوترێ (میزنۆك). دیارە دارشتنی شکاندنەوەیە.

جینگەنە ئەگەر لە جەنگەوە کەوتبێتەوە ئەویش هەڵ دەگرێ بۆ وشەی جەنگ و بۆ فیعلی (جەنگان) ببرێتەوە، لەمەش د پاشگری (ەنە) بەر حیسابی پاشگران دەکەوێ. ئەگەر بسەلمێندرێ لە جەنگەوەیە بە راشکاوی وشەی (فیتەنە) بەواتای (دایکی‌فیت) ان دێت وەك کە دەڵێی: فیتی تۆیە. (فیتنەبان) بەدترە لە فیتەنە، فیتەنەش بەدترە لە (بزۆز، بزێو). فۆلکلۆر دەڵێ:

**مشك مشکی دەر کونێ**
**دەڵێ ئەگەر فلانم نەدەنێ**
**دەی‌کەمە رۆژی فیتەنێ**

رەنگە لێرەدا (فیتەن) هەر فیتنەبێ‌و کێش و قافیە گۆری‌بێتی رەنگیشە لە (فیتەنە)وە بۆ خاتری کێش و قافیە گۆرابێ. فیتەن لە وەزنی پووشەن، قوێەن، رەقەن، گێژەن... دایە کە هەموویان ناوی جێگەن لەبەر ئەمە بێ‌گومان گۆرانی تێدا پەیدابووە. دەبێ بلێم فیت و فیتەنە لەو وشانە نین بەلای فیعلیش و ناویش د بچنەوە، بەلام فیتەنە هێند لە بارە خۆ دەسەپێنێ بە قیاس لە جینگەنەو بە پشتیوانی فۆلکلۆریش.

وشەی (پەستوور) کە لە (پەستن)ەوە هاتووە تاکێکە نە

تاقمی: ڕەنجوور، مەستوور، دەستوور، گەنجوور، وەخشوور[٣] [سیفەتی زەردەشت]. تەنها پەستوور لە بنەچەی فیعلەوە هاتووە. دەگوترێ: هەتا هەیە پەستووری، واتە درێغ مەکەن لە خواردن و نۆشین و خۆش گوزەرانی. دیارە ئەم (ی)ەی نیسبەت وەها ڕادەگەیەنێ پەستوور ئاوەڵناو بێ. لە دەستوور بەو لاوە کە لە زمانی فارسی و کوردیدا بە قانوون دەڵێن ئەوانی دیکە هەمووی ئاوەڵناوون. لەناو پارسەکانی هیندستان دەستوور لەقەبی پیاوی ڕێزلێگیراوە کە دەبێتەوە ئاوەڵناو. نایەتە بیرم وشەم دیتبێ جگە لەپەستوور لە فیعلەوە هاتبێ. بە قیاس دەشێ لە (پەرستن) بە واتای (عابد، مترهب) زاراوەی (پەرستوور) ڕۆبنرێت. جێ خۆیەتی بۆ مەکینەی ڕستن (ڕستوور) دابڕێژین بەڵام دەبێ بزانین وشەکە (ڕێستن)ە چونکە لە ئایندەدا دەبێتە (دەڕێسێ). وشەی (ڕیس)یش دەنگی (ی) تێدایە. لەگەڵ ئەمەش دا ڕستوور خۆشترە لە ڕێستوور. دەشێ ڕێستوور ببێتە (ڕەستوور) بە پێی ئاڵوگۆڕی دەنگ، ئەوسا ئەمیان پەسندترە لە ڕستوور. سەرنجم بۆ ئەوە دەچێ پاراستن، پەستن، بەستن، گەستن، پەرستن، ڕستن، خستن، خواستن، قۆستنەوە، بیستن، گواستنەوە هەمووی تێپەڕە. لە تێنەپەڕ هەر (نووستن، میستن)م بەبیردا دێت، هیچ کامێکیشیان بە کەڵکی زاراوە بۆ داڕشتن نایەن. کەواتە دەمێنێتەوە فیعلە تێپەڕەکان بۆ زاراوە. مادەم تاقە نموونەی ئەم ڕێژەیە لە فیعل پەستووربێت ڕەنگە وەها باش بێ تەنها لەو فیعلانەی بە (ست) کۆتایی یان دێت زاراوە بە پاشگری (وور) سازبدرێت.

تاقمە وشەی قۆپەن، پووشەن، گێژەن، ڕەقەنیش تاکە نموونەی (سووتەن) تێیان دا لە بەشی فیعلە. وشەکان هەموویان ناوی جێگەن. سووتان وەك (پەستن)نی یە هاوقاڵبی زۆری هەبێ ناچارمان بکات پێیەوەبەند بین. دەتوانین هەر وشەیێکی لەبار بوو زاراوەی هاو قاڵبی (سووتەن)ی لێ دابڕێژین.

ڕێژەوی ئاو جۆری ڕژا نیەتی وەك دەڵێ: ئەم کەتلییە ڕێژەوی خۆشە. دەشێ زاراوەی (ڕێژەن) بۆ (مساقط المیاه) داڕێژین کە ناوی جێگایە.

ڕێژەو کە لە فیعلی ڕژانەوە هاتووە بە خۆی و پاشگری (ەو) یەوە قیاس هەڵ دەگرێ. دەتوانین بە مەکینەیێکی دابێشتن یاخود هێڵەگ و سەرەند بڵێین: بێژەوی ڕێکە.

(گوتەن) کە لە قاڵبی (گوتەنی)دا دەردەکەوێ وشەیێکی حازر بە دەستە، ئەگەر زاراوەی ژێربێژی بۆ (منطق) پەرەی نەستاندبایە حەقی (گوتەن) بوو لەبری (منطق) دابندرێ چونکە کە دەگوترێ (کورد گوتەنی) بە ڕاڵێبوونەوە دەگوترێ بەمەش دا جێ ژێرایەتی تێدابۆتەوە. (منطق)ی عەرەبی ئەوەندە پاڵپشتەی لەگەڵ دا نی یە بۆ Logic . لە قورئان هاتووە: وعلّمناه منطِقَ الطیر.

وشەی (ڕوواڵەت) پاشگرێکی پان و پۆڕی بەدوا خۆیدا ڕاکێشاوە (ڕوو)ی ناوی ماددەی کردووە بە ناوی مەعنا. وشەکە بریتی یە لە (ڕوو + اڵەت) بەبیریشمدا نایەت ئەم پاشگرە لەگەڵ وشەی دیکەدا بەکار هاتبێ، ئەگەر هاتبێتیش ژمارەی ئەو وشانە کەمن. سوواڵەت، وەکوو ڕوواڵەت، لە سلێمانی باوە بەڵام گرفتی لەوەدایە کە نەبۆتە ناوی مەعنا، بۆیە ناتوانم بڕیار بدەم لەسەر (اڵەت)ی ئەم وشەیەیان ئاخۆ پاشگرە یاخود نا. لە لایەکی دیکەوە بیرم بۆ ئەوە دەڕوات کە سوواڵەت لە (سووان)ەوە هاتبێ و بووبێتە ناوی مەعنا بەڵام وەك کە (نفایة) ناوی مەعنایەو بۆ ماددە بەکاردێت ئەویش لە ڕێبازێکی نرخاندن و هەڵسەنگاندنەوە خۆی بە مل ئەو شرەقاپ و قاپاخانەدا دابێت و لە سوواڵەت دا، ئەگەر دەخلی بەسەر سووانەوە هەبێ، پاشگرەکە ناوی مەعنای کردووە بە ناوی ماددە. قیاس ڕێ دەدات (پوواڵەت) بە زاراوە دابنێین بۆ ئەو شتانەی پوواونەتەوە. لە ڕێی قیاسێکی نەختێك بەرفرەوانترەوە دەتوانین (خوواڵەت) هەموو خووی بەدی مرۆڤ، کە ویسترا غەیری مرۆڤیشی پێ بگرینەوە.

لێرە بە دواوە فەرهەنگۆکێك بۆ ئەو زاراوانەی کە لە پێوانەوەمان وەرگرتن دەنووسمەوە بەپێی سەرەی هاتنیان بۆ ناو نووسینە کە نەك بە پێی پیتی ئەبجەدییان. بەشی دیکەی نووسینەکەش کاتی خۆی فەرهەنگۆکی دەبێت. بۆ یارمەتی دانی خوێنەر، ئەو وشانەی کە ڕوون کردنەوەیان بوێت بە جۆرێك لە جۆران ڕاڤە دەکرێن، ئەوانی دیکەش لەناو نووسینەکەدا خوێنەر لێیان حالی

| | |
|---|---|
| دەبێت. | خورەك: سريع التأكل |
| رووتاریا: پرۆلیتاریا (F.) Proletariat البروليتاريا طبقة العمال أو الكادحين | سووتۆك |
| سەرشار | سووتێنوك |
| چاوە: حجيرة: Cell | مژۆك |
| هەن [ئەن]: لە ئاڤێستادا هەناسەیە | دزۆك |
| ئافەنت: وعاء | خەندم |
| ترشەزێ: ئۆکسجین (مولد الحموضة) (*) | نەخەندم |
| وردبین: مایکرۆسکۆپ: Microscope: مجهر | بەرئەزموون |
| رنەك: خرماشە | نەزموو |
| پارزۆنگ: مصفاة | نەگەڕ |
| فرەگۆشە | نەخەس |
| مشتار | نەزۆکاندن } تعقيم |
| بەستار | ~~تعقيم~~ |
| دوار | خەساندن |
| ڕستار | ئایەتی: موجب |
| پێکەڵ | نایەتی: سالب، منفى |
| تێکەڵ | نایاندنی نایاندن: نفي النفي |
| ئاوێتە | ئایاو |
| | نایاو |
| بێبڕ: قاطع | نەیار |
| بێسووت | نەپەست (غير قابل للانضغاط) |
| هەڵمژ | نەساز |
| ڕاهێن | ڕەواندن: حەلاڵ کردن: تحليل |
| بێخست: آلة الهدم | نارەواندن: تحريم |
| داسەپێن: متعنت | ناجۆر: unfit |
| وەرگر | لاشەڕ: عدوالحرب |
| فروسماو: مسحور | بەرهێز |
| تێفرووسماو: | بەرترس |
| تێفروسم، تێفروسمە | بەرخول |
| داشۆران: تعرية، انجراف التربة | دانەکی: قابل للعطاء |
| داخوران: تأكل | دانانەکی: قابل للوضع |
| داشۆرو داخور: عوامل التعرية والتأكل | دەروو |

(*) هەرچەندە ئۆکسجین (ترشەزێ) دەگەیەنێ بەڵام ئەمە بەرێ نا... [illegible]

نەراو: منطلق

نەرکێشە

نەرپەڕێنە

نەرهێنە

نەرخەرە

ڕژێنە، خنکێنە.. هتد

هەستەدەر

هۆشەدەر

سەرەدەر

بیستەدەر

دیتەدەر

دەرەئاشتی

دەرەجەنگ

دەرەگرانی

دەرەهەرزانی

دەرەگەرما

دەرەسەرما

دوازدەبەدەر... هتد

وڵات بەدەر

قەفقاس بەدەرەکان Trans Caucasian

ئاسمان بەدەرەکان

کاکێشان بەدەرەکان

کات بەدەر أزل، أبد

کوناش perforated

سەرکەوتە

داکەوتە

نیشتە

تێهەڵکشە

بن توێژ

زرتوێژ

زرتیرێژ

سەروبەر: إجمالي

سەروبن کردن: تغطية الاخبار

بەسەرگرتنەوە

سەرە

بنە

سەربە...

سەرینایی

زەهرەنیا

قورەنیا

ناوەنیا

بنەنیا، ڕۆخەنیا...

ژێراوە

ژێرکراس

ژێرپۆش

ژێرلێو

بنە

بنگە

سەرەچەك

سەرەما

بنەبڕکردن

بنەکێش

بنارو بەرزایی: قاعدة و ارتفاع

بنکۆڵ کردن

بنشل کردن

بنکەل کردن

بنست کردن

بنگر

چەسپێنە: لحيم

چەسپەك: مادةاللحم

چەسپێن: لحام

بن قول، بن تورك، بن جاف...

بن پرۆژە

بن بەرهەم

بن بەرژەوەند

بناشوورە، بنادیوار

هەڵاواردن

هەڵداشتە

هەڵداشتوو

هەڵبەزۆك

برینکاندن : dehydration

برینکێنە : هایدرۆجین مژ

هەڵامسان

هەڵەپاس : ضال الولاء

هەڵبژاردە

هەڵبژێر

هەڵپیتوو

هەڵپیتستان

تێکەلاندن

پێکەڵ

پێکەلاندن : equation

هەڵەباش : متهور

هەڵکوتانەسەر

هەڵکوت

هەڵگرتە

پێوەنان

ڕێماشتن

ڕێماشتنی هەڵگرتە

ڕێماشتنی راستۆکی

هەڵەدار : متسرع

دابەش

دابەشین

دابەشەك

داهێزان

ڕاهێزان

دامرکان

دامردن

دامەزران

داوەڕین

داهێشتە

دابین

داماڵان

داماڵین

قوپاو

زەق

داچەکان

داچۆڕان

دزە، دزەکردن : تسلّل

لیك کردن

تسرب الأخبار

دەلاندن

داهاتنەوە : رکوع

بەسەرراگەیشتن

شیك پۆش : بیوت الازیاء

تەرپۆش

ڕاسان : تصدّی

ڕاتەوولگە

ڕاتەولە

ڕاتەولین

کۆلیتستان

مەلستان

ڕاپێچان

ڕاپیچ

پێچەکان : zigzag

پێچەبەدەورە : حلقة مفرغة

تێوەرێخ

| | |
|---|---|
| تێوەردان | قەڵاشتە |
| وەرگێڕ | چەمکار |
| وەرگەڕاو: مرتدّ | چەمبەند |
| وەرگرە: سماعة Reciever | چەمکێش |
| وەرپێچە: ضمادات | ڕاستکێش |
| وەرفڕێن | واتاکێشەکی |
| تێوەربوون | باهەڵدەر |
| نیوەگلان | بانەخۆر |
| هەڵمخان | باخۆر، باگر |
| بیرکان | تێهێنانەوە |
| ڕەواندن | بەسەرکردنەوە |
| بەحسان | سەراسۆیی |
| هەڵتەختان | لێپرسینەوە |
| جینگلان | لێتوێژینەوە |
| هەڵپان | لێتوێژ |
| شیلوکان | لێزان |
| •هایدروجاندن | پسپۆڕ |
| توکسیداندن | دەنگ دانەوە: echo |
| هایدراندن | ڕەنگ دانەوە |
| دڕەمانان | ڕەنگ هێنانەوە |
| لیراندن | داهاتنەوە: رکوع |
| حیزەلاندن | داهێنانەوە |
| دروستاندن | لێبردنەوە |
| ڕەهاندن | پێداهاتنەوە |
| سپاردە | دڵدانەوە |
| بژاردە | دڵدەرەوە |
| هەناردە بواردە | پرسەکار |
| سووتکە | پرسەگیر |
| سوونەڵ | |
| پالاونە | پرسەدار |
| پەستاوتە | بردەوە |

گیرەوە

گویزەوە: مال منقول

نەگویزەوە

دیتەوە

دۆزەوە

خوازەوە

داهێنەوە

پووچاندنەوە إبطال

برژێنەوە

گیرسێنەوە

برژێنەك

گیرسێنەك

شلانگ

شلۆك

شلەك

پێکداشلانەوە

تێ شلان

براندنەوە

فرگە

خەوگە

خولگە

سوورگە

میزنۆك

فیتەنە

پەرستوور

رەستوور

رێژەن

گوتەن

پووالەت

خووالەت

(١) لە مێژە سەقافەتی ئیسلام بەتەنگ سازانی دەنگەکانی وشە سازانی وشەکان لەگەڵ یەکتردا بووە. زاراوەی (تنافر الحروف) زۆر کۆنە. ئاخێوەرو نووسەری رۆژاوا گوێی نەداوەتە ئەم لایەنە دەنا نەدەبوو وشەی وەکو anesthesia ، [illegible]arycarticasterone پەیدابێت.

deoxycortico-sterone

(٢) انتشارات دانشگاه تهران، بخش نخست، لاپەڕە (١٩٨) پوورداود.

(٣) لە کتێبی مزدیسناو ادب پارسی - د.محمد معین هاتووە: وشەی (وخشور) لە دوو کەرت پێك هاتووە: (وخشو - بر) وەخشوو - بەرە). لە ئاڤێستادا واتای ئەم دوو وشەیە (گوتە) دەبەخشی. بەدوایی کەوتە سەر قالبی: دەستوور، دەستوور

**تکایە، ئەوانەی باس و وتارمان بۆ دەنێرن، پەیڕەوی ئەم دوو خاڵە بکەن: -**

**١ - باسەکە بەخەتێکی خۆش بنووسن و دابڕکردنی (تقطیع) وشەکان بۆ ئێمە بەجێ بهێڵن.**

**٢ - باسەکە بە رێنووسی تازەی کۆڕ بنووسن.**

# المصطلح القياسي

مسعود محمد

ماهو منشور تحت هذا العنوان ضمن محتويات المجلة يشكل القسم الاول من بحث حاول استكناه القواعد والاسس والمسالك التي يمكن لواضع المصطلح في اللغة الكردية ان يتبعها. ويأتي في المقدمة استعراض عام لمهمة وضع المصطلح ومايجب توفره في شخص الواضع وفي القواعد التي يتبعها ومن مفردات االمصطلح من: إلمام باللغة [ووجوب الألمام بلغة حية واحدة على الاقل] وقواعدها وفقهها ومن الميل الى الأخذ بالاسهل والأقصر ومحاولة ربط حاضر اللغة بماضيها حيثما امكن ذلك من خلال الاستعانة بالكلمات التي لها ارتباط لفظي بيّن أو خفي بمثيلها في المعنى من مفردات النصوص التأريخية. وفي مجال نحت المصطلح من الكلمة غير المجردة يبدأ البحث بتلمس الخطى خلال تشابكات اللغة نحو المصطلح المنحوت من لفظة مجردة تامة المعنى وزيادة من التوابع التي لا استقلال لها بمفردها في البيان ويسمى هذا النوع من الكلمة في قواعد اللغة الكردية بالـ (داريِژراو) أي المصنوع أو المنحوت تمييزاً له من الكلمة المركبة ذات جزءين تامي المعنىٰ على الاقل. وهذه الزيادات التابعة منها ماهو سابق أو لاحق للكلمة او متوسط ولها عدد لايكاد يحصى يتوزع على الأسم والفعل وماهو ضمن مجموعة كل منهما ومنها مايختص بالفعل دون الأسم وبالأسم دون الفعل ومنها ماهو مشترك بينهما في تفصيل لايحويه إلا الاستقصاء وعلى صورة لايفهمها الا الملم باللغة الكردية وهو أمر يعم الكردية وغيرها من سائر اللغات. والبحث يدعو الى التوسع في صياغة المصطلحات بمعبرة من التضييق

والتعنت ولا المنافذ شريطة الأخذ بالقياس اللغوي السليم الذي يرفده الفهم العريض للغة وادراك طبيعة المفردة المقيس عليها من حيث كونها (اسما أم فعلا، صفة ام ظرفاً، ذات وزن واحد ام متعددة الاوزان، مقفاةً أم مرسلة، لازمة ام متعدية، واي اللواحق والسوابق والوسائط تلائمها على صورة حاول كاتبها ان يجمع فيها الركن الأول من سلامة الصياغة والركن الثاني من الوفاء بالمقصود.

# زاراڤێد فولکلوری

عبدالكريم دوسكى

پێ نەڤێت ژ وەرا رامان و مێژوا پەیڤا فولکلور (Folklore) بێژم و ل دوی بچم کانێ ژ کور هاتیەو د بنیات دا ژ کێژ زمانی دروست بویە، بەلێ هند دبێژم زانا ولیم توماس (W. Thomas) کرە دناڤ زاراڤێد زانستی دا ل سالا ١٨٤٦ز. مەبەست ژێ ئەو تایێ زانینێ یە ئەوێ لێکولینێ ل سەر کەلەپورێ مللەتی دکەت ب هەمی رەنگ و توخم و تا ڤە.

مللەتێد ئەوریی گرنگی دا ڤی تایێ زانینێ لە دوماهیا جەرخێ هەڤدێو رابون ب کومکرن و دوی چونا دەربارەی [چیروك، پەند، ستران، داستان، هتد]. رەوشەنبیرێد وان ل وێ باوەرێ بون کو دوو تایێد رەوشەنبیریێ هەنە هەر دوو ڤێکرا دچن. ئێك رەوشەنبیریا تەخا کەتخودا یە و یا دن ژی رەوشەنبیریا تەخا هەژارە و هەر دو رەوشەنبیری ڤێك دکەڤن (culture contact) ژ ئەنجامێ ڤێ ڤێك کەتنێ هندەك تشتێد مللەتی دیار دبن و دبنە بنواشە بو رەوشەنبیریێ. ڤان هزر و بیرا هُندەك پالدان کو دەست ب کومکرن و پشك کرنا فولکلوری بکەن لە دوی هەریم و دەڤەرا، لێکولینێد ئەکادیمی ل دوماهیا چەرخێ نوزدێ دەست پی کرن.

د سەبارا فولکلورێ کوردی دا مشە کوردناس و روژهەلات ناس و گەرۆکا دانە قەلەمی و ڤەجەماندن بەلێ رەوشەنبیرید کورد ل سەرێ ڤی چەرخی دەست ب کۆمکرن و بەلاڤکرنا فولکلوری کرن دەمێ کوڤار و روژنامێد کوردی هندەك پەند و گوتنێد مەزنا بەلاڤکرین وەك کۆڤارا ژین ١٩١٨ز، روناهی ١٩٤٢ز.

فولکلورێ کوردی گەنجەکا پر در و مراری یە و مرۆڤ چەند ل پەی بچیت دێ هەر گەوهەر و مەرجانا ژێ دەرکەت. هەمی مرو دشێن تێهنا خوە پێ بشکێن و باجا خوە ژێ راکەن. ڤان سالا مشە خوەندەڤان و نڤیسەرا بەرۆکا فولکلوری دایە بەر داسـ خوە بەلێ مخابن مشە ژ وان کەتینە تەحسین و شاشبونادا. ژ بەر ڤێ چەندێ پێدڤی یە فولکلور ل دوی شوپ و ریەکا زانستی بێتە کۆمکرن و ژێك ڤەکرن. فولکلورێ کوردی تایبەتیا خوە هەیە و دبیتە چەند پشکێد سەرەکی و زاراڤێد خوە یێد هەین.

أ ـ گوتنێد مەزنا:

———— ڤی تایێ فولکلوری جهەکێ فرەهـ و هێژا پێ گرتی، بیرو باوەری، ژیان، پەیوەندی، رەوشت و ئاین و کارو رابون و رونشتنا مرۆڤێ کورد لە ڤان گوتن و پەند تێنە گوتن. [پاول بەیدار] ل پێشگوتنا «گرامەرا کوردی»د سەبار پەندا دا دبێژیت: «پەندێد کوردی گەلەك د دیارن، ئەو بنگەهـ و بناخا خەبەر دانێنە، ب راستی دە. ولەمەندیا زمانێ کوردی نە، دەرهەق هەمی تشتی گوتن هەنە.» هەر وەسا ئەڤ گوتنە ژی دبنە هندەك چقێد دن وەك ڤان:

پەند:

———— فریدرش زایلر (Ereedrish Zayler) دەربارەی پەندێد پێشیا دبێت: «پەندێد پێشا چەند دەربرینەکێد رێك و پێك و مومکن، بارا پتر شوپیا فێرکردنێ و شیرەتا پێڤە دیارە، روخسارەکێ هونەری پێڤەیە» هەر وسا آرثر تایلور (Arther Taylor) نڤیسەرێ ئەمریکی د پەرتوکا خوە دا (The Proverbs) دبێژیت:

«پـەنـدێـد پێشیـا رستـەکـا جوان و رێك و پێکە و وەرباندینە، پر شیرەت و سەربورن، د بەلاڤن دناڤ خەلکی دا. پەندێد کوردی مینـا یاسـایێـد ژیـانـا وانن، دەرهـەق هەمی تشتی تێن گوتن، شارەزایا وان د ژیانێ دا دیار دبیت. زمانێ پەندا بنواشێ زمانێ جوان و زەلالە، پەیڤێد سادە و پر در و مەرجانن وەك پەیکەرا یێد ئێ هاتین. ئەم دکارین هندەك بنواش و بنگەها لڤر ژێرا دانین.

أ ـ دڤێت پەند مەعنایەکا زاراڤی بدەت لجهێ مەعنا زمانی ژی، پەژن و رامـانێـد گشتی هەبن کو مەعنـا پەنـدێ یان ژی ئەگەر ژ پەندێ راست و راست نە دەتە دەستێ مە.

ب ـ دڤێت پەند ژ رستەکا کورت یان دوو رستێت کورت پتر نەبیت، دا ب ساناهی بیت بو ڤەکوهازتنێ دەست بو دەستی.

حـ ـ دڤێت پەند ل سەر حالەتەکێ تایبەتی نەبیت و کەسێ پەند گۆتی ئاشکەرا نەبیت.

ء ـ دڤێت پەنـدێ مەعنـایـەکـا زاراڤی هەبیت نە مەعنـایـەکا زمانی یان رون و سادە ب تنێ هەبیت پەندێد کوردی بشکەکە ژ پشکێـد کەڤن ژ فولکـوری ب رەنگـەکێ بەر فرەهـ ژینـا مرۆڤێ کورد تێدا دیار دبیت و زمانەکێ سادە و پەیڤێد رەسەن و بژوین. هەر وەسـا پەنـدا کوردی ب مێـژویـا گەلێ کورد ڤەگـرێـدایـەو ڤودیکەکا راست و دروستە ژیانا بەری نهو ڤەدگێریتە ڤە وەك ڤان نمونا

**١ ـ ب وەریسێ خەلکی، نە چە کەڤری.**

**٢ ـ ئەگەر سەروکانی شێلی بون، بەر جو دێ رەملن.**

**٣ ـ خابورە، ب ئابورە**

٢ ـ گوتن:

ــــــــــــ گوتن ئاخفتنێد لێك هاتینەو مرۆڤێد مەزن و ئاقلدار ڤەهاندینە دا ببنە سەربور بو مرۆڤێد پاش وان، بەلێ هەر بو حالەتەکێ تایبەتی یێد هاتینە گوتن و مەعنا خوە«مەلدەست د دەتە دەست گوهداری و بێ هزر لێ بێتە کرن. مەعنایەکا زمانی ب تنێ یا هەی. ڤان گوتنا سەلیقە یا هەی و لێك تێن و قافیە بارا پتر ئێك دگریت و ب زمانەکێ جوان و سڤك هاتینە ڤەهاندن وەك ڤان نمونا:

**١ ـ ژنا شەرمین ب شارەکی،**
**مێرێ شەرمین ب کارەکی.**

**٢ ـ هەچیا جانە، یا ب دو بەختانە.**

**٣ ـ جحیلین کەوە، ئەگەر فری هەوە.**

**٣ ـ مامك:**

**ــــــــــــ مامـك پێـك تێت ژ چەنـد پەیڤـا و دو سێ رستـا دروست دکـەن. یا هاتیـە دانـان بو زیـرەکیو بیـر تیـژیا مروڤـا. کەسێ ئەو مامـك دارێتین، هزرا نشتکی یا کری و دانایە د ناڤ چار چوڤێ چەند پەیڤەکا دا. کەسێد دن ژی هزرا خوە تێدا بکەن و مەژیێ خوە بدەنە شولی. هەر وسا دانەرێ وێ ژی نەی دیارەو و ئەم دشێن بێژین هەمی مامکا سەلیقە و قافیە یا تێدا هەی، ب زمانەکێ سڤك و بژوین هاتینە گوتن و دارێتن. خورستیو باقژیا زمانێ کوردی تێدا دیار دبیت وەك ڤان نمونا:**

**١ ـ دارا ل ناڤ دارا،**
**ژی تێت دەنگێ بریندارا.**

**«مێشا هنگڤینی»**

**٢ ـ هێڤەکا ل سەر هێڤەکێ،**
**تەیرەکێ ل سەر شیڤەکێ،**
**کونا دەڤی دنیڤەکێ.**

**«ئاشێ ئاڤێ»**

**٣ ـ هونی و مونی،**
**یێ ل بن کونی،**
**ئەز دبینم و تو نابینی.**

**«چاڤن»**

**٤ ـ هلندر و ملندر،**
**کێ دیتیە کور ژ بابێ بلندتر.**

**«هێسترە»**

٤ - بەر هوز «رەهوانیا زمانی»:

ئەڤ ژی چقــەك دن ژ چقێــد فولكلوری یە. گوتنــەك لێــك هاتیــە و رەنــگ و روبــاری هوزانێ لێ یە. بارا پتر ب كێش و قافیە هاتینە ڤەهاندن. ئەڤ توخمــە بارا پتــر ژ بو زاروا هاتینــە دارێتن دەمێ فێــری ئاخفتنێ دبــن و دەنگێــد گران ب ڤان گرتنــا ل بەر دەڤێ وان سڤــك و رەهوان دبن. هەمی پیتێد گران ئەڤ گوتنە ژێرا هاتینە ڤەهاندن ئەم دكارین بێژین ئەڤە پلەیكا بلندە بو فێركرنا دەنگا د زانستێ فونــەتیكێــدا زمــانێ كوردی ب ڤان توخمــە راهینانا دەولەمەندە و مشە تشتێد وەها تێدا هەنە وەك ڤان نمونا:

١ - سێ سەلك، ب ئاڤێ دا تێن

یا ئێكێ توی تێ،

یا دوێ موی تێ،

یا سێ گوی تێ،

ب دەڤی چو مە یا توی تێ،

ب هستا چو مە یا موی تێ،

ب پیا چو مە یا گوی تێ.

٢ - جەركێ رونی،

درها رولێ را

رها رولێ د ئالێ رێ را.

٣ - تەرمێ نوحێ،

نوح لە پشتێ

هەچیێ حەڤت جا بێژیت

دێ چیت بەحشتێ.

ب - ستران:

كەڤنتــرین و دەولــەمــەنــدترین پشكــا ئەدەبێ فولكلوری یە. هنــدەك زانــا دبێن ســترانێــد شڤان و كاڤانا بەری هەمی توخمێــد دی دەست پێكــر بەلێ هنــدەك یێــد دن دبێــژ ن پشكــا ســترانێــد ئاینی كەڤنتــرین توخمــە. بەلاڤ بونــا سترانێ نەژ بەر ئەدەبیاتێد نقیسی درەنگ پەیدا بون، بەلكو ژ یانا تایبەتی یا گەلێ كورد و وێنێد جیاواز بونە هوێ ڤێ دەولەمەندیێ. هەر وەك [خاجادور ئابوڤیان] دبێژیت «ل جەم هەر كوردەكی مروڤ هەست بە شاعــریێ دكــەت، ب ئاواز و ساز ســترانــا ب چیــا، دول، روبـــار، سولاڤ، گول، چەك، هەســپ و قارەمـــانــیێ دبێن و هەكە هندی كوردا حەژ سترانا كری، هند حەژ پشكێد دی یێــد فولكلوری كربــا دا كەنجینــا فولكلوری دەولــەمــەنتر لێ ئێت. دژیارا گوندا دا هەر شەڤ ل مالەكێ دا مروڤ كوم بن و ستران بێژ لاوك و حەیرانا هاڤێنە بەرهەڤ هەمی رویدان و شەر و شورێــد وان ب ســتــران هاتینــە گوتن و ڤەكــوهــازتن دەست بو دەستێ. ئەم دشێن بێژین سترانا فولكلوری سترانەكا هونەری یە ل سەر سەلیقا خەلكێ گوندا هاتیە گوتن.

آرنولد هاوزر (ARnold Hawzar) دبێت: «سترانا فولكلوری تێتە حساب كرن كارێ مروڤەكی ب تنێ بەلێ یا هاتیە دارێتن ب رەنگــەكێ هونــەری و رەســەنــایەتی یا تێدا هەی، ستران یا سەر پێكی یە، بەلێ نە یا سادە و بێ هونەر و مەبەستە. پێدڤی نینە هەر دەم دانەر یێ نە دیار بیت بەلێ هەر رەنگەكێ بێ خودان (impersonal) وەردگریت. هەر وسا رەنگەكێ گشتی وەردگریت و لە ناڤ هەمی تەخێد مللەتی یا بەلاڤە. ڤەكوهازتنا سترانێ ب زارێ خەلكی هێلا هەر دەم هندەك تشت لێ كێم و زێدە ببن، هەمی بوویەر و تشت د سترانێ دا بزاڤ و لڤلڤینێ دكەن د كەرا كومەلا كوردەوارێ دا.

هێژا توما بوا (Thomas Bois) دبێژیت هندەك دەڤێد ڤان سترانا ڤەدگەرێنە چەرخێ پازدێ و شازدێ زایینی سترانا كوردی مشە نا و چق ژێ دچن ل دوی شارەزایا خوە ئەز دێ كەمە ئەڤ پشكێد خوارێ:

١ - لاوك: Lawik

د قادا ســترانــا كوردی دا لاوك جهەكێ بەر فرەهـ ڤەدگرن و دبەلاڤن. ئەو سترانن ئەوێد ب مێرچاكی و شەرو شورا تێن گوتن. پارا پتر درێژ ن و بابەتێ

وێ ل سەر زێرە کێو چەلەنگیا خوٚرت و مێرخاسا نە و هەر دەم قارەمان سەرکەتی یە و شاد و سەر بلند بەر ب مال تێت.

ئەڤ توخمە ستران ل کوجك و دیوان خانا، دهاتنە گوٚتن.

دبونە پالڤەدان بو کەنج و تولازا کو ریا مێر چاکی پێ بگرن و خوە بدەنە کوشتن د ریا سەر بلندی و سەرفرازیا ناڤێ خوە. پارا پتر ژڤان لاوکا چار بەندن و کێشەکا درێژ هەنە و ل دوی برکا تێنە لێکڤەکرن و رەنگێ هوزانا سەربەست دگریت وەك ڤێ نمونێ:

**داغێ دابو ل سەر داغێ**
**دلێ من داغێ دابو ل سەر داغێ**
**بەگێ منوٚ داغێ دابو ل سەر داغێ**
**برەکا مالێد مە عەبدویا و کالدارا**
**بارکر ژ زوزانێد ژوری**
**هەیلا لمن بەیتارێ ڤەگەریابو**
**وارێ چل کانیێ دەینابو کشلاغێ**
**وەرگەریا وارێ چل کانیێ**
**دانابو کشلاغێ**
**جەهوەر ئاغا ب سێ دەنگا کرە گازی**
**سمکو کەکو رابە کارێ خوە بکە**
**ئەم دێ چینە دیوانا سەربازێد عەجەما**
**ل وەلاتێ تەهران و تەڤرێزا**
**بێنەکێ ل سلاڤی واغێ**
× × ×
**ئاغێ منوٚ رابە سەر خوە**
**بەگێ منو رابە سەر خوە**
**جلێ میران و حاکما بێخە**
**دەستەکێ جلێد قاجاغا بکە بەر خوە**
**رێکا تەهرانێ دویرە**
**رێکا تەڤرێزێ بدە بەر خوە**
**ئاغا سەد جارا دبەختێ تەمە**
**هەکە ئەم چوینە وەلاتێ تەهران و تەڤرێزا**
**دیوانا سەربازێد عجەما**
**دسٚت هەلینانەکا مێرا ژ من را بکە**
**ئەز سەد جارا د بەختێ تەمە**
**سەرێ خوە نە چەمینە ملێد خوە بدە بەر خوە**
× × × ×
**هەسپێ میرێ من دندله**
**رەش مەنێ کەکێ من دندله**
**سەرێ مەیدانا دبەزە**
**بنێ مەیدانا دسەکنە**
**جەهوەرئاغا ب سێ دەنگا کرە گازی**
**گەلی بابکێد عەبدویا**
**سەد جارا دبەختێ وەمە**
**دونیا یە ل وەلاتێ تەهران و تەڤرێزا**
**ل دیوانا سەربازێد عەجەما**
**تێمە گرتنێ یان کوشتنە**
**کەکێ من سمکو بکەن ئاغا**
**داننە شوینا منە.**
× × ×
**کونێ جەهوەر ئاغا مەزنە ڤ عەردێ کەت**
**کونێ بابێ بوزکو مەزنە**
**هەیلا لمن بەیتاری ڤ عەردێ کەت**
**گولیزارێ ب سێ دەنگا کرە گازێ هوینێ رابن**
**هەسپەکێ بوٚزی بەزا ل بن دەرێ کەن**
**لغاڤەکی ل سەر دەڤێ کەن**
**بدەنە دەستێ خورتەکی عەبدویا**
**سڤك بابێ بوزکوٚە دا ڤرێ کەن**
**ئەز نەد غەما گرتن و کوشتنا مێرانم**
**ئەزێ کەتمە غەمێ هاتە کوشتن کولی**
**جەهوەر ئاغا بابێ بوزکوٚ بەلێ ئەز نوزانم**
**چا پاش ئەزێ گل و گازند و**
**داڤ و دالاهیێ خوە ل یا کێ کەم.**
× × ×

**کونێ جەهوەر ئاغا دەینا وارێ سەر کانیێ**
**کونێ بابێ بوزکوٚ مەزنە**
**هەیلا لمن بەیتارێ دەینا وارێ سەرکانیێ**
**گولیزارێ ب سێ دەنگا کرە گازی**
**بلا ببمە قوربانا کویڤك و قوتاسێد**
**بابێ بوزکوٚ هەروٚ سوبان و ئێڤارا**
**شور دبونە سەر باسکێد حەراما قامە دیێ**
**ئەز نەد غەما گرتن و کوشتنا مێرانم**
**ئەزێ کەتمە غەمێ هاتە کوشتن کولی جەهوەر ئاغا بابێ بوزکوٚ**
**ئەڤروٚ چەوا تەرمێ واغاێ گران**
**مابو ل وەلاتێ تەهران و تەڤرێزا**
**ل دیوانا لە غەریبیێ.**

× × ×

۲ ـ حەیرانوك : Heyranok

ــــــــــــــــــ ئەو ستــرانــن ئەوێــد ب ئەڤینیێ و بەر دلکیێ تێنە گوتن. د بەلاڤن دناڤ کومەلا کوردی دا نەخاسمە دناڤ زەری و تولازا دا، لەوا کول و کەسەرا ڤێکرا دا درێژ ن و گل و گازندە و کرفتارێد خوە دکەنە هوزان و ستران و ئاواز وئالێ ئەڤینی و دلداریا پاك و بژوین دیار دکەن. ئێك ژ ساخلەتێــد ستــرانێ ئەوە کو دشێن بەحسێ رامــوســان و بەر و بەرسنکێــد کەچــا بکــەن د ستــرانێ دا. ئەڤ توخمێ ستــرانێ کەچ و کور دهاڤێنە بەر ئێك وەك ڤان نمونا:

**کورکوو دینوٚ ژ مال مەزنا**
**حەنەکا نەکە ئەزا ب لەزم**
**هەکە تو نیچیرڤانی خەزال ئەزم**
**هەکە تو نەخوشی دوختور ئەزم**

× × ×

**فیستان سورێ با دل هەوا**
**تە د پاخلێ دا هێکێد کەوا**
**تە مالا من خراب کر**
**ڤان حەنەکا ڤان درەوا.**

× × ×

هەر وسا هندەك سترانێد دن ژی هەنە ژ بلی توخمێ بەرێ ب ئەڤینێ گوتینــە کەچ یان کور ئەڤینــا خوە خویــا دکــەت ب ستران و رەنگێ سترانا درێژ وەردکریت ل دوی شویا سترانا لاوك دچیت ژ لای یرکا ڤە وەك ڤێ نمونێ:

**بەژنەکا شل و مل**
**ژ بن کونێ مالا بابێ خوە رابو**
**شمکەکا زێری ل پێ خوەکر**
**گولیەکا ئارمیشێ شولێ حەلەبێ ل زەندا خوەکر**
**ل ناڤ کوٚنا تێ و دبێت**
**گەلی خەلکوٚ عالەمێ ئەو کینە**
**ئەو کی نینن**
**ئەو سوارن، سوارێد خالێ وٚ**
**کورێت مامێ وٚ**
**ئێڤارەکا درەنگە برایا خودێ وٚ**
**ئەڤ شەڤە ئەو**
**مێڤانێد ڤێ بەژنێ وٚ.**
**کەچکا دبێژیت ئەز رابم**
**خوە ژ دەلێلێ مالێ را ب خەملینم**
**کراسەکی کتانی سورمەزەری**
**شولی حەلەبێ ل بەر خوەکەم**
**بازنەکی زێری ل دەستێ خوەکەم**
**لەز کەم ب لەزینم**
**شویشەکا گولاڤا بەغدائێ**
**لە دەرێ دیوان خانا بابێ خوە ب رەشینم**
**قەهوەکێ بوٚ مێڤانێ خوە بینم**
**هێل و دارچینا تێ ب کەلینم**
**سێ بەندی نیڤا شەڤێ پێڤە**
**ب چمە سەر جهـ و بالگێ دەلێلێ مالێ**
**قولپا سنگ و بەرا ژێرا ب ڤەتینم**
**خەم و کول و خەیالێد دونیاێ گەلەکن**

ژنیف شەڤ ب جوتێ مەمکا ب رەڤینم

× × ×

٣ ـ دیلۆك Dilok

———— سترانێد سڤکن ل دیلان و سەمـا تێنـە گوتن. کوڤـەنـد ل بەر دهـاتنـە کرن و ب سەلیقـە و کێش و قافیەنە. ناڤەروکا وان ب جوانی و ئەو و تولازیا زەری و ئەسمـەرا هاتینـە ڤەهـانـدن یان ژی ب هنـدەك بویـەران هاتینە گوتن و بوینە پەسته یان سەلیقا سڤك بو دانایە.. کێش و قافیا دیلوکا وەك کێش و قافیا هەمی سترانێد دنن.

درەسەنن و هەمی توخمێد برکا یێد تێدا هەین وەك شەش، حەفت و هندەك جارا بوینە یازدە، ب زمانەکێ سڤك و بژوین هاتینە گوتن. وەك ڤێ نمونێ

**لێ لێ کنێ لێ لێ**
**مالا منێ وای وای**
**رەش روحانێ لێ لێ**
**ئاڤ ل بنێ وای وای**
**ڤان روبارا لێ لێ**
**نالە نالە وای وای**
**دگەل خوە دینیت لێ لێ**
**قرش و قالە وای وای**
**مەمکێد کنێ لێ لێ**
**سێڤا خالقە وای وای**

× × ×

**لێ لێ کنێ لێ لێ**
**مالا منێ وای وای**
**رەش روحانێ لێ لێ**
**ئاڤ ل بنێ وای وای**
**ڤان روبارا لێ لێ**
**وشە وشە وای وای**
**دگەل خوە دینیت لێ لەی**
**دار و قرشە وای وای.**
**مەمکێد کنێ لێ لێ**
**سێڤا ترشە وای وای**

× × ×

**لێ لێ کنێ لێ لێ**
**مالا منێ وای وای**
**رەش روحانێ لێ لێ**
**ئاڤ ل بنێ وای وای**
**ڤان روبارا لێ لێ**
**هورمە هورمە وای وای**
**دگەل خوە دینیت لێ لێ**
**دار و قورمە وای وای**
**مەمکێد کنێ لێ لێ**
**سێڤا خورمە وای وای**

× × ×

٤ ـ لۆرین: Lorin

———— ئەو توخمێ سترانا یە ئەوێ بو زاروکـا تێنـە گوتن ل دەمێ هاویـژکـرنێ یان نڤاندێ. رەنگێ هوزانـا یێ لێ و ناڤـەروکـا وان داخـازە بو ژیـانەکا تەر و نازك بو زاروکی. راستی هنـدی بێـژی پەیڤێـد سڤـك و لێك هاتی نە. سەلیقـەیـەکـا شرین و سڤـك هەیـە هنـدە جارا زاروکی دبـەرا دهلاڤێن دا یێ مژویل بییت یان دبەرا بنڤیت بارا پتر دایك یان داپیر ژ زارویێ خوە را دبێژیت وەك ڤان نمونا:

**خودێوو خوەش خودێوو**
**نە بارینە بەفرێوو**
**حەمکو رێڤنگێ رێوو**
**دێ چیت مالا خالێوو**

× × ×

یان ژێ وەك ڤێ نمونا دن:

**سەرێ هێلو ملانە**
**ترێ ئاڤ هەرزێلانە**
**گولکێ پیرە چێلانە**

خارزێ گەردەن کێلانە.

× × ×

٥ ـ پاییزوك: paiyzok

ــــــــــــــ ژ ناڤــێ وان دیــارە کو ل کەژێ پاییــزێ دبێــژ ن هندەك دبێـژنێ پیرە پاییـزوك، د هەر بەنـدەکـا سترانێ دا پەیڤـا «پـاییز»ێ ب ئاشکەرایی تێت وەکی چاخ. هنـدە جاران ژی نیشـانێـد پاییـزی د دانن مینـا ستێـرا گلاڤێـژێ، تەڤێـد باران و بەفـرێ یان با و عەوران. ناڤـەروکـا پاییزوکا ئەڤینی و بەر دلکی یە د ناڤبەرا کچ و کورا دا، یان کویر نێرینا دونیاێ یە. ب ئاوایەکێ فەلسەفی دەمێ پەلك وەراندنا دار و باری. کوردنـاس تومـا بوا (Thomas Bois) دبێت: «پـاییـزوك، ئانکو سترانێد پاییزێ، بەندێد وێ کورو کچ د هاڤێنە بەر ئێك، دەمێ پاییزێ ژی زوزانێد بلند تێنە خوار چو جوداهی دناڤبەرا [پاییزوکا]و سترانێد دی نینن وەك [لاوك، حەیرانوك، دیلوك.. هتد]ژ لایێ کێش و قافیا ڤە وەك هوزانێد سەربەستن هەر بەندەك بارا پتر (سێ) قافیە ئێك دگرن وەك ڤان نمونا:

هایێ.. هایێ

ئیرۆ پاییزە، دلکێ منێ کەتی یە

بەر کەسەرا،

گورە باکێ یە ل «کاتول و کەلەم پەری»

فراندییە دەخەل و قرشکێ

ل سەر بێدەرا،

هەچیێ دوست و یارەك

ب کەیفا دلێ خوە نەبیت

بلا چو جارا مەدحێد خوە نەکەت

ل ناڤ دیوانا

ل چو دەرا.

× × ×

یان ژی وەك ڤێ نمونا دی ژ پاییزوکا هەر وسا «سێ» قافیە ئێك دکرن

هایێ.. هایێ

ئیرۆ پاییزە

منێ نە کریە کاروبارێ زڤستانێ،

کوچەرێد مال خراب مالێد خوە بارکرنە

ژ وار و کوزێد زوزانێ،

خوزیکا ئەز بیامە هەڤال و هوگرێ بەژنا بلند

دسێ شەڤێد کانوینێ دا و

سێ روژێد خوپانا ڤێ گولانێ.

× × ×

٦ ـ نارینك Narink

ــــــــــــــ ئەو سترانن ئەوێـد ب بوك تێن گوتن دەمێ نیشانی و خەنای و هەتا ڤەدکوهێزن ژ مالا بابێ بو مالا زاڤـای. ئەڤ توخمـە ژی هەر وەك توخمێـد بەرێ ب کێش و قافیـە نە، هوزانێـد سەربـەستن، ب پەستـە تێن گوتن، ئاوازەکێ نەرم و سڤك یێ هەی، بارا، پتر ب جوانی و رندیا بوك تێن گوتن یان ژی ب زاڤای دەمێ دبەن سەرشوێ وەك ڤان نمونا

مەراکر چەندا کێلە

خابویرێ دناڤێت پێلە

نارینێ مال باب هێلە

× × ×

یا رابوی راوەستای

لەوەندی دا هێلای

یا مای ل هیڤیا برای

× × ×

مەراکر ئینا بەر دەری

دبەردا بسك و تەمەری

دای نینە بچیتە سەری

× × ×

هەسپی بینن ژ گارانێ

داکەنە ئەختە خانێ

لێ سوار کەن چاڤ دەرمانێ

هەسپی بینن دا نال کەین

نالبەندی لێ بەتال کەین

چاڤ رەشێ لێ سوارکەین

× × ×

٦ ـ لاوژە ـ لاڤژە Lavije

ـــــــــــــــ کوردناسێ هێـزا تومـا بوا دبێـژیت سترانێـد ئاینی نە یێـد درێـژ، بەلێ نە ئایەتێد قورانا پیروزن براستی ئەڤ توخمە ژی د مشە نە دناڤ سترانێد کوردی دا بەحسێ پێغەمبەری (ص)و هەڤالێد وی دکەن و شەرێد وان ل چاخێ بەرێ دەروێشا ب عەرەبانا ئەڤ سترانە دگوتن و دبەرا عەرەبانە دقوتان، ناڤەروکا وان ئاینی یەو ب رەنگێ هوزانا ب کێش و قافیە ڤەهاندینە وەك نهالا سیسەبانێو بەیتا بورێرەش و چیروکا ئەیوب پێغەمبەر، چەندە هندەك ژ ڤان هوزانن و خودان یێد هەین بەلێ وەك فولکلوری لێ هاتینە.

جـ ـ ئەفسانە ـ چیڤانوك: MythoLoyy

ـــــــــــــــ چیـروکێـد چاخێ کەڤن، گرێـداینـە ب بیـرو باوەرێـد گەڤن. ئەفسـانـا پەیوەندی دگەل خودێد تایبەتی یا هەیو پێك هاتینە ژ پێکولا مروڤی بو تێگەهشتنا دیاردێد دونیایێ، یان پێك هاتیە ژ لێك دانا مروڤی سەربـارەتی وان دیـار دا، بێگـومـان خەیـالینـە پتـر ژ زیری. د ئەفسانێد یونانی دا هەر تشتەکی خودێ خوە هەبو، وەك خودێ جوانیێ، هونەری، شعرێو بارانێ.

دەربـارەی ئەفسـانـا کوردی ماموستا [عەرەب شمو] دبێژیت «ئـەفسـانـە کەرەسـەیەکە بو ڤەژاندنا هندە بیروباوەرێد ئاینی یێد کەڤن و نوی یێد مللەتێ کورد. هەر وسا ئەفسانا کوردی ژی هەر وەکـو ئەفسـانـا گەلێـد دی یە، دەربـرینـا هەولا مروڤی یە سەبارەت ژیانا کومەلێ و رودانێد سروشتی.

د ئەفسانێد کوردی دا هەر دەم مروڤ یێ ب سەرکەتی یە هێزا خراپ ب بندکەڤیت و «مار» هەر دەم نیشانێ هێزا خرابە، زانـایێـد مێـثـولـوژی ڤێ ب باوەریـا کەڤنـا ئاینی ڤە گرێددەن کو «مـار» بو «ئـەهـریمـەن» بریە بەحشتێ هەتا ئادەم دسەردا بری. هەر وەسا ئەفسانا «ئەژدەهاك»ژی «مار» هەر هێزا خرابێ یە. هەر وسا ئەفسانا «خدرێ زیندە» کو خدر مروڤەکێ نەمرە و هەر پاشێ دگـەل هەژار و رێنجبـەرا دکـەت و ریـا باش نیشـا وان د دەت زانایێ مەزن [توما بوا] دبێژیت ئەفسانێد کوردی گەلە جارا دگەل داستانێد کوردی تێکەل بوینە

د ـ داستان Epos

ـــــــــــــــ هوزانـەکـا درێـژە ب رەنگێ چیـروکێ ڤە دچیت بەحسێ مێـرانیـا قەهـرەمـانـەکێ دکەت یێ مێژوی یان ژی یێ ئەفسانەی. داستان توخمەکێ ئەدەبی یێ هونەری یە د داستانێ دا هەر ژیانا مروڤی دیار نابیت ب تنێ، بەلکو ئومێد مروڤی ژی د ئیختە بەر چاڤ. کوردناس (توما بوا) دبێـژیـتە «داستـانێـد کوردی چیـروك بێژ (Cirok bej) یێد هەین دبێژن و دگەرن، دەست پێ دکەن رویدانا ئێك ل دوی ئێکی دبێـژن دەمێ دەگـەهنـە ئاخفتنێـد کەسێد داستانێ ب شعر وان گوتنـا دبێـژن و هەکـە پتـر ژ چیـروك بێـژەکی دحـازربن، ئێك رویدانا دبێت یێد دی هەر ئێك دەوری کەسەکێ داستانێ وەردگریت.

داستـانـا کوردی هەر چەنـدە ب دیمـەن و سیمایێ گشتی ڤە وەك داستـانێـد فولکلوری و ئەدەبێ نفیسی یێـد گەلێـد دی یە، بەلێ ئەم دشێین بێژین دو رەنگێد داستانا هەنە دناڤ فولکلورێ کوردی واتـە داستـانـا کوردی یا خورستی وەك: [مـەمێ ئالان دواتـردە سواری مەریـوان، چەتـو، دمـدم]و رەنگێ دن ژی داستـانێـد هەڤ بار دنـاڤ هەمی مللەتێـد روژهـەلاتێ وەك: [لەیل ومەجنون، شرین و فەرهاد] ل دوی ڤان گوتنا ئەم دشێین داستانا کوردی بکەینە دو پشکێد سەرەکی وەك:

١ ـ داستانا قارەمانی:

ـــــــــــــــ داستـانـا قارەمـانی کەرەسـەیـەکێ

دەولـەمـەنـدە بو هويـر نێرینا گەلەك روێد ژيانا دێرین یا کوردا، ئەڤ توخمێ داستانێ هێدی هێدی ژ خەیالی بەر ب راستی ڤە دچیـت. ژ ئازایـەتیو پەلـەوانیـا سادە و بێ مەبـەست بەرو پەلەوانیەکا مەبەستدار دچیت.

مەزنترین داستانا قارەمانێ د مێژوو فولکلورێ کوردی دا ب دروستی مابێت داستـانـا «دمـدم». ئەڤ داستـانە خەباتا گەلێ کورد دیار دکەت دژی شاهـ عەباسێ ئێکێ ل سالێد ١٦٠٨ز- ١٦١٠ز. مشە کوردناس و زانایێد کورد ئەڤ داستانە کوم کرینە و گەهاندیە چاپێ د. ئوردیخانێ جەلیل د سەبارا ڤێ داستانێدا دبێـژیت: «داستـانـا دمـدم پەیکـەرێ خەباتا مەردانەیە یا کورد دژی شاهێـد ئیـرانێ، نەخشێ خەبـاتـا کوردا یە بەرامبـەر دەرەبەگێد زوردار. بێ گومان داستانا [دمدم] مشە وێنێد راست یێـد زیـرەکیـا پەلـەوانێـد کورد تێدا خویا دبن، دەنگێ گەلێ مە روی ب روی ل بەر سنگێ دوژمنـا دیـار دبیت. د داستـانێـد کوردی دا دو رێـژێـد خەبـاتـا کوردا دیار دبن، خەبات بەرامبەر زوردارێد خومالیو بیانی. د داستانا «عەمێ کوزێ» دا، «عەمێ کوزێ» پەلـەوانێ داستـانێ یە کورێ تەخـا هەژار و رێنجبـەرە، بشـارێ چەتـو دەرەبـەگـە ب هاریکاریا بیانیا نەبیت نەشێت ب سەر پەلەوانی زال ببیت.

٢ - داستانا ئەڤینێ:

داستانا ئەڤینێ ل هەمی جیهانێ دا ب تایبـەتی ل روژهـەلاتێ سوزەکـا تایبـەتی و هەستـەکێ کویـر وراستگـو تێـدا هەیـە، بویەرێد هونەرمەندی تێدا هەنە. داستانا دلـداریـا کوردی سوز و هەست و خوشـەویستی و وەفـاداری و راستگـویی تێـدا هەیـە هەر وەك هەمی داستـانێـد دلـداریێ ل جیهـانێ هنـدە رۆخسـارێـد کومـەلایەتیێ و رەوشت و خوشیێ د ئێخنـە پێش چاڤ. داستـانـا دلـداریا کوردی دو رەنگن یا هەڤ پشـك دگـەل گەلێـد هەڤسـوی وەك «لـەیـل و مەجنـون و شرین وفـەرهـاد» ویشکـا خومـالی وەك داستانا «زەمبیل فروش و خەج و سیابەند» ل ڤان داستانا دا دیار دبێت وێنێ وەفاداریێو سوز و پەیمان و بیر و باوەریا مروڤێ کورد هەر وسا دیمەنێ کێش چاك و خراب دیار دبیت.

د داستـانـا «خـەج و سیـابـەنـد»دا لاوەکی جوتیار حەژ کەچ ئاغای دکەت دا دو کێش پەیدا ببن. ئەڤ داستانە ب تەڤاڤی داسـتـانـەکـا کوردی یەو بشـکـەکـە ژ گەنـجـە نەتـەوای و زور یا پەلاڤـە دنـاڤ مللەتێ کورد دا. وەك هەمی داستانێد دن چیایێد کوردستانێ قادا رویدانێد ڤێ داستانێ یە. کێـم دڤێ وێنێ دا هەنـە، چونکی ب رەنگـەکێ هونـەری و سەرنـج راکێشـەر هاتیـە نڤیسین. ئەڤینـا کور و کەچـا نیشا مە د دەت ئێکە ژ بەرهـەمێـد دیمـەنێـد دەرونی و مەعنەوی دناڤ کوردا دا.

هـ - چیروك: cirok

چیـروك ل فورم و دارشـتنێ وەك چیڤانوکێ دچیت، هەر چەندە ل رویێ کارەساتێ و ناڤەروکێ ڤە هندەك جودای هەنە ئەفسانە ژ خەیالێ وەرگێرایە و وەرگرتیە بەلێ چیروك ژ ژیانێ هاتیە وەرگرتن، زور ژ ژیانێ دور ناکەڤیت. د چیروك و حیکایێتێد کوردی دا گەلەك پەیڤ و گوتنێد باش و ب نرخ تێنـە ڤەگـوهـازتن د وانـدا گەلـە سنـج و رەوشتێد بەرێ یێـ پەیوەندی ب بیرو باوەر و ئاینێ چاخێ بەرێ دیار دبن و تێنە بەر چاڤێد خوندکاران، رەنگێ کەڤنەپەرستیێ تیتە بەر چاڤێد مە، د وان دا تشتێـد وسـا تێنـە بەر چاڤ یێـد کو هزار سالا ل ئاقـل و هشێ مروڤا دا ئاکنجی بوینە.

پەلەوان د چیروکا کوردی دا مروڤە. گیانێ خوە یێ راست نیشا مە د دەت. پەلەوانی د ژیانێ دا مەبەستەك هەیە، ژ بو وێ مەبەستێ ریا حەفت شەڤ و حەڤت روژا دبریت دا بگەهینە ئارمانجا خوە. ئەڤ چیروکە بو مە دەردئێخن کو مروڤ ب کار و رەنجا نەبیت ناگەهیتە ئارمانجا خوە، زانای مەزن [کوردویێف] چیروك و حیکایەتێد کوردی ل سەر ڤان پشکێد ژێری پارڤە

دكەت:

١ ـ چیروك و حیكایەتێد دەرهەقا ژینا مروڤا، دەرهەق ژین و ئاینێ وان.

٢ ـ چیروك و حیكایەتێد مێژویی

٣ ـ چیروك و حیكایەتێد دەرهەق دەهبا و تەیر و تەوالان و تەرمولان.

٤ ـ چیروك و حیكایەتێد خەیالبازی.

ڤی هێـژایی مشـه ناڤێ چیـروكێـد كوردی دنڤیسیت و بەلاڤدكەت وەك چیروكا [ئەبوزێدێ بن هەلال، میر مح، عەلی مەمەدێ نێچیرڤان و و هتد.)

چیروكا كوردی ب ژیانا نەتەوێ كورد ڤە هاتیە پەرچیم كرن چیروكا پەلەوانیێ نیشانا نیشتمانێ كورد یا پێ ڤە نونەكا بەرزە یا كو هەر دەم تورو فولكلورێ كوردی ژ ڤادا وەلات و دول و نهالێد كوردستانێ دور نە كەتیە.

ژێدەرو ڤەروز:


١ ـ لێكولینەوەی ئەدەبی فولكلوری كوردی. د. عیزەدین مستەفا رەسول. چاپی دوەم ١٩٧٩ز

٢ ـ كومەلە تیكستی فولكلوری كوردی. پروفیسور قەناتی كوردو ـ بغدا ١٩٧٦

٣ ـ ئەدەبی فولكلوری كوردی ـ بەشی یەكەم ١٩٨٤ كامەران موكری.

٤ ـ ئەدەبی فولكلوری كوردی ـ بەشی دوەم ١٩٨٤ د. شوكریە رەسول

٥ ـ دەقەكانی ئەدەبی كوردی ـ بەغدا ١٩٧٨ علاء الدین سجادی

٦ ـ ژ بەندی پێشینان لە شیعری كوردی دا كەریم شارەزا بغدا ١٩٧٦

٧ ـ پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی كوردی د. شوكریە رسول بغداد ١٩٨٤

٨ ـ الفولكلور قضایاه وتاریخه ـ یوری سوكولوف ـ ترجمة حلمی شقراوی وعبدالحمید حواس ١٩٧١ المطبعة الثقافیة ـ القاهرة.

٩ ـ الاغنیة الفولكلوریة في العراق ـ عبدالامیر جعفر بغداد ١٩٧٥

١٠ ـ مع الاكراد ـ توما بوا ترجمة آواز زەنكنه بغداد ١٩٧٥

١١ ـ دراسات في الفولكلور ـ د. أحمد أبو زید. القاهرة ١٩٧٢

12 - A Second Book of English idioms by V.H. Collins London 1966

13 - Current Emolish. by A.S. Hornby and others. London 1967

١٤ ـ دەقێد پایزوكا من ژ دەستێ هێژا عبدالرحمن مزوری وەرگرتن.

١٥ ـ لێـك ڤەكـرنـا پەنـدو گوتنـا من وج و مغـا ژ هندەك هزرو بیرێد كوتارەكا هێژا تێلی أمین دیت.

١٦ ـ دەقێد فولكلوری ئەوێد دناڤ لێكولینێ دا هاتین هەمی لجەم من هەنە دەست نڤیس.

ملخص البحث

# المصطلحات الفولكلورية

● عبدالكريم فندى دوسكي

البحث يتناول المصطلحات في الفولكلور الكردي ويبين كيف ان عملية جمع وتحقيق النصوص الفولكلورية بدأت على ايد ي الاوربيين في نهاية القرن السابع عشر الميلادي وبدأت عملية جمع ونشر الفولكلور الكردي في بداية هذا القرن وخاصة على صفحات المجلات والجرائد الكردية مثل [ژين وروناهى . . . الخ] . وفي العقود الاخيرة توجه عدد من الكتاب والادباء الكرد الى جمع هذا التراث الثر وتصنيفه ولكن الخلط والتشويش رافقا أعمال البعض منهم والباحث هنا يصنف الفولكلور الكردى الى الاقسام الرئيسية المدرجة ادناه :

آ ـ الاقوال والامثال :

وهي بدورها تتوزع على الانواع التالية

ا ـ الامثال :

وهي التي تمتاز بسلاسة اسلوبها وموسيقية أوزانها ولها الاسس التالية ان للمثل معنى لغوياً واصطلاحاً، بحيث لايكون المثل لحالة واحدة وخاصة بل يضرب لحالات أخرى

٢ ـ الاقوال :

انها جمل قصيرة ويمتاز معظمها بوزن وقافية شعرية وتكون لحالة خاصة . ولها معنى لغوي فقط

٣ ـ مامك (الالغاز) :

وهي جمل قصيرة وموسيقية وذات قافية وتقال لاختبار الذكاء وسرعة البديهة

٤ ـ بەرهوز (الاحاجى) :

إنها نمط من انماط التمرين على تلفظ احدى الحروف الصعبة للمبتدئين وهي نوع من التدريبات الصوتية .

ب ـ الاغاني :

تحتل حيزاً كبيراً من الفولكلور ولعلها اغنى نمط من بين الانماط الفولكلورية الكردية وإن تواصل الاغنية وبقاءها من جيل الى جيل شفاهة اعطت لها صفة الديمومة والاستمرارية والاغنية الكردية لها الانواع التالية :

١ ـ لاوك :

وهي أغاني البطولة والمجد والفروسية وإن جمع وبحث هذا النمط يكشفان جوانب تاريخية مهمة من تاريخ الشعب الكردي .

٢ ـ حيران :

وهي أغاني الحب تصف جمال وبهاء الشبان وتكون على شكل حوار عاطفي بين محب وحبيب.

٣ ـ ديلوك :

وهي أغـاني الـرقص والـدبكات ومضمونها تكون وصف الفتيان وحبهم وبهاءهم وتكون ذا موسيقى سلسلة وخفيفة.

٤ ـ لورين :

وهي الاغاني التي تتغنى بها الأم عندما تهز طفلها

٥ ـ پاييزوك :

وهي الاغاني التي تصف الخريف والنظر الى الحياة من زاويـة فلسفيـة مع تسـاقـط أوراق الاشجار ومضمون أغلبها حوار عاطفي بين فتـاة وفتى يصفـان حبهمـا بعـدم اللقـاء والوصال وها قد دنا الخريف.

٦ ـ نارينك :

وهي الاغـاني التي تقـال في الاعـراس والحفـلات وتصف العـروسـة وجمـالها ورونقها وخاصة وقت انتقالها من بيتها الى بيت الزوجية.

٧ ـ لاوژة :

وهي الاغـاني الطـويلة التي تقـال في المنـاسبات الدينية ومحتواها ديني صرف.

حـ ـ الاسطورة : چيڤانوك :

بخصوص الاسطورة يورد البـاحث رأيا للبروفسـور (عرب شمـو) حيث يقـول إن الاسطـورة الكـردية تدور حول بعض المعتقدات الدينية القديمة التي كانت منتشرة في بلاد الكرد وتـرد في معظم الاسـاطيـر الكـرديـة الحيـة كرمـز لقوة الشر ويكون المنتصر فيها على الاغلب الانسان.

الملاحم

تزخـر التراث الكردي بنوعين من الملاحم، الملاحم الكردية مثـل (دمـدم، فرسـان مريـوان، زمبيـل فروش، خهج وسيابهند» ومـلاحم مشتـركة بين معظم الشعوب الشرقية مثل [ليلى ومجنون وشـرين وفـرهـاد. ويمكن تقسيم المـلاحم الكـردية الى قسمين رئيسيين هما :

١ ـ ملاحم البطولة :

وهي التي تدور حول البطـولـة وشجـاعـة الفـرسان وأمجادهم ويلتصق هذا النـوع بالشعب الكـردي وأمجـاده إلتصـاقاً قوياً مثل ملحمة (دمدم).

ب ـ ملاحم الحب :

وهي التي تتنـاول الاخـلاص والتفـاني والتضحيـة من أجـل المحبوب حتى أصبح رمزاً من رموز الوفاء والاخلاص مثل «خهج وسيابهند وزمبيل فروش».

هـ ـ القصة :

في القصص الكـرديـة الفـولكلوريـة تظهـر علاقـات الانسـان بالطبيعـة ومعتقـداتـه القـديمـة وتصور قوة وجبروت الحكام على رقاب شعوبهم وتكون القصص الكردية كالانماط التالية :

١ ـ قصص تدور حول حياة الانسان ومعتقداته الدينية

٢ ـ قصص تاريخية

٣ ـ قصص تتناول الحيوانات والطيور وتحكى على ألسنتهم

٤ ـ قصص خرافية وخيالية شبيهة بالاساطير.

ويختتم البـاحث بحثـه بعد هذا الجهد المتواضع من أجل تقسيم الفـولكلور وإيـراد المصطلحـات التي يراها صائبة ويضرب أمثلة من النصوص الفولكلورية لكل مصطلح من المصطلحات الواردة في البحث.

# زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە

● عبدالرزاق بیمار ●

## سەرەتا:

لەبەر ئەوەی ئێمە لەچاو گەلانی تردا زۆر درەنگ خوێندنمان لە قوتابخانەکان دا بوو بە کوردی، مەسەلەی دانانی زاراوە لە کتێبەکانی قوتابخانەدا ساوایە.

ئەگەر ساڵی ۱۹۲۰ یەکەم کتێبی قوتابخانەمان کتێبی (ئەوەلەمین قراءەتی کوردی) بێت[1] بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی تا ساڵانی پەنجا خوێندن بە کوردی هەموو قوتابخانەکانی کوردستانی نەگرتەوەو جووڵانەوەی وەرگێرانی هەندێك کتێبی قوتابخانە زۆر بە سستی بەرێوە دەچوو، لەم ماوەیەدا مامۆستایان رەشید نەجیب، ع. و. نووری، بێکەس، شێخ محەممەدی خاڵ، رەفیق حیلمی. عبدالقادر قەزازو هی‌دی کە لە وەرگێرانی ئەو کتێبانەدا بەشدارییان کرد هەریەکە کۆمەڵێك زاراوەی تازەی لە کتێبی خۆیدا بەکارهێنا.

بەڵام لە ساڵی ۱۹۵۸دا تیشکی شۆرشی ١٤ی تەموز لایەنی تاریکی خوێندنی کوردیی رووناك کردەوەو کوردی خوێندن لە هەموو قۆناغی سەرەتایی‌دا لە زۆربەی شارەکانی لیوای هەولێرو سلێمانی‌و هی‌دیکە بریاری لەسەر درا، لەم رووەوە دوو هەنگاوی زۆر گرنگ نرا : یەکەم لە ساڵی ۱۹۵۹دا بەرێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردی دامەزرا کە بوو بە یەکێك لە دەزگاکانی وەزارەتی

(مـەعـاریف)و ئەرکی ئامـادەکردن و پێش خستنی خوێندنی کوردی پێ سپێردرا.

دووەم نەقابەی مامۆستایان لە ساڵانی ١٩٥٩و ١٩٦٠دا دوو کۆنگرەی بۆ مامۆستا کوردەکان لە شەقڵاوە بەست کە ژمـارەیـەکی باش نووسەرو ڕۆشنبیرانیش لەگەڵ مامۆستایان بەشـداریـیـان تێـداکـردو لە گیـروگرفتی خوێندنی کوردییان کۆڵی‌یـەوەو گەلێ بنـاغـەی بەکـەڵکیـان بۆ پێش خستنی ڕەورەوەی خوێندنی کوردی دانا.

ئەنجـامی ئەم هەنگـاوە پێـك هێنـانی چەنـد لیژنەیێکی لێ‌هاتوو بوو کە بۆ دانان و کۆکردنەوەو وەرگێرانی کۆمەڵێکی بەنرخی زاراوەی زانستی‌و ڕۆشنبیری قۆڵیان لێ‌هەڵ ماڵی، نامیلکەی (زاراوەی زانستی کوردی)یان بڵاوکردەوە.[٢]

دوای ئاداری ١٩٧٠ش دەرگای خوێندنی کوردی خرایە سەرگـازی پشتیّ‌و قۆنـاغی سەرەتـایی‌و ناوەنـدی‌و ئامـادەیی گرتەوەو بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کتێبە زانستی‌یەکانی وەکو کیمیـاو زینـدەورزانی‌و ڕووەك و بیـرکاری کران بە کوردی، جگە لە هەموو بابەتەکانی‌تری خوێندن.

ئێستا کتێبەکانی ئەو قوتابخانانەی لە ناوچەی ئوتونومیی کوردسـتـان بە کوردی دەخـوێـنـن لە پۆلـی یەکـەمـی سەرەتایی‌یەوە تا شەشەمی ئامادەیی لە هەموو بابەتەکان ـ جگە لە زمانی ئینگلیزی‌و عەرەبی‌و ئایین ـ بە کوردی‌یە، دیارە هەر ئەو کتێب و پرۆگرامەشە کە وەزارەتی پەروەردە بۆ گشت عیراق بریاری لەسەر داوە.

وەرگێرانی ئەو کتێبانەش وەکو من ئاگام لێ‌یە پلەبەپلەو ساڵ بەساڵ بوو، هەر ساڵە کتێبی پۆلێك دەکرایە کوردی‌و بۆ ئەم کارەش لیژنە دادەندرا، هەوڵ دەدرا مامۆستای دەرسی بابەتەکەو شارەزای بابەتەکە لەگەڵ زمان پاراوێك [نووسەر، یان زمانەوانێك] لە لیژنەکەدابن. جا هەر لیژنەیێك بەپێی بەندو بەش و برگەی بابەتی کتێبەکەی خۆی زاراوەی ئامادە دەکـردو هەنـدێـك فەرمـانبـەرانی بەڕێـوەبەرێتی خوێندنی کوردییش بەپێی جۆری شارەزایی‌و دەست پەرژان و توانای خۆیـان لە ڕێ‌پێ‌دان و چەسپـانـدن و دەسـتکـاری‌کردنی ئەم زاراوانەدا ـ ساڵ بەساڵ کە کتێبەکان چاپ دەکرانەوە ـ کەم زۆر هاوبـەشییـان دەکـرد. لە ئەنجـام دا هەزاران زاراوە بۆ یەکەم جار لە کتێبەکانی قوتابخانە کۆبووەوەو نزیکەی سێ چوار هەزارێکی لێ‌پـوختـەکـران و لە ژمـارە (١٤)ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری (پەروەردەو زانست)دا بە کۆمەڵ بڵاوکرانەوە.

ئەم کارە بەنـرخـە لەلایـەکـەوە تاقی‌کـردنەوەیێکی زمانی کوردی بوو کە دەری‌خست زمانێکی وشك و بێ‌کارە نی‌یەو ئەوەنــدە زینـدوو و دەرەتـان فراوانـە دەتـوانێ باوەش بۆ ئەو زانسـتـە تازانــە بکـاتــەوەو لە کاروانـی شارسـتـانی‌دا بەجێ نـەمێنێ. لەلایێکی‌تـریشـەوە بنـاغەیێکی بەکەڵکی بۆ زانستی زاراوە داناو مەودای نووسین و لێکۆڵینەوەو وەرگێرانی بابـەتـی زانستی‌و ڕۆشنبیـریی هەمـە جۆری فراوان کردو کارێکی دیـاریشی کردەسـەر نووسـەری ئەو مەیـدانـانـە لە دەرەوەی قوتـابخـانـەکانیش دا، بۆیە گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبی نووسەران تا ڕادەیێکی زور ـ لە مەیدانی بابەتی زانستی‌و ڕۆشنبیـریی تایبـەتی‌دا ـ کەڵکیـان لەم زاراوانـە وەرگـرتووەو لێیان بەکاردەهێنن.

ئەگـەرچی هەمـوو ئەو مامـۆسـتـا بەڕێـزانـەی لە دانـانی زاراوەکـانی کتێبی قوتـابخـانەدا بەشداریيان کردووە شایانی سوپـاسن و جێ خۆیـەتی پیرۆزبایی لە دەست پێشکەری‌و ڕچە شکاندنیان بکەین، بەڵام کارەکە بەو پێ‌یە کە کارێکی نۆیــەرەیــە لە کەمــوکــورتی بەدەر نی‌یــەو تووشی چەنـد گیروگرفتێك هاتووە کە ڕەنگە ئەمانە گرنگترینیان بن:[٣]

١ ـ دانــانی چەنـد زاراوەیێـك بۆ یەك چەمك، جاری وادەبینی لەیــەك کتێب دا دوو جۆرە زاراوە بۆ یەك چەمــك بەکارهاتووە وەکو: هێڵی یەکسانی، هێڵی کەمەرەی زەوی‌و خەتی ئیستیوا لە کتێبێکی جوغرافیادا، یان ئەو زاراوەیەی کە لە کتێبی پۆلێك دا بەکارهاتووە لە کتێبی پۆلێکی‌تردا بۆ هەمان واتا زاراوەیێکی دی بەکارهێنراوە. هۆیەکەی ئەمەش لە سۆنگـەی ئەوەدایــە کە لە وانـەیـە لیـژنـەی جوداجـودا کتێبــەکــانی بابـەتێکی زانستی چەنـد پۆلێکیـان کردبێ بە

کوردیو لە کاری یەکتر ئاگادار نەبوون، یان هەر لیژنەیەی یان هەر ئەندامەی لە لیژنەیەك دا خۆی بە زاناتر زانیوە لەوەی بەریو کۆنترۆلێکی ناوەندیی بەدەسەڵات و تەرخان کراویش بۆ یەك کردن و بژارکردنی زاراوەکان لە گۆڕێدا نەبووە، بەهۆی کەم کادیری کارکەری لێهاتووی بەڕێوەبەرێتی‌یەکەو لێشاوی سەروەری کتێبەکان.

٢ ـ دەست نەدان و نارێکیی هەندێك زاراوە، ئەمەش بۆ چەند هۆیێك دەگەڕێتەوە لەمانە:

أ ـ ئەندامانی لیژنەکانی کتێب وەرگێڕان و مامۆستایانی بابەتە زانستی‌یەکان وەختی خۆی ئەو ماددانەیان بە کوردی نەخوێندووەو شارەزایی‌یێکی تەواویان لە کوردیو لەو وشەو زاراوە تازە کوورانەدا نەبووە، تا چ لە کارکردن لە لیژنەکان داو چ لە کاتی گوتنەوەی دەرسەکان لە پۆل دا لەو ئاستەدا بن بتوانن رەخنە لە کاری ناتەواو بگرن، یان هەوڵی باشترکردنیان بدەن...

ب ـ وەکو گوترا کاری کردنە کوردیی کتێبەکان بەلێشاوو تێکرایی بوو، لەچاو زمانەکەمان و ئەو بابەتە زانستیانەش دا نوێ بوو، چ کەلەپوورێکی زانستیو فەرهەنگیی فراوان و شارەزامان نەبوو بە هانامان بێن تا لەسەر ڕێچکەی ئەوان بڕۆین.

جـ ـ لە دانان و هەڵبژاردن و وەرگێڕانی زاراوەکان دا هەندێك جار ڕێگەی زانستی پەیڕەو نەکراوە، کە لە داتاشین و خواستنەوەدا، یان لە وەرگێڕان و کردنەکوردی، یان لە داڕشتن دا هەوڵی ئەوە نەدراوە کە بەپێی دەستووری زانستیو لوجیك کرد بناغەی ئەم جۆرە کردانەی دانانی زاراوەکان پتەو بکەن کەوەتانێ دواتر روونیان دەکەینەوەو یەك یەك نموونەیان بۆ دەهێنینەوە، بۆیە هەندێك زاراوە تاموبۆی زمانی کوردییان ون کردووەو بە پێوانەی کوردەواری لاسەنگ دەردەچن.

د ـ زۆر کەم نەبێ وشەگەلی زارە (لهجة) جیاوازەکانی کوردی بۆ لێخواستنەوەو داڕشتنی زاراوەی نوێ وەبەر نەهێنراوە، سە بارەت بەمە بازنەی کارکردنی دانەران تەسك بووەتەوەو لە هەڵ هێنجانی زاراوەی بەپێزو چاك دەست ڕۆیشتوو نەبوون. بۆیە زۆر جار دەبینی پێداگرتن لە بەکارهێنانی وشەگەلی یەك زار بەڵکو یەك لکەزاری شارێك بووەتە هۆی نارێکیو هەرەمەیی و کورت هێنانی هەندێك زاراوە.

ئەمجا لەگەڵ ئەوەدا کە کۆمەڵە زاراوەیێکی جوان و ڕێك و گونجاو بەرهەم هاتوون، کۆمەڵێکیش لەق و بزواو و وێنەچوون پێویستە شارەزایانی زمان و زاراوە بە هاوڕێیەتی پسپۆڕانی بابەتە زانستی‌یەکان، پشت بەستوو بە فەرهەنگی زاراوەی زمانانی پێشکەوتوو چاوێکیان پێدابخشێننەوە، دوای بژارو تەتەڵە کردنیان، پەسندیان بکەن و بڕیاری جێگیربوونیان لەسەر بدەن.

بۆ ئەوەش، وا چاکە ڕێ خۆش کردنێك بکەین تا ڕێ هەڵ دەگرینە سەر بنەماو بنچینە زانستی‌یە پێویستەکانی زاراوەزانی، جا دەپرسین ئایا زاراوە چی‌یەو گرنگیی زاراوە لە زمان دا چی‌یە؟

**مانای زاراوە:**

---

پێشەکی دەڵێین دەبێ لەنێوان ناوو زاراوەدا جیاوازی بکرێت ئەگەرچی ئەمەش لەچاو زمانی ئێمەدا نیسبی‌یە! چونکە لای ئێمە زۆر ناوی زانستی هەیە لە حوکمی زاراوە مامڵەتی لەگەڵ دەکرێ، چونکە لە نوێوە کەوتوتە نێو کتێبان و تا ئێستا نە مەیدانی زانستی‌دا دەقی نەگرتووە، لە زمانی عەرەبی‌دا (ورید)و (شریان) ناون و بە زاراوە ناژمێردرێن[٤] بەڵام لە کوردیدا بەرامبەر ئەوانە تا ئێستا وشەی دەقاودەق ماناگەیێنیان بۆ دیاری نەکراوە، بۆیە کە بۆیان دیاریکرا تا بەینێك هەر بە زاراوە دەزانرێن، ئێمە لە کوردی‌دا رەگ، ڕێ، پیك، دەمار، پەی. رەنگە وشەی دیکەشمان هەبێت، بەڵام بەو مانا زانستی‌یەی کە ئەمڕۆ هەیە بەکار نەبراون، شێخ مارفی نۆدەهی نە (ئەحمەدی)دا دەفەرموێ:[*]

(عقب) پاژنە، (عِرق) رەگە

(عصب) پەی‌یە، (کرش) ورگە.

کەچی ئەمرۆ ڕەگ بۆ (جذر) تایبەت کراوەو بۆ (عصب)یش دەمار دیاری‌کراوەو پیك و ڕێو پەی بێ‌کار بەلاوەنداراون و ناچار نە ژێـر چوارچێـوەی زاراوەدا هاتـوون (خـوێـن هێنـەر) و (خوێن بەر)یان بۆ داتاشیون.

ئەمە لە لایێك، لەلایێکی‌تریشەوە زۆر وشە کە لە زمانێك دا زاراوەیـە کاتێـك لە کوردی‌دا وشـەیێکی بەرامبـەر مانـاکـەی بۆ دادەنـرێ سەرەتـا سەیـر دێتـە بەر چاو، بەڵام بە هۆی زۆر بەکارهێنانەوە پیاو لێی ڕادێت و ئاسان دێتە بەردەست.

(( زمانیش دوو بەشە، بەشێکیان زمانی لەیەك گەیشتنە ئەمەش زمـانێکی لەبن نەهـاتـووەو پەیـوەنـدی‌یێکی تونـدوتۆڵی بە زمانی ئەدەبـەوە هەیـە، بەشـەکـەی‌تـر زمـانی تێ گەیشتنـە ئەمـەش ئاشکرایەو پەیوەندی‌یێکی پتەوی بە زمانی زانستی‌یەوە هەیە کەوا ڕای زۆر لەسەری یەکدی‌گیر دەبێت، مەرجیش نی‌یە دەقاودەق لەگـەڵ مانـای یەکـەم جاری وشـەکـان جووت بێت، چونکـە ئۆکسجین کە مانای بنچینەیی (مایەی ژەنگ)ە لە تواناداا بوو ناو بندرێ (بایۆجین) ئەگەر زوو بیان زانیبا کە مایەی ژیانە.[٥] ))

کەوابێ زاراوە وادەکـات وتـە مانـایێکی نوێی دوور لە مانـا زمانی یا بنچینەیی‌کەی خۆی بگەیەنێت، هەروەکو چۆن سەییارە کە ئەمرۆ ئۆتۆمبیلە جاران لە عەرەبی‌دا مانای کاروان و ئەستێرە گەڕۆکەکانی دەگەیاند.[٦]

کەوابێ زاراوە وشـەیـەکـە کۆمـەڵێـك پسپـۆر بۆ مەبـەستێکی زانـستی ڕایـان دەکـەن بە یەك و دای‌دەنێن، دەشبێ بۆنـە یان هاوبـەشـی یان وێـك چوونێکی زۆر یان کەم لە نێـوان مانـا زمـانی‌یـەکـەی‌و مانـا زاراوەیی‌کـەدا هەبێت.[٧] لەبەر ئەوەش کە زاراوەیێـك دانـدراو خەڵکـەکـە لە بەکـارهێنـانی‌دا ڕاهـاتن هەڵ کەندن و لابردنی ئێجگار سـەختە بۆیە دەبێ هەر لەپێشەوە ڕێگەی سەرچڵی‌و سەرپێی‌ی لە دانان و هەڵبژاردنی زاراوەدا لە خۆمان بگرین.

**گرنگیی زاراوە لە زمان دا:**

ئەمـرۆ ڕۆژی پێشـکـەوتنێکی ئێجگـەر خێـرای زانست و تەکنـەلـوجیـایـەو هەر ڕۆژە نزیکـەی پەنجـا زاراوەی نوێ دادەکـەوێ‌و[٨] هەر لکێـك لە لکـەکـانی زانستیی وەکـو کارەبـا، بۆشـایـی‌زانـی، بە هەزاران زاراوەی هەیـەو زمـانـی گەلـە پێشکەوتووەکان بەخۆیانەوە گرتووە. بێ‌گومان زمان یەکە بنچینەو یەکـە کۆڵـەکـەی نەتـەوەیـە، مان و گەشەکردن و پێش کەوتنی بە کۆششی ڕۆڵـەکـانی بۆ فریـاخـستنی بە کاروانی شارستـانـەتیی سەردەمـەوە بەنـدە، ئەمجـا لە بەرامبەر ئەو پەرەسەندنە خێرایەی زانست و تەکنـەلـۆجیـادا نابێ دەستەوەستان و بێ‌ئاگا بووەستین، بەڵکـو دەبێ هەوڵ بدەین ئەم زانستـانـە بە زمـانـەکـەی خۆمـان بنووسین و بەپێی تواناو بە ڕێگەی زانستانەی دروست زاراوەی بۆ دابنێین، ئەمجا کە کاربکەین مەرج نی‌یە گشت لە گشت ئەو زاراوانە بکەینە کوردی یان هاوواتاو هاوچەشنیان لە کوردی‌دا بۆ بدۆزینـەوە، ئەمـە مەرج نی‌یـە، بەڵام گرنـگ ئەوەیـە زمانەکەی خۆشمان لەم مەیدانانە بدەین، هەروەکو زمانانی‌تریش وادەکەن و ئەم هەنگاوە بە ئەرکیکی نەتەوایەتی دادەنێن.

ئیمە، ماوەیێکی دوورو درێژ تا ئەم سەردەمە لە خوێندن بە زمانی کوردی بێ‌بەش بووین، نەك هەر خوێندن بەڵکو لە مافی ڕۆشـنـبـیـریـیش، بۆیـە لە مەیـدانـی زاراوەدا هەست بە کەمـوکـورتی‌یـەکی زۆر دەکـەین و ئەوەی لەم ساڵانـەدا کراوە با بنـاغـەش بێ، بەڵام هێشتـا هەر کەمـە، بەو پێیەش کە زاراوە کۆڵەکەی پشتی زمانی پێشکەوتووی هاوچەرخەو یاریدەریتی بۆ دانەبران لە کاروانی زمانانی‌تر بۆیە هەوڵ و کۆشش لە مەیدانی زاراوەدا ئەرکیکی پیـروزەو بویـە ئەوەی کراوە مایـەی شانـازی‌و بەرچـاو ڕوونی‌و نرخـانـدنیکی باشـە. دەبێ ئەوەش بزانین کە زمـانـانی‌تـری دراوسێشمـان تووشی گیـروگـرفتی کەمیی زاراوەو چەوت و چوێـریی دانـانی زاراوەی زانستی‌و تەکنـەلـوجیا بوون، ئەوانیش خەریکی کۆڵینـەوەن لە هۆیـەکـانی گیـروگـرفتـەکەو بە تەمای کردنەوەی گرێیەکانی ئەم باسەن.

**بنەڕەتەکانی دانانی زاراوە:** ( بروانە ل ٦٧ و ٦٨ لە
مقدمة في تاريخ العربية

بێ‌گومان دانانی زاراوە کارێکی ئاسان نی‌یە، بەڵام هەر ئەوەی خۆشـە تا نەچـەسپـاوە، چونکە کە چەسپا لەقاندن و

دەرهێنـان و فڕێدانی کارێکی قورسـە، لە سۆنگـەی ئەوەدا ئەوانـەی بەم بابـەتـەوە خەریکن دەبێ دەست داگـرن و بە وردی لە دەستووری دانانی زاراوەدا شارەزابن و بە گیانێکی زانستانە زۆر لابین و چیکڵدانە فراوان کارەکە بە ئەنجام بگەیەنن.

زانایانی ئەم کۆڕە گەلێك مەرج و بنەمای بنچینەییان بۆ دانانی زاراوە دەست نیشان کردووە، پێشان دانی پوختەیێکی لێـرەدا بێجـێ نابـیـنـم، بەتـایـبـەتـی لە ڕێـگـەی باس کردنیشیـانـەوە دەتـوانین هەنـدێ ڕواڵـەت و ناوەرۆکی زاراوەکانی قوتابخانەی خۆمان دەست نیشان بکەین:ـ(٩)

١ ـ دەبێ بۆ هەر چەمکێکی زانستی لە یەك بابەت دا یەك زاراوە دابندرێت و نەبێ بە دوو، بوونی چەند زاراوەیێکی جیاواز بۆ یەك مانا سەرلێشێواندن و تێك چوونی شیرازەی زانستی‌یە، وەکو ئەوە لە بەرامبەر زاراوەی (إحصاء)دا، (ئەژمارە، هەڵژمار، سەرژماردن، سەرژمێر، ئامار) داندراوە، با ماناکانیشیان لەیەك نزیك بن یان تەنانەت هاوواتاو یەکسانیش بن، هەربۆیە نابێ بۆ (زاویـة حرجـة) گۆشـەشلۆق، گۆشـەمـۆلـەکـە، کریتیکـال، گۆشەلەق، قورنەی لەق دابندرێت، یان بۆ (خارجي) دەرەوە، دەرەکی، دەرینە هەبێت.

بەڵام ئەگـەر توشی چەنـد زاراوەیـەکی هاوواتـا بووین لە زمـانێـك دا لە کاتی وەرگێـرانیـان دا بۆ زمـانی کوردی واچـاکـە هەوڵ بدەین بۆ هەر یەکـەیـان زاراوەیێـك بدۆزینـەوە، بە نموونە (الأمـراض الســاریــة والأمــراض المعـدیـة) بە نەخـۆشی‌یـە گیـرۆیـەکـان و درمـەکان تەرجەمە بکرێت. هەروەها هەرەوەز بۆ (تـعـاون)، گەل کاری بۆ (عمـل شعبي)، زبـاره بۆ (عـون وإعـانـە)، یاری بۆ (مسـاعـدة) دابندرێ. یان وەرەم بۆ (سل)و گرێکـردنی سی بۆ (التـدرن الـرئـوي)، واتـا نابێ لەبـەر ناوە میللی‌یەکە ناوە زانستی‌یەکەی دوایی پشت گوێ بخەین.

٢ ـ پێویستە بۆنەیەك یان بەشداری‌یەك یان وێك چوونێك لە نێـوان زاراوەی زمـانـەوانی‌و مانـا زاراوەیی‌یـەکـەیدا هەبێت، مەرجیش نی‌یـە زاراوەکـە پراوپـر مانـا زانستی‌یەکەی تژی بێت، هەروەکو زاراوەی (تەریب) بۆ (توازي).

٣ ـ گەڕان بە دوای زاراوەی ڕەسـەن و پشـکـنینی فۆلکلۆرو ئەدەب و زارزمانە جۆر بە جۆرەکان و سوود لێوەرگرتنیان. ئەو کەسانەی زاراوە دادەنێن چەند لە لەهجەکان بە ئاگابن ئەوەندە کاریان ئاسانتر دەبێت و لە هەڵە یان لە کەموکووری بە دوور دەبن.

بە نمـوونـە لە کتێبی (زینـدەوەرزانی)و کتێبـەکـانی تـری بایـۆلـۆجی‌دا بۆ (حـرشفـة)ی ماسی (پـوولـەکـە) بەلامی قەڵـەو داندراوەو بۆ (قشـور الاسمـاك) (پـوولـەکە) بەلامی بێ‌نیشانە. بێ‌گـومـان جیـاکـردنـەوەی ئەو دوو زاراوەیە بە شێوەیێکی گشتی لەبەر خاتری یەك نیشانەی (٧) لەسەر لامەکە کارێکی سەختە. سەربـاری ئەوەش جیـاکـردنـەوەیـان لەلایـەن قوتـابیی زۆربـەی ناوچەکانی کوردستانی عیراق کە لە قسەکردن دا جیاوازی لە نێو ئەو دوو دەنگی لامـە ناکـات کارێکی نارەوایـە، بێ‌گـومـان ئەم زاراوەیە زاراوەیێکی لەقە.

هەروەها لە هەندێ زارزمان دا بە (نمل) دەگوترێ (مێروولە) واتـا لە شێـوەی بچـووك کردنـەوەدا کەچی لە زارەکـانی‌تردا وشە بنـەڕەتـەکـە (مێـروو) دەگـوتـرێ، ئیتـر لەوانەیە لای ئەوانەی بە زارزمانە تایبەتی‌یەکەی یەکەم ڕاهاتوون ئاسان بێ ئەگەر مێروولە بەرامبـەر بە (نمـل)و (مێـروو)ش بۆ (حشـرة) دابندرێت، بەلاَم لای خەڵکی گشتی بە شتێکی لەسنوور بەدەر دیار دەبێ.

٤ ـ پارێـزگـاری ڕەسـەنـیـی زمـانی کوردی لە دارشتن و تێهەڵکێش و وەرگێڕان و هەڵبژاردنی زاراوەدا. واتا وەرگێر بۆی نی‌یـە وشـە کوردی‌یـە ڕەسـەنەکە بەلاوە بنێ، یان کلك و گوێی بکات و وشەیێکی تازەکوورەی وێنەچووو بێنێتەکار. نموونەیێك بۆ ئەمە وشەی (گیانەوەر)ە، کە بەرامبەر بە (حیوان) بەکارهاتووەو (علم الحیوان) بە گیانەوەرزانی تەرجەمەکراوە، دەبێ ئەوە بزانین کە هەرگیـز وشـەی گیـانـەوەر نەگـوتـراوە، بەڵکـو وشـەکە خۆی گیان لەبەرە ئیتر چ پێویست ناکات بێن وشەی جانەوەری فارسی بکـەنـە کوردی، وەکـو ئەوە بێن بەرامبـەر (جـان) گیان دابنێن و ئامرازی (وەر)ی فارسیشی پێوە بلکێنن.

هەروەها (زیندەوەر)یش کە بە مانا (الأحیاء) هاتووە ئەویش هەر ڕەسـەنـایـەتی کوردی پێـوە دیـار نی‌یـە، لەم کارەدا وەکـو

مامۆستایانی جارانیان لێ هاتووه که کتێبێك هەبوو به ناوی (الاشیاء والصحة) ئیتر هەر به ئەشیاو تەندروستی تەرجەمە دەکرا وەکو بڵێی (أشیاء) کۆی (شئ) نییەو ئەم شەیئەش له کوردیدا بەرامبەرێکی نییە، بەم جۆره (أحیاء)یش کۆی (حی)یەو حەییش زیندووه کەوابێ کۆیەکەشی زیندووانه، ئەوسا دەگوتری زیندووان زانی یان به نیازی سووك کردن دەگوتری زیندووزانی. لەوانەیە وەرگێرانی کتێبەکە بڵێن ئەمە بۆیە کراوە تا بۆ (کائن حي)و بۆ (حیوان) وشەی دیکەمان بەدەستەوە هەبێت[11] بەڵام بۆ ئەوانەش بوونێکی زیندوو، گیاندارمان هەیە.

**٥ ـ هەڵبژاردنی ووشەیەکیوا:**

أ ـ که لێك دان یان لێ وەرگرتن یان له چەرخ دانی ئاسان بێت و لەم بارانەدا ماناکە لەدەس نەدات. به نموونه له (فیزیا)دا (بر)یان بۆ (مقدار) داناوه بەڵام که ناچار دەبن له هاوکێشەیەك دا بڵێن (مقدار الاتجاه) دەگوترێ (ئاراستەبر) لێرەدا داڕشتنەکە بەپێی پێوانەی زمانی کوردی ماناکەی دوور دوور دەکەوێتەوه، چونکه (بر) ڕەگی چاووگی برینه، له داڕشتنی زۆر وشەی هاوچەشنیش دا دەوری خۆی بەو مانایە بینیوه، ئەوەتا دەڵێی دیواربر، دەبابەبر، قەڵەم برو گردەبر. هەربۆیە پێتێن، یان پێتاندن له (پەڕین) چاکتره کەوا به مانا (إخصاب) له باسی گوڵ دا بەکار هێنراوه.

ب ـ که تاك بێت، چونکه لەلایەکەوه زاراوه نابێ به ڕسته مانای لێ بدرێتەوه، لەلایەکی تریشەوه، دوو وشه، یان زیاتر له کاتی تێکەولێکەی بەکاربردن دا زۆر باری شێواو پەیدادەکەن.

وەکو زاراوەی (کەوانەی ڕیشوودار) بەرامبەر به (غلصم)ی ماسی، که دەبێتە قورسایی زمان و مایەی سەرلێ تێك چوونی قوتابی کاتێ که دەتەوێ بنووسیت: (الأقواس الغلصمیة)، یان (قوس غلصمی عظمی). بۆیه چارو ناچار له کتێبی (زیندەوەرزانیو دروستی)دا ڕیشوودارەکە پەڕیوه تەرجەمەی (امشاط الغلاصم) کراوه به شانەی کەوانەکان. له کتێبی (ژیانزانی)ی پۆلی دووەمی ناوەندیدا ل ١٩٦ کەوانەکە لابراوەو له تەرجەمەی (قوس غلصمی عظمی)دا نووسراوه (ڕیشوداره کەوانەیەکی ئێسکی)، بۆ (الامشاط الغلصمیة)ش ئەم جاره نووسراوه (ڕیشووداره شانه). جارێکی تر ڕیشوودارەکەش قولەکراوەتەوه بووه به ڕیشوو وەکو

الشقوق الغلصمیة: ڕیشووه دەرچەکان.

الفتحات الغلصمیة: ڕیشووه دەرزەکان.

بەڵام له کتێبی «گیانەوەرزانی»ی پۆلی شەشەمی ئامادەییدا ل ٢٦١، ل ٢٦٢ بەم جۆره کارەکە ئەنجام دراوه:

الغلاصم الجلدیة: پێسته ڕیشوودارەکان

الردهة الغلصمیة: ڕیشووداره هۆده

الخیوط الغلصمیة: ڕیشووداره دەزوو

الاقواس الغلصمیة: ڕیشووداره کەوانەکان

قوس غلصمي عظمي: ئێسکه ڕیشووداره کەوانه.

ئەمە دەردی زاراوەی وشە تێکەڵ کراوه، به ڕای من وشەیێکی خۆماڵی هەیە دەتوانێ جێگەی ئەو وشه تێکەڵه بگرێتەوه ئەویش (قولاب گیره)، دوور نییه زۆر کەس قولاب گیری ماسییان بیستبێ.

جـ ـ که وردو پڕمانا بێت، ئەوەی که به ئاسانی لەناو خەڵکیدا باو پەیدابکات له زاراوەی قورس و کلاو کەس نەزان پەسندتره. مەسەلەی باوبوونی زاراوەو بڵاوبوونەوەی کارێکی زۆر نایاب و شێوه جادووییه، دەبینی زاراوەیێك لەگەڵ هەموو کۆشش و بانگاشەیەك دا بڵاونابێتەوه بەڵام وشەیێکی دیکه به پێچەوانەی ئەوەوه زوو به زوو خەڵکەکە دەیقۆزنەوه. به نموونه دەڵێین وشەی (دێریك) یان (دیرۆك) وەکو زاراوەی (مێژوو) بڵاونەبووەوه بەڵکو له شوێن خۆیان دا پووکانەوه. لەوانەیه هۆی ناوبانگ سەندن و پەرەسەندنی زاراوەی (مێژوو) لەوەوه هاتبێ که ڕەگی وشەکە یەکسەر زوو مانای زاراوه دەخاتەوه یادی گوێگر، کەوا مەبەست له مێژوو له مێژینەیه، بەڵام دیروك یان دیریك که (دیر)ه له مەبەستی بنەڕەتیی وشەکه دوورترەو کەم تر گوێگران پێی ئاشنان.

هەر بەم جۆرەش زاراوەی (زانکۆ) که دەنگەکانی ناسك و وشەیێکی کورت و سووکەڵەیەو مانای زانین و کۆمەڵ بوونی تێداکۆبوەتەوه بڵاوبووەوەو گەلێ زاراوەی

پێشنیاریتر پووکانەوە.

٥ - چاودێریی ڕەوانبێژیو لێوەشانەوەو هاوئاهەنگیی دەنگەکانی زاراوە، بۆ ئەوەی لەسەر زمان ئاسان و وشەکە لووس و لێك بێت. هەندێ وشە دزێو دێنە بەرچاو وەکو وشەی (دەریالوش) کە گوایا بەرامبەر بە زاراوەی (بەحری محیط) داندراوە هەمیشە لە دەعبایەکی دەریا هەڵ لووش بەولاوە (زەریا ناباتە بەر بینایی خەیاڵ. یان وشەی (خەپلە) کە بەرامبەر بە (قرص) داندراوە، مانایەکی ناسك نادات، بە تایبەتی هەندێك جار بووەتە ناووناتورەی ئەو کەسەی دەموچاوی خڕو ئەستوور بووەو بەلای ناشیرینییەوە بۆی داشکاوە، خەپلە کە کولێرەییکی ئەستووری خڕە هەر بەو مانایە وشەی (سەپك) هەیە لەسەر کێشی چەپك گەڵێك لەبارترو لەسەر زمان شیرینتری دەبینم. لە مەتەڵێکی فۆلکلوریش دا لە وەسفی تەماتەدا دەگوترێ: عەبای نارنجی پێدەڵێن ، سەپکی بە کونجی پێدەڵێن. با لە لایەن هاو ئاهەنگی دەنگەکانەوە بەراوردی دەنگی (خ،پ،ل) لەگەڵ (س،پ،ك)بکەین ئەوجا دەزانین موسیقای وشە لەکامیان دایە.

٦ - ئەو زاراوەیەی کە شارەزایان بە گشتی پەسەندی دەکەن و لەسەری ڕێك دەکەون بەتایبەتی لە مەیدانی پسپۆڕیی خۆیان دا دەبێ گشت بەکاریبهێنن، هەرگیز پێویست بەوە ناکات یەکێکیتر زاراوەییکیتری لەو بابەتە دابنێ، چونکە لەم ڕووەوە دووبارە بوونەوەو ڕەنج بەباداچوون ڕوودەدات. تەنیا مەگەر لەو بارەدا کە زاراوەکە هەڵە بێت، یان دەقاودەق شوێنی زانیاریی خۆی نەگرتبێتەوەو بەپێی پێوانەی زانستانە لە زاراوە نەچێ، چونکە زۆر جار گۆڕینی زاراوەییك گۆبەند پەیدادەکات و چاکیی گۆڕینەکە چاوی لەبەر ئاڵۆزیی ئەنجامەکە هەڵ نایەت، بە تایبەتی خۆمان دەزانین کە بناغەی زاراوە بریتییە لە ڕێك کەوتن و یەکانگیریی ڕای چەند شارەزاییك و بریاردان لەسەر گونجاویی وشەیەك.

لەم ڕووەوە نموونە زۆرە، بە نموونە (تەندروستی) زاراوەیەکە دەمێکە بۆ (الصحة) داندراوە، کەچی لەم دواییەدا ووشەی (تەن)یان تێدا بە ئەستەم ژاپێوەو تەنیا (دروستی)یان بۆ (الصحة) داناوە. هەروەها زاراوەی (خانە)و (شانە)؛ کە تا ساڵی ١٩٧٠ زاراوەی (شانە) لە کتێبەکان دا بەڵکو لەناو خوێندەوارنیش دا بەرامبەر بە زاراوەی (خلیە) cell ڕۆیشتبوو ئەمجا ئەگەر شانەی لەش و شانەی هەنگوین و شانەی حیزب، ویان شانەی قژداهێنان بوویێت. بەلام مامۆستایان وەکو بڵێی ئەم وشەیان بۆ مانای زانستییەکە بە تەنگ بینی، بۆیە هاتن وشەی (شانە)یان کرد بە زاراوەی تایبەتی بەرامبەر زاراوەی (النسیج Tissue) و وشەی (خانە)یان لە جیاتی بۆ (خلیة) هەڵ بژارد، خانەش کە فارسییەکەی خانووەو بەرامبەر (دار، مسکن) بەکاردێت، ئەمجا ئەگەر لە عەرەبیدا وشەی (حجیرة) بچووك کردنەوەی وشەی (حجرة) بێت و ئەوانیش گۆڕیبێتیانە سەر کوردی ئەوا لە جیاتی ژوورێك هەموو خانەکەیان بۆ داناوە!

٧ - کەڵك وەرگرتن بە ڕادەییکی ئێجگار زۆر لە دارشتنی زاراوەی کوردیو زانینی جۆرەکانی دارشتن و دەست دانی هەر جۆرێکیان بۆ جۆرە چەمك و مەبەستێك.. بە نموونە ئەگەر ئامرازی (ك) لە هەندێ دارشتن دا بەکارهاتبوو مەرج نییە هەرچی زاراوە هەیە بتوانین لەسەر ئەم شێوەیە دایان بڕێژین. سەیر دەکەی چەند دارشتەیەکمان هەیە وەکو: تیرەك، بەفرماڵك، بەرزەك، دەسك... هتد بە (ك) دواییان هاتووە. بەلام لێنەوەشاوەیە بازرگانی دەرەکیو ناوەکی لە جیاتی دەرەوەو ناوەوە دابڕێژین، چونکە بە نیگاییکی سەرپێیی دەردەکەوێ لەوانەیە ئەم ئامرازی (ك)ە تایبەتی بێ بە دارشتنی ناوی ئامێرو کەلوپەل و ڕەنگبێ بۆ ناوی واتایی دەست نەدات.

یان ئامرازی (وان) بدەینەپاڵ هەموو شتێك بەپێی پێوانەی ڕەزەوان و کەشتیەوان و نێچیرەوان، وەکو ئابووریی ماڵەوانی بۆ (اقتصاد منزلي)و بەیازەوان، چونکە ئەم (وان)ە وەکو دەردەکەوێ ڕەنگبێ زیاتر مانای خاوەنێتیو خاوەن پیشەیی پیشان بدات.

هەروەکو چۆن ئامرازی (گەر) و (ساز) دروست کردنی شتێك پیشان دەدەن و ئامرازی (ۆك) بۆ کەم ڕێزییو بێزاریو

بجـڕوك كـڕدنـەوە بەكـاردێت. دەڵـێ خوازخـوازۆك (سـوالكەر)، چاوچنوك (لەچنینەوە)، خشۆك، ترسنۆك فڕفڕۆك، بیژۆك. ئیتر نازانم چۆن ڕەوایە دەو زاراوەی بەهێزی پڕ لە زەبرو زەنگی وەكو فڕۆكەو سەرۆك بەپێی ئەو پێوانەیە دابڕێژین؟ بەڕاستی من دیومە وشـەی فڕۆكـە ئاسـمـانـی گەرمـی هەڵـبـەسـتی حەمـاسی ساردكـردوەتـەوە، هەربـەم بۆنـەشـەوە وادیـارە بەرەبـەرە زاراوەی سەرۆك دەبێ (سەرەك!

٨ ـ داتاشین زۆر زۆر پێویستت نەبێ دەستی بۆ نەبردرێت، چونكە زۆر جار وشەیەكی واناقۆلا پەیدادەبێت كە نە ماناكەی‌و نە كرۆكـەكـەی نانـاسـرێتـەوە، بە نمـوونە زاراوەی (زەپۆش) كە لە (زەوی + پۆش)ەوە هاتووە بۆ بەرامبەر زاراوەی (جو)ی عەرەبی، جارێ لە ڕووی زانستی‌یـەوە وشـەكـە هەڵـەیە چونكە زەوی‌پۆش هەر ئاسـمـان نی‌یـە بەڵـكـو دارسـتـان و ئاوو بەردو خۆڵـیش زەوی‌پۆشن، هەروەكو زەوی ئاسمانی خۆی هەیە ئەستێرەكانیش ئاسمانی خۆیان هەیە. كەواتە نە ماناو نە شێوەی داتاشینەكەی جێی دڵنیـایی نی‌یـە. پێـویسـتـە داتـاشینیش پێـوانەو دەستووری تایبـەتی بۆ دابنـدرێت و چەنـدو چۆنی ماوەی قرتیانـدن، یان پێوەلكانی پیت و پاشگرو پێشگر دیاری بكرێت.

٩ ـ سڵ نەكردن **لە** وەرگرتن و كردنەماڵی زاراوەی جیهانی بە تایبـەتی لە تەكنـەلـۆجیـاو زانستـە پەتی‌یـەكـان. بێ‌گـومان هیچ زمـانێـك لە توانـای دا نی‌یە لەم ڕووەوە دوورەپەرێز بووەستێت و یەكتەن و خۆڕی بێت. ڕێگەگرتن لە زمانی كوردی بۆ وەرگرتنی زاراوەی جیـهـانـی بەرهـەڵـسـتـیی پەل هاویشتن و هەڵ دانی ڕۆشنبیری‌و زانستی‌و زمانی كوری‌یە.

**رابەرمان لە دانانی زاراوەدا:**

پەیـڕەوكـردنـی ئەو بنـەرەتـانـەی كە بۆ دانـانـی زاراوە دەست نیشانمان كردن، گرنگیی ڕێبازی زانستانە پێشان دەدەن و بەپێچـەوانـەشـەوە سەرلێ‌شێـوان و دووبـارەیی‌و ئاژاوە بە ئەنجام دەگات. چاكترین رابەر بۆ ڕێبازی زانـستی ئەوەیە:ـ

١ ـ دەبێ لە مانـاكـان و پێـوەنـدیی نێـوانیـانـەوە بەرەو دروست كردنی زاراوە بچین، نەوەكو نە ز ر وەوە بەرەو ماناكان ڕێ‌بگرین.[11]

٢ ـ بە وردی سەرنـج لە زارەكـانی زمـانی كوردی بدرێت و هەرچی بۆتەو شێوەی دارشتن و وشەیێكی لەباریان هەیە بیخەینە ژێـر تیشكی لێكـۆڵینـەوەو هەڵسـەنگانـدن بۆ ئەوەی دەست ڕۆیشتووانەو لە كێڵگەیێكی فرە بەرهەم دا كاربكەین.

٣ ـ تا ئێستا لە كوردی‌دا چەند بۆتەو شێوە دارشتنێك هەیە كە لە ئەنجامی خوێندنی مزگەوت و باری ڕۆشنبیریی كۆن دا بۆمان ماوەتەوە، چاكە پێیان دا بچینەوەو بۆتەو شێوەی ڕەسەنی كوردی‌و خۆمـاڵیـیـان لە جیـاتی دابنێین. با لە بەرامبـەر زمـانی فارسی‌و زمانانی دراوسێ‌دا بەپێی توانا سەربەخۆیی‌یەكەی خۆمان بپارێزین.

٤ ـ تا دەتوانرێ دەبێ بە كەمترین كەرەستەو زادی زمان زاراوە بێتـە بەرهـەم، چونكـە ئەمـە دەبێتـە هۆی ئاسـانیی تێكـەولێكەو وەرگـرتنی زاراوەكـە. لەم كارەش دا دەبێ دروستی‌و سەلامـەتیی زمانەكە ڕەچاو بكرێت و بەپێی ئارەزوو سنوورەكانی نەشكێندرێت.

**ڕێگەكانی دانانی زاراوە:**

بۆ دانـانی زاراوە لە عەرەبی‌دا ئەم ڕێگـایـانـەیان پێشان داوە: (الاشتقاق، المجاز، النحت، التعریب)[12] هەروەها (الترجمة)ش.[13]

بەڵام لە كوردی‌دا مامۆستا دكتور كامل البصیر ڕێگاكان دەكا بەمانە:

**١ ـ وەرگرتن**

**٢ ـ ئاوەڵواتا**

**٣ ـ لێكدان**

**٤ ـ داتاشین**

**٥ ـ دارشتن**

**٦ ـ وەرگێران**

**٧ ـ زرەڕێژ.**

كەوا لە كتێبـە بەنـرخـەكـەی‌دا (زاراوەی كوردی) دووروودرێـژ باسیـان دەكـات و نمـوونـەیـان بۆ دەهێنێتـەوەو ڕەخنـە لە چەنـد

نموونەکیشیان دەگرێت.

بۆ مەسەلەی جیاوازیی ئەم دابەش کردنەش دەست بۆ قسەیێکی دکتور کامل درێژدەکەین، هەر لەو کتێبەی‌دا کە دەڵێ: «زاراوەی لێکدراوو داتاشراوو دارێژراو هەرسێکیان لە بناغەدا یەکن و لەبەر تیشکی یەك بنەواشەدا سازدەکرێن، ئەگەر جیاوازییەك لە نێوانیاندا بەدی‌بکرێ ئەو جیاوازییە بەستراوە بە کاتی لەدایك بوون و دانانی زاراوەکەوە.»[١٤]

منیش ئەگەر بە کورتی بەو ڕێگایانەدا بچمەوەو نموونەی زاراوەی کتێبەکانی قوتابخانە بخەمە ڕوو لام وابێ لە کەڵك بەدەر نابێ.

**دارشتن «إشتقاق»**

مەبەست لە دارشتن زێرنگەریی زمانە، چۆن زێرنگەر پارچەیێك یان چەند پارچەیێك لە بۆتەدا دادەرێژێ‌و پارچەیێکی نویی لێ‌بەرهەم دێنێت بەم جۆرە دارشتنیش پەیداکردنی بێژەیەکە لە بێژەیەکی دی بەو مەرجە گونجان و بۆنەیان لە نێوان دا هەبێت چ لە بێژتن و چ لە مانادا.

«ئەوەیە وشەیێك لە وشەیێکی‌دی دابماڵیت، بەلام لە بێژتن و لەمانادا گونجانیان لەنێوان دا هەبێت. . هەروەکو چۆن (کهرب - یکهرب) لە کەهرەبـاو (البستنە) لە (البستـان)ەوە. یان (مستشفی) ناوی جێگایەو لە (یشفی - شفاء)ەوە وەرگیراوە.»[١٥]

هەر بەم شێوەیە لە‌کوردی‌دا ژمارەیێك زاراوە هاتۆتە کایەوە کە بەرامبەر بە مانای زاراوە بێگانەکان تەرازوو وەستاون، ئەوەتا لە وشەی (پاڵاوتن)ەوە پاڵێوگەی نەوت (المصفی)و پیتێن و پیتاندن بە مانای (إخصاب) لە باسی ڕەچەڵەك زانی‌دا لە وشەی پیت و بەرەکەتی زەوی‌یەوە دارێژراوە، هەروەها دارشتنی (گەل کاری) لە وشەی گەل و کار لەسەر پێوانەی گەچ کاری‌و قورکاری.

دارشتنیش مەرج نی‌یە لە یەك وشە بریتی بێ، بەڵکو زۆر جاری وا دەبێ دارشتەکە قاڵبە شووشەیەکەو لە دوو وشە، یان زیاتر پێك هاتووە، ئەمەش چ لە ڕێگەی لێکدانەوە بێت یان لە ڕێگەی ئاوێتەکردنەوە بێت.

هەر بەم جۆرە دارشتەی (گرانەتا)و (ڕەشەگرانەتا) دەبینین لەبەرئەوەش کە سروشتی زمانی کوردی ئیشتیقاقی نی‌یەو تەرکیبی‌یە بۆیە دروست کردنی زاراوە بە هۆی وشەو ئامرازو پێشگرو پاشگرو هی‌تریشەوە هەر دەچێتە ژێر خانەی دارشتن و ناتوانین بە داتاشین یان شتێکی دی بناسین.

کرداری دارشتن لە کتێبەکانی قوتابخانەدا دەورێکی گەورەی لە دانانی زاراوەدا هەیە، مامۆستایانی وەرگێری زمانی کتێبەکان توانیویانە بە چاکی وەبەری‌بهێنن و کەڵکی لێ‌وەربگرن، لە دارشتەی (بەرهەم ماکەکان)دا کە بەرامبەر بە (عوامل الانتاج) دانـدراوە لە دوو پارچەی بەرهـەم و ماك دارژاوە کە بەرهـەم بەروبوومەو ماکیش هۆ یان هەوێنی شتە هەروەها وشەی (میکرۆب کوژ) بەرامبەر بە (تعقیم) دیارە لە دەقی تەرجەمەی پیت بە پیتی وشە دەرچوون‌و بەرەو دارشتنێکی واتایی چوون کە مانای زاراوەکە بگەیەنێ، ئەگەرچی مەبەست لە بنچینەی وشەی تعقیم نەزۆك کردنە، بەلام حاڵەتی پاك کردنەوەو دەرمان کردن مەبەست میکرۆب کوشتنە نەك هەر نەزۆك کردنی.

هەروەکو سەرنجم داوە مامۆستا فوئاد عیززەت کە وەرگێری زۆربەی کتێبەکانی بایولوجی‌یە لەم ڕێگەیە باش تێ‌هەڵ چووەو زۆر بەبرواو بوێرانە زاراوەی نوێی بۆ بابەتی بایۆلۆجی دارشتووە بەتایبەتی لە ڕێبازی پێش خستنی صفەت بەسەر موصوف دا جێ‌دەستی هونەرمەندانەی لە زۆر شوێن دا دیارەو دەرگاییکی ئێجگار گەورەی لەم بابەتە کردۆتەوە. لە ڕاستی‌دا ئەگەر مرۆڤ کاری وەرگێرانی نەکردبێ‌و لە کارەکە ورد نەبووبێتەوە نازانێ ئەم ڕێگایە تا چەند یارمەتیی پوخت و سفت و سووکەڵە کردن دەدات. بە نموونە لە هەندێ شوێن دا دیومە بۆ (السنة الضوئية) داماون بە دەست دەربڕینێکی سووك و تەواو، لە کتێبی جوغرافیای پێنجەمی ئەدەبی نووسراوە ساڵی تیشکی کەچی دارشتنی (ساڵەتیشك) لەسەر ئەو ڕێگە یە ئێجگار باش مانای دەربڕیووە کە مەبەست ئەوەیە تیشك یان ڕووناکی لە ساڵێك دا چەند دەبڕێ تا بیکەن بە پێوانەی دووریی نێوان ئەستێرەکان. هەروەها دارشتەی تیشکەسنگ بەرامبەر بە (أشعة الصدر) لە (تیشکی سنگی)و تەنانەت (تیشکی سنگ)ی ناتەواو ڕزگارمان دەکات.

به نموونه له کتێبی (گیانەوەرزانی)ی پۆلی شەشەمی ئامادەیی‌دا بەسەدان دارشتەی پوخت و پتەو خراوەتە ڕوو کە بوونەتە مایەی کورت کردنەوەو چرکردنی زمان و پێ‌گەیاندنی زمانێکی زانستانەی تا رادەیێك وردو بە تەرازوو و دوور لە زمانی ڕۆژانەو دوور لە زمانی ئەدەبییش. با هەندێك لەو دارشتانە پیشان بدەین:

إمعائية الجوف: هەناو ریخۆڵەیی‌یەکان

مفصلية الأرجل: پێ‌جومگەکان

شعبة شوكية الجلد: لقی درك پێستەکان

عديدة الخلايا: فرەخانەکان

بطنية القدم: سکەپێ

بطنية الموقع: سکەجێ

الأنابيب الأعورية الكبدية: کوێرە بووری‌یەکانی جگەر

الفسحة الشغافية: توێ‌دڵەکەلێن

القناة الهظمية الوسطى: هەرسە جۆگەی ناوەڕاست

الاوعية الدموية الشعرية الشريانية: (خوێن بەرە موولوولەکان).

هەروەکو سەرنجم داوە ئەم جۆرە دارشتنە چەند بناغەیێکی زمانەوانیی هەیە، لەوانە:

١ ـ ئەگەر سیفەتەکە لێك دراوبوو واچاکە (بۆئاسانی) پێش مەوصووفەکە نەکەوێت وەکو:

کرمە توورەکەیی‌یەکان: الديدان الكيسية

کرمە ئەلقەدارەکان: الديدان الحلقية.

پێست درکاوی‌یەکان: ذات الجلد الشائك.

چونکە ئەگەر لە دوو وشە زیاتربوو بۆ خوێندنەوە کەمێك گران دەبێت، لەبەر ئەوە بۆ وەرگێڕانی ڕستەی (التكاثر الجنسي اليرقي) نووسراوە (توخمە زۆر بوونی کرمۆکەیی) بەڵام بۆ وەرگێرانی (عضلات حلقية = ئەلقە ماسولکە)و بۆ (الطبقة تحت المخاطية) ژێرلینجەچین نووسراوە.

٢ ـ لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە زاراوە دەبێ یەك وشەبێ چونکە ئەگەر دوو وشە بوو لە کاتی دارشتنی زاراوەیێکی تازەدا تووشی زەحمەتێکی زۆر دەبین. بە نموونە بۆ (اللامسە) شاخی هەستیاری (کتێبی زیندەوەرزانی‌ی ٣ی ناوەندی)و بۆ (اللويمسات) شاخە هەستیارۆکەکان (کتێبی گیانەوەرزانی) داندراوە، لە کاتی دارشتنی (لويمسە شفويە)دا ناچار بۆ سووك کردنەوە نووسراوە لچەشاخۆچکە (زیندەوەرزانیی ٣ی ناوەندی) بەڵام لە (گیانەوەرزانی)دا کراوە بە (هەستەوەرەکانی لێو). واتا هەر چارەی نیوەیێکی لێ‌قرتاوە.

٣ ـ زانراوە کاتێك کە صیفەت پێش مەوصوف دەکەوێ (ە)یەکی دەخرێتە سەر وەکو بۆ ساڵی وشك و سازی تەڕ دەگوترێ (وشکەساڵ)، (تەڕەساز)، جۆرە خواردنێکە بەڵام ئەگەر هاتوو صیفەت مانای ژمارەی گەیاند ئەوا ئەو (ە)یەی پێویست نی‌یە. بە نموونە لە (گیانەوەرزانی)دا نووسراوە:

تاکەپەنجەکان: وترية الأظلاف

دەبوایە بڵێین:

تاك پەنجەکان

هەربەو جۆرەش دەگوترێ جووت باڵەکان، مرۆڤی سێ‌لچ.

٤ ـ لەو دوایی‌یەدا هەندێ وشەی وەکو (ساز، کار، گەر، گە) زیاد لە پێویست بەبێ سێ‌و دوو دەستیان بۆ دەبەن، زۆرجاریش دارشتەکان ناگەنە ئاستی خواست. دیارە دەبێ لە بنج وبناوانی ئەو وشانە ئاگاداربین تا نیزیکی‌و گونجانیان بۆ زاراوە دارشتەکانمان مسوگەر بکەین. دەنا (ساز) لە دەوروبەری دروست کردن (ساختن)دا دەخولێتەوە، (کار)یش یان لە پیشە یان کارتێکردن یان لە شێوەوە هاتووە، گوتراوە منداڵ کار، قورەکار، کڵ کار. بەڵام لە کتێبی جوغرافیای پۆلی چوارەمی گشتی‌دا ئەم (کار) انە تۆمارکراون:ـ

تاو ێرکار: أرض صخرية

کیمیاکار: الكيميائي

پێوانەکاری: المسح

لمکار: الرملي

جێکار: أثر

جۆشکار: لاحم

دیکار: المیدانی

رووناکی‌کار: الضوئي

شوێنکار: معالم أثر

قەڵاکار: محصنة

گڵکار: الطینیة.

مرۆڤ کار: مرۆڤ کرد

هۆکار: مؤثر، تأثیر

هونەرکار: فني

**دووەم ـ مەجاز:**

---

مەجـاز بریـتـی‌یـە لە گواسـتـنـەوەی وشـە لە مانـای بنچینـەیی‌یـەکـەی خۆیـەوە بۆ مانـایەکی نوێ، واتا هەندێ وشـەی کۆن دێنن مەبـەست و مانـای تازەی پێ‌دەردەبـڕن و وای‌لێ‌دێت کە وشـەکـە چەمکێکی نوێ لە جیـاتی چەمکە سواوەکەی جارانی، یان چەمکێکی تازە سەرباری چەمکە کۆنەکەی دەردەبڕێت.[١٦]

بێ‌گومان ئەم پێناسینە دان بەوەشّ دا دێنێ کە دەبێ پێوەندی لەنێـوان مانـای تازەی وشـەکـەو مانـای بنچینـەیی خۆیدا هەبێت.[١٧]

لە کوردی‌دا وشەی (پاشکۆ) ـ شتێکە کە سوار لەپاش خۆیەوە دای‌بـەستێ[١٨] بەڵام ئێستـا بووە بە زاراوەیـەك بەرامبـەر بە (ملحق)ی کتێب و دامـودەزگـاو خانـوو... بەکـار دەهێـنرێت. هەروەهـا وشـەی (تـەوەرە)ی ئاش بۆ میحـوەری گۆی زەوی‌و میحوەری کاروبارو سیاسەت و فیزیا بەکاردەهێنرێت. (جومگە) کە بە مانـا (مـفصـل)دیت کە دوو ئێسـك لە لەشی مرۆڤ دا سەرەکـانیـان دەگـەنـە یەك و ماوەی جووڵانـەوەیـان دەمێنێ وەکو ئانیشـك و جومـوشـك و مەچـەك، ئەم زاراوەیـە بۆ مەکینـەو بۆ بەڕێـوەبـەرایـەتی بەکـاردەهێنرێت و زاراوەی‌تری لێ دارژاوە وەکو جومگان (التمفصل)و دەجومگێن....

خانـەخـوێ خاوەن ماڵێکـە میـوان ڕادەگـرێت، بەڵام بۆ بایۆلۆجی پێویستیان بە زاراوەیێك بوو کە بەرامبەر ئەو ئەندامەی لەشە بێت کە میکرۆب، یان کرم و طفیلی بەخێودەکات. ئەمجۆرە بەم جۆرە ژمارەییەکی زۆر وشەی جوان جوانی کوردی گوێزراوەتەوە مەیـدانی زانستی‌و زاراوەی لی‌هـاتـوویـان لێ بەرهـەم هـاتـووە. ئەوەتـا: گەنـدەبـاڵ، گەنـدەپێ، چووك، توول، ژێمـاڵـە. خشتەك، لاکێشە.. هتد.

لە ئەنـدازەدا ناوی شتـومـەکی ناومـاڵ و هەنـدێـك پیشـە گوێـزراونـەتـەوە بۆ مانـاو مەبەستی نوێی زانیاریی ئەندازە، وەکو (بازنە) ـ دائرة ـ لە بازنی دەستەوە کە خرە، خشتەك (مکعب) کە دارێکی شەش ڕووی ڕێکی زێـڕینگـەرانـە، یان پارچـە قومـاشێکی چوارگـۆشـەیی‌یە لەژێر هەنگڵەوە لە چۆغەی دەدەن. تەریب (تـوازی) بۆ ئەو هێڵە درومـانـانـەیـە کە جاران بەرگدروو کورتەك، یان کوڵەنجەی ناو بە لۆکەی پێ‌تەرتب دەداو ڕێ‌ڕێ دەبوو.

لاکێشـە (مستطیـل) بریتی‌یـە لە تەژگـە بەڕی شێـوە تیسمـاڵـك، قووچـەك (مخـروط) لە قووچـەکـە بەردی کەڵەکەکراوەوەو تیرە (قطر)ی بازنە کەوەکو ژێ، یان تیرەی کەڵاش و بێـژنـگ وایـە (چیوە)ش بۆ محیط لە چوارچێوەوە وەرگـیـراوە. (چـەق)یش لە شوێـن مەرکـەزی بازنـەدا بەکارهاتووە، لە چەقی ئاسمان یان لە چەقی ڕێ‌یە یان کە مەزراح دەخولێتەوە چەق دەبەستێ.

بۆ یەکـەم جار کە کتێبی (ئـابـووری) بۆ پۆلی پێنجـەمی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٧٣دا کرا بە کوردی، نووسەرو دکتۆر سامـاڵ مەجیـد فەرەج کە پسپـۆڕی ئابـووری‌یـەو سەرۆکی لیـژنـەی وەرگێـران بوو کۆمـەڵێك زاراوەی ئابووریان هێنایە مەیدانی بەکاربردن کە هەندێکیان لەوانەیە بۆ یەکەم جار بە مەجـاز لە مانـاو مەبـەستی کۆنـەوە گوێـزراونەتەوە بۆ کۆڕی هەڵگرتنی چەمك و مەبەستی زانستیی ئابووری، بە وێنە:

بەرهەم ماکەکان: عوامل الانتاج

بەرهەمداریی: الانتاجیة

بەرهەم دەر: الانتاجي

بەرهەم هێن: المنتج

بەرات: مخصصات

پشك: سهم

پار: قطاع

تێچوون: الكلفة

تێچوونی ڕادەیی: الكلفة الحدیّة.

جامبازی: المضاربة

چەرچی: الوسیط

خواست: الطلب

دابین كردن: الاشباع

سەرڕێژی بەها: فائض القیمة

سەربار: أضافي

شمەك: سلعة

كەڵكی ڕادەیی: المنفعة الحدیة

كۆك كردن: ضبط

لەكاركەوتن: الاندثار

مڵكانە: ریع الأرض

نیوەكاری: المحاصصة

نەختینە: النقدي

وەبەرهێنان: إستثمار

هەڵ ئاوسان: تضخّم

ئێمە لە كوردەواریدا (بەتایبەتی لەلادێدا) بە هەزاران وشەی ڕەسەنی مەیدانی مەڕوماڵات داریو جووت و زەویو ڕەزو بێستان و پیشەی هەمە جۆرمان هەیە، زۆربەشیان وا خەریكە لە كاردەكەون و باویان نامێنێ، بە پێویستی دەزانم شارەزایان بە گیانێكی سپۆرت و زانست پەروەرانە هەوڵ بدەن سوود لەو خەرمانە وشانە وەربگرن، ئەو نامۆییو دوورەپەرێزییەی لە نێوان دا هەیە نەمێنێ.

هەروەكو چۆن جاران لایان سەیر بوو (پاشبەند) بۆ قافیەو (پاشكۆ) بۆ ملحق و (گەمارۆ) بۆ محاصرە بەكاربهێنن چونكە ئەمانە بۆ كەلوپەل و كاروباری كەرو ئەسپ و سەگ بەكارهاتوون، نابێ ئەمرۆ پێیان سەیر بێت كە ناوی ئامێرێكی ئاشی ئاو ببێ بە زاراوە بۆ پارچەیێكی كەشتییێكی بۆشایی.

گەلی عەرەب هەر لەكۆنەوە ئەمەی كردووە ئەوەتا هەرچی زاراوەی كێش و مۆسیقای هەڵبەست هەیە لە ڕەشماڵیان وەرگرتووە، خۆ كۆمەڵێك وشەی بەنرخ و بەرێزی عەرەبی بە مەجاز لە هەڵس و كەوتی حوشترەوە وەرگیراوە. بێگومان ئەمەیە ڕێی دەوڵەمەند كردنی فەرهەنگی زانستی زمانی كوردی.

**داتاشین:**

---

داتاشین ئەوەیە لە دوو وشە، یان زیاتر وشەیێكی نوێ دەربهێنیت، بە مەرجێك گونجان و لێوەشانەوە لە نێوان وشە داتاشراوەكەو وشە لێداتاشراوەكان دا هەبێت.[19]

وەكو زاراوەی (زانكۆ) لە زانین و كۆ، یان كۆمەڵەوە داتاشراوە، یان (فێرگە) لە فێربوون و پاشگری (گە)وە داتاشراوە دوای ئەوەی چەند پیتێكیان لێ قرتێن دراوە. جاری واش هەیە پیتیان لێناقرتێت و بەر ڕێبازی لێكدان دەكەون.

لەم ڕووەوە دكتۆر كامل دەڵێ: دەبێ داتاشین «شان بە شانی ڕێبازی لێكدان بەكاری بهێنین و هیچ سنوورێكیش ناتوانێ لە یەكیان جیابكاتەوە.»[20]

زانایانی عەرەب حەز بە داتاشین ناكەن و داوادەكەن خەڵكەكە خۆیان لێ دووربكەنەوەو وشەی داتاشراو بە بارێكی قورس دەزانن.[21] هۆیەكەشی ئەوەیە كە د. القاسمی دیاری دەكات و دەڵێ:

«زمانی عەرەبی ڕەوشتی ئیشتیقاقییەو وەكو زمانانی هیندو ئەورووپایی تەركیبی نییەو داتاشین لە مێژووی دوورو درێژیدا دەورێكی كەم نەبێ نەیبووەو وشە داتاشراوەكانیش كەمن»و «داتاشین بە كەیفی عەرەبیان نییەو داتاشراو مانای لێ داتاشراوەكە دادەپۆشێت.»[22]

لەگەڵ ئەوەشەوە تەقەللای داتاشین لە عەرەبیدا هەر هەیە، بۆ ئەم باسە دەتوانین سەیری فەرهەنگێكی وەكو (المورد) بكەین دەبینین ژمارەیێكی زۆر وشەی داتاشراوی وەكو شبغروی، ضوحیوی، طقسیعربیدی، هەروەها داتاشینی (یموطر) لە موتورایزەوەو (یهدرج) لە هایدروجنایزەوە دەبینین.[23]

ڕێگـەی داتـاشین «پێـویستییـەکـانی ژیـانییـە لە نەریتی سووك کردنی وشـەی دووردرێـژی لەسـەر زمـان قورسـەوە هەڵ قولاوەو خۆی چەسپـانـدووە، بۆیـە دەبێ بۆ دروست کردنی زاراوەی پێـویستی شارەزایـانـە پەیـڕەوی بکـرێت و بە چاوی نازانستییانە تەماشا نەکرێت.» (٢٤)

بەڵێ داتـاشین پێـویستـەو تا ئێستـا لە کتێبـەکانی قوتابخانەدا ژمارەییێك زاراوەی داتاشراو پەیدابوون و زۆربەیان جێی خۆیان گرتـووە. لەچـاو زمـانـی کوردییش دا کە ئەویش یەکێکـە لە زمـانـەکـانی هینـدوئـەورووپایی ماوەی داتاشینی تێدا بەرفراوانە، پێشگـرو پاشگـرێکی زۆرو جۆراوجـۆری هەیـەو وشـەکـانیشی لێهاتوون بۆ تێکەڵ کردن و لێکدان وەك زمانانی دی.

ئەوەی لە ڕێگەی «داتاشین» سەرنجی ڕاکێشاوم ئەوەیە کە لە زانستی بایـۆلـوجیو کیمیـادا لە هەمـوو زانستـەکـانیدی زیـاتـر بەکـارهـاتـووەو زاراوەکـان تا ڕادەیـێـك جێگـەی خۆیـان گرتووەو پێـویـست کراون؟، وەکـو لە (ئـۆکسجین)ەوە ئۆکسـانـدن و دەئـۆکسێن، هێلزۆك بەرامبـەر (بیـوض ولـود)، (مـوگنـەکـار) لە موغناتیس و کارتێکردنەوە داتاشراون.

سەرنجی دووەم ئەوەیـە کە دەبێ خوێنـەر بە ئاسـانی بنـچـیـنـەی هەر دوو، یان هەر سێ وشـە لێکـدراوە داتـاشـراوەکان بزانێت و سەری لێ تێك نەچێت. بە نموونە لە کتێبی (گیـانـەوەرزانی)دا گۆڕەجـوڵـە بە مانـا (الحـركة الانتقـالیـة) دروست کراوە بەڵام گۆڕ زوو نیشـانـەی وشەی گۆڕاو یان گۆڕین یان گواستنەوە بەدەستەوە نادات، بەڵکو گۆڕ لە نیشانەی دەشتاییو قەبرەوە نزیکە.

یان کانـزا کە لە کان و (زادە)وە هاتـووەو زادەش بۆ توخمی مرۆڤە نەك بۆ کان.

هەر چۆنێك بێت گەلێك داتاشراوی دیکە لە کتێبەکان دا جێی خۆیان کردووەتەوەو پێویستیان بە لێکۆڵینەوە هەیە وەکو:

وشکاوی: برمائي

نەبار: مجدب، بدون مطر

گشتکۆ: ئینسیکلوپیدیا

ڕاکێشگە: مجرة

کۆرپەلەگەشە: النمو الجنيني

پەرە قۆناغی جۆر: المرحلة التطورية للنوع

ڕێسا: قاعدە

بەرکەوت: خارج القسمة

ڕێنووس: إملاء

فێرخواز: متعلم

**(٤) وەرگێڕان و کردنە کوردی:**

وەرگێـڕان بەمـانـا تەرجـەمـەکـردنی زاراوەی بێگـانـە بە کوردیـیـەکـی پەسـنـدو تەواو، لە هەڵبـژاردنی زاراوەی کوردییش دا بەرامبـەر بەو زاراوە بێگـانـانـە ڕێگەی دارشتن چاکتـرین ڕێگـەیـە. وەکـو دەزانین کتێبـەکـانی قوتـابخـانە گشتیـان (زانست بابـەتـەکـان) لە عەرەبییـەوە کراون بە کوردی، بۆیە وەرگێڕانی زاراوە دەورێکی باش دەگێڕێ بە سەرکـەوتنی وەرگێـڕانـەکـە. بێگـومـان دەبێ لەم کتێبانەدا بەتەواوی شێوازی زمانێکی زانستانەی بە سەنگ و تەرازووی ورد بێتە کایەوەو شێوازی ئەدەبی دووربکرێتەوە، بۆ ئەمەش دەبێ زاراوەکـان یەك جۆربن، واتـا «زاراوەییێکی بێگـانە بە هەمـوو جۆرە زانستـەکـان دا بە یەك چەشن تەرجـەمـەی کوردی بکـرێت و زاراوەی تاك بە تاك تەرجـەمـە بکـرێت چونکە ئەمە لە دارشتن و لە گەردان دا، کار ئاسان دەکات.» (٢٥)

بۆ وەرگێـڕانی زاراوەش وا چاکـە شارەزای بابـەتی زانستی و زمـانـزان و پەروەردەکـارو پسپـۆری ڕێـزمـان و نووسەرانی بەتو- هاوکاری بکەن.

بەڵام کردنـە کوردی کە ئەوەتـانێ بە عەرەبی (تعـریـب)ی پێدەڵێن وەرگرتنی وشەیێکی بێگانەیە دوای ئەوەی دەخرێتە سەر شێـوەی ئاخـاوتن و مۆسیقـای زمـانی کوردی ئیتـر لەوانەیە چەند دەنگێکی لێ کەم بکـرێتـەوە، یان بگـۆڕدرێت وەکـو: فابریقە. مەکینـە، جنـدوکـە، بسمیل کردن، غوسڵ، تارەت، سەرفترە. کایە. ئەمەش دوو ڕێبازی هەیە (٢٦)

١ ـ وەرگـرتنی وشـەیێکی بێگـانـە بەبێ دەستکـاری وەکو

لوگاریتم، کۆساین، هایدروجین، ریالیزم، ئیمپریالیزم، سۆشیالست، رژێم، سیستەم.

٢ ـ وەرگرتنی وشەیێکی بێگانە بە دەستکاری‌یەوە، ئەمەش یان لە رووی سیستەمی دەنگ، یان لە رووی سیستەمی دەستووری رێزمانی‌یەوە دەبێت. ئێمە چ لە رێگەی زمانانی دراوسێ‌وەو چ یەکسەر کۆمەڵێك زاراوەی لاتینی کۆن و ئەوروپایی تازەمان وەرگرتووە، وەکو فەلسەفە، مۆسیقا، ئیمپراتور، ئەستورلاب، دیموقراتی، فابریقە، قەپتان، شەپقە، پرۆژە.. هتد.

ئەوەی لەم رووەوە سەرنجی راکێشاوم چەند خاڵێکە:

١ ـ هەندێك مامۆستا لە جیاتی وەرگرتنی زاراوەیێکی زانستی جیهانی، خۆیان بە وەرگێرانی‌یەوە خەریك دەکەن و وەرگێرانەکەش بێ‌هوودەیە وەکو زاراوەی گالاکسی، یان مجەرڕەی عەرەبی کە دەکرێ بە راکێشگە (لە راکێشان و جەرەوە).

٢ ـ زۆر زاراوە وا هاتوونەتە زمانی کوردی، بەتایبەتی لە عەرەبی‌یەوە کە لابردنیان پێویست نی‌یە، سەیرم کردووە مامۆستا شاکیر فەتتاح لە هەموان زیاتر لە کتێبی مێژوو و پەروەردەی نیشتمانی ئەم زاراوانەی کردووە بە کوردی کە بە پێویست نازانرێن، ئەمانە چەند نموویەکن لەو زاراوانە:ـ

خەلیفە: جێ‌نشین
فەلسەفە: راستی‌پەرستی
مۆسیقا: سازوئاواز
سیاسەت: زرنگ بازی
وەزارەت: کاربەدەستی
وەزیر: کاربەدەست
منارە: چراگا
ئیمام: پێشەوا..
مەلیك: شا

بە پێچەوانەشەوە زۆر زاراوەی بیانی تووش دەبین کە نە لە مێژوو و نە لە باری رۆشنبیریمان دا رەگیان داکوتاوەو بەرامبەرەکانیشیان بە کوردی دەست دەکەون، مانیان بە پێویست نازانم، بە نموونە لە کتێبی (پەروەردەی ئایینی)دا ئەم زاراوانە هاتوون:

خەشم
رێ‌نموونی
پەروەردگار
گومراهـ
مەردوم
بەخشش
بەخشندە
میهرەبان
تەوانایی
وێل
کلۆج

دەبێ ئەوەش بزانین کە بەرێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی ئەمرۆ پەیرەوی بریارێك دەکا کە دەڵێ: **وشەو زاراوەی بیانی، بەلاتینی‌و فارسی‌و هی‌دیکەوە بەکار نەهێنرێت و لە جیاتی ئەوان کوردی ئەگەر نەبوو عەرەبی بەکاربهێنرێت.** ئەم بریارەش بێ‌گومان لەچاو زاراوەی وەرگیراوو بە کوردی کراو پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.

## ئەنجام

لە ئەنجامی وەرگێرانی کتێبەکانی قوتابخانەدا بە هەزاران زاراوەی زانستی هاتنە مەیدانی بەکارهێنان، ئەمەش تاقی‌کردنەوەیەك بوو هاتە بەردەم زمانی کوردی کەوا وەکو هەموو زمانێکی زیندوو و رەسەن لە تاقی‌کردنەوەکە دەری‌بردو هەموو نیشانەیێکی ئەوە سەری‌هەڵ دا کەوا خەریکە بناغەی زمانێکی زانستی کوردی شان بەشان زمانی ئەدەبی بێتەدارشتن.

لە دانانی زاراوەی ناو کتێبەکانی قوتابخانەدا هەندێك جار پەیرەوی بنەرەت و بنەما زانستییەکان نەکراوە، لەبەر ئەوە چەند گیروگرفتێك سەری هەڵ داوە، لەوانە دانانی چەند زاراوەیێك بۆ یەك چەمك و دەست نەدان و نارێکی هەندێکیتر لە ڕووی ماناو لە ڕووی زمانەوە.

بەپێی توانا چەوتیو چوێرییەکانی زاراوەی کتێبانی خوێندنمان پێشان داو بۆ هەر خاڵێك چەند نموونەیەکمان هێنایەوەو ڕێگەی باشترکردنیانمان دەست نیشان کرد.

لە دواییش دا دەڵێین ئەم زاراوانە پێویستیان بە پێداچوونەوەو لێکۆڵینەوە هەیە، سەرباری کاری بەردەوام بە مەبەستی:

١ - بژارکردنیان و پوختەو چاکترکردنیان.

٢ - یەك کردنەوەی زاراوە دووبارەکان، لەڕێگەی یەك کردنەوەی بنەرەتەکانی زاراوە دانان و فەرهەنگ ڕێك خستن، ئەم کارەش سەرهەڵ دەدا بۆ دانانی پێوانەیێکی یەك گرتووی زاراوەو تۆمارکردنی بە بەڵگە (توثیق)ی زاراوەو سەرچاوەکانی زاراوەو تۆمارکردنی زانیاری دەربارەی ئەو دامو دەزگایانەی تایبەتین بە دانانی زاراوەو پرۆژەکانیان.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


(١) ڕ. هاوکاری، ژمارە (٧٠٠)، ١٨ - ٨ - ٨٣ مامۆستا نەریمان.

(٢) زاراوەی زانستی کوردی: نەقابەی مامۆستایان /لقی سلێمانی، ژمارە (٦) سلێمانی - چاپخانەی ژین/ ١٩٦٠

(٣) بروانە: بەرەو زاراوەی یەکگرتووی کوردی - دەستەی کوردی کۆڕی زانیاریی عیراق - ل٣.

(٤) د. محمود الجليلي. گۆڤاری آفاق عربية - ژ ١٢ ی ١٩٨٥

(٥) د. ابراهيم السامرائی - العربية تواجه العصر - بغداد - ١٩٨٢ صفحة (١١٨).

(٦) الأمير مصطفى الشهابي - المصطلحات العلمية في اللغة العربية / مطبوعات المجمع العلمي العربي بدمشق /١٩٦٥ ط٢.

(٧) سەرچاوەکەی پێشوو.

(٨) د. علي القاسمي - مقدمة في علم المصطلح - بغداد/ ١٩٨٥ ل٦٣

(٩) بۆ ئەم باسە بروانە (١) د. ابراهيم السامرائی - سەرچاوەی پێشووتر (٢) د. علی القاسمی - سەرچاوەی پێشوو کە بە پەلوپۆتر لەو مەرجانە دواون.

(١٠) بروانە کتێبی زیندەوەرزانیو دروستی /پۆلی سێیەمی ناوەندی چاپی یەکەم/ ١٩٧٣ لاپەڕە ٣٠٩

(١١) د. علي القاسمي - سەرچاوەی پێشوو - ل ٣٦

(١٢) - مصطفى الشهابی - سەرچاوەی پێشوو

(١٣) د. علي القاسمي - سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٢، هەیە (التضمين)یش بە ڕێگەیێکی دی دادەنێ، د. عبدالله الجبوری - ڕۆژنامەی (العراق) ٣ - ٣ - ١٩٨٦

(١٤) دكتـور كامـل حسـن البصيـر/ زاراوەی کوردی ـ بێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن ـ سلێمانی /١٩٧٩، ل٨٨
(١٥) مصطفى الشهابی ـ سەرچاوەی پێشوو.
(١٦) د.علي القاسمی ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٩٨
(١٧) الشهابی ـ سەرچاوەی پێشوو.
(١٨) فەرهەنگی خاڵ.

(١٩) د. علي القاسمی ـ سەرچاوەی پێشوو ل١٠٢
(٢٠) د. كامل حسن البصير ـ سەرچاوەی پێشوو ل٧٠
(٢١) محمـد كامـل حسين، لە د. ابـراهيم السـامـرائی/ سەرچاوەی پێشووەو لاپەرە (١١٧).

(٢٢) د.علي القاسمی ـ سەرچاوەی پێشوو.
(٢٣) منير البعلبكی قاموس المورد/ انكليزی ـ عربي.
(٢٤) د.كامل حسن البصير ـ سەرچاوەی پێشوو ل ٧٠.
(٢٥) د.صبحي كمال حسون ـ الجمهورية/ بغداد ١٩٨٦/١/١٩
٢٦) د.علي القاسمی ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل ٩٩

(٢٧) سەرچـاوەی ئەم لێـکـۆڵـینـەوەیـە گەلێـك کتێبی قوتـابخـانـەیە، بەتایبەتی ئەوانەی زۆرتر سەیر کراوان، یان ناوناو ناوم بردوون ئەمانەن:

١ ـ زیندەوەرزانیو دروستی ـ بۆ پولی دووەمی ناوەندی/ چاپی دووەم ١٩٧٣ ـ چاپخـانـەی حکـوومەت، وەرگێرانی فوئاد عیزەت و هاوڕێیانی.

٢ ـ زیندەوەرزانیو دروستی ـ بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی /چـاپی یەکـەم/ ١٩٧٣، چاپخـانـەی مەعـارف. فؤاد عیزەت و هاوڕێیانی.

٣ ـ جوگـرافـیـای عیـراق و. . / بۆ پۆلی سێیـەمی ناوەندی /چـاپی دووەم/ ١٩٧٣، چاپخـانـەی حکـوومـەت، وەرگێرانی شەکوور مستەفاو هاوڕێیانی.

٤ ـ گیانەوەرزانی بۆ پۆلی شەشەمی زانستی، چاپی نۆیەم/ ١٩٨٥ چاپخـانـەی پەروەردە لە هەولێـر، وەرگێـرانی فؤاد عیزەت و فریدون محمد فرج و هاوڕێکانیان.

٥ ـ ئابـووری بۆ پۆلی پێنجـەمی ئامـادەیی (ئـەدەبی)، چاپی یەکـەم/ ١٩٧٤ چاپخـانـەی ئیـرشاد. وەرگێرانی د. ساماڵ مەجید فەرەج و هاوڕێیانی.

٦ ـ ژمارەو پێوان بۆ پۆلی شەشەمی سەرەتایی /چاپی ١٥ ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی ئەسعەد/ وەرگێر: رەشید نەجیب.

٧ ـ جوغرافیای گشتی، بۆ پۆلی چوارەمی گشتی، چاپی یەکەم/ ١٩٨٥ چاپخانەی عەشتار وەرگێر د. احسان فؤادو هاوڕێیانی.

٨ ـ پەروەردەی ئایینی بۆ پۆلی یەکـەمی ناوەنـدی /چـاپی سێیـەم/ ١٩٧٢ چاپخـانـە دار الجـاحـظ، وەرگێرەکانی، شێخ موحەممەدی خاڵ و هاوڕێیانی.
٩ ـ گۆڤاری پەروەردەو زانست ـ ژمارە (١٤)ساڵی ١٩٧٨ چاپخانەی دار العراق ـ بەغدا.

(*) بروانـە (ئـەحـمـەدی) چاپخانەی فرات/ ١٩٣٦ ل٦، وەکـو سەیـردەکـرێ لەوێ نووسـراوە (عـصـب)پـیـە، راستی‌یـەکـەی (پـەی)ەیە کەمانای دەمارە، بۆ ئەم مانایەش بروانە فەرهەنگی خاڵ، بەرگی یەکەم، رەنگبێ بە شێوەی رێنووسی کۆن نووسرابێ.

# مصطلحات الكتب المدرسية

عبدالرزاق البيمار

بدأ التعليم باللغة الكردية في المنطقة الكردية بالعراق بصورة محدودة وعلى نطاق ضيّق بعد الحرب العالمية الاولى فقد يعتبر كتاب أولمين قراءتى كوردى) المطبوع سنة ١٩٢٠ أول كتاب مدرسي كردي وكان خاصاً بتعليم الالفباء الكردي، واقتصرت الدراسة باللغة الكردية في بعض مدارس مراكز بعض المدن القليلة، وبعد ثورة ١٤ تموز سنة ١٩٥٨ شملت الدراسة جميع المرحلة الابتدائية وفي مدارس المنطقة الكردية، الاّ انّ ثورة ١٩٦٨ المجيدة فتحت الباب على مصراعيه وأحدثت ثورة في التعليم باللغة الكردية كماً وكيفاً، إذ شملت جميع مراحل الدراسة الابتدائية والمتوسطة والثانوية وفي جميع مدارس منطقة كردستان للحكم الذاتي، فقد ترجمت مواد علمية جديدة وربمّا لأول مرة الى اللغة الكردية كالكيمياء والفيزياء والجبر والمثلثات والطبيعيات والاقتصاد وغيرها، ومن خلالها برزت مسألة وضع المصطلحات وتنقيتها وتوحيدها. ولاغرو فقد إعتورت عملية وضع المصطلحات بعض النواقص والسلبيات منها وضع عدة مصطلحات لمفهوم واحد وتكرارها أو تباينها واختلافها في مادة واحدة أو مواد مختلفة، ومنها أيضاً عدم تطابق المصطلح المترجم مع نظيره المترجم منه في المعنى وعدم إعتماد بعض واضعي المصطلحات الأسس العلمية الواجب إتباعها عند وضع المصطلحات، ومنها عدم استثمار طاقات اللغة الكردية بكافة لهجاتها استثماراً شاملاً حيوياً.

ولأجل إلقاء الضوء على واقع المصطلح في الكتب المدرسية الكردية قام الباحث وبالاعتماد على مصادر علمية عربية بتعريف المصطلح وذكر أهميته بالنسبة للغة، وقد تطرق الى مبادىء وضع المصطلح وشرحها بايجاز مع ذكر نماذج من مصطلحات غير مستساغة بيّن مثالبها وأخرى جيدة بيّن محاسنها.

ولاجل تنوير الطرق أمام العاملين في ميدان وضع المصطلحات فقد ذكر الباحث الدليل الصحيح الى ذلك والذي يشمل على مايلي: ـ الانطلاق من المعاني والعلاقات الموجودة بينها الى خلق المصطلح وليس العكس، والاحاطة بالمصطلح المتوفر في القاموس الكردي وفحصه واستقرائه وإعادة النظر في المصطلحات المتداولة الآن وتبديل غير الصالح منها باخرى كردية رصينة أصيلة، والأقتصاد قدر الامكان في اللغة عند صياغة المصطلح مع مراعاة قواعد اللغة وصرفها.

وعرج الباحث بعد ذلك الى طرق وضع المصطلحات وهي: ـ الاشتقاق، المجاز، النحت، الترجمة. وشرح من خلالها كيفية وضع المصطلح على هديها وأورد أمثلة كثيرة من المصطلحات المستخدمة في مجموعة من الكتب المدرسية لمراحل مختلفة ومواد عديدة شارحاً لمسلكها وموضحاً لمدلولاتها وجذورها اللغوية وناقداً إياها مبيناً وجوه العيب فيها ومشيداً بالأمثلة الحسنة المستنبطة من تلك الكتب المدرسية.

وخلص في الختام الى ان الكتب المدرسية الكردية من خلال مصطلحاتها ساعدت على تبلور لغة علمية ليس على نطاقها فحسب بل خارجها وعلى صدور المجلات والمطبوعات الدورية والكتب الصادرة باللغة الكردية. وأشار في الختام الى ضرورة مراجعة ودراسة تلك المصطلحات بقصد تنقيتها وتوحيدها وتوثيقها وتوثيق مصادرها.

# زاراڤێت ئەدەبێ دمەم و زینا خانی دا

● رەشید فندی ●

زاراف دئــەزمـانی‌دا، پەیڤــەکــه یان ژ پەیڤــەکێ پتـره، دیـارکـرنـا رامـانــەکا تایبەتی‌و خومالی ددەت، وئارمانجەکا دیارکری دگەهیینت، لەورا (زاراف) رامانەکا دورتر کورتر ژ رامـانـا پەیڤـا ئاسـایی خویـا دکەت، و مەودایەکا بەرفرەهتر وەردگریت، وجوانیەکا باشتر ددەتێ. . هەبونا زاراڤا دناف هەر ئەزمانەکی‌دا، نیشان وسیفەتا هێزو شیان و پێڤەهاتنێت وی ئەزمـانی‌یــه، وکــەڤنـاتی ورەســەنایەتی ووەراوو گەش و بونـا بەردەوامـا وی ئەزمـانی دیـاردکەت. . لەورا (زاراف) یان زانستێ زاراڤـا تایــەکێ ئەزمـانی‌یــەو رەنگــەکێ دیـارێ رەهوان بێژیا وی ئەزمانی‌یه. .

ئەزمــانێ کوردی ژی مینــا هەمی ئەزمــانێت کەڤنــارو رەســەن و خودان وەرارو گەش بون، یێ دەولــەمــەنــده ب هەمی رەنگێت زاراڤــا، ول گەلــەك لایێت ژیــانێ، هەر چەنــده دڤێ وێ راستیێ ژی دەست نیشــان کەین، کو نەمــازه ژ لایێ زاراڤێـت زانـسـتـی‌ڤـه، مه کێـمــاسی‌و بێ‌سەروبەری هەنەو ئەم پێتڤی گەلەك زاراڤێت زانستی‌نه د هەمی دەلیڤێت نوی دەرکەفتێت زانستێ ئەڤرۆدا. . .

لێ ژ بەر وێ چەندێ کو ملله‌تێ مه خوەیێ مێژوویەکا درێژه د لاو رەخێت ئەدەبی‌دا، لەورا ئەم هێڤ دکەین، کو مشەو پر زاراڤێت ئەدەبی د تم پەرتوکێت مەیێت ئەدەبی‌دا هەنه، نەمازه ددیوانه هوزانێت کلاسیك دا. .

دڤێ ئەم راستیەکا ئاشکەرا ژی ژ بیر نەکەین و ژ رێکا زانستی دور نەکەڤین، دەمێ ئەم کارەکی وەسا بخوینین و شرۆڤه کەین، ئەو راستی ژی ئەوه کو ملله‌تێ کورد چونکی دگــەل هنــده ملله‌تێت دی د ژیت ل ڤێ دەڤــەرێ، مینـا ملله‌تێت عەرەب و فورس و تورك، تشتــەکی مسـۆگــەرو د جهدایه، گەر وەلو ببینین، کو گەلەك تێکەلیا ئەزمانی دناف وان ملله‌تـان دا پەیـدابـوویـه چ ژلایێ پەیڤاڤەبیت، یان ژ لایێ وێنـەو زاراڤـەو «ئیـدیـوم» ب کار ئینـانێت ئەزمـانیڤه، هێش پتر، کارێ ئەدەبێ وان ل ناف هوزانێت ئێکو دودا دیارکری‌یه. .

لەورا ئاسـایی‌یـه گەر گەلـەك زاراڤەو ئیدیوم ژ ئەزمانێت نێــزیــك دنـاف رێـزێت ئەدەبێ کوردی‌دا بەرچـاف ببن!! چونکی یادیـاره وان هۆزانڤـانـان تامـا هۆزان و ئەدەبێ وان ملله‌تان سەح کرنەو جهێ وان زاراڤەو ئیدیوما دناف رێزێت هوزانێت خۆدا خوەش کری‌نه. .

ڤێجا هوزانڤانێت مه، یان ئەو زاراف و ئیدیوم ب وان ئەزمانێت بیانی ب کار ئانینه، مینا هەبونا زاراڤێت ئەدەبێ عەرەبی‌و فارسی دنـاف هۆزانـا کوردی‌دا، یان ژی نیڤــەرو ب کار ئانینــه، ئانــەکـو نیڤ بیـانی‌و نیڤ کوردی، یان ژی شیانه ب کوردیەکا خومالی ب کاربینن. . .

لەورا ئەو زاراف گەلــەك جاران ب زاراڤــێــت هەمــی ملله‌تێت روژهــەلاتـا ئیسـلامی تێنـه هژمـارێ، وخـومالی ملله‌تــەکی ب تەنێ نینن، هەر وەســا ژ لایــەکێ دن ڤه

پاکی هەر جۆرێ پێــویستــە لە جۆرەکـانی تـرەوە دوور بێت هەر بۆیــەش تۆو بەکــار ناهێنــرێ تەنهـا لە کاتی دوورەگە کردنیدا نەبــێ. هەر لەبــەر ئەوەشــە دەبــێ تۆوی گوڵ لە پایــز دوای پێگـەیشتن و کۆکـردنـەوەی یەکسـەر بچێنـرێ یا تێکەڵاوی لمی شێـدار بکـرێو لە بەهـاری ساڵی داهـاتـوودا بچێنرێ زۆر جار تۆوی گوڵ چەند مانگێ وەیا چەند ساڵێ یا زیاتر دوا دەکەوێ ئەوجا شین دەبێ بۆیە، پێویستە چاوەروانی بیت و ئەو خاکەی کە تۆوەکەت لێناشتووە هەڵی نەگێریتەوە.

٤ ـ زۆربوونی بە هۆی دابەش کردنی رووەکە کۆنەکانەوە:

ئەم رێگـایـەش لای خۆمـان بڵاوە بەڵام بە شێوەیێکی کەم، لێـرەدا گوڵێ تەمـەن بچـووك یا بڵێین بێچـوو لە بنی گوڵـە کۆنـە تەمەن درێژەکەوە شین دەبێ، دەتوانرێ ئەو بێچووە بە وورياى هەڵبکەنرێو لە جێگایێکی دیدا بنێژرێ.

**«جۆرەکانی پەروەردەکردنی رووەکی گوڵ»**

رووەکی دارگوڵ بە سێ جۆر پەروردەو خزمەت دەکرێ:

١ ـ دار گوڵێ ئاسایی (شجيري): Bush Roses

ئەم شێوەیە لەم کاتەی ئێستاماندا بڵاوەو لە باخچەکاندا پەیرەو دەکــرێ. لێــرەدا رووەکــەکــە ٤ ـ ٦ لقی سەرەکی لە بنـەوەی رووەکەکە کە رێك و پێك و جوان بێت پەرورده دەکرێو ئەوانی تر دەبڕێنەوە. . . .

وە پێویستە ئەم رووەکە لە نزیکی خاکەوە موتووربە بکرێ بۆ ئەوەی لە ژێـرەوە لقی تـر بکـات و زیـاد بکات و شێوەی دارگوڵی دەوەنی ئاسایی وەربگرێ.

٢ ـ دارگــوڵــێ یەك لق (الـقــائـم): standard Roses لەم شێوەیەدا دارگوڵەکە تەنها یەك لقی چاك و بە هێزی لێ پەرورده دەکرێو ئەوانی‌تر دەبڕێنەوە، ئەمەش لە بەرزی ٨٠ ـ ١٢٠سم لە دووری زەوییەوە موتووربە دەکرێ ،هەروەها هەندێ جار لە بەرزی ەوا مەتــرەوە. جۆری رەســەنی بەکـارهێنـراویش بۆ ئەم مەبەستە گوڵی نەسرینە.

٣ ـ دارگوڵی پەل کێش (المتدلي) Weeping stadard Roses لەم شێوەیەدا هەروەکو گوڵێ تاکە لق خزمەت دەکرێ بەڵام ئەم جۆرەیـان لە بەرزی ١,٥ ـ ٢ مەتـرەوە موتـووربـە دەکرێ ئینجا دەخرێتە سەر دیوارو پەرژینی ئاسن و پەل دەهاوێژێ، جۆری رەسەنی بەکار هێنراویش بۆ ئەم مەبەستە گوڵی نەسرینە.

**«شوێنی چاندنی دارگوڵ»:**

پێویستە لەژێر سێبەری دارە گەورەکاندا نەنێژرێ بە جۆری کە بەری تیشکی خۆری بەرنەکەوێو لاوازی بکات، چونکە ئەو دارە گەورەیــە لەگــەڵ دارگــوڵـەکـەدا هاوبـەش دەبێت لە ئاو و خواردن دا. بۆیــە دەبــێ دوور بێــت لە داری گەورەو بە لای کەمەوە رۆژی ٣ کاتژمێر (سەعات) تیشکی خۆری بەرکەوێ.

**«خزمەت کردنی باخچەی دەوەنی گوڵ»**

١ ـ بێـڵ تەپ:ـ یا هەڵکـەنـدی دەورویـەری دارگـوڵەکە کە ئەمـەش دەبێت زۆر قووڵ نەبێت چونکـە رەگی دارگـوڵ نزیـك زەوییەو دەبێتە هۆی برانی رەگەکانیو لەناوچوونیان و لە کۆتاییدا زیان دەگەیێنێتە دارەکە بۆیە دەبێ قووڵی هەڵکەندنی ٩ ـ ١٢سم زیاتر نەبێت بەمەش گژوگیای زیان بەخشی پێ لەناو دەچێو ئەو خاکەش هەواکەی دەگۆڕێ.

٢ ـ بژار:ـ هەڵکــەنـدنی ئەو گژوگیـایـە نامـۆیـانـەی کە لە دەوروویــەری گوڵــەکـەن بۆ ئەوەی بەشـداری خواردن نەکـات لەگەڵیاو بێهێزو لاوازی بکات.

٣ ـ ئاودان: گوڵ بە گوێرەی پێویستی ئاو دەدرێت ژمارەی ئاودانی لە هاویندا زۆر دەبێت، لەبەهارو پایزدا کەمتر لە زستان پێــویستی بە ئاودان نابێت تەنهـا لەکـاتی باران بران دا نەبێ. . بۆیە دارگوڵ هەر کاتی بینیت ژێرەکەی ووشکە، دەبێ ئاو بدرێ.

٤ ـ پەین کردن:ـ پەین زۆر پێویستە بۆ خواردن لەو خاکەدا بۆ دار گوڵ، چاکتــریـن پەیـن پەینی ئاژەڵییــە کە کۆن بوویێو ماوەیێـکـی زۆر خۆرو باران لێـیدابێ بۆ ئەوەی گژوگیــا سەوز نەکات، ئەم بەینەش لە کۆتایی زستان دا دەکرێت و بە رادەی ٣ ـ ٥سم ئەستـووری ئەوجـا لەگـەڵ خاکـەکەیدا هەڵ دەکەنرێو تێکەڵ دەکرێ. . دوای پێك هاتنی چرۆی گوڵ چەند جارتر بە پەینی کیماوی پەین دەکرێ، ئەویش لە مانگی نیسان و ئایار،

هەروەهـا دەتـوانـرێ لە جیـاتی ئەو پەینـە پەینی کیمـاوی بەکـار بهێنرێ وەکو (نەتراتی ئەمۆنیا) و (سولفاتی ئەموونیا) و (نەتراتی پۆتـــاس) کە بە ڕێـــژەی ٣٠ ـ ٤٠ گرام بۆ هەر مەتـرێکی چوار گۆشە لە یەك جاردا.

٥ ـ هەڵ پەرداوتن :ـ داری گوڵ پێویستە هەموو ساڵێ زۆر بە چاکی بن پەل بکرێ بۆ ئەوەی لقە کۆن و بێ‌هێزو وشکەکانی ببڕێتەوە تاکو زیان نەگەیێنیتە دارەکە چونکە ئەو خواردنەی کە بۆی دەچێ بۆ ئەوانیش دەچێ، هەروەهـــا ئەو لقـــە بێ‌هێـزانـە گوڵ ناگرن بۆیە دەبێ ٣ ـ ٥ لق پێ‌گەیشتوو بەهێزو گەش بهێڵرێتەوە ئەو دوایی لقەکانی ببڕێتەوە ئەمەش لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکـەمـــەوە تاکـــو کۆتـایی مانگی شوبـات هەڵ پەرداوتنیش لە بەرزی‌یەکەوە دەبێ کە ٤ ـ ٦ چرۆی پێوەبێ

**«چۆن گوڵی کراوە تەمەن درێژتر دەبێت لە ناو گوڵدان دا»**

دەتوانرێ بە پەیرەوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە تەمەنی گوڵی ناو گوڵدان درێژتر بکرێت ئەوانەش:

١ ـ نەهێڵرێ گوڵەکان تیشکی خۆریان بەر کەوێ تاکو پلەی گەرمیان بەرز نەبێتەوە.

٢ ـ نەخرێنە بەر تەوژمی هەوا تاکو بە پەلە کاری هەڵماندنی بەرز نەبێتەوەو وشك بێتەوە.

٣ ـ پێـــچـــانـــەوەی گوڵـــەکـــان بە قومـــاشێکی تەڕ لە کاتی گواستنەوەی تاکو هەواێکی شێداری بەرکەوێ.

٤ ـ دانـــانی گوڵـــەکـــان لە شوێنێکی شێـداروزەوی‌یـەکـەی دەورووبەری بە بەردەوامی ئاو پرژێن بکرێ تاکو بەرزبوونەوەی ڕادەی شێ لە هەوادا دەگاتە ڕادەی تێر بوون.

٥ ـ گوڵەکان لە پلەی گەرمایی نزم دا دابنرێن کە لە نێوانی (٥ ـ ١٠) سْ بێت بە گوێـــرەی جۆری گوڵـــەکـــانی بە مەرجێ نەبێتە هوێ بەستنی ئاوی شانەکانی قەدو شانەکانی بمرێ.

٦ ـ هەڵ نەگـرتنی گوڵ لەگـەڵ مێـوەو سەوزە چونکـە دەبێتـە هوێ زۆربـوونی گازی (ئـەثیلین) ئەمـەش دەبێتـە هوێ وەرینی پەڕەی گوڵەکان

٧ ـ پاك کردنەوەی ئەو گوڵدانەی کە گوڵەکانی تێدا پارێزگاری دەکـرێ پێش بەکـارهێنـانی، چاکتـریش وایە گوڵدانی گێرو پێچ خواردوو بەکـــار نەهێنـرێ چونکـە بە چاکی پاك نابێتـەوە، دەبێ ئاوی ناو گوڵدانەکەش هەموو ڕۆژێ بگۆڕێ، هەروەها شۆرینی قەدی گوڵـەکـان پێش گەڕانـــەوەیـــان بۆ ناو ئاوی تازە نەوەك کەڕوویان لەگەڵ خۆیان دا هەڵگرتبێ.

٨ ـ بڕینەوەی قەدی گوڵەکە لە ٢ ـ ٣سم لە لای خوارەوەی چونکە لەوانەیە کونی قەدی ڕووەکەکە گیرابێ‌و ببێتە هوێ بۆگەن بوونی شانەکانی لەناو ئاودا.

٩ ـ ئەو گەڵایـانـەی دەکـەونـە ناو ئاوەکـە بکـرێنـەوە، نەوەك کەڕوویان هەڵگرتبێ

١٠ ـ چاکتر وایە حەبی ئیسپرین، وەیا هاڕاوەی خەڵووزی نەرم بکـــرێتـــە ئاوەکـەوە بۆ مژینی دردراوە ژەهـراوی‌یـەکـان کە کەڕووەکان دەری دەدەن.

١١ ـ بەکـارهێنـانی گوڵـدانی مس زۆر چاکە چونکە ناهێڵێ کەڕووی تێدا گەشە بکات و پاك کردنەوەی ناوێ.

١٢ ـ هەندێ لە پەروردەکەرو زانایانی گوڵ لە وڵاتە پێش کەوتـــووەکـــان هەنـــدێ مادەی کیـــمـــاوی بەکـــاردەهـێـنـن بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی گوڵ لەوانە:

١ ـ Zetien

٢ هیدروکس الکینولین 8 HQC

٣ ـ (المالیك هیدرازید MH3

٤ ـ (ب9) (B9)

٥ ـ السایکوسیل C. C. C

**«بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان»**

لەم کاتـەی ئێستـامـانـدا هۆرمۆنەکان بۆ هاندانی پێك هاتنی ڕەگ لە قاژ و بۆ زیـــاد بەرگـــرتـن بەکـــاردەهـێنێ، هەروەهـــا بۆ نەکـــەوتنی بەری میـــوە لەپێش وەرزی چنیین وە بۆ لەنـاوبـردنی گژوگیای زیان بەخش وە بۆ کورت کردنەوەو نەمانی ماوەی گەشە نەکـــردن لە دارا لە وەرزی زستـــان دا وەیـــا بۆ وە دەس هێـنـانی جۆری تازە لە دارو ڕووەکـــی گوڵ و جوانـــی بە زیـــاد کردنـــی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی لە خانەدا.

بۆ زیـاد کردنی ڕەگ و ڕیشـەو دروست بوونی لە قەڵـەم دا هۆرمۆنی (ألفا نفثالین أستیك أسید) بەکاردەهێنرێ. هەروەها بۆ پێك هاتنی ڕەگ و ڕیشەو یارمەتی دانی لە شین بووندا هۆرمۆنی (أندوّل أستیك أسید) بەکار دەهێنرێ ئەم هۆرمۆنانەش لە بازاڕدا بە ناوی (Rootone) وە دەفرۆشرێ.

وە بۆ زۆر بەرگرتنی مێوە هۆرمۆنی (بیتا نفثالین أستیك أسید) بەکاردەهێنرێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد گرتنی بەر لە داری مێوەو ڕووەکی سەوزە هەروەها ئەو مێوەیەش کە ئەم هۆرمۆنەی پێوە دەکرێ، ناوکی کەم دەبێ، ئەم هۆرمـۆنـەش لە بازاڕدا بە ناوی Fruitone دەفرۆشرێ.

ئەو هۆرمـۆنـەش کە یارمـەتی مێـوە دەدات بۆ نەکـەوتنی و نەوەرینی پێش وەرزی چنینی ئەویش هۆرمۆنی (نفثالین أستیك أسید) کە بە شێوەی گیراوە ئەو دارە بەردارەی پێ ئاوپرژێن دەکرێ.

ئەو هۆرمـۆنـەش کە بۆ لەنـاوبـردنی گژوگیـای زیـان بەخش بەکاردەهێنرێ هۆرمۆنی (D .4 .2) یە.

**ئەو مێروو و نەخۆشی یە ڕووەکی یانەی کە تووشی درەختی گوڵ دەبن:**

زۆر جار مێـروو یا نەخـۆشـی دەبـێتـە هۆی لاواز بوونی یا فەوتانی، بە تەواوی جاری واش هەیە هیچ گوڵ ناگرێ، ئەو ئافەتانەش کە تووش دەبن ئەمانەن:-

١ - شۆوکـە: ئەم مێـرووە ناسـراوە تووش گەڵاو لق و چرۆ دەبێ بە هۆی تێکـەڵاوی گیـراوەیی (مـلاثیـون) چارە دەکـرێ، هەروەها بە ئاوپرژێن کردنی ڕووەکەکان بە تێکەڵاوی گیراوەی (سـولفـاتی نیکـوتین) بە ڕێـژەی ٢./. بە مەرجێ پێش دەم کردنەوەی گوڵەکان بکرێت بۆ ئەوەی کار نەکاتە سەر پەڕەی گوڵەکان.

٢ - مێرووی توێکڵەدار: ئەمەش مێروویێکی زۆر بچووکەو بە توێکڵێکی سپی داپۆشراوە تووش لقە کۆنەکان و هەندێ جار تووش لقـە تازەکـانـیش دەبـێ بە هۆی ئاوپـرژێـن کردنـی بە تێکەڵاوی (ڕۆنی ڤۆلك) چارە سەر دەکرێ.

٣ - جاڵجـاڵـۆکـەی سوور: ئەم جاڵجاڵۆکەیە ڕەنگی سوورە بەڵام بە ئاسانی بە چاو نابینرێ بە ژمارەیێکی زۆرەوە دەکەونە سەر گەڵاکان و زەردی دەکەنەوەو دەوەرێ، بە هۆی قانگە دانەوە بە گۆگرد لە بەیانی زوودا وەیا بە ئاوپرژێن کردنی بە مادەی (المیتاسستوکس).

٤ - دۆوکـە: لە گەورەتـرین نەخـۆشی یـەکانی گوڵە بە پەڵەی ئاردی چرو پر لەسـەر گەڵاو لق و چرۆکـان دەردەکـەوێ دەبێتـە هۆی شێـوانـدن و وشـك بوونـەوەیـان ئەم نەخـۆشی یە لە بەیانی زوودا بە گۆگرد قانگە دەدرێت

٥ - ژەنگ: Rust ئەم نەخۆشی یە لە هەموو عێراقدا بڵاوە وە بەوە ناسـراوە کە خاڵێ پرتـەقـاڵێ تۆخ لەسـەر گەڵاو لقە تازەکان دەژێ و وشکی دەکـاتـەوە بە کۆکـردنـەوەی گەڵاکـان و سووتانیان چارە دەکـرێ وەیـا بە گیـراوەی کبـریتاتی مس بە ڕێژەی ١./. وەیـا بە ئاوپـرژێـن کردنـی بە گیـراوەی لەنـاویـەری کەوو (المانكوزیب) بە ڕێژەی ١/ ٤ ./. .چارە دەکرێ.

٦ - (پـەڵـە) ڕەشـەکـە:- Black spot ئەو کەڕووەیی کە تووش دەبێ نیشـانـەکـانی پەڵەی ڕەش دەکەوێتە سەر ڕووی گەڵاکانی سەرەوەو دەبێتە هۆی زەرد بوونەوەی گەڵا تووش بووەکان و ئەوجە وەرینیان. بێهێز دەبێ و پاشان لق و قەدیش تووش هەمان پەڵە دەبێ، بەرگـری کردن لەم نەخـۆشی یـە بە ڕێـك و پێکی ئاو بدرێ، ئاوپـرژێنی ڕووەکـەکـە بە گیراوەی (Fermate) بە ڕێژەی ١/٢./. هەروەهـا ئاوپـرژێنی لە سەرەتـای تووش بوونـدا بە گیراوەی (کالسکارتین) بە ڕێژەی (یەك لە هەزار) وەیا گیراوەی (کبریتی میکرونی بە ڕێژەی ٢٥و. ./. . وەیا (الكوبرافیت) بە ڕێژەی ٣و. ./. .

**ئەو سەرچاوانەی کە بۆ ئەم باسە سوودم لێ وەرگرتوە:-**


١ - دلیـل التنسیق الـداخلي للنبـاتـات الظـل وإنتـاج الأزهار القطف) - تألیف الدکتور طاهر نجم رسول الطبعة الأولیٰ سنة ١٩٨٤

٢ - الزهور ونباتات الزینة - بأشراف الدکتور أبو دهب محمـد أبـو دهب أستـاذ نبـاتـات الـزینـة - کلیة الزراعة - جامعة القاهرة - الطبعة الأولیٰ سنة ١٩٧٨

٣ - الحدائق والنباتات الزینة والغابات - الطبعة الثالثة السنة ١٩٧٨ - للصف الثالث الزراعي -

٤ - مجلة صوت الفلاح عدد ٦٦٤ حزیران ١٩٨٥

٥ - فەرهـەنگی زانیـاری بەشی یەکـەم و بەشی سێیەم مامۆستا کەمال جەلال غەریب چاپی یەکەم - ساڵی ١٩٧٤ - ساڵی ١٩٨٣.

# انواع وردة الجوري
# اسمها العلمي
# موطنها

بقلم: صلاح الدين صالح مجيد

ان نبـات وردة الجـوري هو من الشجيرات او من المتسلقات وهي تنمـو في جميـع ارجـاء العالم باستثناء المناطق الحارة. وقد اطلق الشاعر الاغريقي سابو قبل ٦٠٠ ق. م لقب «ملكة الورود» كمـا تنـاولها العالم الاغريقي الشهير ثيو فراستو انواع تلك الوردة من حيث الوانها وروائحها.

بعـد هذه المقـدمـة يقف الكاتب على الاسم وردة الجوري، ويذكر بان هناك تشابهاً من حيث تسمية الورود في كثير من لغات العـالم، ثم يأتي الى وصف نبـات الـورد من حيث عائلة الـورود واجنـاسهـا وانـواعها ـ كالوردة البرية مثلا التي اهتم بها المعنيون وبذلوا جهوداً جيدة لزرعها وتربيتها، كما دخلت الورود التجارية بين انواع الورود.

يتنـاول الباحث فوائد وردة الجوري من حيث اضفاء الجمال والفتنـة على حديقـة البيت والمحـلات العامة، كما ان بعضاً منها يستفـاد منهـا لغرض اخراج دهن الورود والعطور الفواحة ولتغطية الحيطـان والاحجـار والامـاكن غيـر الـلائقـة، كمـا انها تستخدم لاغراض صناعية وتجارية، ويمكن الاستفادة منها لجعلها سياجاً شائكاً، وبعد ذلك ينتقل الى تكاثر الورود ويشـرح طرق تكاثرها، كطـريقـة الاقـلام وهي اسهـل الطـرق واكثـرهـا شيوعاً، وطريقة التطعيم وطريقة التكاثر بالبذور، واخيراً طريقة توزيع النباتات القديمة.

وحول انواع تربية الورود يذكر لنا ثلاثة انواع:

التربية الشجيرية والتربية القائمة والتربية المتدلية.

ثم يلقي الضوء على مكان زرع نباتات الورود وكيفية الرعاية والعنـايـة بحـديقـة شجيرات الورود، كحفر اطراف نبات الورود والتشـذيب والتنقيح والسقي والتسميـد وقطـع الجـذور القديمة الضعيفــة بحيث لا يؤثــر على الجـذور الشـابـة ذات الحيـويـة والنشــاط، وبعد ذلك يرشدنا الباحث الى كيفية اطالة عمر الوردة المتفتحـة المـزروعـة في المـزهـرية كحجب اشعة الشمس عن الـورود لكي لا ترتفـع درجـة حرارتهـا وعـدم تعرضها لشدة الجو ولف الـورود بقطعـة قمـاش مبلل اثنـاء نقلها، ووضع الورود في مكـان رطب وعـدم وضع الورود مع الفواكه والخضرات وتنظيف المـزهـريـات التي تحفـظ فيهـا الـورود واستخدام مواد كيمياوية لاطـالـة عمـر الـورود كاستعمـال هيدروكس الكينولين والماليك هيدرازيد والسـايكو سيل، ثم استعمال الهورمونات.

وبعــد ذلــك يتطــرق البـاحـث الى الامــراض التي تصيب شجيـرات الـورد وبعـددهـا ويلقي الضـوء على كل حشرة تلحق الضرر او تؤدي الى اصابة شجيرة الورد بمرض معين، او الافات الـزراعيـة التي تفتـك بالشجيرات، ويشخص علاج كل مرض او آفة زراعية من خلال الادوية التي يحددها للقضاء على تلك الامراض.

# ڤیتامینەکان

بەشی یەکەم

دوکتور زەنوون پیریادی
کولێژی زانست/ زانکۆی بەغدا

## پوختەی لێکۆڵینەوە

*لەم وتارەدا باسێکی دوورو درێژی ڤیتامینەکان دەکەین، بە تایبەتی پێک هاتووی کیمیایی و پەیوەندی هەر ڤیتامینێک بە تەندروستیەوە. هەروەها باسی ئەو بابەت و جۆرە خواردەمەنیانە دەکەین کە ڤیتامینیان زۆر تیادا هەیە. وە گوایە کەم خواردنی ڤیتامین چ جۆرە نەخۆشییێک لە مرۆڤدا پەیدا دەکات.*

## سەر ناوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە

پێشەکی
مێژووی دۆزینەوەی ڤیتامینەکان.
کۆمەڵەی ڤیتامین ـ B
ترشی پانتوثنیك
کەم خواردنی ترشی پانتوثنیك.
بایوتین:
ترشی نایکۆتینیك.
رایبۆفلیڤین.
ثایەمین.
پیریدۆکسین ـ ڤیتامین ـ B
کۆبەڵ ئەمین ـ ڤیتامین ـ B[12]
ئینۆسیتۆڵ.
کۆلین.
ترشی ئەسکۆربین ـ ڤیتامین ـ C .
ڤیتامین ـ A .
سەرچاوەکانی ڤیتامین ـ A
مەترسی کەم خواردنی ڤیتامین A.
ڤیتامین ـ D
ڤیتامین ـ K
ڤیتامین ـ F

**پێشەکی: -**

**خواردەمەنی مرۆڤ تەندروستانەو تەواو نیە ئەگەر هاتوو هەر ـرێتی بێت لە ماددەکانی کاربۆهیدرات و چەوری‌و پرۆتین. بەڵکو پێویستە لەگەڵیاندا ماددەیەکی‌تر هەبێت. ئەم ماددەیە گرنگە پێی دەڵێن ڤیتامین V - itamine ڤیتامینەکان لەناو سەوزەو میوەو گۆشت و شیرو هێلکەدا زۆرن و. . . گەلێك چەشنیان هەیە. هەندێکیانیش دەفەوتێن لە ئەنجامی کوڵاندا.**

**مێژووی دۆزینەوەی ڤیتامینەکان.**

لە ساڵی ١٨١٦ز تاقی‌کردنەوەیەك لە لایەن زانای بایۆلۆجی ماجندی Magendie یەوە پێك هێنرا بەم جۆرەی خوارەوە: -

ماجندی ژمارەیەك لە زیندەوەری وەکو جرج و کەروێشکی بەخێوکرد لەسەر جۆرە خۆراکێکی تایبەتی لە لابۆرەکەیدا. جونێك لەم زیندەوەرانە تەنها کاربۆهیدراتی دەرخواردەدان و جونێکی تری تەنها چەوری پێ دەدات، وە جونێکی تریش هەر سێ جۆرە خواردەمەنی‌یەکانی پێویست بۆ تەندروستی واتە کاربۆهیدرات و چەوری‌و پرۆتینی دەرخوادەدان. لە ئەنجامدا ئەماشای کرد کە هەموو ئەو جۆرە خواردە مەنی‌یانە بێ سوود بوون بۆ تەندروستی‌و هەموو جرجەکان و کەرویشکەکان تەندروستیان تەواو نەبوو، هەمێشە بە شێوەیەکی ئاسایی هەراش نەدەبوون و بە بێ‌هۆ تووشی نەخۆشی دەبوون. ماجندی گیانەوەرەکانی پەروەردە دەکرد لەسەر خواردنی شەکر (کاربۆهیدرات)و هێلکە (پرۆتین)وە رۆن (چەوری) ئیتر هیچ خواردەمەنی‌یەکی تری نەدەدا پێیان.

هەر چەندە خۆی نەی‌دەزانی بۆچی کەرویشك و جرجەکان هەراش نابن و نەخۆش دەکەون، بەم جۆرە خۆراکە بەڵام هەستی پێ کرد کە کەموکوڕیەك لە خواردەمەنیکەیان هەیە. پاش تاقی‌کردنەوەکەی ماجندی بە (٦٥) ساڵ زانایەکی‌کە هات ناوی لونێن Lumin بوو. ئەمە هەڵسا تاقی‌کردنەوکانی ماجندی دووبارە کردەوە وئەنجامەکانی سەلماندو چەسپاند. هەمیشە ئەمیش نەیتوانی بەڕاستی بزانێ هۆی چی‌یە لە ساڵی ١٩٠٥ ز «پەکلها رێنگ» Pekelharing تاقی‌کردنەوەیەکی تازەی پێك هێنا بە سەر ژمارەیەك لە بەچکە مشکدا. ئەم بەچکە مشکانەی هێناو بەخێویانی کرد لەسەر خۆراکێکی تایبەتی کە برێتی بوو لەمانەی خوارەوە:

١ - کازەئین Casein : جۆرێکی تایبەتیە لە پرۆتین پەتی. لە شیر پوختەو خەست دەکرێت.

٢ - ئەلبۆمین ALbumin : جۆرێکی تایبەتی‌ترە پوختە دەکرێت لە پرۆتینی پەتی: لە زەردێنەی هێلکە، چونکە زەردێنەی هێلکە رێژەیەکی زۆری ئەلبۆمینی تیادا هەیە.

٣ - ئاردی برنج.

٤ - پیو.

٥ - نمەکی خواردن

پاش ماوەیەك پەروەردەکردن لەسەر ئەم جۆرە خواردەمەنی‌یانە مشکەکان لاوازو بێ‌هێز دەبوون. پەکلهارنیك هەلسا لەگەڵ ئەو پێنج خواردەمەنی‌یانەی سەرەوە هەندێك شیری تازەی دەرخواردان. سەیری کرد تەندروستیان گەشایەوەو گشتیان بەهێز بوون. کوتوپڕ هەڵی‌هێنا کە هۆی ئەم رووداوە چی‌یەو گوتی پێویستە لەناو شیرەکەدا ماددەیەك هەبێت کە بووە بە هۆی گەشەپێدانی تەندروستی مشکەکان. بێ‌گومان ماددەکانی ژمارە (١ - ٥) لەسەرەوە هیچیان ماددەکەی شیری تیادا نی‌یە. هەروەها زانایەکی ئینگلیز بە ناوی هۆپکز Hopkins ئاشکرای کرد کە چەند نەخۆشی‌یەك هەیە وەکو نەخۆشیی «ئەسکەرپووت»و نەخۆشیی ئێسکەنەرمە[3] تووشی هەندێك کەس دەبن لە هۆی کەم خواردنی جۆرە خواردەمەنیەکی تایبەت. ناوی ڤیتامین Vitamin ە، ئەوە بوو لەم کاتەدا هاتە کایەوە. زاناکان بریاریان دا ئەو ماددەیەی کە لەناو شیری تازەدا هەیەو کاردەکاتە سەر گەشەپێدانی هەراشبوون و تەندروستی رێك و پێکی، ناوینێن ڤیتامین Vitamin .[4]

سەرەڕای ئەو هەموو تاقی‌کردنەوانەی باسمان کردن دەتوانین بڵێین مێژووی دۆزینەوەی ڤیتامینەکان بەراستی لە ساڵی (١٩١٢ ز) دەست پێ‌دەکات. لەم ساڵەدا هۆپکز Hopkins «تێ‌ڕوانی»[5] ڤیتامینەکانی دانا.

ئەم تیۆروانیــە (تیــوریــە) دەڵێت:ـ ماددەیــەك هەیــە لەنــاو هەندێك لە خواردەمەنی‌یەکاندا (وە ناوی نرا بە ڤیتامین) پێویستە بۆ تەنـدروستیی و گەشـایـەتی ژیـان . ئەگـەر مرۆڤ ڤیتـامینەکان نەخوات وەیا کەمی بخوات ئەوا لەوانەیە توشی نەخۆشی تایبەتی ببێت وەکـو نەخـۆشی «ئـەسکـەربووط»ونەخوشی «بەری بەری» «ئیسکە نەرمە».

وشەی ڤیتامین Vitamin لە دوو وشەی بچووك هاتوە: وشەی ڤایت Vit کە واتای پێویست دێت، وشەی (ئەمین amim ) کە برێتیە لە جۆرێکی پێکهـاتـوی ئورگانیك کە هەمویان کۆمەڵەی ئەمێنی (NH2) تیـادا هەیـە. هەر وەکـو لە پەراوێـزی ژمارە(٤)ی پێشودا باسمان کرد ناوی (ڤیتامین (Vitomine) ە) بۆ یەکەم جار لە لایەن فانکەوە Fumk دارێژرا چونکە تاقی‌کردنەوەکانی ئاشکرای کرد کە زۆربەی ڤیتامینەکان کۆمەڵەی ئەمینیان (NH2) تیادا هەیە. شایـانی باســە تاقی‌کـردنەوەکانی فانك زۆربەیان بەسەر تویکڵی برنجدا، واتە کەپەکی برنجدا جێبەجێ کرد لە ئەنجامدا توانی ماددەی (ڤیتـامین) جیـا بکـاتـەوە لە کەپـەکـەکـە. ئەم ماددەیـە کۆمـەڵـەی ئەمینی (NH2) تیـادا هەبـوو. ماددەکـەی پوختە کردو بەکـاری هێنـا بۆ تیمـار کردنی نەخـۆشی «بەری بەری»و گەلێك نەخـۆشیی‌تـر شایـانی باسە مەرج نیە هەموو ڤیتامینێك کۆمەڵەی ئەمینی NH2 تیــادا هەبێت وەکــو فونـك دەڵێت، بەڵام لەگـەڵ ئەویشدا ناوی ڤیتامین هەر مایەوە هەتا ئەمرۆ.

**دوو بڕ ڤیتامین دۆزراونەتەوە:ـ**

١ ـ ئەو ڤیتامینانەی کە لە ئاودا دەتوێنەوە.

٢ ـ ئەو ڤیتامینانەی کە لە ئاودا ناتوێنەوە بەڵام لەناو رۆندا دەتوێنەوە.

لەبەر سیفەی تواندنەوەی ڤیتامینەکان دەبینین ئەو ڤیتامینانەی کە لە ئاودا دەتوێنەوە لە ناو شانەکانی لەشدا زوو بەند نابن و، پێـویستـە هەمـوو «رۆژێك» بیانخون لە گەڵ‌خواردەمەنیدا چونکە زیادە خواردنی ئەم جۆرە ڤیتامینانە پاشەکەوت نابێت بەڵکو فڕێ دەدرێتە دەرەوەی لەش لەگەڵ میزوو پیسایی. لە لایەکی ترەوە ئەو ڤیتامینانەی جۆری دووهەم واتە ئەوانەی لە رۆندا دەتوێنەوە دەبینین لەنـاوشـانـەکـانـدا پاشـەکـەوت بکـرێن و کومەڵ ببن بۆ ماوەیــەك بەبێ فڕێدانـیــان بۆ دەرەوەی لەش چونکــە لە ئـ... ناتـوێنـەوە پوختـەی مەبـەستمـان بە کورتی ئەوەیە کە: لە... چیـەتی 1 ڤیتـامینیـەکـان گرنگن بۆ تەنـدروستی بەڵکو جەبە... خواردنیـانیش لە خواردەمـەنیـدا هەمیشە گرنگن بۆ تەندروستی کەم خواردنی ڤیتـامینـەکـان هەمیشـە کاردەکـاتـە سەر رەوشـت... گەشـایـەتی تەنـدروستی. سوودەکـانی هەر ڤیتـامینێك بەجیـ... تەندروستی بە درێژی باس دەکەین لە مەودوا.

ئەو ڤیتامینانەی کە لەچەوریدا دەتوێنەوەو لەناو چەورید هە... لە ناو لەشی ئادەمیزادا ئەمانەی خوارەوەن:

١ ـ ڤیتامین ـ A

٢ ـ ڤیتامین ـ D

٣ ـ ڤیتامین ـ E

٤ ـ ڤیتامین ـ F

٥ ـ ڤیتامین ـ K

ئەو ڤیتامینانەی کە لەئاودا دەتوێنەوە لەناو رۆندا ناتوێنەوە ئەمانەی خوارەوەن:

١ ـ ڤیتامین ـ B

٢ ـ ڤیتامین ـ C

٣ ـ ڤیتامینی تر.

لە لاپەرەکانی ئایندەدا، بە دووروودرێژی باسی ئەم ڤیتامینانە دەکەین و لە پێکهاتوی کیمیاییان دەکۆڵینەوە.

## کۆمەڵەی ڤیتامین ـ Vitamine B - Complex

کۆمــەڵـە ڤیتـامین ـ B پێیـان دەڵێن «ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکس Vitamine B - Complex چونکە لە راستیدا یەك ڤیتامینکی تەنهاو پەتی نی‌یـە بەڵکـو برێتیـە لە چەن ئاوێتـەیـەکی تێکـەڵاو وە هەر یەکێکیـان ڤیتـامینێکـە بۆ خۆی. خۆماڵەکانی[٦] ئەم ڤیتامینانە لە یەك دەچن، بۆ وێنە هەمویان وەك یەك لەناو ئاودا ناتوێنەوە وە لەناو هەمان خواردەمەنیدا هەمویان بە یەکەوە هەن. لە لایەکی

ئەوە مێـژووی دۆزینـەوی ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکس هەموویان بە یەکـەوەیـە. سەرچـاوەی سروشتی [٧] بۆ ڤیتـامین ـ B بریتیـە لە خواردەمەنی تایبەتی، بەڵام پێویستە لە بیرمان نەچێت کە ئەمڕۆ هەموو ڤیتامینەکان لە دەرمانخانەکاندا دەفرۆشرێن بە شێوەیەکی پەتی و مرۆڤ دەتـوانێ بیکـڕێت و بیخـوات. شیـانی باسـە ئەو ڤیتـامینـانـەی کە لە دەرمانخانەکان دەیفرۆشن لە شێوەی حەپ و کەپسول زۆربەیان دەست کردن. ئەم ڤیتامینانە لە سەرچاوەیەکی دەوڵـەمـەنـد بەو ڤیتامینانە خەست و پوختە دەکرێن، وە هەندێك جار لە لابۆردا دەگیرێنەوەو دروست دەکرێن بۆ وێنە ڤیتامین C لە شەکری گلوکۆز دروست دەکرێت. شایانی باسە پێویستە هیچ کەسێـك لە خۆیـەوە دەرمـان و ڤیتـامینـەکـان لە دەرمـانخـانـە نەسێنێت و بیخـوات بەبێ ئاگـاداری و ئامـۆژگاری پزیشك. زۆر خواردنی هەندێك لە ڤیتامینەکان زیان دەبەخشێتە تەندروستی لە جیـاتی سوود. کۆمـەڵـەی ڤیتـامین ـ B پێـویستی بۆ یاریـدەدانی ئەنـزیمـەکـان لەنـاو شانـەکـانـدا بۆ ئەوەی بە ڕێکـوپێکی کارەکیمیاییەکانیان جێبەجێ بکەن.

لەبـەر ئەوەی ڤیتـامینـەکـان یاریـدەی ئەنزیمەکان دەدەن بۆیە هەنـدێـك جار پێیـان دەڵێن «شـەریکی ئەنزیم» واتە کۆ ئەنزیم «coeuzyme» [٨] وەیا «یاریدەری ئەنزیم» چونکە وشەی «Co» بە مەعنـای یاریـدەدەر دێت. ئەم ڕاستیـەش ئاشکـرا بوە لە لایـەن زانـاکـانـەوە، واتە ئەنزیمەکان بەتەنها ناتوانن کارلێك بکەن، [٩] پێویستیان بە ڤیتامینی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی چالاك بن و بتوانن کارلێك لەگەڵ یەکتریا بکەن.

ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکس لە هەشت ئاوێتـە پێـك دێت و هەر ئاوێتەیەکیان ڤیتامینێکە بۆ خۆی. ئەم هەشت ڤیتامینانە ئەمانەی خوارەوەن: ـ

١ ـ ترشی پانتۆثنیك Pauto Thenie acid

٢ ـ ترشی نایکوتینیك Nieotin

٣ ـ زایبۆولیڤین Riboflavin

٤ ـ ئایمین Thimine

٥ ـ بایۆتین Biotin

٦ ـ پیریدوکسین Pyridoxine

٧ ـ ترشی فۆلیك Folic acid

٨ ـ کۆبەڵ ئەمین Cobalamime

لەگـەڵ ئەم هەشت ڤیتـامینـانـەدا باسی ماددەیـەکی کەیشی دەکەین کە پێی دەڵێن «کۆلێن Clolene» کۆلێن بە شێوەیەکی تەواو بە ڤیتـامین نازمیـرێت چونکـە لەنـاو شانـەکـانـدا بە شێوەی «یـاریـدەدەری ئەنـزیم» واتـە کۆ ئەنزیم coeuzyme کار ناکات. بەڵکو بە شێوەیەکی تر سوود دەدات. کۆلێن لەگەڵ ڤیتامین ـ B کۆمـپـلێکس باس دەکـەین هەر لەبـەر ئەوەی کە ئەم ماددەیـە هەمیشە لەگەڵ ڤیتامین ـ B کۆمپلێکس دا لەناو خواردەمەنیەکاندا هەیە. هەمیشە باسی ماددەیەکی تریش دەکەین لەم بەشەدا کە پێی دەڵێن «ئینوسیتول».

سەرچـاوەی دەوڵـەمـەندی ڤیتامین ـ B کۆمپلێکس هەویرترشە Yeast لە پاشـان جەرگ و ئاردی گەنم و جۆ واتـە ئەم ڤیتـامینـە لەناوکەپەکدا زۆرە.

## ١ ـ ترشی پانتۆثنیك Panto thenie Acid

ئەم ماددەیـە لە ساڵـی ١٩٤٠ز لە لابـوردا ئامـادە کراو دەستووری کیمیایی ئاوێتەکەیان دۆزیوەتەوەو بەم شێوەیە: ـ

```
CH3   OH   O
HO - CH2 - C - CH - C - NH - CH2 - CH2 - COOH
CH3
```

ترشی پانتۆثنیك Pamtoyl - B - alamine

ئەم ڤیتـامینـە لەنـاو شانـەکـانی ڕووەکی سەوزدا دروست دەبێت. هەمیشـە ترشی پانتـوثنیـك لەنـاو شانـەکـانی هەنـدێك زیندەوەری میکروسکوپی (واتە زیندەوەری زۆر ورد کە بە چاوی پەتی نابینـرێن. بەڵام لەژێـر زەرەبینـدا چاو دەیـان بینێت) کە دروست دەبێت. ئەوەی شیانی باسە ئەم زیندەوەرانەی خوارەوە ترشی پانتۆثنیك لەناو لەشیان دا دروست نابێت.

مریشك. جرج. بەراز. مەیمون. مشك. ڕیوی.

لەشی مرۆڤیش ئەم ڤیتـامینـە دروست ناکـات واتـە پێـویستە

لەگەڵ خواردەمەیندا وەری‌بگرێت.

پێویستی مرۆڤ بەم ڤیتامینە زۆرە چونکە بەشدار دەبێت لە پاریدەدانی ئەنزیمێکی یەگجار گرنگ بۆ ژیان کە پێی دەڵێن کۆ ئەنزیمی ـ A (Coenyme -A) وە بەکورتی پێی دەڵێن Co A .

لە خوارەوە فورمیلای (دەستووری)[10] کۆ ئەنزیم ـ A نەخش دەکەین

بڕوانە لە یاسای (فۆرمیولاکەی) سەرەوە کە ترشی بانتوثنیك پارچەیەکە لە «کۆ ـ A» . ئەم ئەنزیمە کە پێ دەڵێن Co - A پیشەی لەناو لەشدا ئەوەیە کە کۆمەڵەی ئەسیل Acyl کە برێتیە لە (R - e -) بگوازێتەوە لە گەردیکەوە بۆ گەردیکی‌تر، هەروەها پێویستە بۆ دروست کردنی ترشە ئورگانیکەکان کە ناومان نان بە ترشی چەوری Falty aeids دیسانەوە کۆ ئەنزیم ـ A پێویستە بۆ ئۆکسید بوونی ترشە چەورەکان لەناو شانەکاندا جگە لەمە گەلێك سوودی تریشی هەیە.

## کەم خواردنی ترێشی بانتوثنیك

هەر چەندە هێشتا زۆر باش روون نەبوتەوە بۆ زاناکان دەوری راستەقینەی ئەم ڤیتامینە چی‌یە لە گەشە پێدانی تەندروستی مرۆڤ، بەڵام ئەو تاقی‌کردنەوانەی کە بەسەر هەندێك زیندەوەردا کراون ئاشکرای کردوە کە ئەم ڤیتامینە پێویستە. بۆ وێنە تاقی‌کردنەوە لەسەر جرجا ئاشکرای کردوە کە ئەگەر هاتوو خواردنەکەیان ترشی پانتوثنیکی تێدا کەم بێت یاتیادا کەم بێت وەیا نەبێت ئەوا جرجەکان گەورە نابن باش و رەنگە رەشەکەی پێستیان کاڵ دەبێتەوەو بۆر هەڵ دەگەری ئەم جۆرە نەخۆشیە لە زانیاری تەندروستیدا پێی دەڵێن نەخۆشی «ئەکروموتریچیا» Achrotriehia . وادیارە گرنگی ئەم ماددەیە ئەوەیە کە بەشداری دەبێت لە دروست کردنی کۆ ئەنزیم ـ A وەکو لە سەرەوە باسمان کرد. ترشی پانتوثنیك لەم خواردەمەنیانەی خوارەوەدا هەیە: -

١ - هەویر ترش Yeast.

٢ - جەرگ.

٣ - هێلکە.

٤ - هەموو جۆرە گۆشتێك.

٥ - شیری تازە.

ئەوەی شایانی باسە مێوەو سەوزە زۆر کەم لەم ڤیتامینەی تیادا هەیە.



٢ ـ بایۆتین Biotin

بایۆتین یەکێکە لە پێکهاتوەکانی ڤیتامین ـ B کۆمپلێکس وە لە ساڵی ١٩٣٦ز دۆزراوەتــەوە. کۆگــەڵ Kogel وە هاوڕێیــەکی بە ناوی تونیس Tonnis ماددەیەکیان لە زەردێنــەی هێلکەدا دۆزیەوە کە زۆر پێویست بوو بۆ هەراش بوونی بەچکە جرج و مشك. لە ساڵی ١٩٤٠ز جیــورجی و دوڤیگنــود بە یەکــەوە Gyongy and Duvigmeaud ئاوێتــەیەکیان دۆزیەوە کە دەستووری کیمیایی خوارەوەی هەبوو، ناویشیان نا بایۆتین. Biotin




هەر وەکو گوتمان کاری بایۆتین بەسەر تەندروستی جرج و مشکدا تاقی کراوەتەوە. ئەو مشکانەی. کە خواردەمەنیان برێتی بوو لە سپێنەی هێلکە (سپێنەی هێلکە بایۆتینی تیادا نیە) هەموو تووکیان بەرداو هەمیشە جۆرە نەخۆشیەکیان تووش دەبوو لە ماسولکەکانیاندا. ئەم مشکانە نەیان دەتوانی بجوڵێنەوەوە نەخۆشیەکەیان پێی دەڵێن museucar Imcoordin atine واتە تێك چوونی ماسولکەکان.

بەڵام ئەم مشکانە کە زەردێنەی هێلکەیان. دەرخواردرا هەموو بوژانەوەو گەرانەوە دۆقی ئاسایی بێ گومان دەبێ ئەمە بەهۆی ماددەی بایۆنینەوە بێت کە لە زەردێنەی هێلکەدا زۆرە.

شایانی باسە ماددەی بایۆتین بە چەنیەتیەکی کەم لە ریخۆڵەی زیندەوەردا دروست دەبێت ئەویش بە هۆی جۆرە بەکتریایەکی Bacteria ، [١١] تایبەتی کە لەناو رێخوڵەدا دەژین و بایۆتین دروست دەکەن. بەڵام کەم خواردنی بایۆتین لە لایەن مریشك و مراویو قازو مەیمون و مانگا دەبێتە هۆی تێك چوونی تەندروستیان.

بایۆتین هەر وەکو گوتمان لە زەردێنەی هێلکەدا هەیە بەڵام لە سپێنەکەیدا نیە. بۆ زاناکان ئاشکرا بوە سپێنەی هێلکە کە دەچێتە ناوریخوڵەوە ئەو بەکتریانە دەکوژێت. کە بایۆتین دروست دەکەن. لەم دوایەدا پارسۆن P - arson گوتی کە سپێنەی هێلکە بایۆتین دەفەوتێنێت لە ریخوڵەدا نەك بە هۆی کوشتنی ئەو بەکتریانەی کە دروستی دەکەن بەڵکو بایۆتین دەفەوتێنێت بە کارلێك کردنی لەگەڵیا، واتە لەگەڵ بایۆتین پێکهێنانی ماددەیەکی گەرد گەورە بە جۆرێك کە ناتوانرێت ئیتر هەڵ بمژرێت و بگوازرێتەوە بۆ ناو خوێن. شایانی باسە بایۆتین لە شانەکانی مرۆڤدا دروست دەبێت واتە زیادە خواردنی ئەم مادەیە هیچ سوودیکی وای نیە چونکە فرێ دەدرێتە دەرەوەی لەش لەگەڵ میزو پیساییدا.

بایۆتین بە زۆری لە جەرگی وولاغدا هەیە، هەروەها لەناو



هەویرترش و فستق عەبیدو کاکاوو هێلکەدا هەیە. ڕۆژی (١٠) میللغرام واتـە (٠٠٠٠١،٥) گرام لە بایـۆتین پێـویستـە بۆ هەموو مرۆڤێك بیخوات بۆ تەندروستیەکی ڕێکوپێك.

### ٣ ـ ترشی فۆلیك Folie Aciel

ئەم ماددەیـەش بەشێکی تری ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکسـە، زۆر پێویستە بۆ تەندروستی مرۆڤ و لە سپێناغا بە تایبەتی زۆرە. لە ساڵی ١٩٤٥ز دەستـووری کیمیـایی ئەم ڤیتـامینـە دۆزرایەوەو لە خوارەوە دەینووسین: ـ

کەم بوونی ترشی فۆلیك لە لەشی مرۆڤدا دەبێتە هۆی تووش بوونی ئەو کەسـانـە بە نەخـۆشی کەم خوێنی واتـە بە نەخـۆشی ئەنیمیا Leukop enia ئەم نەخۆشیە برێتیە لە کەم بونی ژمارەی خرۆلە[١٢] سپێکانی ناو خوێن. ئەمەیش بێ‌گومان زۆر زەرەری هەیـە بۆ تەنـدروستی چونکـە لەش لاوازو بێ هێـز دەکـات، بەرامبـەر بە بەربـەستی هێـرشی میکـرۆبـەکـانی نەخـۆشی کەم دەبێت بۆیـە نەخـواردنی یا کەم خواردنی ترشی فۆلیـك لەوانەیە ببێتـە هۆی نەخـۆش کەوتنی ئەو کەسـە. ئەمـە ئەگـەر هاتوو ئەو کەسـە تەمـەنی لە ٢٥ ساڵ زیـادتـر بوو، بەڵام ئەگـەر هاتـو ئەو کەسە منداڵ بوو ئەوا کەم خواردنی ئەم ڤیتامینە زەرەرێکی کەیش دەبـەخشێت ئەویش هەراش نەبـوونی ئەو منـداڵـەیـە واتە گەورە نابێت وەکو منداڵی ئاسایی.

شایـانی باسـە مرۆڤ ترشی فۆلیـك دروست دەکـات لەنـاو ریخۆڵەدا بەکتریایەکی تایبەتی دەژێت لەناو ریخۆڵەی ئادەمیزاداو دەتوانێ ئەم ڤیتامینە ئامادە بکات. کەوا بوو کەم خواردنی ئەم ڤیتـامینـە زیـانی نیـە بۆ تەنـدروستی بە مەرجێك ئەو بەکتریایانە چالاك بن لە ریخولەدا.

### ٤ ـ ترشی نایکۆتینیك Nicotinie Acid :

ئەم ڤیتـامینـە کە بەشێکـە لە ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکس ناوێکی تری هەیەو پێی دەڵێن «نایەسێن» Niecin کەم بوونی ئەم ڤیتامینە لەناو خواردەمەنی مرۆڤدا دەبێتە هۆی تووش بوون بە نەخۆشی «پلاجرا» Pellagra نەخۆشی پلاجرا لە ساڵی ١٧٣٥ەوە ناسراوە. نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە ئەمانەن: ـ

١ ـ پێستی مرۆڤ دەقەڵەشێت وە ربر دەبێت.

٢ ـ بیـــرو هۆش و لێـك دانـەوەی ئەو کەسـە لاواز دەبێت واتـە مێشك و دەمارەکانی کۆئەندامی هەست، باش کارناکەون.

٣ ـ سکی نەخۆش دەچێت و تووشی جۆرە زەحیریەك دەبێت.

لە نێوان ساڵانی ١٩١٠ ـ ١٩٣٥ لە ئەمەریکا ١٧٠،٠٠٠ کەس تووشی نەخۆشی پلاجرا بوون بەبێ ئەوەی کەس بزانێت هۆی نەخۆشیەکەیان چیە. هەتا زانایەکی بە ناوبانگ بە ناوی جوزیف گولـدبـەرگـەر Goseph Goldberger هات و ئاشکرای کرد کە نەخۆشی پلاجرا لە ئەنجامی کەم خواردنی جۆرە ڤیتامینێك لە خواردەمـەنیـدا تووشی مرۆڤ دەبێت هەر چەنـدە پێکهـاتـوی ڤیتامینەکەی نەزانی.

لە ساڵی (١٩٣٧ز) ئێلڤیهجەم Elve hjem هوولڵی Woolley بۆیان روون بووەوە کە ترشی نایکوتینیك Nicotinic acid برێتیە لە «ڤیتـامینـەی باسمـان کـرد. لە بازاری بازرگـانی ئەم ماددەیـە پێی دەڵێن «نایەسین»

سرنجی خوێنەرانی بەرێز رادەکێشین بۆ ئەوەی کە ئەم ماددەیە لەگـەڵ نیکـۆتین ی ناو جگـەرەدا جیـان و یەك نین. ماددەی نیکـۆتین Nicotin کە لە توتنـدا هەیـەو زیـانێکی زۆر دەبـەخشێتـە تەندروستی فۆرمیولای کیمیایی جیایەو هیچ پەیوەندیەك نی‌یە نێـوان نیکـۆتین و[١٣] ماددەی ترشی نایکـۆتینیـك (ڤیتـامینی نایەسین)) هەر چەندە ناوەکانیان نزیکن لە یەکەوە.

لەم دواییـەدا زانـرا کە نەخـۆشی «پـلاجـرا» بە تەنهـا هۆی کەمیـەتی ترشی نایکـۆتینیـك (نایەسین) نی‌یە. بەڵکو هۆی ئەم نەخـۆشیـە برێتیـە لە کەمیـەتی هەمـوو کۆمـەڵـەی ڤیتـامین ـ B کۆمپلێکس بە شێوەیەکی گشتی. لە لایەکی ترەوە لێکۆڵینەوەی

تایبەتی ئاشکرای کردوە کە کەمیەتی پرۆتین لەناو لەشی مرۆڤدا هەمیشە کاری هەیە بەسەر تووش بوونی ئەو کەسە بە نەخۆشی «پلاجرا».

نەخۆشی پلاجرا زۆربەی جار تووشی نەزیفی[١٤] ریخۆڵە دەبێت و بەم هۆیەوە پیسی نەخۆشەکە خوێناوی دەبێت.[١٥]

بێ گومان کە نەخۆشی پلاجرا تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە خواردەمەنی تەندروستانە ناخۆن. بۆ وێنە منداڵی مەکسیك لە ساڵەکانی رابووردودا توشی پلاجرات دەبوون چونکە خواردنیان تەنها گەنمە شامی بووەو، هیچی تر.

ماددەی ترشی نایکۆتینیك لە گەڵێك خواردەمەنی رووەکیو گیانەوەریدا. هەیە. بە تایبەتی لە گۆشت بە هەموو جۆرەکانیو لە جەرگ دا هەیە. ئەم ڤیتامینە هەمیشە بە شێوەیەکی کەم تر لە هێلکەو شیردا هەیە بەڵام لەگەڵ ئەویشا خواردنی هێلکەو شیر بە شێوەیەکی بەردەوام مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە مەترسی نەخۆشی پلاجرا. ئەوەی راستی بێت هێلکەو شیر ماددەیەکی تیادا هەیە بە ناوی تریپتۆفان[١٦]، Tryptophan وە دەتوانێت جێگای ترشی نایکۆتینك بگرێت لەناو لەشدا.

شایانی باسە ترشی نایکۆتینیك (نایەسین) لە گەنمدا هەیە بەڵام بەداخەوە مرۆڤی ئەمرۆکە سوودی لێ وەرناگرێت چونکە ڤیتامینەکە لە ناو تویکڵی گەنمەکەدا هەیە واتە لە ناو کەپەکی ئاردی گەنمەکەدایە. کە ئارد دەبێژنەوە، یا لە هێلەکی دەدەن کەپەکەکەی فرێ دەدەن بۆ ئەوەی نانەکە سپیو جوان بێت. بەم جۆرە ڤیتامینەکانی ناو کەپەکەکەمان لە کیس دەچێت و سوودی لێ وەرناگرین. خەڵکی ئارەزویان لە نانی بۆر نییەو حەز بە نانی سپی دەکەن. بەداخەوە نازانن کە چەنێ نانە بۆرەکە بەسوودترە لە نانە سپیکە بۆ تەندروستی. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە ئۆردوگای[١٧] سوپاو سەربازەکان نانەکەیان (سەمون) نەبێژراوەتەوەو رەنگی سەمونەکەیان بۆرە. مەبەست لەمە ئەوەیە ڤیتامینەکانی ناو کەپەکی ئاردەکە سوودی لێ وەربگرن.

لە وڵاتە پێش کەوتوەکان ئەم مەسەلەیەیان بە جۆرێکیتر چارەسەر کردوە. لەو وڵاتانە وەك ئەمەریکا ئاردی گەنم لە شوێنی خۆی هەندێك ڤیتامینی «نایەسین ی» تێکەڵ دەکەن پێش ئەوەی بیکەنە ناو گونیەو بۆ بازار بروا. بەم جۆرە سوودی کەپەکەکەی دوو بارە دەگەرێتەوە بۆ گەنمەکە.

**٥ - رایبۆفلێڤین Riboflavin (ڤیتامین B2)**

بەشێکی تری ڤیتامین - B کۆمپلێکسەو هەندێك جار پێی دەڵێن ڤیتامین B2. لەشانەکانی رووەك و بەکتریاو لەناو هەویر ترشدا دروست دەبێت. شایانی باسە شانەکانی لەشی مرۆڤ ناتوانێت ئەم ڤیتامینە بۆ خۆی دروست بکات. بۆیە پێویستە هەندێك لەم ڤیتامینە لەناو خواردەمەنیدا ببێت. ئەم ڤیتامینە بە تایبەتی پێویستە. بۆ منداڵ بۆ ئەوەی یاریدەی بدات کە هەراش و گەورە بێت. بە پێچەوانە کەم بوونی ئەم ڤیتامینە لەناو خواردەمەنی منداڵ دەبێتە هۆی ئەوەی هەراش بوونیان دوا بخات. هەمیشە رایبۆفلێڤین پێویستە بۆ گەورە بوونی رووەك و هەراش بوونیان.

لەم خواردەمەنیانەی خوارەوەدا ڤیتامین - B2 زۆرە: -

١ - جەرگ

٢ - هەویر ترش yeast

٣ - لە گەنمدا هەیە واتە لەناو نان و سەمون و بەرهەمەکانی گەنم.

٤ - هێلکە.

٥ - شیر.

٦ - سەوزەی تەر.

رایبۆفلێڤین لە شێوەی حەپ و کەپسول دەفرۆشرێت لە دەرمانخانەکان. لە کارگەی دەرمان سازی دروستی دەکەن و پوختە دەکرێت لە جۆرێکی کەرووی[١٨] سەوز کە بە خێوی دەکەن، وە ڤیتامینەکەی لێ پوختە دەکەن چونکە کەروە سەوزەکە رایبۆفلێڤین دروست دەکات.

شایانی باسە کەم خواردنی ڤیتامین - B2 نابێ بە هۆی تووش بوون بە نەخۆشیەکی تایبەتی وەکو «پلاجرا» بۆ وێنە، بەڵام بۆ زاناکان ئاشکرا بوە کە ئەم ڤیتامینە زۆر پێویستە بۆ هەراش بوونی منداڵ و بەچکەی زیندەوەرەکان. لە لایەکی ترەوە ئاشکرا بوە کە ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی «پلاجرا» وەیا نەخۆشی «بەری

بەری، دەبن هەمیشە رایبۆفلیڤین لە لەشیاندا کەمە بەلآم بە تەنها کەم بوونی رایبۆفلیڤین نابێ بە بەڵگەی ئەو نەخۆشیانە.

پێکهاتوی ئەم ڤیتامینە لە لایەن کۆهن Kuhn دۆزراوەتەوە. لە پاشان کۆهن لەگەڵ رەفیقێکی کە ناوی کارەر Karrer بوو توانیان ماددەکە ئامادە بکەن لە لاپۆردا. لەپاشان بۆ ژمارەیەك لە زاناکان روون بووەوە کە رایبۆفلیڤین بە شێوەیەکی پەتی لە خواردەمەنیدا نی‌یە. ئەوەی لە خواردەمەنیدا دۆزرایەوە چەن ئاوێتەیەك بوون نزیك بە فورمیولای رایبۆفلیڤین لە خوارەوە دەستووری فورمیولای رایبـــۆفـلیڤین دەنـــووسین لەگــەڵ دوو ماددەی تری نزیـــك بە رایبۆفلیڤین : -



## ٦ - ثایەمین (سایەمین) Thiomine

سایەمین بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی پەتی ئامادەکرا لە لایەن زانای هۆڵەندی جەنسن Jansen ، لە هەمان کاتا ئەم ماددەیە ئامـادەکـرا لە لایـەن زانـای ئەڵـەمـان «ر ـ ر ـ ویلیـامـز»و هاوڕێکـانی‌یـەوە. ئەم زانـایـانـە توانیـان ڤیتـامینی سایەمین لە کەپەکی برنج پوختەو پەتی بگرنەوە.

گەلێـك کەس بەشـدار بوون لە دۆزینـەوەی پێکهـاتـوی ئەم ڤیتـامینـە وەکـو ویـنـداوس Windaus کلارك Clark گورین Gurin وە ویلیـامـز Willeams هاوڕێکـانیـان دەستوری کیمیایی خوارەوەیان دۆزیەوە بۆ سایەمین: -

دەکرێت بۆ ئەوەی بزانین چەندێك لە ڤیتامین سایەمین[١٩] هەیە لەناو خواردەمەنیەکاندا.

ڤیتامینی سایەمین زۆر خۆگرە[٢٠] Stable لەناو شلاوی ترشدا ناگـۆڕێـت و تێـك ناچـێـت، بەڵام لەنـاو شلاوی گەرمی (ئەلکـەلیـدا) قولـەویـدا[٢١] (تفتی) خۆی ڕاگیـر ناکـات و تێك دەچێت. تێك چوونی پێکهاتوی ڤیتامینەکە بێ سوودی دەکات و بەڵکـو دەبێتـە ماددەیـەکی ژیـان بەخش بۆ ژیـان. هەمـوو زینـدەوەرێـك جگـە لەوانـەی «کـاوێـژکـەرن»[٢٢] پێـویستیان بە خواردنی «سـایـەمین» هەیـە چونکـە ئەو زینـدەورانە ناتوانن ئەم ڤیتامینە دروست بکەن لەناو شانەکانی لەشیاندا.

کەم بوونی وەیـا نەبـوونی ئەم ڤیتـامینـە واتـە سایەمین دەبێتە




ئەم کارلێکە کیمیاییەی سایەمین کە لە سەرەوە نووسراوە زۆر بە سوودە بۆ شی‌کردنەوەی سایەمین. ڕەنگی سایۆکرۆم شینە واتە بە گوێـرەی ڕادەی شینێتی سەرەوە دەتـوانین بزانین چەنـدێـك (سـایـەمین)مـان هەیـە. ئەم جۆرە تاقی‌کـردنـەوەیـە لە لابـۆردا

هۆی تووش بوونی مرۆڤ بە نەخۆشی «بەری بەری» Beriberi

نەخۆشی «بەری بەری» لە مێژەوە ناسراوە لە لایەن مرۆڤەوەوە بەتـایبـەتی لەو وڵاتـانـەی کە گەلـەکـانیان لەسەر خواردنی برنج بەرادەی یەکـەم دەژین. نیشـانـەکـانی نەخۆشی بەری بەری

ئەمانەی خوارەوەن: ـ

١ ـ ئارەزوونەکردن لە خواردن واتە بێ ئیشتهایی.

٢ ـ بێ هێزی.

٣ ـ کەم خەوی.

٤ ـ زوو توورە بوون و توورە بوون بەبێ هۆ، واتە نەخۆش «عەصەبی» دەبێت.

٥ ـ دڵ لێدانێکی خێراو تەنگە نەفەسی.

٦ ـ هەندێك جار نەخۆشی لە هوشی خۆی دەچێت و بێ هۆش دەبێت.

٧ ـ قاچ و دەستی نەخۆش هەندێك جار دەپەنمێت[٢٣]

٨ ـ ماسولکەکانی نەخۆش دەئێشێن.

ئەوەی شایانی باسە نەخۆشیی بەری‌بەری دوو جۆری هەیە: ـ

١ ـ بەری بەری تەڕ.

٢ ـ «بەری‌بەری» وشك.

هەر پزیشك دەزانێ ئەم دوو جۆرە نەخۆشیە لەیەك جیا بکاتەوە.

پاش ئەوەی زانیمان کە سایەمین چۆن دۆزرایەوەو پێکهاتوی چیەو چ نەخۆشیەك تووشی مرۆڤ دەبێت لە ئەنجامی کەم خواردنی، یا نەبوونی ئەم ڤیتامینە لە لەشدا، ئەمجار پرسیار دەکەین ئایا ئەم ڤیتامینە لەناو چ جۆرە خواردەمەنیەك زۆرەو لەناو کام خواردەمەنیەك نی یە؟ وەیا کەمە.

ئەم ڤیتامینە بە ڕێژەیەکی بەرز لە توێکڵی گەنم و جۆو برنج دا هەیە، واتە لە کەپەکی ئاردە برنجدا زۆرە. کەچی خەڵکی سودی لێ وەرناگرێت چونکە هەروەکو گوتمان ئارد دەبێژنەوە پێش ئەوەی بیکەن بە نان وە کەپەکەکەی فڕێ ئەدەن. هەمیشە کەپەکی برنجیش فڕێ دەدرێت بێ‌گومان. هەر وەکو لە ولاتە پێش کەوتوەکاندا کردوویانە بە عادەت ئیمەش دەتوانین هەندێك لەم ڤیتامینە گرنگە لەگەڵ ئاردا تێکەڵ بکەین پێش ئەوەی بفرۆشرێتە نانەواکان وە خەڵکەکە. بەم جۆرە ماددەی سایەمین دەگەڕێنینەوە ناو ئاردەکە.

گۆشت بەهەموو جۆرەکانی واتە گۆشتی وولاغ ۆ ماسی و پەلەور[٢٤] هەموو لەشێك لە سایەمینیان تێ‌دا هەیە. هەر وەها شیری تازەیش کەمێك لەم ڤیتامینەی تێ‌دا هەیە.

**٧ ـ پیریدۆکسین (ڤیتامین Pyridoxine (B6 :**

لەساڵی ١٩٣٨ز ئەم ڤیتامینە دۆزاوەوەو لە هەویر ترش پوختە کراوە بەشێکی گرنگی ڤیتامین ـ B کۆمپلێکسە. شایانی باسە دوو ئاوێتە هەن کە زۆر پێکهاتوویان لە پێکهاتوی پیریدۆکسین دەچێت وە هەمشە سوودیان بۆ تەندروستی هەر وەکوو سوودی پیریدۆکسین وایە. لە خوارەوە دەستووری کیمیایی پیریدۆکسین لەگەڵ ئەو دوو ئاوێتەی کە لە سەرەوە باسمان کردن دەنووسین:



ئەم سێ ئاوێتانەی سەرەوە بە یەکەوە پێیان دەڵێن ڤیتامین B6 - لە راستیدا ماددەکانی سەرەوە هیچیان کاری ڤیتامین ناتوانین بێنن بە تەنها. دەبێ هەر سێکیان بەیەکەوە بن بۆ ئەوەی کاری ڤیتامین B6 ببەخشن.

کەم خواردنی ڤیتامین B6 لەگەڵ خواردەمەنیدا نابێتە هۆی تووش بوون بە نەخۆشیەکی تایبەتی وەکو ڤیتامینەکانی تر. بەڵام کەم خواردنی ئەم ڤیتامینە چەن نیشانەیەکی هەیە وەکو: -

١ - کەم خوێنی.

٢ - زوو توورە بوون (عەصەبی).

٣ - سوور هەڵگەڕانی پێستی دەست و قاچ و برژانەوەی پەنجەکان.

٤ - لە منداڵا هەندێك جار کەم بوونی ڤیتامین B6 دەبێتە هۆی هەراش نەبوونی و درەنگ بالغ بوونی.

٥ - هەندێك جار مرۆڤی نەخۆش بە کەمیەتی ڤیتامین B6 لە لەشیا دڵی هەڵ ئەشێوێت و دەرشێتەوەو ئارەزوی خواردەمەنی ناکات.

٦ - هەندێك جار قورگ و چاوی نەخۆش دەسوتێتەوە.[٢٥]

تا ئیستا ئاشکرا نەبوە کە ئایا چەندێك لە ڤیتامین B6 پێویستە بۆ مرۆڤ بیخوات هەموو رۆژێك. هەندێك لە زاناکان و پسپۆرەکانی خواردەمەنی لەو بڕوایەدان کە پیریدۆکسین لە لەشی مرۆڤدا دروست دەبێت بە گوێرەی ئەوە کە گەلێك جار ماددەی ترشی (٤ - پیریدۆکسین (4 - Pyridoxine Aeid) لەناو میزی مرۆڤدا دۆزراوەتەوە. شیانی باسە ئەم ماددەی کە لە دوایدا باس کرا لە پیریدۆکسین پەیدا دەبێت لەناو شانەکاندا. ئەگەر هاتوو چەنیەتی ترشی (٤ - پیریدۆکسیك) لەناو میزدا زیادتر بوو لە چەنیەتی ڤیتامین B6 کە ئەو مرۆڤە دەیخوات، ئەوە ئەمە دەگەیەنێت کە هەندێك لە ڤیتامین B6 لەناو لەشدا دەبێ دروست بێت. ئەوە بوو لەمەودوا دۆزرایەوە کە جۆرەبەکتریایەك لەناو ریخۆڵەدا دەژێت و دەتوانێ پیریدوکسین دروست بکات. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەم مەسەلەیە هێشتا بە تەواوی روون نەبۆتەوە.

ڤیتامین B6 لەناو دانەوێڵەدا زۆرە بە تایبەتی لەناو چەکەرەی تۆودا[٢٧] وەکو گەنم و جۆو گەنمەشامی. بەشێکی زۆریش لەم ڤیتامینە لەناو هێلکەو گۆشت و جەرگ و گورچیلەدا هەیە.

٨ - کۆبەڵ ئەمین (ڤیتامین B12 Cobalam ine :

لە ساڵی ١٩٤٨ز. بۆ یەکەم جار ڤیتامین B12 پوختە کراو بە شێوەیەکی پەتی و بللوری خەست کرا لەلایەن دوو جون (تیپی)[٢٨] جیاواز لە زانایانی کیمیای بە ناوبانگ جونێکیان (تیپێکیان) لە ئینگلترە بوون بە سەرۆکایەتی ئی. لیستەر سمیث E. Lester smith جونەکەی (تیپەکەی) تری لە ئەمەریکا بوون بە سەرۆکایەتی ریکس Riekes. هەردوو جون (تیپ) لە ڤیتامین B12 دەکۆڵانەوە بەبێ ئەوەی هیچیان ئاگاداری لەوی تریان بێت. هەر لایەکی لەم دوو جونە ڤیتامین B12 یان خۆشەو خەست کرد لە جۆرە بەکتریایەك. فۆرمیولای دەستوری کیمیایی ئەم ڤیتامینە زۆر ئاڵۆزاوییە، بەڵام دۆزراوەتەوەو بەم شێوەی خوارەوەیە: -

ئەم ڤیتامینە وەکو دەبینیت لە فۆرمیولاکەیدا توخمی کۆباڵت ی تیادا هەیە. شایانی باسە لەشی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرەکان توانای دروست کردنی ئەم ڤیتامینەیان نی یە. تەنها یەك جۆر بەکتریای تایبەتی هەیە کە لەناو خۆڵدا دەژی و توانای دروست کردنی ڤیتامین B12 ی هەیە. واتە ڤیتامین B12 ئامادە دەکرێت لە لایەن کومپانیەکانی دەرمان سازیەوە بە هۆی بە خیوکردنی و زۆر کردنی ئەم جۆرە بەکتریایە.

(کۆتایی بەشی یەکەم)



فيتامين $B_{12}$

پەراوێزو فەرهەنگۆك : -

١ - خۆراك = ئەوەی دەخورێت.
= خواردنێکی تایبەت = راشن Rashin
٢ - ئەسکەرپووت = أسقربوط: لە مێژەوە ئەم نەخۆشیە ناسراوە.

پێش ئەوەی ڤیتامینەکان بدۆزرێنەوە نەخۆشی ئەسکەربووت توشی ئەو جۆرە کەسانە دەبوو کە میوەو سەوزیان نەدەخوارد، وەکو ئەو کەشتیوانانەی کە وێڵ بوون بەدوای ژیانیانا بۆ ماوەیەکی زۆر بەناو دەریاداو لە خواردنی میوەو سەوزی دەبران. هەتا ماوەیەك ناوی نەخۆشیەکەیان نا بە «نەخۆشی کەشتیوان» چونکە بە زۆری تووشی ئەوان دەبوو. هۆی ئەم نەخۆشیەش بریتیە لە کەم خواردنی ڤیتامین - C. لە لاپەرەکانی ئایندەدا باسی ئەم ڤیتامینە بەدرێژی دەکەین. نیشانەکانی ئەسکەرپووت ئەمانەیە: -

١ - هەست کردن بە لاوازی گشتی، وە رەنگ پروکان.

٢ - هەست بە ئازار لە جومگەو هەردوو لاقدا دەکرێت.

٣ - سووتاندنەوەو ئاوسانی پووك، وە هەوکردنی ددانەکان.

٤ - کەم ئارەزوکردنی خواردن و کێش کەم بوونەوە.
بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشیە پێویستە مرۆڤ بە بەردەوام ڤیتامین - C بخوات.

٣ - ئێسکەنەرمە: الکساح - بەتایبەتی توشی منداڵ دەبێت بە هۆی کەم بوونی ڤیتامین - D لە لەشیاندا. ئێسکەکانیان رەق نابن و گەلێك جار دەبێتە هۆی ئیفلیجی ئەو منداڵە. خۆدان بەبەر هەتاو تیمارێکی زۆر بەکارە بۆ ئەم نەخۆشیە. تکایە سەیری باسی ڤیتامین - D بکە لە لاپەرەکانی ئایندەدا.

٤ - ڤیتامین Vitamin: ئەم ناوە لە ساڵی (١٩١٢ز)دا دانرا لە لایەن کاسیمیر فەنك Casimir Funk وە بە واتای «پێویست بۆ ژیان» دارێژراوە.

٥ - تیۆروانی = نظرية Theory

٦ - بەریبەری = نەخۆشیەکی تایبەتیە بە کەمیەتی ڤیتامین - B دا باسی دەکەین لەمەودوا.

٧ - سەرچاوەی سروشتی = مصدر طبيعي.

٨ - کۆ ئەنزیم Coenzyme: دەتوانین بە کوردی ناوی بنێین «هاوئەنزیم» چونکە ئەم ماددانە هاورێی ئەنزیمە، بەبێ بوونی ئەنزیم کاری خۆی جێبەجێ ناکات.

٩ - کارلێك = تفاعل، کارلێکی‌کیمیایی = تفاعل کیمیائي.

١٠ - فۆرمیولا = دەستوور = یاسای کیمیایی = القانون الکیمیائی أو الصیغة الکیمیائیة.

١١ - بەکتریا: Bacteria گیان لەبەرێکی میکروسکۆبیە واتە تەنها بە زەرەبین دەبینرێت. جۆرو چەشنی بەکتریا زۆرن هەندێکیان سوود بەخشن بە مرۆڤ. وە هەندێکیان زەرەرو هۆی نەخۆشین. ئەو بەکتریایانەی کە مرۆڤ نەخۆش دەخەن پێیان دەڵێن میکرۆب Microbes

١٢ ـ خرۆڵە سپیەکان: کریات الدم البیضاء. خرولەکانی خوێن دوو جۆرن: ـ

أ ـ خرۆڵە سوورەکان Red Cell

ب ـ خرۆڵە سپیەکان Wite Cell

خرۆڵـە سوورەکـان ئاسنیـان تیـادا هەیـەو ئۆکسجین دەگـوازێتـەوە لە سیـەکـانـەوە بۆ ناوشانەکان کەچی خرۆڵە سپیەکان میکروبەکانی نەخۆشی دەکوژن.

١٣ ـ نیکۆتین، Nicotin : ئەم ماددەیە لەناو توتن دا هەیە

١٤ ـ نەزیف: نزیف: خوێن بەربوون.

١٥ . هەنـدێـك جار پیسـایی نەخـۆش رەش دادەگیرسێت چونکە خوێنەکەی ناوی کۆن دەبێت.

١٦ ـ تریپتۆفان: یەکێکە لە ترشە ئەمینیەکانی لەشی مرۆڤ.

١٧ ـ ئوردوکا = معسکر.

١٨ ـ کەرووی سەوز = Mold = طحالب.

١٩ ـ سایەمین = Thiamine

٢٠ ـ خوگر = ثابت، بە ئاسانی پێکهاتوی تێك ناچێت

٢١ ـ قلوی = واتە زۆر تفت وەکو NaoH وە KOH

٢٢ ـ کاوێژگەر = مجتر.

٢٣ ـ دەپەنمیت = ئەستوور دەبیت = یتتفخ، یورم

٢٤ ـ پەلەوەر = طیر (طیور).

٢٥ ـ دەسوتێتەوە = یلتهب.

٢٦ ـ دانەوێلە = حبوب.

٢٧ ـ توو = بدور.

٢٨ ـ جون = مجموعة.

تکایە، ئەوانەی باس و وتارمان بۆ دەنێرن، پەیرەوی ئەم دوو خاڵە بکەن: ـ

١ ـ باسـەکـە بەخـەتێکی خۆش بنـووسن و دابـڕکردنی (تقطیع) وشەکان بۆ ئێمە بەجێ بهێڵن.

٢ ـ باسەکە بە ڕێنووسی تازەی کۆڕ بنووسن.

# الڤيتامينات

بقلم : الدكتور ذنون پير يادي

كلية العلوم ـ جامعة بغداد

يتناول البحث الفيتامينات بشكل مفصل ولاسيما تركيباتها الكيمياوية وعلاقة كل ڤيتامين بالصحة، كما يتناول المواد الغذائية الغنية بالڤيتامينات والامراض التي تصيب جسم الانسان من جراء قلة الڤيتامينات.

في البداية يفرد الباحث مقدمة لدراسته ويلقي الضوء على اكتشاف الڤيتامينات حيث ان العالم البايولوجي ماجندلي اول من اجرى تجربة على مجموعة من الحيوانات في مختبره الخاص واكتشف بان بعض المواد الغذائية تفتقر الى عوامل منشطة لصحة الانسان وتقويتها، ومن بعد هذا العالم جاء ليونين فاعاد تجارب ماجندلي السابقة وهو ايضا لم يستطع ان يكتشف الاسباب الى ان جاء بكلهارنيك واجرى تجربة جديدة واستخدم في تربية صغار الفأر مواد خاصة فلم يحصل على نتيجة مرضية فاضطر ان يعطيها الحليب الطازج فوجد ان صحتها قد تحسنت لذا اكتشف ان في الحليب مادة تؤدي الى تحسين وتطوير صحة الفئران.

كما ان هوبكنز وضح بان هناك عدة امراض تصيب البعض وانها ناتجة عن قلة تناول بعض الاطعمة، وقد ظهر اسم ڤيتامين منذ ذلك الوقت.

وقد قرر العلماء تسمية المادة التي تؤدي الى نمو الجسم وتقوية الجسم وتحسين صحة الانسان بالڤيتامين Vitamin وهذه المادة موجودة في الحليب.

بعد ذلك ينتقل الباحث الى نظرية الڤيتامينات التي تعتبر مادة مفيدة وضرورية لجسم الانسان، فاذا لم يتناولها الانسان او يقلل منها فيصاب ببعض الامراض الخاصة كمرض اسقربوط والكساح. ثم يشرح لنا كلمة ڤيتامين التي تتكون من مقطعين Vit بمعنى الضروري وامين amine التي تتكون من نوع عضوي حيث ان جميعها فيها المجموعة الامينية ( NH2 ).

ثمة نوعان من الڤيتامينات :

١ ـ الڤيتامينات التي تذوب في الماء

٢ ـ الڤيتامينات التي لا تذوب في الماء ولكنها تذوب في الدهون

وعلى المرء تناول الڤيتامينات كل يوم لانه لا يمكن الاحتفاظ بتلك الڤيتامينات في الجسم بل انها تفرز اوتطرح خارج مع البول والغائط، وتحتفظ بالڤيتامينات التي تذوب في الدهون في جسم الانسان لمدة من الزمن، ويذكر الباحث اسماء الڤيتامينات التي تذوب في الماء والتي تذوب في الدهون ثم يتطرق الى مجموعة ڤيتامين B وتركيباتها، ويمكن الحصول عليها في الصيدليات على شكل حبوب او كبسولات، ولا يجوز شراء الادوية والڤيتامينات دون استشارة طبية لانها تلحق الضرر بالمرء كون هذه الڤيتامينات تساعد الانزيمات، لان الانزيمات لا تستطيع ان تتفاعل دون مساعدة ڤيتامينات خاصة. كما ان هذا الڤيتامين B كومپليكس يتكون من ثماني مركبات وهي :

حامض پانتوثنيك، حامض نايكوتنيك، زايبوفليڤن، ثايمين، بايونين، حامض فوليك، كوبل أڤين، والى جانب هذه الڤيتامينات يتحدث الباحث عن مادة اخرى تسمى (كولين) والتي لا تعتبر ڤيتامين بقدر ما هي موجودة مع ڤيتامين B كومپليكس لانها غير موجودة في الخلايا بشكل مساعد للانزيم، واضافة الى هذه المادة يتناول الدكتور ذنون مادة اخرى تسمى ئينوسيتول، ولا ننسى بان مصدر غناء ڤيتامين B هو الخميرة ثم الكبد ودقيق الحنطة والشعير.

يتطرق الباحث الى كل ڤيتامين ومادة بشكل مفصل ويبحث عن مكوناتها وفوائدها والمواد التي تكون غنية بها. وفي ختام بحثه يشرح المصطلحات العلمية التي استخدمها في سياق بحثه، ولا ننسى بانه عزز دراسته ببعض الصور التخطيطية ليقف القارىء بنفسه على ڤيتامين B-2 مثلا لانه من الڤيتامينات المعقدة جداً ولكنه اكتشف من قبل فريقين مختلفين من علماء الكيمياء.

# ئاڵوگۆڕی تەکنۆلۆژی

ئەنوەر قەرەداغی- بەغدا

ئاشکرایە کە زۆر لە خوێندەوارە بەڕێزەکانی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» خوشەویست زۆر شتیان بیستووەو خوێندوتەوە لە بارەی گواستنەوەی تکنولۆجیەوە ئەم باسەش کورتە هەوڵێکە بۆ ڕونکردنەوەو کۆکردنەوەی هەندێ لەو بیروڕایانەی بلاوکراونەتەوە لە سەری.

**بەشی یەکەم: -**

مەبەست لە وشەی تکنۆلۆژی بریتیە لە زانینی کردن و پێك هێنانی گشت ئەو کارانەی پەیوەندیان هەیە بە چالاکی ئابووریەوە، ئەمەش تەنها دورست کردن و گۆڕینی بەرهەم ناگەیەنیت.

بەڵکو بەکارهێنانی هەموو زانست و زانیاریو پێشکەوتنێکی دەست کەوتو ئەگرێتەوە بۆ ئامادەکردن و دورستکردن و پێشکەش کردنی ئامێرو بەرهەم و چالاکی ئابوری واتە گشت خزمەتەکانیشی ئەگرێتەوە گواستنەوەی تکنۆلۆژی بەوە ئەوترێت کە زانینیبەرهەمە پیشەسازییەکان یا (پروسیسە) کانیان یان ڕیبازەکانی خستنە بەرهەمیان بگوێزیتەوە لەو شوێنەوە تیا دەرکەوت وە نەشونمایکردوە بۆ شوین و جیگایەکی دیکە ئەمەش لەوانەیە لەولاتیکەوە بۆ ولاتیکیتر بێت یان لە شوێن و بەشیکی ولاتیکەوە بیت بۆ شوێن و بەشیکی دیکەی هەمان ولاتو مەبەستی تایبەتی ئەم باسەش ئەو گواستنەوەیە کە لە ناوەند ئەو ولاتانەدا رو ئەدات کە جیاوازی پلەی پێشکەوتنی پیشەسازیو ئابوریان تیدا هەیە.

زانای ئیتالی (جیوڤانی پیتەر لونگو) [٣] چەند بلاوگە (CHANNEL) **یەکی تۆمارکردوە بۆ گواستنەوەی تکنولۆجی. کە ژمارە (١) دەریان ئەخات.**

- **شتومەکی مادی** MATERIAL OBJECT
  - بەرهەم (بەرهەمی تەواوکراویان نیمچە تەواو
- ئامێر (بە تەواوی یان بەش بەش) EQUIPMENT
- بەڵگەنامە DOCUMENTATION
- بە خۆڕای (کتێبو، ڕیبۆرتوو، ژونال...).
- نیمچە قەدەغە (مافی دورستکردن و نەخشەو دیزاین و وردەکاری بەرهەمەکە RESTRICTED
- مرۆڤ.

خوێندن و توێژینەوە - STUDY - EDUCATION

بۆ پرسەدانان CONSUL TANCY

ئیشکردن و بە کرێگرتن EMPLOYMENT

مەبەست لە بەرهەمە تەواوکراوەکان ئەو شتانەیە. کە بەتەواوکراوی لەولاتیکەوە ئەهێنرێن بۆ ولاتیکیکە کە وەکو

ئامێـرو ئوتـۆمبێـل و فروکـەو وێنـەی نیمچە تەواوکراوەکانیش تەلەفزیونیکە کە پارچەکانی لە ولاتیکی دیکەوە بهێنرێن. بۆ ئەو ولاتـەی تێدا کۆئـەکـرینـەوە. یان (ئـەیرکۆ ندیشین کە قاوغو هەمو پارچەکانی لە ناو ولاتیکا دورست کرابێت و بە تەنهـا (کـومپـریسـەر) کە لە ولاتیکی دیکـەوە بۆی بهێنرێت مەبەست لە ئامیرەکان هەمو (مکائین و معدات) ئەگرێتەوە کە پێویستی بۆ بە کارهێنان یان بۆ دروست کردنی بەرهەم کە هەر وەکـو بەرهـەم یان بەتـەواوکـراوی ئەهێنـرێن یان بەنیمچـە تەواوکـراوی بەلگەنامە هەموو ئەو نەخشەو نوسراو ودەرهێنان و پەراوکانە ئەگرێتەوە کە دانراون بۆ پێکهینانی ئەو ئامێرو بەرهەمەو هەندیك لەمانە شتی گشتین واتە وەرگرتن و کرینیـان زۆر هەرزان و ئاسـانـە هەنـدێکیـان نیمچـە قەدەغەکراون واتە تەنها بەشێکی کەمیان ئەخرێتە ناودەستی کریار، یان ئەبێت کریار بەلێن بدات کەوا نەیدات بە هیچ لایـەکی کـەوە هەروەهـا هەنـدێ لەو بەلگـەنـامـانە بە هیچ کلۆجێـك بە کەسی نادات ولات و کومپـانی دورستکـەر چونکە ئەو تکنولۆجیەی لا زۆر گرنگەو بریتی‌یە لە چەندەها ساتی هەول و تەقـەلای. سودەکـانیشی پەیـوەندیان بە زۆر بەکارهێنانی دیکەوە هەیە. رولی مروڤیش زۆر گەورەیە لە گوێزانەوەی تکنۆلۆجی‌دا بۆ وێنە ئەو کەسانە بەشدار ئەبن لە کونگرەو کورس و سیمینارەکان یان ئەو قوتابیانەی خوێندنی تایبەتی بەرزیان لە ولاتێکی پێشکەوتوو تەواو ئەکەن دێنەوە بۆ بەکـارهێنـانی زانیـاریـەکانیان لە ولاتەکەی خۆیان دا یان ئەوانـەی بە ئەنـجـامـی مانـەوەو ئیشکـردن لە ولاتێکی پیشەسازی پیشکەوتوو ئەبنە پسپۆر لە هەندێ بەشی زانینا ئەگـەرێنـەوە بۆ ولاتی خۆیـان. هەروەهـا لە کاتی کرین و هینـانی هەنـدێ ئامێـردا لە ولاتیکـەوە بۆ ولاتیکی دیکـە رێـك کەوتـن ئەبێت لەسـەر ئەوەی ولاتی فرۆشیـار چەن پسپـۆرێکـی خۆی بنێـرێت لەگـەڵ ئامێـرەکـان دا بۆ ئاگاداری‌کردن و دامەزراندنی ئامیرەکانی‌دا مەشق پی‌کردنی سەرتایی کادرەکانی کریارو یان کریار پێش هاتنی ئامیرەکان چەنـد پسپـورێکی خۆی ئەنێـرێت بۆ ولاتـەکـەی دیکـە بۆ ئەوەی مەشـق بکـەن و شارەزای پەی‌دا بکـەن لە بارەی کردنـەوەو بەستنـەوەو ئیش پی‌کـردنی ئامێـرەکـانـەوە پێش هێنانیان بۆ ولاتی کریار، لەم بارەیەوە دەرفەت هەیە بۆ وتنی زۆر وردەکاری کە پەیوەندیان هەیە بە رادەی سود وەرگرتنی ئەو کەسـانـەی ئەینیـرێت بۆ ولاتیکی‌تـر بۆ مەشق کردن و شارەزابون و چۆن ئەمە بەستراوە بە پلەی زانینانەوە ئامادەیان بۆ بەکـارهێنـانی ئەو هەلـەی بۆیـان تەرخـان کراوە. تا چ رادەیەك خۆیان ماندو ئەکەن و بە پرسیارو لێکۆلینەوە وشت بی‌نینی بە سودوە چۆن هەنـدێ لەو کەسـانـە خۆیـان بە شتی‌کەوە خەریك ئەکەن و کاتەکانیان بەفیرو ئەبەنە سەرو بەم جورە مەرجی تەرخان کردنی ئەو هەلانەی ئەبرێتە سەر لەلایـەن کومپـانیـای فرۆشیـاری تکنـۆلـۆجیەکەوە چونکە تا پسپـۆرکـانی ولاتی کریـار کەمتـر فێر ببن و شارەزایان کەمتر بێ‌و هەمیشـە پێویستیـان بە مان بێ زوتـر ئەبێت و سپیـرو کەرەسەی ئامێرەکان زورتر ئەبێت بگورێن هەروەها هەندێ جاریش ئەو پسپـورانـەی ئەهێنـرین بە شیـوەی لێ‌پـرسـراو CONSULTANT بە شیـوەیکی ورد هەل نەبـژێـردراون یان زمـان نەزانین ئەبیتـە هۆی سود لێ‌وەرنـەگـرتن لێـیان بە شیوەیەك تەواو جگە لە بلاوگەکانی گواستنەوەی تکنەلۆجی کە ژمارە (١) پیشانی دان چەند هێزیکی پال پێوەنەر، هەن کە پێیـان ئەوتـرێت ئەژانسە (AGENCY) کانی گواستنەوەی تکنۆلوجی وەکو لە ژمارە (٢)دا.

**ژمارە (٢)**

- **بەکارهێنەرانی ناوخۆ** LOCAL USERS
- **ریکخراوە بەرهەم دروستکەرانی ناوخۆ**
  LOCAL PRODUCTION ORGANIZATIONS
- **ریکخراوو کومپانیە جیهانیەکان**
  TRANSNATONAL ONTERNTIONAL

بەکـارهێـنـەرانی ناوخـۆ دانیشتـوان و ریکخـراوە پیشـەسـازییـەکـانی ولاتیـك ئەگرێتەوە کە بەرهەم ئەکرن و بەکـاری ئەهێـنن رێـك خراوە بەرهـەم دورست کەرانی

ئەگەڕێتەوە کە ڕێگای دورستکردنی ئامێرو بەرهەمیان ئەدرێتی بە ئەنجامی ڕێگانامە (LICENCE یان ئاژانسی AGENCY یان (قونتەرات = CONTRACT) هەروەها ڕێك خراو کومپانیە جهانیەکان ئەوانە ئەگرێتەوە کە لە ناوەند دوو یان چەند ولآتیکا کار ئەگرن و ڕێك ئەکەون بۆ دورست کردنی بەرهەمێك بە جوتە یان بە هەمویان (ئیدکویست)[5] لە توێژینەوەیەکیا ئەژانسی گوێزەرەوەی تکنۆلۆجی بە بوەیەکی کۆمەلایەتی داناوە کە بە هۆی ئەو مەرجانەی خوارەوە هەلئەسێ بە هەلْ بژاردن و خستنەکاری ڕێبازیکی تایبەتی بۆ جێبەجێ‌کردنی مەبەستەکەی.

- سوودی خۆی تێدا بێت لە گواستنەوەکەدا INTEREST.
- دەستەلاتی (ڕامیاری ئابوری)... هەبێت POWER
- توانا CAPABILITY ی (ڕاگەیاند، ڕێك خستنی) زانیاری... هەبێت بۆ هێنانەی دی گواستنەوە کە.

ئاشکرایە کە یارمەنی‌دەرێکی کاریگەرە لە هەمو گواستنەوەیەکی تکنەلۆجیا ڕادەو پلەی زانیاری ئەو ڕیکخراو ولآتەیە کە تکنەلۆجیەکە ئەدات وە ئەوەی وەری‌ئەگرێت. بۆ وێنە تکنەلوجی ئامێرێکی بەرهەم هێنەرە وەکو پەیژەیەك دەرخراوە (٤) کە لە ژمارە (٣)دا پیشان ئەدرێت.

**(ژمارە ٣)**

**بیگۆرە بە کەلك تری‌کە INNOVATE**
**نەخشەی کردنی‌داڕێژە DESIGN**
**دروستی بکە BUILD**
**باشتری کە IMPROVE**
**بیبە بەڕێوە MANAGE**
**چاودێری بکە INSPECT**
**ئاگاداری بکە لە کەموکوری MAINTAIN**
**ئیشی پێ بکە OPERATE**

گەر (وەرگری تکنولوجی) ئەو ئامێری بەرهەمە بەو هەنگاوانەدا بڕوات لە ئەنجامدا دەستەلاتێکی تەواو پەیدا ئەکات. بەسەر تکنولۆجیەکەداو بە پیچەوانەی ئەوەوە گەر هەولی بازدان بدات بەسەر ئەو پلەی هەنگاوانەدا. تووشی قۆرت و دواکەوتن ئەبێت زۆتر بیرین (٣) هەر لەبەر ئەوەیە کە پێویستە لەسەر پسپۆرەکانی ولآتی کریار ئەو پلەی هەنگاوانە بە شێوەکی وردوو بیرلێکراوە ببرن تا لە هەمو هەنگاویکدا باری ئابوری بوون و نەبوون مەشق پێ‌کردن و ئامادەکردنی کادر رۆلێکی تەواویان بدرێتی بێ‌گومان لە هەمو گەل و کومەلێکا چەندەها پێداویستی هەیەو هەست کردن بەو پێداویستیانە لە لایەن پسپۆرەکانی ولآتەوە بە یەکەم هەنگاوی گواستنەوەی تکنولۆجی دائەنرێت و لە لۆژیك گواستنەوەدا، یەکێ لە گرنگترین کاری هەل بژاردنی‌یەك لە دوای یەکی ئەو پێداویستیانەیە چونکە زۆر کەرەت بریاردان لەسەر هێنانی کام ئامێر، یان، بەرهەم (هتد) بریتی ئەبێت.

بە بەرەو پیشەسازی چوونیکی ریکوپێك یان ئەبێتە هۆی سەغلەتی‌و قۆرت دروستکردن لەو ڕێبازەدا، لە پاش دیاریکردنی ئەو بەرهەمە یان ئەو ئامێری بەرهەم دروستکەرو هەنگاوی دوهەم بریتی ئەبێت لە تەکنولۆجی‌یێکانی دروست کرد نیو بەکارهێنانی.

PRODUCTION AND UTILIZATION TECHNOLOGIES

واتە لەوانەیە ئەو بەرهەمە تەنها یەك چارەسەری تکنیکی بوویت (وەکو سیستەمیکی هاتووچوکردن بە فرۆکە) یان کۆمەلێ لە جیاتی (ALTERNATIVES) هەبێت (هەر وەکو هەلبژاردنی دروستکردنی پیشەسازی خواردەمەنی لە تەکنولۆجی‌یێکانی کشتوکالآ). لەبەر ئاسانی وێنە هێنانەوە لێرەدا باسی هەنگاوەکانی گواستنەوەی تەکنۆلۆجی ئامێرێکی دروستکەر ئەکەین و بێ‌گومان ئەو هەنگاوانە ئەگونجین بۆ بەرهەمەکانیش و ڕێبازەکانی دروست کردنیان ـ ئەنجا ژمارە

(٤) ڕەورەوەی ئەو گواستنەوەیە دەرئەخات وەکو چەند هەنگاوێکی یەك بە دوای یەك بە هەنگاوی بیرلێ‌کردنەوەو نوقلانەی دوا ڕۆژ دەست پێ ئەکات و کات و لێکدانەوەو پلانکردنی لە جیاتیەکان و هەڵسەنگاندنی باری ئابوریان کە شتێکی ئاشکرایە ئەو توێژینەوەی باری ئابوری‌یە زۆر شت دەرئەخات وەکو نرخ و بوون و نەبوونی کەرەسە خاوەکان و ئیشکەران و گەورەو بچووکی بازارو نرخی گواستنەوەی تەکنۆلۆجی‌یەکە، دوورودرێژی ئەو ماوەیەی پێویستە بۆ گواستنەوە کەچەندو چۆنی گشت سەرمایەکەو جێ‌بەجێ‌کردنی پارەی بەردەوام بۆی - ئەنجا ئەنجامی ئەو هەڵسەنگاندو لێکدانەوەیە ئەبنە هۆی هەڵبژاردنی ئەو چەشنە تەکنولوجیەی کە لە هەموو بارێکەوە ئەلوێت و ئەگونجێت لەگەڵ پێویست و پلەی پێشکەوتنی ولاتەکەدا.

ژمارە (٤)

**نوقلانەو پیش بینین FORECASTING**

**پلان کردنی لە بریتی‌یێکان PLANNING OF ALTERNATIVES**

**هەڵسەنگاندنی ئابوری ECONOMIC EVALATION**

**هەڵبژاردنی تەکنولۆجی‌یێکە CHOICE OF TECHNOLOGY**

**گوێزانەوەی تەکنولۆجی TRANSFER OF TECHNOLOGY**

**گواستنەوەی-سیستەمی TRANSFER OF ORGANIZA TIONAL**

**ریکخستن و زانیاریەکەی AND EDUCATIONAL SYSTEMS**

قۆناغی پاش ئەوە هێنان و گواستنەوەی ئامێرەکانە یان دامەزراندنی کارگەکەیە - شتێکی ئاشکرایە کە لە پلەکانی گواستنەوەی تەکنولوجیا پێویستە گرنگی‌یێکی زۆر بدرێت بە سیستەمی ڕێك خستن و زانیاری‌یە تایبەتیەکەی ئەو تەکنولۆجی‌یە کە جگە لە بارە تکنیکیەکانی ڕێبازی بەرێوەبردن و بازارکردنی بەرهەمەکە ئەگرێتەوەو ڕێك خستن و ئاگاداری کردنی کەرەسە خاوەکانی‌و ئامادەکردن و مەشق پێ‌کردنی کادرەکانی بۆ هەموو بەشەکانی هێنانەدی ئەو تەکنولوجی‌یە.

**بەش دووهەم: -**

---

ئەگەر چاوێك بخشێنین بەسەر ڕووداوەکانی هەشتاکان داو بەرەو سەدەی بیست و یەکەم بچین بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە بەختیاری ئاسایشی جیهان بە لەیەك نزیك بوونەوەی گەلانەوە بەستراون و بۆ مەبەستی ئاڵوگۆرکردن و سوود لە یەکتری وەرگرتن لە بارەی ئەو خوێندن و زانستی‌و تەکنولوجیانەی لە ڕێبازی درێژی مێژووی ئادەمیزادا دەست کەوتووەو کۆکراوەتەوە.[٦]

هەروەها گەر گوێ‌بگرین لەو گفتوگۆو رازو گلەیی‌یانەی کراون لە ناوەند ولاتانی سەرەوەو خوارەوە بە تایبەتی لە بارەی تەسك کردنەوەو کەم کردنەوەی ئەو جیاوازیە گەورانەی لە پلەی پیشەسازی‌و ئابووریان هەن گرنگی گواستنەوەی تەکنولوجیمان بۆ دەرئەکەوێت و پێویستی دانانی پرۆگرامی یارمەتی‌و دەستگرتنی ولاتانی سێ‌هەم لە لایەن ولاتە پێشکەوتووە پیشەسازی‌یەکانەوە. لەم بارەیەوە دڵسۆزی لە بەخشین و فرۆشتن و تواناداو شارەزایی لە کرین و وەرگرتنیا ڕۆڵێکی یەجگار بەسوودو گرنگ ئەنوێنن بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتنی ولاتانی (خوارەوە) - ئەمەش ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە مەرجی سەرکەوتن لە گواستنەوەی هەر تەکنولوجین بۆ هەر ولاتێك پەیوەندی‌یێکی بالای هەیە بە بوون و نەبوونی توانای تەکنولۆجی ناوخۆیەوە[٧] هەر لەبەر ئەوەشە پلەکانی تەکنولوجی‌یە هەڵبژیراوەکە لە لایەکەوە هەوڵ و تەقەلاکانی زانست و پێشکەوتنی ناوخۆ پەرەی پێ‌ئەسێنێ‌و لە لایەکی دیکەوە توانای تێگرایی تەکنولۆجی ناوخۆ کۆنەکاتەوە...

هەر وەکو باسیشمان کرد پروسیسی (PROCESS) گواستنەوە پەیوەندی بە چەند کارێکی تری یەك لە دوای یەك دا هەیە لێ‌کدانەوەیێکی ڕامیاری‌و ئابوری میری‌یەوەو

زانینی سەرچـاوە هەبـووەکـانی (AVAILABLE) تەکنـولـۆجی و هەڵسـەنگـانـدن و هەڵبژاردنی بە کەڵك ترینیان کە گونجاوە لەگـەڵ پێـویستی ناوخـۆداو ئەمجـا گەیشتن و تۆمـارکـردنی ڕێـك کەوتـنـێـك لەگـەڵ ئەو ڕێـك خراو و وڵاتـەی تەکنـولـۆجیـەکـەی لێـوەئـەهێنـرێت ڕێکەوتنێك کە مەرجی ڕێـکـوپـێـکـی و دڵسـۆزی تێدا بێـت بۆ گوێـزانـەوەی تەکنـولـوجی یـەکـەو وەرگێران و گونجاندنی لەگەڵ هاندان و یارمـەتی دانی تەکنـولۆجی ناوخۆداو بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەو زانیـاریـە تازەیـە بۆ هەمـوو بەشـەکانی تری وڵاتەکە کە پەیوەندی یان هەیە پێوەی[٨]

## بەشی سێ هەم: -

ئاشکـراشـە لای هەمـوان کە مەسـەلـەی ئاڵـوگـۆری تەکنـولـوجی کراوە بە بارێکی گرنـگ لە هەمـوو وڵاتـان داو کۆمەڵی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کۆبونەوەی ١٩٦٣دا دانی نا بە پێـویستی ئاڵـوگـۆری تەکنـولـۆجی و لە ١٩٧٠ بریارێکی ستراتیجی دەرکرد[٩] کەتیایدا داوای لە وڵاتە پێشکەوتووەکان کرد دەستی یارمەتی رابکیشن بۆ وڵاتانی جیهانی سێ هەم و هەروەهـا بە هۆی ڕێـك خراوی (اونکتـاوە)وە بریـارێکی گرنـگ دەرکـرد لە ١٩٧٦دا بۆ پیـاچـوونـەوەو فرەپێـدانی کاروباری تەکنولۆجی ناو وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست.

هەروەهـا ڕێـك خراوی عەرەبی بۆ پەروەردەو زانیـاری و زانستی (المنظمـة العـربيـة للتـربيـة والثقـافـة والعلوم) مەسەلەی گواستنەوەی تەکنولۆجی کرد بە بەشێکی گرنگی پروگـرامـەکـانی لە ١٩٧٥وە (٩) وە لە کۆنگـرەی وەزیـری لێپـرسـراوەکـانیان لە ١٩٧٦دا لەرەبات[١٠] چەند بەشێکی گرنـگی پێش خستنی تەکنـولـوجی باس کردوە هەروەهـا گواستنەوەی تەکنولۆجی کرا بە نامەیێکی سەرەتایی DRAFT) (MEMO و بڵاوکراوەی گفتوگۆی ناوەند عەرەبوو ئەوروپا لەو کۆنگرەیەی لە بەغدا بەستراوە لە ساڵی ١٩٧٧دا.[١١]

لە وڵاتەکەی خۆشمان دا کاری گواستنەوەی تەکنولۆجی بەشێـوەیێکی گشتی سپێـراوە بە (ئـەنجوومەنی لێکۆڵینەوەی زانیـاری) کە هەوڵ ئەدات بۆ دانـانی ڕێبـازی زانستی بە گونجـانـدنی زانیـاری بەکـارهێنـان و گواستنەوەی لە پلەی تاقیگـا (مختبـر)و کێلگـەوە (حقـل) بو پلەی بەکـارهێنـانی زانست و ئابووری یەوە ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە یارمەتی جێ بەجێ کردنی گواستنەوەی تەکنولۆجی ئەدات بە دوو پلەی جیاواز.[١٢]

١ - رادەی کۆمیتـەی زانستی ئەنجـوومـەنـەکـە نوێنەری هەمـوو بەشـە جیـاوازەکـانی (لێکـۆڵینـەوەو بەرهـەم هێنان و خزمەت گوزاری) تێدایەو پێشنیاز ئەکەن بۆ ستراتیژ یەت و ئامـانجی [لێکـۆڵینـەوە] لێکـــدانـەوەی زانستی لە ناو وڵاتـەکـەداو مەرجـەکـانی هاوکـاری زانستی دائـەنێت بۆ ناوەنـدتـری ئەنجوومەنەکەو ڕێك خراوە زانستی یێکانی تری ناوخۆو دەرەوە.

٢ - رادەی چەقـەکـانی (مـراکـز) ناو ئەنجـوومەنەکە کە هەڵ دەستنی بە تۆژینـەوەی بەشـەکـانی ئابـووری بەپێی پێداویستی لێکۆڵینەوەیان سەرەرای ئەوەش هەر چەقەیەش (مـوکـز) ئەنجـوومـەنی خۆی هەیـە کە نوێنەری هەموو ئەو بەشانەی تێدایە کە پەیوەندی یان هەیە بەکارو ئیشەکانیانەوەو ئەم ئەنجـومـەنـانە چالاکی یێکانی چەقەکان ئەبەن بەرێوەو ڕێبـازیـان بۆ دائـەنێن لە ناوەنـد ڕێبـازی گشتی هەمـوو ئەنجوومەنی لێکۆڵینەوەی زانستی (مجلس البحث العلمي) جگـە لەم ئەنجـوومـەنەی سەرەوە لە هەموو دانشگاکان دا، چەشنـە ڕێبـازێـك هەیـە بۆ لێکۆلینەوەی زانستی و جگە لە ڕێگـامـایـەکی تۆمـارکـراو بۆ پەیـوەنـدی زانستی لەگـەڵ وەزارەتـەکـان دا کە هەر یەکـە بەپێی چەشنی ئیشـوکـارو پێداویستی خۆی ڕێك دەکەوێت لەگەڵ دانشگاکان دا کە ئەمەش بێ گومان دوو ئامانجی گشتی هەیە: -

(١) بۆ فرەکردن و فراوان کردنی تواناو زانیاری مامۆستاو لێکۆڵینەوەکانیان.

(٢) یارمەتی کارگەو رێك خراوە پیشەسازییەکان بۆ سەرکەوتن بەسەر هەندێ قۆرت و چەڵەمەی ناو ئیشوکاریان و ئەمە بێ گومان باری تیوری لەگەڵ باری ئیشوکاریش دا نزیك دەکاتەوە. . .

## پەراوێزو سەرچاوەکان : -


١ - ئەم باسە کورتە لێوردبوونەوەیێکی سەرەتایی بنچینەکانی تیوری گواستنەوەی تەکنولۆجییە.

٢ - ئێستا خانەنشینە پێشان راوێژکاربوو لە وەزارەتی نەوت و بەشداری کردوە لە چەند کۆنگرەو سیمیناریك کە پەیوەندییان بە گواستنەوەی زانیاریو تەکنولوجی هەبوە لەناوخۆی عیراق و لە دەرەوەی.

٣ - PETERLONGO GIOVANI - PROF ENGINEER, APPLICATION IN INDUSTRY, THE TRANSFER OF TECHNOLOGY SEMINAR S. A. F. STOCKHOLM 1980

4 - SEVRAT. S., REALITIES IN THE TRANSFER OF TECHNOLOGY MASSON, PARIS 1976 (CHAPTER 3)

5 - EDQUIST, CED, SOCLAL CARRIERS OF TECHNIQVES FOR DEVELOPMENT SAREC REPORT R3 1979 STOCKHOLM

6 - TECHNOLOGY TRANSFER INSTITUTE OBJECTIVES FOR ESTABLISHING TECHNOLOGY TRANSFER FOUND - ATION, TOKYO 1980.

7 - STOCKFELT, TORBJORN, Ph. D. EVERYDAY LEARNING - THE BASIS FOR ADULT EDUCATION EDUCATIONAL DEVELOPMENT UNIT, STOLKHOLM UNIVERSITY 1981.

٨ - محاضرة من اعداد المكتب الدولي للمنظمة العالمية للملكية الفكرية (الفيبو) جنيف ١٩٨٢ - WORLD INTELLECTUAL PROPERTY

٩ - دراسة الجداول المنقحة النهائية بشأن المركز الاقليمي العربي لنقل التكنولوجيا وتطويرها (الامم المتحدة / المجلس الاقتصادي والاجتماعي / اللجنة الاقتنصادية لغربي آسيا : E / ECWA CTT Rev. 3 1978

١٠ - التقرير النهائي، مؤتمر وزراء الدول العربية المسؤولين عن تطبيق العلم والتكنولوجيا، الرباط ١٦ - ٢٥ / ١٩٧٦ (لە ژمارە ٩ دا تۆمارکراوە]

١١ - عقد المؤتمر برعاية مركز التنمية الصناعية للدول العربية ومنظمة الامم المتحدة للتنمية الصناعية والمنظمة العالمية للملكية الفكرية ووزارة الصناعة العراقية (بغداد ٥/١٠/٣/١٩٧٧) لە ژمارە (٩) دا تۆمارکراوە . .

١٢ - الحوافي، رشيد مجيد، النظام المؤسسي والنقل الافقي للتكنولوجيا (ص ٤)، حلقة الاعلام العلمي والنقل الافقي للتكنولوجيا / مجلس البحث العلمي، بغداد - نيسان ١٩٨٢ . . .

١٣ - نەمتوانی وشەی تەواو دابنێم بۆ هەندێ لە وشە ئینگلیزیەکان. . .

١٤ - مەبەست لە بەشی یەکەم بنچینە تیوریکەی باسەکەیە (بەشی دوهەم) زانیاری گشتییتیو (بەشی سێهەم) زانیاری تایبەتی ناوچەکەیە.

# نقــل التكنولوجيا

انور القرهداغي

ان هذه الدراسة هي محاولة متواضعة لتعريف «التكنولوجيا» وماهيتها وبعض أوجه عملية نقلها وأهم العوامل التي تساعد على نقلها بما فيها مراحل وقنوات «النقل» السليم والسريع لها.

هناك تعاريف مختلفة لمصطلح «التكنولوجيا» الا ان هناك اجماعاً عاماً بأنها تشمل مجموعة المعارف والخبرات والمهارات لصناعة انتاج معين أو خدمة معينة أو مجموعة من الخدمات أو التوجات ضمن منظور الفعاليات الاقتصادية الشاملة.

وان نقل التكنولوجيا عملية تنطوي على مجموعة من العوامل التكنولوجيا والاقتصادية والأدارية والثقافية والسياسية وبالتالي فاءن نقل التكنولوجيا يدل على انتقالها ابتداء من انتاجها عن طريق اختيارها واكتسابها وتكيفها التكيف الملائم الى تطبيقها بناء على الشروط السياسية والاقتصادية والاجتماعية والبيئية ويجوز تحقيق مفهوم النقل على انه يحدث عموديا (أي من البحث الأساسي الى البحث التطبيقي والتطوير والنشر) أو انه يحدث افقيا (أي من قطاع اجتماعي اقتصادي ولنقل الصناعة الى قطاع آخر مثل النقل أو الصحة او التعليم) في حدود بلد ما و/ أو فيما بين البلدان )

كما تعنى الدراسة بتهيئة المستلزمات المحلية والخطط الوطنية بغية ضمان فعالية عمليات نقل التكنولوجيا بما في ذلك:

أ ـ تحديد الأهداف ومستلزمات تحقيقها عن طريق ترتيبات مالية وقانونية ومؤسسية واخرى تتعلق باعداد الكوادر ومستويات تأهيلها.

ب ـ تنسيق الاجراءات الوطنية في المجالات المتصلة بتطوير ونقل التكنولوجيا ـ الخ ج!)

كما عنت الدراسة بتثبيت بعض.

(أ) قرارات منظمة الأمم المتحدة الداعية الى البلدان المتقدمة لنقل التكنولوجيا الى البلدان الأقل نموا.

(ب) برامج المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم في هذا المجال.

(ج) نشاطات الأجهزة المحلية مثل مجلس البحث العلمي والجامعات والمؤسسات البحثية الاخرى جهودها الكبيرة والمستمرة بهدف تطويع التكنولوجيا واستخدامها لاحداث تغييرات انتاجية وتنظيمية ومحاولة ازالة ومعالجة مواقع التخلف الاقتصادية والاجتماعية في القطر.

# فیساگۆریزم لە ڕووانگەی بیرکاری یەوە



نافیع کاکە

فیساگۆرس کەسێکی زانستی مێژوویی بوو زیاتر لەوەی کەسێکی ئەفسانـاوی بێت، زۆر شت دەربارەی نووسراوە بەڵام هیچ نووسینێکی خۆی لە دووا بەجێ نەماوە، نووسینێکی‌وا ووردیش نیە کە هەواڵی ویمان بە ووردی بگەیەنتێ. گوایە لە سامۆس لە دایك بووە لە ساڵی 580 یان 572 پێش زایینی کەوا ئەو دوورگەیە دەکەوێتە بەشی باکوری دەریای ئیجەو لە سەردەمی کۆندا بنکەی پەرستگای (هیرا Hera) بووە خوای ئاسمانی گریکی‌یەکان و ژنی شەرعی (زیۆس Zyos) بووە لە سەدەی شەشەمی پێش زایینی‌دا.. دەگێڕنەوە کەوا لێرەدا ماوەیەك زانیاری خوێندووە لە ئەشکەوتی چیایەکی سپی‌دا، پاشان لە ترسی داگیرکەری پولیکراتس کە ئەو دوورگەیەی داگیرکردووە ئەوێ بەجێ دەهێڵێ، دەچێتە میسرو ماوەی (12) ساڵ لەوێ ماوەتەوەو ئەستێرەشووناسی‌و ئەندازەو ئامۆژگاری تیادا خوێندووە، دووای داگیرکردنی میسریش لەلایەن قەمبیزەوە لە 525 پ.ز دا لە گەڵی چووێتە بابل و ماوەی (10 - 12) ساڵیش لەوێ ماوەتەوەو ژمێرەو مۆسیقاو ئایینی تیادا خوێندووە ئەنجا پاش ماوەیێکی زۆر دەچێتە (کروتۆن Ciroton) کرێت کەوا ئەوسا وولاتی یۆنان بووەو تەمەنی (65) ساڵ بووە، قووتابخانەکەی لەوێ کردۆتەوە سەبارەت بەوانەی دەیانەوێ بە ژیانێکی ئاسوودەتر بژین بەگوێرەی باوەڕیان کەوا دەست بەسەر خودی خۆیان دابگرن و گیانیان پاکژ بکەنەوەو ئامادەی بکەن بۆ ژیانی دووای مردن. کەوا گۆشتیان نەدەخواردو تەنیان (جسد) بە بەندیخانەی گیان (روح) دانابوو، ڕێبازەکەیان زۆر شتی نهێنی‌و بیری ئایدیالی تیادابوو کەوا دەبوایە بەووردی پەیرەویان بکردبایە، لەو قوتابخانەیەشدا ئافرەت و پیاو وەرگیراون و هەموو بووارێکیش هەبووە بۆ ئافرەت دوور لە جیاوازی زایەندی (جنس) کە بە جیاوازی‌یەکی سرووشتی‌یان دانابوو کەوا شارەزای ئاداب و فەلسەفەو دایکایەتی‌و پەروەردەی ماڵ دەبوون و هیچ جیاوازی‌یەك لە نێوانیاندا نەبووە سەبارەت بەوەی لە کۆمەڵەی فیساگۆریزم دان.

بەڵام فیساگۆرس خۆی لە خەڵکەکە جیاکردۆتەوەو خۆی بە زلتر داناوەو ووتوویەتی (ئادەمیزادو خوداوەند هەن لە

نێوان ئەو دوو لایەنەشدا گیان لەبەریتر هەیە وەکو فیساگۆرس). فیساگۆرس خۆی تەواو بەندکردووە بەو یاسایانەی دایناون سەبارەت بەوەوە لەناو خەڵکەکەدا پایەیەکی بڵندی هەبووەو هەمیشە ڕێزی لێ گیراوەو هەرگیز بە ڕۆژ شەرابی نەخواردۆتەوەو خواردنیشی بەزۆری نان و هەنگوین بووەو هەردەم پۆشاکی ڕەنگی سپی بووەو پێکەنینی نەبووە، گۆشتیشی نەخواردووە چونکە پێکهاتووی لاشەیە لاشەش گۆڕی گیانە کەوا پەیوەندی بە (تناسخ الارواح) هەیە کە بە مردنی کەسێك گیان لە لاشەکەی جیادەبێتەوەو دووبارە دەچێتەوە بەر لاشەی گیان لەبەرێکیتر کە تازە نەشوونما دەکاتن و گەلێك پەیرەو وبەرنامەی تریش کە بۆ کەسانی ڕێبازگەکەی دانابوو پەیرەویان بکرایە چەشنی وەرزشی گیانی کە لێرەدا بواری نیە چونکە تەنها لە ڕووانگەی ژمێرەوە باسی دەکەین.

فیساگۆریزم بەگوێرەی ڕێبازگەکەی زانیارییەکەی تێکەڵی ئەفسانەیە ئەوەش مۆرکی ئەو سەردەمییە تەنانەت لە باسی زانیاری گەردوونی یەوە دەڵێ کەوا زەویو هەیڤ بەدەوری خۆر دەخولێنەوەو خۆرو هەسارگەو ئەستێرەکانی تریش هەموویان بە دەوری ئاگرێك دا دەسوڕێنەوە کەوا لە چەق دایەو بە (چەقە ئاگر) ناوی دەبات.

زانیارییەکەی دەڵێ (ژمارە سرووشت دابین دەکات) کەوا لێکچوونێك هەیە لەمیانەی سرووشت و یەکەدا لە جۆرەکانی ژماردندا کەوا پەیوەندی بنچینەیی نێوان ژێیەکانی مۆسیقاو (بیرکاری) دۆزییەوەو چیرۆکی ئەو دۆزینەوەیەش تائێستا لای خەڵك ماوە لە شێوەی چیرۆکی فۆلکلۆری کۆن کەوا چۆن فیساگۆرس لەو دۆزینەوەیەدا ووردو دابینکەر بووە، لە کاتێ کەوا ژێیەکی توند دەلەرێتەوە ڕەوگەکەی دەنگێکی تایبەتی دروست دەکات و ئەو دەنگە جیاوازانەی دروست دەبن لە ئەنجامی دابەش بوونی ژێیەکاندان بۆ ژمارەیەکی تەواوی بەشێك.. بۆ دوو بەش و هەروەها.. کە بە هەر بەشێك دەووترێ (گرێ) گرێی یەکەم و دووەم و هەروەها.. وە ئەو دەنگەی لە گرێی یەکەمی ژێ یەکەدا دەردەچێت سەبارەت بە ڕەوگەکەی جیاوازە لەو دەنگەی لەگرێی دووەم دەردەچێت وە دووەمیش لە وەی تر جیاوازە.. وە هەروەها... لەکاتی دەرچوونی دەنگێك لەیەکێ لە گرێیەکانی ژێیەکەدا کە تەواو توند نەکرابێ بەتەواوی لەسەر گرێیەکەدا واتە نەکەوتبێتە سەر خاڵی نێوان دوو گرێیەکە ئەوە ئەو دەنگەی دەردەچێت جیاوازی نابێت لەگەڵ ئەو دەنگەی دەردەچێت لەسەر خاڵێك کەوا تۆزێك (گرێیەك کەمتر) لەخۆی دوورتر بێت سەبارەت بەجیاوازی نەبوونی ڕەوگەکەیان.

ئەو دەنگانەی لەنێوان گرێی یەکەم و دووەم دەردەچن زۆر بەیەکتر نزیکن و بە هاسانی یەکتر جیا ناکرێنەوە هەروەها دەنگەکانی نێوان دووەم و سێیەمیش لەگەڵ یەکتر بەڵام ئەو دەنگەی لە یەکەم گرێ دەردەچێت جیا دەکرێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەسێیەم دەردەچێت بەئاسانی لەبەر ئەوەی ڕەوگەکەیان بە پلەیەك لە یەکتر جیاوازن و بۆ هەموو گرێیەکانی تریش بەو شێوەیەو کاتێ شوێنی خاڵەکانی هەرگرێیەکی یەك ژێ دەگۆڕێت لەسەر درێژی ژێیەکەدا بەدەست لێدان و کرژکردنی ژێیەکە دەنگێکی هۆرمۆنی دەردەچێت.

فیساگۆرس ئەوەی دۆزییەوە کەوا ئەو دەنگە هۆرمۆنیانەی لە ئەنجامی لەرینەوەی ژێیەکان پەیدادەبن و بەرگوێ دەکەون بەرامبەرن لەگەڵ دابەشکردنی ژێیەکە بەسەر ژمارەیەکی تەواودا، ئەو دۆزینەوەیە بۆ فیساگۆرس و فیساگۆرسییەکان هێزێکی ئەفسانەی ئاڵۆز بوو.

چون یەکی سروشتی دەنگەکان و ژماردنیان پیشانیدا کەوا هەموو دوورییەکی دیاریکراو لە سرووشتدا نەك تەنها هەر دەنگ دەبێت ژمارەیەکی تەواو بن لەگەڵ یەکتری دووای یەك چون یەك گونجاون. کەوا ئەو ڕێبازە باوەڕیان وابوو لە تواناداییە خولگەی هەسارگە ئاسمانییەکان بپیورێن بەهۆی پەیوەندییە دوورییە مۆسیقییەکان و هەر شتێکیش کە لە سرووشت دا هەیە شێوەیەکە لە شێوەکانی مۆسیقا

وەکـو جوولانـەوەی ئاسمـانی یـەکـان شێـوەیـەکی مۆسیقایە دەربارەی هەسارگەو ئەستێرە ئاسمانی یەکان سەبارەت بەوەوە گۆرینی ژمـارەو ئەنـدازە هاتـە ئاراوەو هۆیـەکـەی سروشتی یەکـەیـە بەوەوە فیسـاگۆرس سەلماندی کەوا جیهانی دەنگ پەیـوەنـدی بە ژمـارەوە هەیـە ئێستـاش کەوا هەر دەنگـە، شەپۆل و لەرەی تایبەتی خۆی هەیەو دووای سەلماندنیشی ئەو ڕاستی یە دەسەلمێنێ کە لە جیهانی ڕووکەش دا هەیە، لێـرەدا دەڵێ (ئێستـا سەیـری دەورووپشتی خۆم دەکـەم (مـەبـەسـتی سامـۆس) خۆم لەنـاوەڕاستی دیمـەنێکی ڕەنـگـاوڕەنـگ و ناوەنـدێکی جـۆراوجـۆری سرووشت دەدۆزمـەوە، ئایـا ئەوە بەگـوێـرەی پێکهـاتنی ژمـارەی سادە چۆن دەبـێـت) ئەو پرسیـارە وامـان لێ دەکـات بگـەڕێنـەوە بۆ هەندێك یاسای سرووشتی نەگـۆڕو بۆ ئەو مەبـەستـەش دوو شتمـان دێتەبەر یەکـەم کێش کردن ستـوونی یـەو دووەمیش ئاسـۆ لەگـەڵ کێش کردنـدا گۆشـەیـەکی وەستـاو دروست دەکـەن واتە لە ئەنجامی یەکتر بڕینی هێڵی کێش کردن و هێڵی ئاسۆیی دا.

دەربڕینی ئەوەش ئەوەیە دوو هێڵی لەسەر یەکتر ستوون سرووشـتی گۆشـەی وەستـاو پێـك دەهێنن. ئەگـەر ئەو گۆشـەیـەش چوار جار بسـووڕێنین بەمـەرجێ تەوەری ئاسۆ بچێتە جێگەی تەوەری ستوون (یان تەوەری کێش کردن)، تەوەری ستـوونیش بچێتـە جێگـەیـەکی تـر ئەوا دەگـەینە جێگـەیـەك کە لە سەرەتـاوە لێ یـەوە دەستمـان بە جوولانی گۆشـەکـە کردووە ئەوەش جێگـایەکە کەوا لەچوار جار زیاتر جێگـەی گۆشـەکـەمـان گۆڕی یـە (گـۆڕیوە) بەوەدا گۆشەی وەستاو لە گۆشەی تر جیا کراوەتەوە.

بۆ سەلمـانـدنی ئەوە بەتـاقی کـردنـەوە فیسـاگـۆرس گووتـوویـەتی ئێمـە لەسـەر ئەو زەوی یە پان و بەرینەدا ین لە کەنـداوێکی دوورگـەی سامـۆس بەرەو کەنـاری ئاسیـای بچـووك کەلای خواروومـانـە پارچـەیەکی سێ گۆشە دەگرمە دەست (لـەسـەر شێـوەی گۆشـەی وەستـاو بووەو) وەك نیشـانـدەرێـك بەکاری دێنم وێنەی ئێستا ڕووی خوارووە




وێنە ـ 1 ـ

بەوەرچـەرخـانـدنی سێ گـۆشـە وەستـاوەکـە بەئاراستەی میلی کاژمێر چوارجار لەگۆشەی - A - بۆ جێگەی گۆشەی - B - ئەوا چوارگۆشەکمان بۆ دروست دەبێت درێژی لایەکی یەکسانە بەدرێژی ژێی سێ گۆشەکە.

چوار گۆشـە خاڵـدارە گەورەکـەش ئەوەیـە کەوا بەرامبـەر گۆشـە وەستاوەکە خەیالێ لەسەر زەوی دروست بووە.

کەوا ئێستـا نیشـانـدەرەکـەمان گۆشەیەکی دروست کردووە لای سەرووی گۆشـەکـە لە خوواروودایـە (مەبەستی ژێی سێ گـۆشـەکـەیە) بیسوڕێنین تا گۆشەیەکی تری وەکو یەکەم دروست بکەین ئەوە ڕووی دەکەوێتە خۆراواو بە دروست کردنی گۆشەیەکی تری وەکو پێشوو بەسووڕاندنی پارچەکە ئەو کاتـە ڕووی دەکـەوێتـە باکـورو ئەگـەر یەکێکی تریش دروست بکـەیـن هەر بە سووڕانی پارچـەکـە ئەوە ئەو جارەش ڕووی بەرەو خۆرهـەلاتی دەبێت، وە بەسـووڕانی پارچـەکـە جارێکی تـر ئەوا دووبـارە ڕووەکـەی دەکـەوێتەوە خوواروو کەوا جێگـەی جاری یەکـەم بووە (ئـەوەش بە سووڕانـدنی پارچـە سێ گـۆشـەکـە تەنها بە ئاراستەیەك کە ئاراستەی میلی کاژمێرە).

ئەگەر ئێستا چوار خاڵە دەست نیشانکراوەکە وەربگرین ڕووەو خوواروو خۆراواو باکـورو خۆرهـەلات هەریـەکـەیان دەبنە سەرە وەستاوەکەی سێ گۆشەیەکی وەستاو، وە سەری دوو سێ گۆشەی کە گۆشەکانیان هاوسێی یەکترن سەرێکی گۆشـەی چوارگـۆشـەیەك دروست دەکەن کە ئەویش وەستاو

دەبێت، ئەوە کاتێ کە هەمیشە ژێی سێ گۆشەکە لە دەرەوە بێت لە کاتی سوورانیدا، لە ئەنجامدا چوارگۆشەیەکی بچووك دروست دەبێت (ئەو چوارگۆشەیەی لە ئەنجامی سورانی تەنها سێ گۆشەکە خۆی دروست بووە)و بە بۆشی دەمێنێتەوە لە ناوەڕاستی چوارگۆشە گەورەکەدا (ئەو چوارگۆشەیەی دروست بوو لە ئەنجامی سوڕاندنی سێ گۆشەکە سەبارەت بە بەرکەوتنی هەموو ئەو زەوی‌یەی دەکەوتنە بەرامبەر گۆشە وەستاوەکەی سێ گۆشەکە)، کەوا درێژی لایەکی چوارگۆشەکە یەکسان بوو بە درێژی ژێی سێ گۆشەکە. بەوەوە چوارگۆشەیەك لەسەر ژێی سێ گۆشەوەستاوەکە دروست بووە کە بیرۆکەی دیمانەی چوارگۆشەکانی سەر لاکانی سێ گۆشەیەکی وەستاوی لێ هاتە ئاکامەوە کەوا ئەو چوارگۆشەیەی لەسەر ژێی سێ گۆشەیەکی وەستاو دروست دەبێت یەکسانە بەکۆی ئەو دوو چوارگۆشەیەی کە لەسەر لاکانی تری سێ گۆشەکەدا دروست دەبن، بۆ ئەو سێ گۆشانەی کە ڕێژەی لاکانیان (3 ـ 4 ـ 5) بێت وێنەی 2 لە دەقە مێژوویی‌یە کۆنەکانی



وێنەی ـ 2 ـ

بەسوڕاندنی سێ گۆشە وەستاوەکە چوار جار لەدووای یەکتر چوارگۆشەیەك دروست دەبێت درێژی لایەکی یەکسانە بەژێی سێ گۆشەکەو ڕێژەلاکانی سێ گۆشەکە (3 ـ 4 ـ 5)ە.

یۆنان دەردەکەوێ کەوا زانیاری ژمێرەیان زانیوە پێش فیساگۆرس بەڵام تەنها بۆ کاروباری بازرگانی بووە نەك بەو شێوەیە بەڵام فیساگۆرس یەکەمین کەسێکە وای لە ژمێرە کرد ببێتە زانیاری‌یەکی سەربەخۆ ئۆستکینۆس دەڵێ

فیساگۆرس یەکەمین کەسێکە لێکۆڵینەوەی لە ژمێرە کردووە کە هیچ ئامانجێکی بازرگانی تیادا نەبێ ـ بە باوەڕی ئەو ڕێبازە ژمارە گرنگی‌یەکی زۆری هەیە لە سیستەمی سرووشتداو باوەڕیشیان هەبوو کەوا دوورایی ئەستێرەو هەسارگەکان و خۆرو هەیڤ لە چەقە ئاگردا هاوڕێژە دەبن لەگەڵ یەکتر بەڕێژەیەکی سادە کەوا جووت دەبێت لەگەڵ ڕێژەی دەنگی مۆسیقا، کەوا هەموو شتێك ژمارەیە یان




وێنەی ـ 3 ـ

ژمارە سێ گۆشەیی یەکان ئەو ژمارانەن توانای پڕکردنی سێ گۆشەکیان هەیە بەخاڵی لە یەکتر دووری یەکسان.

ژمارە دەنووێنێ بەوەوە بەڕای فیساگۆرس جیهان ڕێك لەگەڵ ژمارەو ئاوازدا ڕێك دەکەوێ کە لە تواناداهەیە




وێنەی ـ 4 ـ

ژمارە چوارگۆشەیی‌یەکان ئەو ژمارانەن توانای پڕکردنی چوارگۆشەیان هەیە بە خاڵی لەیەکتر دووری‌یەکسان وەکۆی دووژمارەی سێ گۆشەیی دەکاتە ژمارەیەکی چوارگۆشەیی

دەنگــی مۆسیقــا بگــۆڕێتــە ژمــارە، سەبــارەت بە لەیەکچوونیان. . مۆسیقا لە ژیانی ئەندامانی ئەو ڕێبازەدا گرنگی‌یەکی زۆری هەبووە لەکاتی نوێژو ئاهەنگی ئایینی‌دا سەبارەت بە مەبەستی پاکژکردنەوەی خود (نفس) لە گەردو خەوش هەر ئەو باوەڕەش وای لێ‌کردوون کە پتر سەرنج لە مۆسیقـا بدەن و بایـەخ بەدەنـگ بدەن بەلای فیسـاگۆرس و فیسـاگۆرزمی‌یەکان هەموو شتێك لە ژمارەو ئاوازدا هاتووەو ژمارەش دوو ڕەوشتی هەیە تاکی‌و جووتی تاکی سنووردارەو جووتیش بێ‌سنـوورە چونکـە توانـای دابـەش بوونی هەیە، تاك مێ‌ینەیە چونکە بەتەنیا بێ‌بەرەو جووتیش نێرەیە چونکە سەرچاوەی بەرە. یەکە (وحدە) لایان بنچینەی ژمارە بووە لە وەش دا دووە هاتیتــە ئاراوە بە واتــا یەکــە بریتی‌یــە لە بنچینەی بوون و شێوەداو ماتریالی بوونەو سەرچاوەی خێرو شادمـانی‌یـە پێچـەوانـەی دووەیەو سەرچاوەی ئاژاوەو هەرایە بۆیـەش هەردەم دووبـەرەکـایـەتی لە نێـوان دوواندا هەیە ـ بەڕاستی ئەوانـە سروشتێکی نهێنی‌یـان هەبـووە لە ژمێـرەدا کەوا ڕەنـووسی یەکیـان (1) بەخـاڵ دادەنـاو دوویـان (2) بەهێـڵ و ڕەنـووسی سێ (3) بە ڕووبــەرو چواریش (4) بەقــەبــارە دادەنـا. هەروەهـا دیســان (1) یەك بە ئەقـڵ و یەکایەتیشیان بە ڕەووشتی خودایەتی دانابوو.

دوو (2) هێمـای نێـرو سێ (3) هێمـای مێ‌و پێنجیش (5) چونکە بەرەنجامی کۆی (2) و (3)یە (2 + 3 = 5) بەستبـوویـانـەوە بە هێمای دەست گیرانیەتی کەوا کۆی نێرو مێ‌یـە هەروەهـا ڕەنـووسی (4) چوار هێمای یەکسانی بووە

| | | |
|---|---|---|
| گەرم | سارد | |
| خاك | ئاو | تەڕ |
| ئاگر | هەوا | وشك |

وێنەی ـ 5 ـ

چونکـە بەرەنجـامی کۆی دوو ڕەنـووسی یەکسـانە (2 + 2 =4) هەروەهــا گەر (4) دابــەشــی دووش (2) بکــرێ بەرەنجـام دووەو یەکسـانـە بە ڕەنـووسی بەسـەر دایەشکراو (4/2= 2). دیسانەوە ئەو ڕەنووسە (4) چوار پیرۆز بووە چونکــە تووخمــە سروشتی‌یــەکــان چوارن (4)و پێیــان دەگـوتـرێت (تـووخمە فیساگۆرسی‌یەکان) کەوا خاك و ئاوو هەواو ئاگــرن و ڕەوشتی گەرمی‌و ساردی‌و تەڕی‌و ووشکیـان هەیــەو هەر شتێکی سروشتی هەبێت لەوانــە پێــك دێت تەنـانـەت گیـان و جەستـەی مرۆڤ و تەنـە ئاسمـانی‌یەکان پەیـوەنـدیـان بەوەو بە یەکتـرەوە هەیەو ڕۆژی لەدایك بوونی مرۆڤیش پەیوەندی بە کاتەکەیەوە هەیە سەبارەت بە دیاری کردنی چارەنـووسی هەر یەکێـك. ڕەنـووسی حەوتیش (7) هێمای ناکام بووە چونکە کۆلکەی دابەش بوونی نیەو ئەو چوار (4) ژمارە یەکەمەیان پیرۆز بووە ( 1 ـ 2 ـ 3 ـ 4) چونکە ژمارە دەیان (10) لێ پێك دێت و ڕەنووسی دەش (10) پیـرۆزە چونکـە ئەو ژمـارانـەی دەکـەونە نێوان یەك و ئەوەوە (1 ـ 10) هەمــوو ژمـارەیـەکی لێ‌پێـك دێت، ئەوە دیسان پیرۆزی‌یەکی تری ژمارە (4) چوارە کەوا لەو چوار (4) ڕەنـووسـە ژمـارە دە (10) پێـك دێت. تاکـو ئێستاش پاشمـاوەی ئەوە هەرمـاوە وەکـو وەی ڕەنـووسی (7) حەوت




تووخمـە فیسـاگـۆرسی‌یـەکان ئەو چوار تووخمەن کەوا شێوەیان هەیەو هەر توخمەش دوو شێوەی بەر دەکەوێ (ساردوتەڕ)یان (گەرم ووشك).

* کەوا ئەوانیش (ئاو ـ خاك ـ هەوا ـ ئاگر)ن و هەموو شتێکی سروشتیان لێ پەیدایە.

پیرۆز بێت و (13) سێزدە دزێو بێت. لە کوردەواریش دا ڕەنووسی (3) پیرۆزەو سەبارەت بە دوو پات کردنەوە بەکاردێت و ژمارە حەوت (7) پیرۆزترەو سەبارەت بە خاوەندیەتی بەکاردێت وەك وەی بڵێین (کابرا سێ جاران دووپاتی کردەوە یان کابرا خاوەنی حەوت فلانە شتە.
ڕەنووسی سێزدە (13) بەدزێو دادەنێن تەنانەت لە پێوان و برکردنی هەندێ شت وەکو دانەوێڵە ناوی ناهێنن و لەجیاتیدا ووشەی (زیادە) بەکاردەهێنن سەبارەت بە وەی سێزدە (13) بێبەرەکەتەو لەبریتیدا ووشەکی بەرەکەتدار دادەنێن ئەویش (زیادە)یە. بەڵام چواردە (14) بەرەکەت دارە لە وانەیە لەبەرئەوەی بێ کەوا ژمارەکە (13)نیە ئیدی ئەگەر (12)یان (14) بێ ئەوە مۆرکی بەرەکەتی پێوەیە، هەروەها ژمارە (60)یش سەبارەت بە زۆری بەکاردێت وەکو شەستەباران و ژمارە هەشتا (80)ش سەبارەت بەتوندی خێرایی بەکاردێت وەك بڵێین فلانەکەس بەهەشتایی بیرەدا تێپەڕی. بەکارهێنانی ڕەنووس و باوەڕە نهێنییەکانیان لە کوردە واریشدا بنچینەیەکی هەیەو لەخۆوە نیە دووریش نیە هەرکاری ئەو ڕێبازە بێت لە خۆرهەڵاتدا هەروەکو فیساگۆرسییەکان باوەڕیان وابوو کەوا ژمارە بۆ زانینی نهێنییەکانی سروشت یارمەتیان دەدات وباوەڕیان زانینی نهێنییەکانی سروشت یارمەتیان دەدات و باوەڕیان وابوو کەوا ژمارە تەنها شێوەیەکی جیهان نیە بەڵکو جیهان لە ژمارە پێکهاتووەو بیرکاری لایان هەموو ڕاستییەك بوو کەوا جیا نەدەکرایەوە لەمیانەی تەنی فیزیکیو ڕەوشتی ئەندازەیی.
هەروەها ڕەوشتە ئەندازەییەکانی ژمارەیان خوێندبوو ناویان لە هەندێك نابوو ڕەوشتی (ژمارە سێگۆشەییەکان)یان ژمارەکانی سێگۆشەییو لە هەندێکیتر ڕەوشتی (ژمارە چوارگۆشەییەکان) یان ژمارەکانی چوارگۆشەیی، کەوا ژمارەکانی 3 ـ 6 ـ 10 ـ 15.. ژمارەی سێگۆشەینە چونکە سێگۆشەیەك بۆی هەیە پڕ بکرێت بەژمارەك خاڵ بەیەکسانی یەکتر لەو ژمارانە کەوا خاڵەکان دووریان لەیەکتر یەکسان بێت.
وە ژمارەکانی 4 ـ 9 ـ 16 ـ 25.. ژمارەی چوارگۆشەیین چونکە چوارگۆشەیەك بۆی هەیە پڕ بکرێت لە ژمارەیەك خاڵ بە یەکسانی یەکتر لەو ژمارانەو دووریان لەیەکتریش یەکسان بێت.
فیساگۆرسییەکان ئەوەیان دۆزییەوە کەوا کۆی دوو ژمارەی سێگۆشەیی لەدوای یەك دەکاتە ژمارەیەکی چوارگۆشەیی سەبارەت بەوەو بە سروشتی گۆشەی وەستاوو سووڕاندنی پارچە سێگۆشەکە بەدەوری خۆیدا دیمانەی فیساگۆرس دۆزراوە لە ئەندازەدا کە دەڵێ (لە هەموو سێگۆشەیەکی وەستاودا ڕووبەری ئەو چوارگۆشەیەی لەسەر ژێیەکەی دروست دەبێت یەکسانە بەکۆی ڕووبەری هەر دوو چوارگۆشەکانیتر کە لەسەر لاکانی تردا دروست دەبن).
هەروەها باوەڕیش وایە فیساگۆرسییەکان توانیویانە پرسیاریش شیکاربکەن نزیك لە دیمانەکەشیان ئەویش بە دووجاکردنی لاکێشە یان کێشانی چوارگۆشە بەمەرجێك ڕووبەرەکەی یەکسان بێت بەڕووبەری لاکێشە، هەروەها تەنەرێکەکانی ئەندازەیان خوێندووە وەکو ئەو تەنانەی کە تەنیشتە ڕووەکان و گۆشەیان یەکسان بووە: شەش پاڵو (خشتەك) ـ هەڕەمی چوار ڕوو هەشت ڕوو. هەروەها فیساگۆرسییەکان گرنگییان دابووە تێکرایی ئەندازەیی أ: ب = ب: جـ کە ئەوەش لایان هێمای ئەرستۆکراتی بووەو هەوڵی وەیان داوە هەموو پەیوەندییەك ببەستنەوە بە پەیوەندییەکانی ژمارەیی کەوا ژمارە هەموو شتێکە.

**سەرچاوەکان: ـ**


1 ـ ارتقاء الانسان ج ـ برونوفسكي ـ ترجمة د. موفق شخاشيرو.
2 ـ تأريخ علوم الطبيعة د. محمد عبداللطيف المطلب.
3 ـ سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان. حمید عزیز سعید.
4 ـ فيثاغورس د ـ مصطفى غالب.
5 ـ صورة الكون د. محمد عبداللطيف المطلب.

# الفيثاغورية من منظور رياضي

نافع كاكه

كان فيثاغورث عالماً تاريخياً اكثر من ان يكون شخصاً اسطورياً، كتب عنه الكثير، بيد انه لم يترك اية كتابة بعد وفاته، وليست ثمة كتابة واضحة دقيقة تخبرنا عنه بشكل دقيق، يعتقد انه ولد عام ٥٨٠ او ٥٧٢ ق. م في ساموس، وقد قضى سطراً من حياته يتلقى علوم عصره هناك، وبعد احتلال تلك الجزيرة يضطر الى مغادرتها متوجهاً الى مصر حيث يسلخ ١٢ عاماً من عمره في اكتساب المعارف المتعلقة بعلم الفلك والهندسة، ثم يذهب مع قمبيز الى بابل ويبقى هناك قرابة ١٠ ـ ١٢ عاماً يتلقى معرفة الحساب والموسيقى والدين، ثم يمم وجهه شطر جزيرة كريت حيث كان عمره آنذاك ٦٥ عاماً يفتتح فيها مدرسة كانت تقبل في صفوفها الرجال والنساء دون تمييز، وقد انعزل فيثاغورث عن الناس مصوراً نفسه ارقى من غيره مرتبة ومركزاً ويقول: «الانسان والاله موجودان وبينهما احياء آخرون كفيثاغورث».

والفيثاغورثية حسب اتجاهها العلمي تتداخل مع الاسطورة، وتؤكد هذه على طابع ذلك العصر، حتى ان فيثاغورث نفسه يقول بأن الارض والقمر تدوران حول الشمس وان الشمس والكواكب الاخرى جميعاً تدور حول نار التي هي في المركز يسميه «مركز النار».

ويذهب علمه او معرفته الى ان «العدد او الحساب يضمن الطبيعة» حيث ثمة علاقة تشابه بين الطبيعة والاحاد في انواع التعداد والذي اكتشف اللعلاقة الاساسية بين الاوتار الموسيقية والرياضيات.

لقد اكتشف بان الاصوات الهارمونية التي تتولد نتيجة لذبذبات الاوتار وتسمع تتعادل مع تقسيم او توزيع الوتر على عدد كامل، وكان هذا الاكتشاف بالنسبة لفيثاغورث والفيثاغورثيين قوة اسطورية معقدة.

كما ان تقاطع خطين احدهما عمودي والثاني افقي يشكل زاوية قائمة ويذهب الى كيفية رسم المربع والمثلث.

استطاع فيثاغورث ان ينتشل علم الحساب من استخدامه الروتيني في الاعمال التجارية الى علم مستقل، واعتقد بان له اهمية كبيرة في النظام الطبيعي.

وكانت للموسيقى اهمية عظيمة اثناء الصلاة والاحتفالات الدينية بالنسبة لتطهير النفس من الشوائب والادران، وكان هذا الاعتقاد وحده دفعهم الى التفكير الدقيق في الموسيقي والاهتمام بالصوت، لدرجة انهم اعتقدوا بان كل شيء نابع عن الرقم واللحن والرقم له صفتان الآحاد والزوجي، الآحاد محدود والزوجي غير محدود لان له قابلية القسمة. كما انهم وصفوا خصائص سرية للاعداد حيث كان رقم (١) يرمز الى العقل وصفة الالوهية. ورقم (٢) رمز للذكر (٣) رمز الانثى، كما ربطوا بين (٢ + ٣ [redacted] ١٥ برمز فترة الخطوبة ووصفوا صفات وخصائص لاعداد اخرى.

وقد حاولوا ايضاً ربط جميع العلاقات بالعلاقات العددية لان العدد هو كل شيء بالنسبة لهم اضافة الى قضايا اخرى تتعلق بالمستطيل والمسدس والهرم ذي الابعاد الاربعة والثمانية.



# هێرشی ده هەزار جەنگاوەرەکە "هێرش بۆسەر فارس"

کەمال غەمبار لەسەری نووسیوە

**پێشەکی:**

سەردەمێك دڵمان بەوە خۆش دەکرد کە بەر لە زایین بە پێنج سەدە، مێژوونووسێکی گریکی وەك زەینەفۆن «گەزنەفۆن» باسی کوردی کردووەو بە وڵاتی کوردەواری‌دا گوزەری کردووە، هەر چەندە ئەو ساتە زانیاری‌یێکی ئەوتۆمان لەبەر دەست نەبوو، کە بزانین ئەم مێژوونووسە چۆن هاتۆتە کوردستان و چی نووسیوە، بەڵام وەك بەڵگەنامەیێکی مێژوویی گرنگ مایەی بەختەوەریمان بوو، کە ئێمەی کوردیش ناووشوورەتمان لەناو مێژوونووسانی جیهانی‌دا ون نی‌یەو لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو باسی نەتەوەی ئێمە کراوە، کە بە ئازایەتی‌و جوانمەردی ناوی دەرکردووە.

ئەو کتێبەی کە لەبەردەستمان دایە ڕووناکی‌یێکی تەواو دەخاتە سەر کوردەکانی کوردستان کە چۆن بەرەنگاری هێرشەکەی ئەو دە هەزار جەنگاوەرە بوون، کە ڕوویان کردۆتە ناوچەکەو ویستوویانە بە زۆرە ملێ خۆراکی خۆیان وەدەست بێنن و دەستیان کردووە بە تاڵان کردنی خەڵکەکە.

زەینــەفــۆن هەرچــەنــدە کە بۆ سوپـاکـەی خۆی دادەتـاشێو بە جۆرێ باسی ئازایـەتیو چاونـەتـرسان و خۆڕاگرتنیان دەکات، بەڵام بیەوێو نەیەوێ نەیتوانیوە نکـولی لە قارەمـانیـەتی کوردەکان و خۆبەخت کردنیان بکات لەپێناوی پاراستنی ناوچەکەیان دا، هەر بۆیەش ناوی کتێبـەکـەی ناوە» ئەنـابــاسس Anabasis واتــە پێ هــەڵ گەڕان یاخــود پێش کەوتـنـی سەربــازانــە، مەبـەستیشی سەرکـەوتنـە بۆ سەر شاخەکانی کوردستان پاش ئەوەی سوپاکەی کۆرش شکاو خۆشی لە شەڕدا کوژ راو گریکـەکـان ڕێگـەی کوردستـانیـان گرتـەبەر لە گەڕانەوەیان دا بۆ وڵاتی خۆیان.

**ناوەرۆك و شیکردنەوەی کتێبەکە:**

ئەم کتێبــە بریتیـیــە لە چوار سەد لاپـەڕەی قەبـارە گەورە، لەسـەر کاغـەزی سپی لە چاپخـانـەی زانکۆی مووسڵ چاپ کراوە. مامۆستا یعقوب افرام منصور لە ئینگلیزییەوە وەریگێراوەتەسەر زمانی عەرەبی. وەرگێر ساڵی ١٩٦٤ وەرگێـرانـەکـەی تەواوکردووەو مامۆستا فؤاد سفر ساڵی ١٩٦٥ وشەیێکی بۆ نووسیوەو کتێبەکە بەو جۆرە هەڵ دەسـەنگێنێ کە لەو کتێبـە مێـژ ووییانەیە کە ناوبــانگێکی جیهــانی هەیـەو مێـژ وونـووسی گریکی زەینەفۆن بە شێوازێکی دڵ کێش و ڕەوان دایناوە. ئەم کتێبــە ساڵی ١٩٨٥ چاپ کراوە، زەینــەفـۆن قوتـابی فەیلەسـووفی گەورە «سـوکـرات» بوو، بیر قووڵ و، ڕا راست و، زۆر زاناو شارەزا بوو، ئەو کتێبەی گەورەترین کاری کردە سەر ڕۆڵـەکـانی نیشتمـانـەکـەی، تەنانەت وتـراوە کە ئەنـابـاسس پەنجـەرەیێکی گەورەی بۆ یۆنان کردەوە کە بە هۆی ئەوەوە سەریان لە شارستانیەتەکانی ڕۆژهـەڵاتی کۆن خوارکـردەوە کە گەشەکردنیان لە سی ئەوان کەمتر نەبوو، دوور نییە کە ئەم کتێبە لەو هۆو پاڵ پێـوەنـەرانـە بێت کە ئەسکـەنـدەری مەقدۆنی بەرەو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی کۆن پەرەبسێنێ.

جگـە لەوانـەی باسمـان کردن کتێبـەکـە بایە ‌سیحی گەورەی هەیــە بۆ لێکــۆڵینــەوەی مێـژ ووی عیـراق و جوگــرافیـاکـەی، کە باسی بارو دۆخی کۆمـەڵایـەتیو ئابووریو جوگراف سەردەمی کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زایین دەکات.

ئەوەی کە لێرەدا شیاوی باسە ئەوەیە کە کەم کەس هەیــە شتێــك لە بارەی هێـرشـەکـەی ئەسکـەنـدەری مەقــدۆنـی بۆ سەر عیــراق نەزانی کە لە ب شەڕێکی دابری نزیك بە شاری هەولێر لەگەڵ «دا را» لەیەکیان داو لە ئەنجـام دا لە ئەنجـام دا سوپـاکـەی دارا بەزیو شکــا، بەڵام زۆر کەس هەیــە گوێ لەو هێــرشــەی فارسیو گریکی نەبـووە کە لە ئەنـازۆڵـەوە بەرەو عیراق کشـان و لەگـەڵ فارسە ئەخمینییەکان کەوتنە جەنگ و شەڕەکە لە سەعاتێکی زیاتر نەخایاندو «کۆرش»ی تێدا کوژ را کە برای «ئەرتحشتا»ی دووەم بوو، هەر دوو برا کوری «داریـۆس ـ ئاسیـای بچـووکی دەکـرد، کۆرش ویستی تاجەکە لە براکەی بسێنی، بۆ ئەم مەبەستەش سوپـــایـــێـــکـــی هەزار سەربــازی ئامــادەکــردو ئیسپـارتیـیـەکـانیش بە سوپایێکی گەورە یارمەتیان دا، کۆرش بۆ سەر ئەرتحشتــای براکــەی هێرشی بردو لە مەودای دوو ڕۆژ دوور لە بابــل پێــی گەیــشــت و لە شەڕەکەدا کوژ را، بەڵام گریکەکان نوشستیان نەهێنا، لە دەشتــەکـانی ئاشـووردا بڵاوبوونەوەو بەسەر چیاکانی «قــردو»و ئەرمـێـنـیــا کەوتـن تاکــو گەیـشتنــە شاری

«تەرابزون»، لەوێ وە بەرەو وڵاتەکەی خۆیان بۆی دەرچوون.

ئەوەی لەو نووسینەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە ڕووناکی بخەینە سەر ئەو خاڵ و لایەنانەی کە پەیوەندی‌یان بە کوردەوە هەیە نەك دوان بە دوورودرێژی لە هەندێ مەسەلەی لاوەکی‌و چۆنیەتی شەڕەکەی نێوان کۆرش و براکەی‌و بەپێی پۆیست هەندێ خاڵ ڕوون دەکەینەوە.

وا دیارە زەینەفۆن کتێبەکەی بە ناوێکی خوازراوەوە نووسیوە کە »تیمستۆجین»ەو ناوی باوکی «جریلوس»ە.

**شەڕی کۆناکساو کوشتنی کۆرش:**

چێشتەنگاو بوو کە نزیك بوو بگەنە ئەو شوێنەی کە کۆرش بڕیاری دابوو لێی بوەستێ کە «پاتجیاس» دەرکەوت و سواری وڵاخێ بوو کە عەرەقەی دەرواڕوو بەغار دەهات و یەکسەر بە فارسی‌و یۆنانی پڕ بە دەم هاواری‌کرد: «پاشا بە سوپاییکی گەورەو نیزامێکی سەربازی وا بەرەو ئێمە دێ». ئەو کاتە بە جارێ خراپ سەریان لێ‌شێوا، چونکە هەموو وایان زانی کە پاشا بەر لەوەی ئەوان شوێنی خۆیان وەربگرن هەڵیان دەکوتێتە سەر... نیوەڕۆ داهات هێشتا لەشکری پاشا دیارنەبوو، بەڵام دەمەدەمی عەسر بوو کە تەپ وتۆز وەك پەڵە هەورێکی سپی دەرکەوت، پاش ماوەیێك شتێك وەك ڕەشایی‌یێك کە بۆ مەوداییکی درێژ، درێژ دەبوەوە بەسەر دەشتایی‌یەکەوە دەبینرا. بەرەبەرە سەرەسونگی‌و سوارەو بەشەکانی لەشکرەکە دەرکەوتن. لێرەدا (کۆرش) بەسواری لەگەڵ وەرگێرەکەی خۆی‌و سێ چوار کەسی‌تر خۆیان گەیاندە لای «کلیرخوس»و بانگیان کردو ئاگاداریان کرد کە سوپاکەی بەرەو ناوجەرگەی لەشکری پاشا بەریت چونکە پاشا خۆی لەوێیە. کۆرش وتی «ئەگەر لەوێ سەرکەوین، هەموو شتێك تەواو دەبێ». بەڵام سوپاکەی پاشا لەوەدا نەبوو، هێجگار زۆر بوو کوشتارێکی گەورە لەنێوان سوپاکەی کۆرش و پاشادا کرا، گریکەکان شەڕێکی ئازایانەیان کردو زیانێکی زۆریان لە سوپاکەی پاشاداو کۆرش دڵ خۆش بوو کە گریکەکان فارسەکانیان لەپێش خۆیان دا ڕامالی‌و بانگەوازی، کردنی بەپاشای خۆیان ڕاهێشت..

کۆرش لەوە ترسا کە پاش پشت لە گریکەکان بگرێ‌و شەق وپەقیان بکات، یەکسەر بەرەو ڕووی چوو و لەگەڵ ئەو شەش سەد کەسەی لەگەڵی‌دا بوو هێرشی بردو ڕیزی سەربازەکانی پێش دەمی پاشای سمی‌و شەش هەزار کەسی شکاند، پاشان دەنگ وابڵاوبۆوە کە بە دەستی «ئەرتاجرسس»ی سەرکردەکەیان کوژرا، بەڵام کە ڕایان کرد ئەو شەش سەد کەسەی کە لەگەڵ کۆرش بوون لە کاتی هەڵمەت بردن و تەکان دانیان پەیوەندی‌یان تێك چوو و نەیان توانی ڕاویان بنێن و بەدوایان بکەون و ژمارەییکی زۆر کەم دواکەوتن، کە زۆربەیان لەو کەسانە بوون کە کۆرش ناوی نابوون «هاورێ نانی»، کە لەگەڵ ئەو ژمارە زۆر کەمە مایەوە پاشا چاوی پێ‌کەوت و هاواری‌کرد «پیاوەکە دەبینم»و بێ‌سڵەمینەوە پەلاماری‌داو زەبرێکی ئاراستەی سنگی کردو قەڵغانەکەی سمی‌و بریندار‌بوو، دەش ڵێن کۆرش بە شمشێرەکەی خۆی، خۆی کوشت و هەر چۆنێك بێت کۆرش کوژرا. لەو قۆناخەدا سوپای پاشاو گریکەکان ماوەی سێ میل لێك دووربوون، گریکەکان ئەو هێزانەیان ڕاو دەنا کە ڕووبەڕوویان ببوونەوە وەك بڵێی سەرکەوتنێکی باشیان بۆرەخساوە، فارسەکان خەریکی تاڵان کردن بوون وەك بڵێی سەرکەوتنەکەیان تەواوە، بەڵام گریکەکان پاش ئەوە بۆیان دەرکەوت کە پاشاو سەربازەکانی بوونەتە کەلوپەلی ئەوان، پاشا گوێی لە «تیسافرنوس» بوو کە یۆنانی‌یەکان ئەو

لەشکرانەیان بەزاندووە کە ڕوو بە ڕوو یان بوونەتەوەو لەسەر ڕاونانیان بەردەوامن، ئەو حەلە هێزەکانی خۆی گردکـردەوەو بە شێـوەیێکی جەنگی ئامـادەی کردن و هەنگـاویـان هەڵ هێنـاو کە گریکـەکـان دیتیـان کە ریزگرتنیان پتەوو توکمەیە بەرامبەر فارسەکان سەرلەنوێ سروودی کوشتاریان گوت و بە گیانێکی دوژمنکاری لە هی پێشوو بەهێزتر پەلاماریان دان، فارسەکان بەرامبەر پەلامـارەکـە خۆیـان نەگرت و رایان کرد و گریکەکان بە دوایان کەوتن.

کە خۆر خەریك بوو ئاوابێ گریکەکان وەستـان و چەکی خۆیـان کۆکردەوەو ئیسراحەتیان کرد، لە هەمـان کات دا سەریـان سـورمـا کە «کـۆرش» لە هیـچ شوێنێکـەوە درنەکــــەوت و کەس هەواڵێکی بۆ نەهـــــــــــێنان . . . پاش ئەوەی لەبـابـەت مانەوەیان راوێژ یان کە شتومەکەکانیان بێنن یاخـود بگـەڕێنـەوە سوپـا گاکەی خۆیان، بڕیاری گەڕانـەوەیـان داو دەمی شێوان گەیشتەوە خیوەتەکانیان، بۆیـان دەرکـەوت کە هەمـوو کەلـوپـەل و خۆراك و خواردنـەوەیـان تاڵان کراوە، لەبـەر ئەوە کەم و کووڕیێکی زۆر کەوتە ناو ئازووخەی سوپاکەیان، بە جۆری زۆربەی گریکەکان بێ شێو مانەوە، لەراستیدا نانی نیوەڕۆشیان نەخوارد بوو. ئەمشەوەیان ئاوا بەسەر برد. بۆ بەری بەیـانی سەرکـردەکان کۆبوونەوە، لەگەڵ ڕۆژهـەڵاتن هەواڵی مەرگی «کـۆرش»یان پێ گەیشت، کە ئەم هەواڵـەیـان بیـست نائـومێـدیێکی گەورە دایگـرتن چ بکـەن باشـە؟! چێشتـەنگـاو بوو کە هەواڵدەران لەلایەن پاشاوە گەیشتن و هاتبوون کە قسە لەگـەڵ سەرکـردە گریکـەکـان بکـەن و پێیان گوتن کە پاشـا سەرکـەوتـووەو کورشی لەنـاو بردووە، داوایـان لێ دەکـات کە چەکـەکـانیان دانێن و بێنە دەباری پاشاو ئەگەر بتوانن بەخششی پاشایەتی بۆ خۆیان وەربگرن، کە ئەو قسانەیان کرد گریکەکان ڕقیان هەڵ ساو پێیان گوتن کە سەرکـەوتـوو، چەك دانـانێن، (کلینـۆر)ی ئەرکادی کە بە تەمەن ترینیان بوو وەڵامی دانەوە «ئەوان بەرلـەوەی چەکـەکـانیان دانێن دەمرن. پاش ئەوەی کە زۆر لە سەرکـردە گریکـەکـان هەر یەکـە بەجـۆرێـك مەسـەلـەکـەی شی کـردەوە لەدواییدا لەسـەر ئەوە ڕێـك کەوتـن کە چەك فڕێ نەدەن و خۆیـانـی پێبپـارێـزن. پاشان (فالینۆس) گوتی: پاشا ئاگاداری کردووین کە پێتان ڕابگەینین کە ئێستا ئێوە لێرەن ئەوە شەڕ ڕاگـرنـنـە لە نێـوان ئێمـەو ئێودا، بەڵام ئەگەر چ بۆ پێشـەوە، یـا پاشـەوە بجـوولێن ئەوە مانـای شەڕ کردنە، لەبـەر ئەوە داوای وەڵام دانـەوەی ئەم خاڵـە دەکـەم. «کـلیـرخـۆس» وەڵامـی دایـەوە: ئێمـەش هەمـان بیـرکـردنـەوەمـان هەیـە. «فالینۆس» گوتی: مەبەستت چییـە؟ کلیـرخـۆس پێی گـوت. مەبەستم شەڕڕاگرتنە ئەگەر مانەوە، شەڕکردنە ئەگەر بۆ پێشەوە هاتین یاخود گەڕاینـەوە لە ئەنجـام دا «کلێـرخـۆس» بووە سەرکردەی گریکەکان، کە پیاوێکی خاوەن تاقیکردنەوەو بەهۆش بوو. هەموو لایێك سوێندیان خوارد کە ناپاکی لەیەکتر نەکـەن و سوێنـدخـۆری ڕاستگـۆ بن. «ئـەرێـوس» کە سەرکردەیێکی یۆنانی بوو پێشنیازی ئەوەی کرد کە بەو ڕێگـەیـەدا نەگـەڕێنـەوە کە پێیدا هاتـوون، بەڵکـو ڕێگەیێکی دوورتر بگرنە بەر، کە پێویستیان بە ئازووخە نەبێ و لە سوپـای پاشـا دوور بن، کە نەتـوانێ خۆی کۆبکاتەوەو بەسەریان دا بدات. هەرکە تاریکی داهات پێشـەنگی سوپـای گریکـەکـان توانی خیوەتگایێك ساز بکات، بەڵام ئەوانەی دوایی گەیشتن خیوەتی خۆیان لێ هـەڵ دا قاوقیـژ و غەڵبـە غەڵبێکی زۆریـان نایەوە کە

یەکتــریــان بانــگ دەکــرد تەنــانــەت دوژمن گوێی لێیـان بوو، بە جۆرێ ئەوانـەی لێوەیانەوە نزیك بوون لە خیـوەتـەکانی خۆیان دا ڕایان کرد، تەنانەت پاشاش ترسی لێنیشتبــوو، گریکــەکـانیش ترسێکی ناوەخت دایگرتن بەڵام کلێرخۆس ترسەکەی ڕەواندنەوە کە بە «تــۆلمیــدس»ی بانگــدەری ڕاگــەیـانــد کە فەرمـانی بێدەنـگ بوون و کپی بدات پاشـان دەست بکـات بە بانــگ ڕاهێشتن کە «ســەرکــردەکــان جاڕ دەدەن ئەو کەسەی زانیاری لەمەڕ ئەو گوێدرێژە بێنی کە لەنێوان چەکــەکــان دا بەرەڵــلا بووە ئەوە دە هەزار جونـەیهی دەدرێتێ» کە سەربـازەکـان لە بانگـەکە گەیشتن دڵ نیا بوون کە ترســەکــەیــان شتــێــکــی ڕاســت نییــەو سەرکردەکانیان لە مەترسی دوورن.

«تیسافرنۆس» چەند کەسێکی نارد کە لە مەرجەکان بدوێن، «کلێرخۆس» پێی گوتن جارێ دەبێ لەپێشەوە شەڕ بکەن چونکە قاوڵتیان نییەو هیچ گریکێك حەدی ئەوەی نییە کە لەگەڵ یۆنانییەکان لەمەڕ مەرجەکانەوە بدوێ هەتاکو قاوەڵتیان بۆ نەهێنێ، کە هەواڵدەرەکان بە پەلە ڕۆیشتن و خێرا گەڕانەوەو پاش مشت ومڕێکی زۆر شوێنی دەسکەوتنی ئازووخەیان پێشان دان و کە کاتی لواو داهات کلێرخۆس وەڵامی دانەوە کە پەیمانی شەڕ ڕاگــرتــن دەبــەستێو پێیگــوتن کە یەکســەر شوێنی ئازووخـەیـان پێشـان دەن، وێـڕای شەڕ ڕاگرتن لەگەڵ سوپاکەی بەشێوەیێکی جەنگی ڕێگەی گرتەبەرو خۆی سەرکردایەتی پاشەنگەکەی کرد، تووشی چەند جۆگەو جۆبـارو ڕووبـار بوون و پردیـان بە دارخـورمای کەوتوو دروست کردو بەســەریـان دا ڕۆیشتن و پەڕینـەوە. پاش ئەوەی گەیشتنـە دێیـەکـان ڕابـەرەکان پێیان گوتن کە دەتـوانن ئالیـك و مەیو سرکەیان دەسکەوێت هەروەها چەند جۆرە خورمایێك.

پاشــان «تیســافــرنــۆس» بە سیفەتی پەیامبەر لەلایەن پاشـاوە هات و لە گوایـە پاشـای قەناعەت پێهێناوە کە ببێتـە ڕێنیشــاندەریان، ئەوانیش داواکەیان قبووڵ کرد بەڵام بەگـومـانـەوە. گریکـەکـان بیست ڕۆژ چاوەڕوان بوون هەتـا «تیســافــرنــۆس» گەڕایەوە، بەڵام ڕیزەکانی خۆیـان تێـك نەدابـوو و بەیـەکەوە نووسابوون و خۆیان قایـم کردبــوو، چونکـە لەو ڕایــەدا بوون کە پاشـا بە خۆڕایی نییــە کە هانمـان دەدات بمێنینەوەو هەر کاتێ هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە پەلامــارمــان دەدات، لەو ماوەیــەدا «تیســافــرنــۆس گەیشت و لە ڕواڵەت دا نیازی گەڕانەوە بوو بۆ نیشتمان.

**ڕێگرتنەبەر بە گومان لێك کردن:**

هەر دوو لا دەستیان کرد بە ڕۆیشتن، «ئاریوس»یش لەگـەڵ «تیســافــرنــۆس»و «ئــۆرونتاس» پێکەوە خێوەتیان هەڵ دا، گریکـەکـان بە گومـانـەوە سەیـریان دەکردن، بۆیــە لە کاتــی ڕێــگــەدا بە تەنــیــا دەڕۆیــشــتــن و ڕێنیشــانــدەری تایبەت بە خۆیان بەکاردەهێنا، نێوانی هەر دوو لەشکــرەکـە لە (٣)میـل کەمتـر نەبـوو. پاش ڕۆیشتنی سێ ڕۆژ گەیشتنە شوورەی مادی، دوای ئەوە لە ماوەی دوو ڕۆژدا (٢٤)میل ڕۆیشتن و لە دوو چەم پەڕینـەوە پاشـان گەیشتنـە شارێکی قەڵـەباڵغ کە ناوی «سیتــاس» بوو میــل ونیـوێـك لە دیجلەوە دوور بوو. پاش شێوان یەکێك هات گریکەکانی ئاگادار کرد، کە سوپـاکـەی «تیسافرنۆس» شەوێ هێرشتان دەکاتەسەر و لە باخچەکەی نزیکتانەوە هێزێکی گەورە هەیە، ئاگاتان لە خۆ بێو پاسەوانییێکی قایم و توند لەسەر پردەکەی دیجلە دانێن، چونکـە ئەگـەر تیسـافـرنـۆس بتوانێ شەو تێکیدەدات تاکـو نەتـوانن بپـەڕنـەوەو لە نێوان ڕووبارو نۆکــەنــدەکـەدا دادەبـڕین. گریکـەکـان بەسـەر فێڵی

فارسـەکـان کەوتن و لەگـەل گەردی بەیـانی لە پردەکـە پەڕینـەوە، پاش ڕۆیشتنی ١٥٠ میل لە ماوەی دە ڕۆژدا بەناو میدیادا تا گەیـشتنـە ئەو گونـدانـەی کە سەر بە دایکی کۆرش بوون، تیسـافـرنـۆس بۆ ئەوەی سووکی بە (کـۆرش) بکات ڕێگەی یۆنانی‌یەکانی‌دا کە بە ئارەزووی خۆیان تالانی خەلەو خەرمان و مەرو مالات و شتی‌تری بەنرخ بکەن و کوێلە نەبێ.

پاش ڕەوتـی(٦٠) میـل دیجلەیـان بەجێ‌هێشت و تێبینی شارێکی دەولەمەندیان کرد کە ناوی «کانیای»بوو کە شوێنێکـە نزیـك لە شوێنی ئێستـاو دەوترێ «قەلای کیژ ۆلە»و لە خواروی شەرقاتە. خەلکەکە نان و پەنیرو شەرابیان بۆ هێنان، لەوێ‌وە بە کوندەی پف دراودا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە

**غەدرکردنی تیسافرنۆس:**

---

پاشان گەیشتنە زێی‌گەورە، لەوێ (٣) ڕۆژ مانەوە، لەو ماوەیـەدا هیـچ نیشـانـەیێکی کاری نارەوا لەلایـەن تیسـافـرنۆسەوە دەرنەکەوت، کلیرخۆس بڕیاری‌دا بەپیێ توانا لە گەلی‌دا کار بکات و ئەو گومانە بن بر کات کە بۆتە هۆی دوژمنکاری‌یێکی ئاشکرا، گفتوگۆیێکی زۆر لەنێوان هەر دوو لا کرا بۆ ئەوەی دلیان لە گومان پاك بکەنەوەو بروا بە یەك بێنن بەلام تیسافرنۆس هەرچەند بە ڕوالەت خۆی وانیشان دا کە مەبەستی بەرژەوەندی‌و خزمـەتگـوزاری گریکـەکانە کەچی لە ئەنجام دا کاری نامەردانەی خۆی کردو داوەتی «کلیرخۆس»ی و چەند سەرکـردەیێکی کرد بۆ خواردنی شێـوان و بە پیـلان‌گرتنی بۆلای پاشـاکـەی خوی ناردنی لەوێ ملیـان پەڕانـدرا.

لێرەوە باسی زەینەفۆن دەکەین کە جلەوی سەرکردایەتی سوپاکەی کردو بەرەو کوردستانی عیراق هەنگاوی نا.

**بەرەو کوردستانی عیراق:**

پاش گرتـنـی سەرکـردەکـان و کوشـتـنـی سەد ئەفسـەرەکـەو ئەو سەربـازانـەی کە لەگـەلیـانـا بوون، گریکـەکـان تووشی بارو دۆخێکی پەشێـوو نارەحـەت بوون، وەك سەیـریـان کرد لە هەمـوو لاوە دەورەیـان دراوە، چاوەڕوانـی ئەوەیـان نەدەکـرد کە کەس کەل وپـەلیـان پێ‌بفرۆشێ، ڕابەرێك نی‌یە ڕێنوێنی‌یان بکـات، لەنێـوان چەنـد ڕووبـارو چەمێـك دا گیـریان خواردووەو ناتوانن لێ‌یان بپەڕنەوەو بگەڕینەوە نیشتمان، تەنـانـەت فارسـەکانیش لێ‌یان هەلگەڕانەوەو دەستیان برین، بۆیـان ئاشکـرا بوو ئەگـەر سەرکەوتنیش وەدەس بێنن ناتـوانن هیـچ کەس لە دوژمنـانیـان بکـوژن، خۆ ئەگەر بشکێن نەفەرێکیان ڕزگار نابێت. خەم و پەژارەو نائـومێـدی دای‌گـرتن، ئەو ئێـوارەیـە کەم کەس لەوانـە نانیان خواردو ئاگریان کردەوە، بەلام لێ درێژ بوون و خەو نەچووە چاوی کەس، هەموویان تاسەو شەیدای نیشتمان و دایك و باوك و مندال و خێزانەکانیان بوون و وایان زانی کە جارێکی‌تر نایان بێننەوە.

پاش ئەوەی چەنـد سەرکـردەیێـك قسـەیـان کرد، «زەینەفۆن»یش قسەی خۆی کردو گوتی:

**«ئالێرەدا یەك شت هەیە کە هەمووسان دەی‌زانین، پاشاو تیسافرنۆس هەموو ئەوانەی بە دەستمان کەوتبوو بۆ خۆیـان برد، ئاشکـراشـە سوورن ئەگـەر بۆیـان بکرێ، ئەوەی کە ماویشمانە تەفرو تۆنای بکەن، وەك دەبینم دەوری ئێمە ئەوەیە کە هەر شتێ پێمان بکرێ بی‌کـەین تاکـو نەهێلین بکـەوینـە بەردەست فارسـان، بەلکو وا چاکترە بۆ ئێمە کە مسوگەری بکەین ئەوان لە بەردەستی ئێمـەن....** هتـد، پاشان لەسەر قسەکانی دەڕوات و پێشنیـازی دانـانی ژمـارەیێکی پێـویست لە سەرکـردەو ئەفسـەر دەکـات و دەلێ: **دەبێ ئەوە بزانن**

ژمـاره زۆری‌و چەنـد هێـزێـك سەرکـەوتن لە شەڕدا وەدەس ناهێنن، نەخێـر کە لایێـك دەچێتـە پێش دژی دوژمن و وەرو هێـزێکی مەعنـەوی هەیـەو خوداوەندی لەپشتەوەیە، دوژمن وەك بنکەیێك خۆی لەبەر ناگرێ، هەروەك تێـبـینـی ئەم خاڵـەم کردووە لە بارەکـانـی سەربازیدا، ئەو کەسانەی کە تاکە ئامانجیان ئەوەیە کە سەر سەلامـەت بێ، تاسـایی مەرگێکی کلۆلانـەی سووکانە دەمرن، کەچی ئەوانەی پەی بەوە دەبەن کە مردن تووشـی هەمـوو خەڵـکی دەبێ، هەوڵ دەدەن مەردانە بمرن، بە زۆری تەمەنیان درێژ دەبێ‌و ئەگەر بژین ژیانێکی بەختیارتر ڕادەبوێرن، ئەمانە ڕاستین و دەبێ دەرکی پێ‌بکـەن و نیشـانی بدەن کە ئێـوە پیـاوی ئازاو بە وەجن و داوا لە هی‌تـر بکـەن کە شوێن پێی ئێوە هەڵ گرن».

پاش ئەم دوانە هی‌تر قسەیان کردو چەند ئەفسەرێك هەڵ بژاردران کە شوێنی ئەوانـەی بەدەست فارسـەکان کوژران بگرنەوە.

زەینـەفـۆن نایـاب ترین جلی سەربـازی لەبـەر کرد وای‌زانی کە خواوەنـد سەرکـەوتنی پێ‌بـەخشیـون، سەرکـەوتن چاکتـرین چەکی گەرەکـە، کلنیـۆر باسی غەدرو خیـانـەتـی فارسـەکـانی کردو گوتی ئەگـەر مەبەستمان چەك سەندن بێ بە دەستی خۆمان و ناچار کردنیان بێ کە نرخی تاوانەکانیان بدەن و لە دوارۆژدا لە دژ یـان دا جەنگێکی ڕەخسـاو بجـەنگین، ئەو حەلە ئاسمان یاریدە بێ کۆمەڵێك هیوای مەزنمان هەیە لە دەربازبوون دا»

هەر ئەو قسانەی کردو نەکرد هەتا یەکێکیان پشمی‌و کە سەربـازەکـان گوێیـان لە پشمینـەکـە بوو هەموویان چۆکیان دادا پێکەوەو سەجدەیان بۆ خواوەند برد کە ئەو نیشـانـەی دەرکـرد. . . پاش ئەوە زەینـەفۆن قسەی‌تری کردو گوتـی : «ئـیـوە شیـاوی ئەوەن پیـاوی ئازاو ڕەشیـدبن و، ئازاو جوانمـەرد، لە ناخـۆشی‌دا دەربـاز دەبن، ئەوەتان بێتەوەو بیر کە فارسەکان بە سوپایێکی گەورەوە هاتنە سەر «ئەثینا»و وایان نازانی لەسەر زەوی ڕەشی دەکـەنـەوە، بەڵام ئەثینی‌یەکان ئازاو چاونەترس بوون، ڕووبەڕوویان بوونەوەو شکاندنیان.».

پاش ئەوەی زەینەفۆن کۆمەڵێك پێشنیاری‌تری کردو کەس بەرهـەڵستی نەکـردو پێی‌گـوتن سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە جەنگاوەرەو شەڕکەرە، زیان کەرەکانیش کوژ راوەکانن.

**گریکەکانی دووچاری قۆچەقانی‌و تیرباران دەبن:**

لەگەڵ کۆتایی قسەکان و گردبوونەوەیان هەڵ سان و ڕاپـەڕین و ئاگـریـان لە گالێسکـەو خیوەتەکانیان بەردا، هەر کەسێ کەلـوپـەلی زیـادی ویست لەنـاو خۆیان دا دابـەشیـان کرد و ئەوی مایـەوەش خستیـانـە ئاگـرەوە، پاشـان قاوەڵتی بەیـانیـان خواردو دوایی لە زێی گەورە پەڕینەوەو بە شێوەیێکی جەنگی لەگەڵ ولاخی بارهەڵگر لەناو چوارگۆشەیێك دا ڕۆیشتنی، کەمێك دوورکەوتنەوە «میثـریـداتس» دەرکـەوت بەخـۆی‌و نزیکـەی دوو سەد سوارەو نزیکەی چوار سەد تیرهاوێژ و قۆچەقانی هاوێژ، ئەوان چەکی سووکیان پۆشیبوو و زۆر خێرا غاریان دەدا.

بەڵام میثـریـداتس بەرەو گریکـەکان چوو وەك بڵێی دۆستیـانـە، هەرکـە هەر دوو لا لە یەك نزیـك بوونـەوە پیـاوەکـانی میثـریداتس پیادەو سوارەیان لەپڕ تیربارانیان کردن و ئەوانتـریش قۆچـەقانیان هاوێشت، هەندێکیان زامدار کرد، پێشەنگی گریکەکان زۆر پەریشان بوون، بەڵام نەیـات توانی وەك ئەوان بکـەن، چونکـە وەك ئەوان تیرەکانیان بری نەدەکرد، ئینجا زەینەفۆن بڕیاری دا کە بۆ دواوەیـان ڕامـاڵی، بەڵام لە کاتی ڕاونـانیـان

کەسیان پێ نەگیراو لە کاتی کشانەوەی دوژمنەکانیان زیانێکی زۆریان تووش بوو، تەنانەت کە لەسەر پشتی ولاخەکانیشیان بوون هەڵ دەهاتن گریکەکانیان بریندار دەکرد. لێرەدا زەینەفۆن سەرزەنشت کرا چونکە لە جەرگەی سوپاکەدا دوور کەوتەوەو هیچ زیانێکی بە دوژمنەکان نەگەیاند. ئەم شەڕەی کە بەرەنگاری بوون وای لێ کردن کە پارەیێکی زۆر بدەن بەو کەسانەی کە قۆچەقانی دروست دەکەن و ژمارەیێکی زۆر بنە قۆچەقانی هاوێژ و لەگەڵ سوپاکەی گریکەکان بن نەك جارێکی تر تووشیان بینەوەو پەریشانیان بکەن، ئەم ڕۆژە وەستان و بۆ ڕۆژ دووەم لە هەستان و دەبایە لە جۆگەکە بپەڕنەوە لە ترسی ئەوەی تووشی دوژمن نەبن، پەڕینەوە «پێش ئەوەی «میثریداتس» سەری دەربێنێ ئەم جارە هەزار سوارەو چوار هەزار تیرهاوێژ و قۆچەقانی هاوێژ ی لەگەڵ بوو. ئەم ژمارەیەشی لە «تیسافرنۆس» دەسکەوتوو بوو و بەڵێنی پێ دابوو ئەگەر ژمارەیێکی ئاوا جەنگاوەری هەبێ ئەوە بە ئاسانی گریکەکان دیل دەکات و دەیان داتە دەست ئەو، لە نرخ کەم کردنەوەی گریکەکانی لەسەر بنەچەیە حیساب کردبوو کە لە هەڵمەتی یەکەمی دا هەرچەندە کە هێزەکەی کەم بوو کەچی تووشی زیان نەبوو بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو زەرەیێکی گەورەی لەوان دا.

بەڵام کە هێرشیان هێنا ئەم جارە خراپ شکان، زۆر لە پیاوەکانی فارسەکان کوژران و هەژدە کەسیش بە دیل گیران، گریکەکان لە خۆیانەوە دەست پێشخەری یان کرد لە شەق و پەق کردنی لاشەکانیان بۆ ئەوەی ترسێکی گەورەتر بخەنە ناو دوژمن. پاش ئەم ڕاکردنەو شکانەی دوژمن، گریکەکان ڕێگەیان بە دڵنیایی گرتەبەرو گەیشتنە شارێکی گەورەو چۆڵ کە پێی دەوترا «لاریسا»و لە کۆنەوە میدی یەکان لێ دادەنیشتن. دوای ڕویشتنی ١٨ میل گەیشتنە قەلاتێکی سەخت و قایم، نزیك شاری «مسیلا» کە ڕۆژی لەڕۆژان ئاوەدان بوو و شوێنی میدی یەکان بوو، پاش ئەوەی بە دەیان میلی تر ڕێگەیان بڕی و تووشی فارسەکان بوون و شەڕیان لەگەڵ کردن و زۆریان لێ کوشتن و خۆیان چاك کۆکردەوەو چەند جارێك هێرشیان بردە سەر فارسەکان و شکاندنیان و بە هەموو لایێك دا رایان کرد، ناچاربوون ڕێگەیان بگۆڕن ئەو ڕێگەیە بگرن کە دەیان گە یێنێتە ئەو دێیانەی کە تاگریان تێدا نەکرا بۆوە، ئەو گوندانەیان سووتاند کە تیایان دا جمان بۆ ئەوەی نەهێلن دوژمن لێیان نزیك بنەوە، بەڵام سەریان سوورما بوو چی بکەن باشە، ناچاربوون بیر لە حاڵی خۆیان بکەنەوە سەرکردەکان کۆبوونەوەیێکیان کرد، دیلەکانیان هێنا لەو ناوچانەیان پرسی کە دەورەیان داون پێیان گوتن کە خوارووی بەرەو بابل و میدیایەو ڕێگەی بەرەو ڕۆژهەلات بۆ شوشەو هەمەدان دەچێ و ڕێگەی بەرەو ژووروی بەسەر چیاکانەوە بۆ لای (کەردۆکان) کوردەکان دەچێ و بۆیان ڕوون کردنەوە ئەو نەتەوەیە, چیانشینن و زۆر ئازان و مل کەچی پاشا نین، لەڕاستیدا سوپایێکی پاشا کە سەدو بیست هەزار کەس دەبوو جارێك غەزووی ولاتەکەی کردن لەبەر سەختی و ڕەقەنی ڕن زەوی یەکەی یەکیان بەسەلامەتی لێ نەگەڕایەوە. . . سەرکردەکان بەتەواوەتی لەو زانیاری یانە گەیشتن و لایەکیان لەو کەسانە جیاکردەوە کە شارەزاییان لە ڕێگاویان دا هەیە لە هەموو لایەکەوە هیچ شتێکیان دەرنەبڕی کە چ ڕێگەیێك دەگرنەبەر، بەڵام بیریان لەوە کردەوە کە پێویستە «کوردستان» لە ڕێگەی چیاکانەوە داگیربکەن، چونکە ئەوان بە پێی قسەی دیلەکان هەر کە لەو کوردانە تێپەڕبن دەگەنە ئەرمینیا کە ولاتێکی

بەرین و دەوڵەمەندەو «ئۆرونتاس» حوکمداری دەکات، لەوێوە وەك دیلەکان گوتیان ـ پیاو بە ئاسانی بە هەر لایەك دا حەزبکات دەتوانێ بڕوات. بۆ موبارەك باوی ئەم مەبەستەیە قوربانیان پێشکەش کردو فەرمانیان دا کە پاش نانی شێوان هەر کەسە خۆی بپێچێتەوەو ئامادەبێ کە شوێن ئەفسەرەکانیان بکەون کە فەرمانیان بۆ دەردەکرێ.

**بەرەو کوردستانی عیراق:**

هێشتا شەوی بەبەرەوەمابوو کە ئیشارەتەکە دراو راپەڕین و بەرەو چیاکە بۆی دەرچوون و بەرەبەیانی گەیشتنە تەپلە سەری، سوپاکە هەموو رارەوەکانی بری، بەرەو گوندی ناو چیاکان چوون، خەڵکەکە یەکسەر لە ماڵ دەرچوون و بە خاوو خێزانیانەوە روویان کردە شاخەکان، خواردەمەنییەکی زۆر بۆ گریکەکان بەجێ ما، زۆر دەفرو هەورو ئامانی مس لە ماڵەکان دا هەبوون، یۆنانییەکان شتێکیان لێ نەبردو بەدوای خەڵکەکە نەکەوتن، ویستیان بە نەرم و شلی لەگەڵیان بجووڵێنەوە، رەنگە بێ ئەوانە دوژمنی پاشابن و رێگەیان دەدەن بە سەلامەتی لە هەرێمەکەیان و گوزەر بکەن، بەڵام خۆراك شتێکی پێویست بوو، هەرچی کەوتە دەستیان بردیان، خەڵکەکە گوێی پێنەدان کە بانگیان کردن و، لە راستیدا هیچ نیشانەیێکی دۆستایەتیان بەرامبەر گریکەکان دەرنەخست.

کە دواکەس لە لوتکەکەوە بۆ ناو گوندەکان شۆڕ بۆوە، ئەو حەلە تاریکی داهاتبوو، سەرکەوتن و دابەزین رۆژێکی تەواوی خایاند، ئەو حەلە دەستەیێك لە خەڵکەکە هێرشێکیان بردە سەر پاشبەندی گریکەکان و هەندێکیان لێ کوشتن و هی تریان بەردو تیر بریندار کرد، هەرچەندە کە ژمارەی کوردەکانیش کەم بوو، کەچی لە ناکاو گریکەکان بەسەریان دا وان، لەراستیدا ئەگەر ژمارەیێکی زیاتریان لەگەڵ بوایە لەوانەبوو بەشێکی زۆر لە سوپاکە قڕ بکەن.

لەبەر ئەوە ئەو شەوە لە دێیەکان دا مانەوەو کوردەکانیش لەسەر چیاکان ژمارەیێك مەشخەڵیان داگیرسان لە دەورەی خۆیان دا. بەیانی بەهێزترین چواریێیان لەگەڵ خۆ برد کە شتومەکەکانیان هەڵ بگرن و هەموو کۆیلەکانیان بەرڵلاکرد چونکە ژمارەیێکی زۆر لە چوار پێی باری کەلوپەل و کۆیلە دەبووە هۆی خاوو خلیسکی رێگەبرین و ژمارەیێکی زۆر لە پیاوی بەرپرسیار لەوە کارێکی بێسوود بوو، لەگەڵ ئەو هەموو ژمارە زۆرە خەڵکەی لەگەڵیانە دەبوایە دوو ئەوەندە ئازووخەی پێویستیان پێ بێ، بۆیە لە رێگەی بانگ راهێلەرەوە فەرمانەکانیان دەرکردو جێبەجێ کران.

کە نانی بەیانیان خوارد بۆیدەرچوون، رۆژی دووەم رەشەبایێکی پیس هەڵیکرد، بەڵام دەبوایە هەر برۆن چونکە ئازووخەکە بەشی نەدەکردن، کوردەکان «زەینەفۆن بە دوژمن ناویان دەبات ـ ك.ع ـ» چەند هێرشێکی توندوتیژیان هێناو لە رارەوە تەنگەبەرەکان دا خۆیان دانووساند، ئەمەش وایکرد کە گریکەکان لەسەرخۆ برۆن، کوردەکان تیر بارانیان کردن و هی زۆر ئازایان لە گریکەکان کوشت و بریندار کردو ناچاریان کردن کە لە هەمان کات دا کە دەکشێنە دواوە شەڕیش بکەن، چونکە کوردەکان شوێنی سەخت و دژیان لە چیاکان و رێرەو رەوەزەکان دا گرتبوو و خۆیان لێ قایم کردبوو.

زەینەفۆن چەند کەسی لە کوردەکان بەدیل گرت، هەندێکی لێ کوشتن و بریاریان دا کە سوود لە هەندێکی تر ببینن تا هەرێمەکەیان پێشان بدەن،

هەرەشـــە لە کوردێ کرا کە ئەگـــەر شارەزای بەرێگەیێکی‌تر هەبێ پێی نەووتن و کوشتیان.

**کوشتار لە چیاکان دا:**

پاش نیـوەڕۆ کۆمـەڵێـك جەنگـاوەر بەرەو شاخـەکان تەگبیری ئەوەیان کرد ئەگەر بەرزایی‌یەکە بگرن دەبێ شەوێ ئێشـك بگـرن و بەیـانی ئیشـارەتی هێـرش بردن دەرکـەن و ئەوانـەی لەسـەر لوتکـەکەن پەلاماری چیایی‌یەکان بدەن کە دەسـەڵاتیـان بەسـەر ڕێڕەوی دەرەوەی دۆڵەکەوە هەیە کەچی پێویستە ئەوانی‌تر بەو بەری خێرایی‌یەوە بگەنەوە ئەوان.

پاش ئەم ڕێـك کەوتنـە لەسـەر کێشـانی ئەم نەخشەیە، نزیکـەی دوو هەزار پیـاو ڕاپـەڕین، ئەو حەلـە دایە ڕێژنەی باران، زەینـەفـۆن لەگـەڵ پاشبەندی سوپاکە بەرەو دەربوونە ئاسایی‌یـەکـەی دۆڵـەکە چوو کە سرنجی کوردەکان بۆ ئەم ڕاڕەوە ڕاکێشێ، بۆ ئەوەی ئەو کەســانــەی ئێشیــان پشت لێ‌گـرتنی کوردەکـانـە ئاشکرانەبن. کە پاشەنگەکە گەیشتە جۆگـەیێـك دەبـوایـە لێی‌بپـەڕێتـەوە تا ڕێگـەی خۆی بەرەو بەرزایی‌یەکە ببڕێ، کوردەکان بەردی گەورە گەورەیان گلۆر دەکردەوە کە هێندە گەورە بوون پڕ بە عەرەبانەیێك بوون، لەبـەر ئەوە نزیـك بوونـەوە لە ڕاڕەوەکـە تا بڵێی زەحمەت و گران بوو، کە دە هەزار سەربازەکە دیتیان کە عەملیات لە یەك لا ناکـرێـت، هەوڵیــان بۆ شوێنی‌تـر داو بە ڕاستی بەردەوام بوون، هەتاکو شەو داهات، وەکە وایان زانی کە پاشـەکشێیـان دیـارنی‌یـە، بۆ شیـوٚ خواردن گەڕانەوە، لەناو پاشەنگەکە هی وا هەبوو تەنانەت نانی بەیانیشی نەخوارد بوو، بەڵام کوردەکـان بەردەوام بە درێـژایی شەو بەردیـان غلۆر دەکردەوەو گرم و هۆری دەهات.

لە نیـوەشـەودا ڕێـك کەوتن و لەگـەڵ گەردی بەیانی گردبـــوونـەوەو کش ومـات بەرەو دوژمن چوون، لەبـەر ئەوەی کە تەم بوو نەبینــران، و لە کوردەکـــان نزیـــك بوونـەوە، بەڵام هەر کە یەکتـریـان بەدی‌کـرد دەنـگ و هاواری شەڕ بەرز بۆوە کوردەکان ڕێگاکەیان چۆل کردو ڕایان کردو ژمارەیێکی کەمیان لێ‌کوژرا چونکە مرۆڤی خۆش بەزبوون.

کە فریســوفـۆس» گوێی لە شەیپوور بوو یەکسـەر هێرشیان بۆ سەر لوتکەی چیاکە بردو هەندێ سەرکردە بەرەو ڕێگای تر چوون کە پێ خوستی کەم لەسەر بوو، ئەوانــە زوو شوێنی خۆیـان گرت، زەینـەفـۆن لەگـەڵ پاشـەنگـەکەدا هەمان ڕێچکەی گرتەبەر کە پێشەنگەکە بڕیبووی، چونکە بۆ چوارپێی بار پیاڕۆیشتنی ئاسان تر بوو، نیوەی تری پیاوەکانی لە پاشەنگی چوارپێ‌یەکان دانـابـوو، کە پێشکـەوتن گەیشتنە لوتکەیێك کە بەسەر ڕێگـەکـەی‌دا دەنـۆڕێ، دیتیـان دوژمنی بەسـەرەوەیـەو خۆی لێ‌دا نوسـانـدووەو قایم کردووە. لەو حالـەتـە دەبـــوایـــە یا لوتکـەکـەیـان پێ‌چـۆڵ بکـەن یاخـود لە گریکەکان دادەبڕێن. ئەوان دەیان توانی بەو ڕێگەیەدا بڕۆن کە ئەوانی‌تر گرتبوویان، بەڵام ئەو ڕیچکەیەی تر تاکە ڕێگەیێك بوو کە چوارپێ دەتوانێ بیبڕێ، پاشان بانگی ئازایــەتی نوانــدنیـــان دا، بە کۆمـــەڵی چەنـد بەتـالیـۆنێـك هەڵمـەتیان بردە سەر لوتکەکە، لە هەموو لایـەك هێـرشیـان نەبـرد بەڵکـو ڕێگـەیان پێ‌دان ئەگەر کوردەکان ویستیان ڕابکەن، لە کاتی بە سەرکەوتن دا هەر یەکە چاکترین ڕێگەی دوزی‌یەوە، دانیشمەندەکان تیـــرـبــارانیـان کردن و بەردەبـارانیـان کردن، بەڵام کە نزیـك بوونـەوە لە هێرش بردن دا بەردەوام نەبوون، لە ئەنجام دا شوێنەکەیان بەجێ‌هێشت و ڕایان کرد.

کە گریکـەکـان ئەو چیـایـەیـان بڕی، سەیریان کرد شاخـێـکـی تریــان لەپێشـــەو دوژمن خۆی لێ‌دا قایم کردووە، بڕیـاریـان دا پەلامـاری ئەویش بدەن، بەڵام زەینـــەفـــۆن دەرکی بەوە کرد ئەگـەر چیـای یەکـەم بێ پاسەوان بەجێ بهێڵن، دوژمن دەگرێتەوەو کە وڵاخی

باری پێــدا دەڕوات هێرشی دەبـرێتـە سەر، قەتـاری کاروانەکە دووردورێژ بوو، لەبەر ئەوە هەردوو ئەفسەری سەد. نەفەرەکە «سیفسۆدۆرۆس»و «ئارخاجۆراس»ی لێ بەجێ‌هێشتن و زەینــەفــۆنیش ئەوەی کە مابـوون بەرەو شاخەکەی‌تری بردن.

هێشتا چیایێکی‌تر مابوو لەوی‌تر ڕەق تر بوو دەبوایە بگیرێ، وا دیـارە کە گریکـەکـان لێی‌نـزیـك بوونـەوە دانیشمـەنـدەکان بێ‌شـەرکـردن چۆڵیان کرد، ئەم کارە سەری هەموو کەسێکی سوڕماندو وای لێ‌کردن کە لەو باوەڕەدا بن ئەوانە لەوترسە چۆڵیان کردووە نەوەك گەمارۆ بدرێن و شەت وپـەت بکـرێن، لەڕاستی‌دا گریکـەکان شتێکی‌تریان بینی، لەسەر لوتکەکەوە دیتیان کوردەکان لە خوار ڕێگـەکـەوە «دۆڵـەکەوە» هەموویان دەرپەڕین و پەلاماری پاشەنگەکەیان دا.

زەینەفۆن لەگەڵ چەند کەسێکی تەمەن کەمتر بەسەر لوتکەکە کەوت و فەرمانی بەوانی‌تردا کە لەسەرخۆ بڕۆن تا دەستەکانی تری پاشەنگەکە پێیان بگەن و ئاگاداری کردن کە بە چەکەوە لەسەر زەوی‌یێکی تەختایی بوەستن ئەوەی کەمـێـك لە دۆڵـەکــەدا دەڕۆن، ئەو حەلــە «ئـاراخـاجـۆراس» هات و پێی‌گـوت کە پیـاوەکـانی لە چیـاکـەدا ڕامالران و «سیسۆدورۆس» و «ئەمفیکراتس»و ئەوانی لەگــەڵیــان دا بوون گشتیــان کوژران چونکـە نەیان وێرا بازدەنە سەر خوار تاشەبەردەکەو بە پاشەنگ بگـەن، کە کوردەکـان ئەم سەرکـەوتنـەیان بەدی‌هێنا، لەسـەر لوتکـەی بەرامبـەر چیـاکەی سێ‌یەم دەرکەوتن، زەینەفۆن بە هۆی وەرگێڕێکەوە پێی‌گوتن کە پێشنیازی شەڕڕاگرتن دەکات و داوای بەدەستەوەدانی کوژراوەکان دەکــات، ئەوانیش وەڵامیـان دانـەوە کە لاشـەکـانیـان پێ‌دەدەنــەوە بە مەرجێ گریکـەکـان ماڵــەکــانیــان نەســووتێنن. زەینـەفـۆن بەوە ڕازی‌بـوو. کاتێ کە ئەم گفتـوگـۆیـە لە ئارادابـوو هەموو خەڵکی ناوچەکە ڕژانە سەر چیـاکـەو کە گریکـەکـان لە چیـاکەدا شۆڕبوونەوە بەرەو لای ئەوانـەی بە چەکـەو وەستـابوون، دوژمن بە ژمـارەیــێــکـی بێ‌شــومــارو دەنـگـێـکـی بەتــرس پەلامــاریــان دان و لەکن لوتکــەی ئەو چیــایــەی کە زەینـەفـۆن لـێوەی شۆڕدەبۆوە کوردەکان دەستیان کرد بە غلۆرکردنەوەی بەرد، قاچی پیاوێکیان شکاندو، ئەوەی کە قەڵغــانــەکـەی زەینـەفـۆنی هەڵ گرتبـوو ڕای‌کـردو قەڵغــانــەکـەی لەگـەڵ خۆی برد، ئەوســا سوپــاکـەی گریکـەکـان هەمـووی گردبـوونـەوەو شوێنێکیان کرد بە سوپــاگـەو کۆمـەڵـێـك خانـووی بە ئیسـراحـەت و زۆر خۆراکیــان بینی، هەروەهــا شەراب زۆر بوو بەلام لە سەردابــی بە گەچ سەرگــیــراویــان ئاخـنــی بوو.

کوژراوەکانیان درایەوە دەست و نێژران. ڕۆژی دووەم بێ ڕێ‌نیشـادەر ڕێگـەیـان گرتـە بەر، دوژمن لەپشتەوە پەلامـاری دان و ویستی نەیـەڵێ بە هیـچ ڕێچکەیێکی تەنگــەبــەردا تێپــەڕن و دەســەڵاتی خۆیـان بەســەردا بســەپێنن. لە ڕۆیشتن دا گریکـەکـان تووشی چەندین پەلامــارو سەختی‌و دژوار بوون، لەبــەر ئەوە هەوڵ و تەقـەلـلایێکی زۆریـان دەدا کە لە بەرزای‌دا بڕۆن و لە نشێـودا نەبن نەوەك کوردەکـان بەسـەریـان دا زاڵ بن.

بۆیـە بەو ڕێگـایـانەدا دەڕویشتن کە لێیان دوور بوون، چونکە چەکەکانیان تەنیا تیروکەوان و قۆچەقانی نەبوو، بەڵکــو تیـرهـاوێـژی هێجگـار کارامـەو شارەزابـوون، کەوانـەکـانیـان درێـژی لە نێوان چوار پێنج پێ دەبوو، تیرەکانیش لە سێ پێ درێژتر بوون.

لە کاتی تیـرهـاویشتن دا پێی چەپیان دەبردە پێش و کۆتـایی خوارەوەی کەوانـەکـەی لەسەر گیر دەبوو ئەوسا

ژێیەکەیان رادەکێشا تیرەکانیان قەڵغان و زرێیان دەسمە

**گوزەرکردن بەرەو ئەرمێنیا:**

پاش ئەوەی لە دەست کوردەکان خۆیان دەربازکرد، لەو دێیانەی روویان لە رووباری دیجلەیە سوپاگای خۆیان لێداکوتا، ئەو شوێنەش سنوورێك لەنێوان «ئەرمێنیا»و «کوردستان» پێك دێنێ، ئالێرەدا گریکەکان حەسانەوە، دڵشادیشن بەوەی کە ئاو نیشتۆتەوە، رووبارەکە نزیکەی نیومیل و زیاتر لە چیاکانی کوردستان دوور بوو، لەبەر ئەوە کە لێرەدا مانەوە هەتا بڵێی گوشاد بوون، ئازووخە زوورە، بەزۆری لەو هیلاکی و ماندوویی و چەرمەسەرییە دەدوان کە بەتووشیانەوە هاتبوون، چونکە بەردەوام ماوەی هەفتەیێك خەریکی شەرکردن بوون لە کاتی تێپەربوونیان بە هەرێمی کوردەکان دا، کە تیایدا زیاتر دووچاری شەڕو ناخۆشی هاتن لەوەی کە بەرەنگاری «پاشاونیسافرنۆس» بوون، لەبەر ئەوە بیری دەربازبوون لەو هەموو رووداوانە وای لێکردن کە خەوێکی باش بخەون.

لێرەدا دەوەستین و باسی ئەرمەن و ماردینی و کلدانییەکان ناکەین کە ئەلقە لە گوێی ئۆرۆنتاس و ئەرتۆخاس بوون، چونکە هەر رووداوێك بووە شتێکی سەرەکی نەبووە، هەرچەندە کە کوردەکان کۆڵیان نەداو بەدوای یۆنانییەکان کەوتن کە ویستیان لە دیجلە بپەرنەوە، وەکو دیتیان ئاو تا سنگیان دێ، نەیان توانی لە ئاوەکە بدەن و خۆیان رابگرن، چونکە تەوژمی ئاوەکە توندوتیژ بوو، هەروەها گەر یەکێ دەستی بخاتە سەر سەری بۆ بەرگری کردن لە خۆی ئەوە تەنیا بۆ خۆپاراستن بووە لە تیرو هاوێژ راوی‌تر، لەبەر ئەوە کشانەوەو لەسەر کەناری رووبارەکە خیوەتیان لێ‌هەڵ دا پاش ئەوە سەیریان کرد چەند کۆمەڵە کوردێکی زۆری چەکدار گردبوونەتەوەو سەر لوتکەی چیاکەیان گرتووە، ئەو حەلە گریکەکان هەستیان بە نائومێدییێکی گەورە کرد، ئەو سەختی‌و گرانی‌یەیان تێبینی‌کرد ئەگەر لە رووبارەکە بدەن، هەروەها ئەو سەربازە ئامادەبووانەیان تێبینی کردن کە رێگەی پەرینەوەیان لێ‌دەگرن، لەبەر ئەوە ئەو رۆژ و شەوە مانەوەو نەیان دەزانی چ بکەن. زەینەفۆن خەونێکی بینی کە خۆی کۆت کراوە، بەڵام کۆتەکە لە خۆیەوە پچراو خۆی بە سەربەست و بەرەڵلا بینی‌و هەستی بە دڵنیایی کرد کە بارو دۆخیان بەرەو باشی دەچێت. پاش ماوەیێك دەستیان کرد بە رویشتن و کە کوردەکان دیتیان کە کاروانی کەلوپەل کەمی ماوە، لە ئەنجامی ئەمەوە دەستیان کرد بە تیرباران و قۆچەقانی هاویشتی بۆ گریکەکان، تەنانەت کە لە ئاوەکەش دەپەرینەوە هەندێکیان بەتیری کوردەکان بریندار بوون، هەتاوەکو لە ئاوەکە پەرینەوەو لە دەست کوردە بەرگری کەرەکان دەرباز بوون و هەتاکو پێیان نایە خاکی ئەرمەستان لاپەرەیێکی‌تر کرایەوە لە رووداوی‌تر کە ئێمە لێرەدا لێی نادوێین و تا ئێرەو دەوەستین.

**ئەنجام:**

**١ - ئەوی بە وردی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە زەینەفۆن وەك سەربازێك لەگەڵ دە هەزار گریکەکە نەبووە، بەڵکو مرۆڤێکی ژیرو**

رۆشنبیر بووە، جگە لە مەبەستی دەسکەوتنی مادی کە چۆتە ریزی لەشکری کۆرشەوە، وەك گەریدەیەك و مێژوونوسێکیش بە گەڵ سوپاکە کەوتووە.

٢ ـ زەینەفۆن هەرچەندە لە ئازایەتی یۆنانی‌یەکان کەم ناکاتەوە مۆرکی پێ‌لێ‌هەڵ برین لە باس کردنی جەنگاوەرە گریکەکان بە نووسینەکەیەوە دیارە، بەڵام زۆر رووداویشی بە دەسپاکی‌یەوە نووسیوە.

٣ ـ نووسەر هەرچەندە کوردەکان، بە (دوژمن)ناو دەبات، بەڵام بەو پەری ئازایەتی‌و لە خۆبوردن باسیان دەکات و لەو ئەشکەنجەو شەرەشەق و چەرمەسەری‌یە زۆرە دەدوێ کە لە خاکی کوردستان دووچاری بوون.

٤ ـ زەینەفۆن رێگەی شووشەو هەمەدانی نەگرتۆتە بەر، واتە رووی نەکردۆتە کوردستانی ئێران نەوەك فارسەکان زەبر لە سوپاکەی بدەن، ئەمە لەلایەك و لە لایەکی ترەوە نزیك ترین رێگەی گرتووە کە لە رێگەی کوردستانی عیراقەوە بچێتە کوردستانی تورکیاو لەوێشەوە بۆ یۆنان.

٥ ـ ئەو بەشانەی کە پەیوەندی‌یان بە کوردەوە هەیە چاکترین بەڵگەن بەدەست مێژوونووسان، کە کورد وەك نەتەوەیێك هەرگیز سەر بۆ بێگانە شۆڕ ناکات و ئەو پەری قوربانی دەدات کە ناوچەکەی خۆی بپارێزی‌و ناهێڵێ بێگانە ولاتەکەی پێ‌شێل بکات.

٦ ـ هەرچەندە کە گریکەکان چەك و جبەخانەیان لە کوردە چیایی‌یەکان تازەترو باڵاتربووەو نەخشەی جەنگی‌و سەربازیی رێك و پێکیان پەیرەو کردووە، بەڵام جەنگاوەرانی کورد کارێکی وایان پێ‌کردوون کە با بە دەواری شەری نەکردبێ.

٧ ـ زەینەفۆن تووشی هەڵەیێکی مێژوویی بووە کە میدی‌یەکانی بە فارس ناوبردووە، کەچی نەژادو رەسەنی کورد میدی‌یەکانن.

٨ ـ کوردەکان سەریان بۆ پاشاکانی فارس شۆڕ نەکردووەو بەرگریان لە ناوچەی خۆیان کردووەو چیا گەردن کەشەکان بوونەتە قەڵاتی سەخت و قایم بۆ خۆپاراستن و بەرگەگرتن و بەرگری کردن.

٩ ـ زەینەفۆن پێ لە جەرگی خۆی دەنا کە باسی ئازایەتی کوردەکان دەکات کە چۆن رووبەرووی لەشکرەکەی بوونەوەو زەبری خۆیان وەشاندو زۆریان لێ‌کوشتن، ئەم دان پیا نەش باوەرنامەیێکی مێژوویی گەشە لە مێژووی پر شانازی گەلی کوردمان.

● ● ●

لە راستی‌دا زەینەفون نێوی کوردی بە شێوەی ئەمرۆی، یانی (کورد) نەهێناوە، بەڵکو ناوی (کەردوخۆی) بردووە، بەڵام لەنێو ئەو کتێبەی، کە بە زمانی عەرەبی‌و هێندیك وەرگێرانیشی بە زمانی ئینگلیزی بڵاو ـ بۆتەوە ئەم ناوانەی وەکو زەنەفۆن لە بەرهەمەکەی‌دا باسیان دەکات وایان ناو نەبردوون بەڵکو بە شێوەی ئەمرۆ ناویان هێناون، بروانە:

ئاناباسیس، کتێبی (٤)، تێکستە یونانێکەی.

(رۆشنبیری نوێ)

# حملة العشرة آلاف

## "الحملة على فارس"

كمال غمبار




وبلاد فارس وبيزنطه والاناضول ذات قدر واف من الـوضـوح وممتعـة فهي في حد ذاتهـا سجّـل حافـل بالمجازفة والمهارة العسكرية ولذا فانّ كتاب (حملة العشرة آلاف) تعتبر من الكتب التآريخية القيمة ونال الكتـاب شهـرة واسعـة، فيـذكـر المؤرخ مثـلاً بأنّ مجمـوعـة من النـاس سمعـوا عن ذلـك الـزحف الاغريقي الذي جاء من الاناضول الى العراق، وفي معركة لم تستمر اكثر من ساعة قتل فيها كورش وأبيد جيشـه الـذي كان قومـه نحو عشرة الاف محارب.

واصل الاغريق تغلغلهم في براري آشور وجبال قرد وأرمينيـا وبلغـوا قلعة (ماد) وعبروا الجداول والانهار ووصلوا مدينة مزدهرة اسمها (سيتاس) التي تبعد نحو ميـل من نهـر دجلة ثم دخلوا موطن كورش واحتلوا أراضيـهـم وبـلادهم، يصف الكتـاب بدقـة رحى المعـارك التي دارت في تلك البـلاد وحـالـة جيوشها

وبعدها يتحدث الكتاب عن غدر تيسافرنوس من قبل كليرخوز الذي كان يتظاهر بالمحبة والمودة له وقُضي عليـهو وعلى عدد من قادة الاغـريق الـذين اتهمـوا بالتآمر مو كورش وضربت اعناقهم،

يصف المؤرخ المـذكـور مسار تلك الحملة والتي ترجمها يعقـوب افـرام منصور عن الانكليزية الى اللغة العربية بشكل مفصـل ويتحـدث بأمـانـة ودقـة عن الظروف القاسية المريرة التي اجتـازتهـا ومن خلالهـا واثنـاء مرورهـا بأرض كردستـان المقـاومـة العنيفة من قبل الاكراد القاطنين في مناطق الجبال حيث استخـدمـوا النبـال والمقـاليـع والسهـام واحدثوا فيهم اصابات بليغة وتكبد الاغريق خسائر فادحة.

لقد تناولنا في عرضنا للكتاب الجوانب التي تتعلق بالكرد وحـاولنـا القاء ضوء كثيف عن المعارك التي دارت رحاها بين الجيش اليـوناني والاكراد. يصف زنيفون في كتابه هذا كيف ان الاكـراد لم يخضعـوا للعـاهـل الفارسي وقد ورد في سياق حديثـه : **«ان هؤلاء القـوم يقطنـون الجبـال، وانهم بواسـل جداً، وغيـر خاضعين للعـاهـل، والحقيقة ان جيشاً ملكياً، قوامه مئة وعشرون الفاً، غزا مرة ديارهم، فلم يعد منهم فرد واحد بسبب وعورة الارض التي وجب عليهم ان يوغلوا فيها»**

**والجـديـر بالذكر ان هذا الكتاب يتناول حقبة هامة جديرة باهتمام المؤرخ ورجال التاريخ تعود الى القرن الخامس قبل الميـلاد سجـل فيها المؤرخ ذلك الحدث التاريخي تسجيلاً مفصـلاً، وبقـدر مايعني شعبنا الكردي في تلك الفترة تناولنا مايمت بصلة بشعبنـا لأهميـة الكتـاب تاريخياً وجغرافياً ولما فيـه من وصف احـوال البـلاد الاجتمـاعيـة والاقتصـاديـة، ولاننسىٰ بأن هذا السفـر فتـح نافذة واسعة امام اليونان فاطلوا منها على حضارات الشرق القديم، ولعله من جملة الحوافز لتوسع الاسكندر المقدوني نحو بلدان الشرق القديم.**

